# شازادەی حەمام

## لە شاری سلێمانی

بیرەوەرییەکانی

محەمەد حسین پاپولی یەزدی



بەرگی پێنجەم



وەرگێڕانی لە فارسییەوە:
ئەرکان عەبدوڵڵا - تەها سێکانیانی

پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی:
ساڵح بێچار

چاپی دووەم - ٢٠٢٢

# شازادەی حەمام

لە شاری سلێمانی

بیرەوەرییەکانی

## محەمەد حسین پاپولی یەزدی

وەرگێڕانی لە فارسییەوە:

**ئەرکان عەبدوڵڵا – تەها سێکانیانی**

پێداچوونەوە و داڕشتنەوە:

**ساڵح بێچار**

چاپی دووەم ٢٠٢٢

ناوی کتێب: شازادەی حەمام لە شاری سلێمانی
نووسینی: محەمەد حسێن پاپولی یەزدی
بابەت: بیرەوەریی
وەرگێڕانی: ئەرکان عەبدوڵڵا – تەها سێکانیانی
پێداچوونەوە و داڕشتنەوە: ساڵح بێچار
تایپ: پەیام دارا – محەمەد قادر
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: هەرێم عوسمان
چاپ: چاپخانەی کارۆ
نۆبەتی چاپ: چاپی دووەم – ٢٠٢٢
شوێنی چاپ: سلێمانی – هەرێمی کوردستان
تیراژ: ٥٠٠
نرخ: ٨٠٠٠ دینار



لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٥٣٦ ) ی ساڵی ٢٠٢٢ ی پێدراوە
ISBN - 978-9922-9883-0-6



**سەرباسەکان** — **لاپەڕە**

## پێشەکی

مرۆڤ کاتێک دەتوانێت خۆی بناسێت، کە بەرامبەرەکەی چون ئاوێنەیەک، کار و کردەوە و شێوە و ڕوخساری وەک خۆی بۆ نمایش بکات، نەک هەر بە شان و باڵی خۆیدا هەڵبدات و وابزانێت تەنها و تەنها هەر خۆی مرۆڤە و هەر خۆی خاوەن حەقە یان هەر خۆی ستەملێکراو و مافخوراوە. ئێمەی کورد دەیان و سەدان کتێبمان لەسەر شکۆ و شانازی خۆمان یان لەسەر جەور و ستەمی ڕۆژگار بەرامبەرمان نووسیوە. بەڵام هەموو ئەمانە دەچنە خانەی بە خۆداهەڵدان و خۆ وەک فریشتە نیشاندان. ئەی کاتێک نووسەرێک، مێژووناس و پرۆفیسۆرێکی جیۆپۆڵەتیکی بە ڕەگەز فارس دەربارەی کورد دەنووسێت، ئەوکاتە ئەودیوەی کە لە خۆمانەوە نادیارە و پەی پێنابەین بۆمان ڕوون و ئاشکرا دەبێت، کە ئاخۆ فارسێک کە ئێمەی کورد وەک داگیرکاری خاک و چەوسێنەری نەتەوە و نەژادی خۆمان لە دەوڵەت و ئایدۆلۆژیای سیاسی ئەوان دەڕوانین؛ چ هەست و دیدێکی بەرامبەرمان هەیە؟ ئایا کورد وەک نەتەوەیەکی شەڕەنگێزی خوێنڕێژ و بێ فەرهەنگ و دور لە شارستانی دەبینێت، یاخود وەک نەتەوەیەکی خاوەن کەلتوور و فەرهەنگ، نەتەوەیەک کە شەیدای ژیان و ژینگە دۆستییە؟ ئایا کورد وەک ستەمکار یاخود ستەملێکراو دەناسێت؟

ئەم کتێبە بەرگی پێنجەمی "شازادەی حەمام"ە، کە نووسەری بەناوبانگی ئێرانی دکتور موحەمەد حسێن پاپولی یەزدی نووسیویەتی. پەرتوکەکە بەرهەمی گەشتێکی پازدە ڕۆژەی نووسەرە، کە لە بەهاری ٢٠١٩ سەردانی شاری سلێمانی و دەوروبەری کردووە، بەشێکی گرنگی کتێبەکە بریتیە لە یادەوەریی نووسەر و گفتوگۆی ئەو لەگەڵ هەندێک کەسێتی کوردی باشوور. ئەم کتێبە چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی پڕ کارەسات و مەرگەساتی کورد لە باشووری کوردستان بەشێوازێکی هونەریی سادە و جوان بە خوێنەرانی نیشان دەدات.

نووسەر کارەکتەرێک بە ناوی تەها، "تەها عەبدوڵلا فەرەج"، دەکاتە هەوێنی نووسینی کتێبەکەی و لە پاڵ ئەم ناوەدا کە لەڕاستیدا کەسێکی کارەساتبار و بەشمەینەتی کوردە، ئەسپی خەیاڵ و ئەندێشەی تاودەدات، جارێک وەک پێشمەرگەیەک هەستی کوردایەتی بەرز دەفڕێت و جارێک وەک مرۆڤێکی تینووی ئازادی دەدوێت.

ئەم نووسەرە فارسە لەبارەی مێژوو و جوگرافیای کورد شارەزاییەکی تەواوی هەیە، هەر لە تەمەنی منداڵی لەگەڵ کوردانی ڕۆژهەڵات، ئاشنایەتی پەیداکردووە و پەی بە میواندۆستی و مرۆڤدۆستی و ئازایەتی کورد بردووە. ئازایەتی بەو واتایەی کە پیاو و ژنی کورد هەمیشە بۆ مانەوە و بەردەوامی ژیان جەنگاون، کارەسات و کۆمەڵکوژیی و زوڵم و ستەم و نادادی، بێ هیوا و ڕەشبینی نەکردون بەرامبەر ژیان و ئازادی.

نووسەر لەپاڵ گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهاتی کارەکتەرەکانی نێو کتێبەکەیدا، سەبارەت بە ژیانی سیاسیی، کۆمەڵایەتی، کەلتووریی و ئایینی کوردستانیش دەدوێت، بە جۆرێک بۆ ئێمەی کورد زۆر گرنگ و جێی بایەیەخە، کە نووسەرێکی ئێرانی بەڕەگەز فارس بەم جۆرە و بەم تێڕوانینە مرۆڤدۆستییەوە بڕوانێتە خەڵکی کورد و خاکی کوردستان.

**ئەرکان عەبدوڵلا مەحموود***

سلێمانی ٢٠٢١/٨/١

* مامۆستای زانکۆ

**پازدە رۆژی پڕ بیرەوەریی لە سلێمانی**

ئەم کتێبە، دەرەنجامی گەشتێکی نەورۆزی ٢٠١٩ یە، بۆ کوردستانی عێراق. تەها عەبدوڵڵا فەرەج سێکانیانی، کتێبی "شازادەی حەمام"ی وەرگێڕابووە سەر زمانی کوردی سۆرانی، لە سلێمانی چاپی کردبوو. ئەو ئێمەی بۆ جەژنی نەورۆز بانگهێشتی کوردستان کرد. پازدە رۆژ لە پڕ بیرەوەرییترین رۆژەکانی ژیانمان، لەسەر خاکی پڕ گەوهەری هەرێمی کوردستان بەسەربرد. گەشت بۆ وڵاتێکی سەراپا سەوز و ئاودار و کوێستانی پڕ لە بەفر. سروشتێکی جوان و بێگەرد. نە نیشانەیەک هەبوو بۆ تێکدانی سروشت و نە ئاماژەیەک بۆ پیسکردنی کەشوهەوا. ئابوورییەکی پتەو کە بەخێرایی بەرەو گەشەسەندن دەڕوات. هەمووئەم جوانییانە، بەتایبەت خەڵکە میهرەبان و میواندۆستەکەی، پیاوانی بەغیرەت و ژنانی بەتوانا و چالاکی ئەم هەرێمە، وێنایەکی جیاوازتریان لەسەر هەرێمی کوردستان بە ئێمە بەخشی.

دکتۆر محەمەد پاپولی یەزدی لەم کتێبەدا یادەوەریی و گفتوگۆکانی لەگەڵ کەسانی جیاواز نووسیوەتەوە. ئەو بە پێنووسە بە بڕشتەکەی ئازار و نەهامەتی و جوانییەکانی کوردستانی دەربڕیوە. ئەم کتێبە نە مێژووە، نە مرۆڤناسییە، نە لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە، بەڵکو دەردەدڵی کەسانێکی ڕەنجکێش و ماندووی ئەم سەرزەوییەیە. نیشاندانی تابلۆیەکی خەباتی گەلی کوردە بۆ ئازادی. نموونەی سەرگوزەشتەی مرۆڤگەلێکە. مشتێک لە خەرمانی دۆخی ئەو حکوومەتانەیە کە بە دڕندەیی، بە هێزی چەک و لوولەی تانک دەیانەوێت پەرەپێدان جێبەجێ بکەن.

ئەم کتێبە چیرۆکی زەردەخەنە و گریان، خۆشییەکان، ئومێد و نیگەرانی کەسانێک دەگێڕێتەوە کە هاوفەرهەنگ، هاودین، هاوسێ و هاوچارەنووسمانن. خەڵکێک کە یەک لە کۆڵنەدەرترین کەسانێکن لە پێناو بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆی و یەکسانیدا.

ئەم کتێبە چیرۆکی پیاوان و ژنانی تێکۆشەر و پێشمەرگەیە کە لە پێناو بەدەستهێنانی ئازادیدا دەستبەرداری ژیانی خۆش و کەسوکاریان بوون. چیرۆکی ژنانی وەک شەمسە و زوبێدەیە کە هیچ کاتێک پشتی هاوسەرەکانیان بەرنەدا و پێبەپێی ئەوان جەنگان، بگرە جارجاریش بە دەرد و ئازاری قوڵترەوە تێکۆشاون. چیرۆکی گەلێکە کە مرۆڤایەتی و میواندۆستی لە سەرەکیترین خەسڵەتەکانی ئەوانە.

بەوهیوایەی ئەنجامەکانی ئەم گەشتە دڵۆپێک بێت و بڕژێتە ناو سەدەفی پەیوەندی نێوان ئێران و کوردستان تا مرواریيەک لە هاوکاری و پێکەوەژیان بخوڵقێنێت.

سوپاس بۆ ئەو هەموو میواندۆستییەی کوردەکان، بە ئارەزووی دیدار و سەردانی دوبارە.

**فاتیمە وسوقی (هوما)***

ئۆکتۆبەری ۲۰۲۲

* **هاوژینی د. محەمەد حسێن پاپولی یەزدی**

# بەشی یەکەم
# کوردستانی عێراق

## سێکانیان

### چیرۆکێک لە هەزاران

سێکانیان یەکێکە لە هەزاران گوندی کوردستانی عێراق، گوندێکی نموونەیی سەر ڕووی زەمینە. گوندێکە شوێنی لە دایکبوون و پەروەردەکردنی کەسانی قارەمان و لەخۆبووردووە. هەڵکەوتەی گوندەکە کوێستانییە. کاتێک خودا بەهەشتی دروستکردووە، هاوکات سێکانیان‌یشی بەهەمان جوانیی دروستکردووە. سێکانیان واتە (سێ کانی یاخود سێ سەرچاوەی ئاو). ئەم گوندە قەڵایەکی سروشتییە، لەسەر گردۆڵکەیەک هەڵکەوتووە و چواردەوری بە زنجیرە شاخی بەرز دەورە دراوە.

دیواری شاخەکان ڕێک و بەرزن، لە شاخەکان بەرزتر تەنها ئاسمانە. لە پشت سێکانیانەوە هیچ گوندێکی دیکە نییە. لە خوار گوندەکەوە دۆڵێکی قوڵ هەیە، دۆڵێکی لێژ و سەخت، کە بە دارستانێکی چڕوپڕ داپۆشراوە. ئەمبەراوبەری دۆڵەکە هەمووی ڕەزی ترێیە. "ترێ" ئەو میوە بەهەشتییەیە کە لەم دۆڵە قوڵ و کوێستانییەدا بەردەوامی بە ژیان دەبەخشێت. دروستکردنی ئەم ڕەزانە ئاماژەیە بۆ هەوڵ و ماندوبوون و تیکۆشان و ژیریی کوردانی ژیاندۆست. ژیاندۆستییەک کە لە نێو دڵی بەردا ئەم میوە بەهەشتیە، بەرهەمدەهێنێ. لە سەروو ئەو گوندەوە، ئاسمانێکی شین و ڕوونە. ئاسمانێک کە تیشکی خۆرەکەی لە درەوشانەوەدا پێناسە ناکرێت.

هەندێک جار تەم، تا پشتی دۆڵەکە دادەپۆشێت. چاو، چاو نابینێت. لە زستاندا، بەفر هەموو لایەک دادەپۆشێت. شەوانە تریفەی مانگ چرای ڕێگەیە. تریفەی مانگ و ئەستێرەکان پەڕوباڵ بە خەیاڵ دەبەخش. شاعیرانی کورد لەو کوێستانانەدا جوانترین شیعر دەنووسن. ئەگەر شەو تاریک و ئاسمان ساماڵ بێت، ملیارەها ئەستێرە دەبریسکێنەوە. مرۆڤ حەزدەکات دەستەکانی بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمان و ئەستێرە بچنێت. لە کاتی بەهاردا لە درز و کەلێنی شاخەکانەوە ئاو هەڵدەڕژێت. ئاوێکی سارد و ڕوون، لە دامێن و بەرزایی شاخەکانەوە دێتە دەرەوە. هەموو جۆگەلە ئاوەکان یەک دەگرنەوە و دەڕژێنە دۆڵە قوڵەکەوە. دوو گوند بە ناوەکانی سەرگەڵوو و بەرگەڵوو لەو دەربەندەدا ئارامیان گرتووە. کە هەر یەکەیان، چیرۆکی خۆی هەیە "گەڵوو" واتە باریک، وەکوو گەرووی مرۆڤ. ئەو دۆڵە تەنگ و چڕە شوێنی خەبات و تێکۆشانی گەلی کورد بووە. دۆڵێک کە هەر بەردێکی چیرۆکێکی لە ژێردایە، دۆڵێک کە هەر بستێکی چیرۆکی خەباتگێڕێکی کوردمان بۆ دەگێڕێتەوە. لەم بەهەشتە کوێستانییە پڕ لە گوڵ و گوڵزارەدا، سەدان ساڵ، یاخود هەزاران ساڵ بێت کە ئەو خەڵکە بەهەشتی و زەحمەتکێشە لێی نیشتەجێ بوون. خەڵکە ئازا و ماندوونەناسەکەی ئەم گوندە، وەک تەواوی گوندەکانی دیکەی کوردستان، نموونەی ئازایەتی و قارەمانێتین، شێرەژنانیشیان ژنانی ئازا و جەنگاوەرن، نموونەی فیداکاری و خۆڕاگرین. سیکانیان، نموونەیەکە لە گوندەکانی کوردستانی عێراق. کوردستانی لانکەی خەباتگێڕان. منداڵانی پەروەردەی ئەم ئاو و خاکە؛ دلێر و ئازادیخوادازن. لە ساڵی ١٩٧٤-١٩٨٨ لە ١٧٠ کەسی دانیشتووی سیکانیان حەفتا و سێ کەسیان بەدەستی هێزەکانی سەدام حسێن، شەهید بوون.

کەسانێک بە گا و گاسن، زەوی دەکێڵن و کەمێک گەنم و جۆ دەچێنن، لە دامێنی کێوەکاندا، بە بێڵ و پاچ و قوڵنگ زەوی تەخت دەکەن، مێوی لێدەچێنن و دەیکەن بەرەزی ترێ. هەڵبەت بەرهەمی ترێ بژێوی و ئابووریی ئەو خەڵکە دابین دەکات. باخەوانان تاکو بەپیادە، بگانە زەوی و باخەکەیان، دەبێت چەندین هەڵدێر و سەختەڕێ ببڕن، لە هەورازێکەوە بۆ هەورازێکی تر، لە دۆڵێکەوە بۆ دۆڵێکی تر، پاچ و بێڵ بەدەستییانەوە و تەوراسی هەڵپاچینی دار و مەتارەی ئاو بە کەمەریانەوە، نان و پەنیر

بە کۆڵیانەوە. بە ئازایەتی و لێهاتوویی ژنان و پیاوانی سێکانیان، جوانترین باخییان لە دامێنی چیاکەدا بنیادناوە. مرۆڤ حەز دەکات چەندین کاتژمێر لە دامێنی چیاکە دابنیشێت و هەوڵ و تێکۆشانی چەندین سەدەی ئەو خەڵکە ڕەنجدەرە ببینێت، کە لە باوک و باپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە. ئەو باخانە بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونی کەسانی کۆڵنەدەر و پەروەردەی ناو سروشتە. دۆشاوی ترێ، نموونەی باشترین دەرمانی هەموو دەردێکە. پێشنیار دەکەم حکوومەتی هەرێمی کوردستان، بۆ تۆماری ڕەزەکان لە تۆماری جیهانیدا، هەنگاوبنێت. دوورنییە ئێستا کە ساڵی ٢٠٢٠ ـە ئەو هەنگاوەی نابێت. زەوییەکە خاکێکی بەپیتە، بەڵام نارێک و بەردەڵانە. دەکرێت کێڵگەی بچووکی لێ دروست بکرێت.

سروشت بە سەوزەڵانییەکی چڕ داپۆشراوە. لە دەوروبەری گوندەکەدا جۆرەها گیادەرمانیی هەیە. ئەو ئاژەڵانەی لەم هەرد و کێوانە دەلەوەڕێن تامی گۆشت و شیرەکەیان خۆشترە. بەرهەمی گۆشت و شیرەمەنی کێوەکانی کوردستان لە جیهاندا بێ وێنەیە. ئەو ئاژەڵانەی کە بەدەستی ئەو خەڵکە ڕەنجدەرە لە کێو و دارستانەکاندا پەروەردە دەکرێن، باشترین شیر و گۆشتیان هەیە. گۆشتی ئەم ئاژەڵانە بەهایەکی خۆراکیی بەرزیان هەیە. ئەمانە خەڵاتی سروشتن کە بەدەستی خەڵکی ئەم گوندانە پـەروەردە دەکرێن، هەنگوینی ئـەم شاخانە، هەنگوینێکی زۆر بەتام و خـۆش و بێخەوشە، هەر وەک خەڵکەکەی.

لە وەرزی بەهار و هاویندا مەڕ و ماڵات، لە لەوەڕگەی کێوە بەرزەکان دەلەوەڕێن، مریشک، کەڵەشێر و باڵندە ڕەنگاوڕەنگەکانی دیکەی کوردستان، نموونەی جوانترینی باڵندەکانن. گۆشت و شیرەمەنی و گیای خۆڕسک، سەرچاوەی خۆراکی خەڵکی بەهێزی ئەم کوێستانانەن. لەم بەهەشتە بەرینەدا کەڵەکێوی و باڵندە کێوییەکان سەرچاوەی بەشێک لە خۆراکی خەڵکەکەیە. ژنانی دەستڕەنگێنی کورد، لە خوریی مەڕ و مووی بزن، جلوبەرگی جوان بۆ پیاوەکانیان دروستدەکەن. لەو دەشت و دۆڵانە، لە گوندەکانی کوێستانەکانی کوردستان، چەندین سەدەیە داری توو بووەتە سەرچاوەیەکی بژێویان. توو، میوەیەکە بەهای خۆراکی هەیە، دۆشاو و مرەبای لێ دروست دەکەن، یان وشکی دەکەن و زستان سوودی لێ وەردەگرن. سەردەمانێک

جوتیاران لە دەشت و دۆڵەکاندا تووتنیان دەچاند، تووتنێک کە بە تەواوی شارەکانی کوردستان و عێراقدا بڵاو دەبووەوە. لە سەردەمی کۆندا پیاوانی کورد تفەنگچی و ڕاوچی بوون، بە پەیدابوونی چەکی ئاگرین و تفەنگ و دووربین، کاری ڕاوچییەتی ئاسانتر بوو؛ بەڵام ئەو خەڵکە هەرگیز لە ڕاوکردندا زیادە ڕەوییان نەکردووە. ئەوان هەمیشە ڕێزیان لە خەڵاتەکانی خودا گرتووە و سەرچاوەی سروشت بە خەڵات دەبینن نەک سامان. ئەوان کەسانی ئاشتیخوداز و ئازادیخودازن.

لەسەردەمی هەخامەنشینەکانەوە تاکو ئێستا، هیچ حکوومەتێک نەیتوانیووە بەزۆر خۆی بەسەر کوردستاندا بسەپێنێت، ئەوەی ئەم خەڵکەی داوە بەدەست دوژمنەوە؛ دڵسافی و خۆشباوەڕی خۆیان بووە، چەندین ڕەوت و ئایدۆلۆژیا لە کوردستان هەبووە و هەیە: ڕەوتی ئیسلامی، نەقشبەندی و قادری، کۆمۆنیزم و سۆشیالیزم، بەڵام باشترین بیرکردنەوە لەلای ئەم گوندنشینانە ئازادی و سەربەخۆیی و دادپەروەرییە.

خەڵکی ئەم دەشت و دۆڵانە میواندۆستترین خەڵکی سەر ڕووی زەوین. ئەوان دەڵێن هەر کەسێک دێت بۆ ئەم بەهەشتی خودایە بەخێربێت، نانی پێدەدەین و لە ئایینی ناپرسین؛ بەڵام ئەگەر میوانی خۆسەپێن، ویستی بەزۆر خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت، ئەوا بەرگریی دەکەن و پشتی دەشکێنن.

گوندەکانی سێکانیان، سەرگەڵوو و بەرگەڵوو، هەریەکەیان چەندین بەسەرهاتیان هەیە. بەسەرهاتێک کە بەشێک لە مێژووی هاوچەرخی کورستان نیشان دەدات. من لەم کتێبەدا کارم بەسەر مێژووی تێکۆشانی ڕابردووی ئەم گوندانەوە نییە. من کارم بەسەر ئەو بەسەرهاتەوە هەیە کە چەند ڕۆژێک میوانی ئەو کەسانە بووم و بۆیان گێڕاومەتەوە. ئەم کتێبە وتەی کەسانی زیندووی ئەو گوندانە و کەسانی ناوچەکەیە کە خۆیان بەسەرهاتەکانیان بۆ گێڕاومەتەوە. کەسانێک کە خۆیان تاوانەکانی سەدام حوسێنیان بینیوە و چەشتووە. کەسانێک کە تا ئێستاش بەهۆی زوڵم و زۆری بەعسەوە لە بارێکی دەروونیی خراپدا دەژین. بەرگری میللەتێک کە لە بەهەشتدا گرفتاری حکوومەتێکی دۆزەخیی بوون. لە ساڵی ٢٠١٩ دا بۆ گەیشتن بە گوندی سێکانیان، تەنها یەک ڕێگا هەبوو، ئەویش دەبوو بەسەر کێوێکی بەرزدا سەربکەوین. کێوێکی بەرز و هەڵدێر، ئێمە بە ماشێن بەرەو سێکانیان ڕۆیشتین. کاتێک

لە سلێمانییەوە بەڕێکەوتین و لە گەردەنەی سەرگەڵووەوە سەرەوخوار بووینەوە. گوندی سێکانیان هەر وەکوو نقێمێک لە دوورەوە دەدرەوشایەوە. گەردەنەیەکی بەرز کە دەشتی سلێمانی بە دۆڵی سەرگەڵووەوە دەبەستێتەوە. پێش دروستکردنی ئەو جادەیە ڕۆیشتن بەرەو سەرگەڵوو کارێکی دژوار بوو. پێشمەرگەکان لە کاتی هێرشی دوژمندا دەیانتوانی ئەو کوێرە ڕێگایە بگرن. لەکاتی زستان و سەهۆڵبەنداندا سەرکەوتن بەسەر ئەو کێوەدا تەنها لە توانای خەڵکی ناوچەکەدا بوو.

گوندەکە لە دۆڵێکدایە و لە بەرامبەر کێوەکەدا هەڵکەوتووە. کاتێک دەچیتە نێو دۆڵەکەوە ئیتر ناتوانیت سەرگەڵوو ببینیت. بۆ گەیشتن بە سێکانیان دەبێت دوبارە سەربکەویتە سەر گەردەنەیەکی تر، کاتێک گەیشتیتە سەر گەردەنەی دووەم ئەوکاتە گوندەکە نزیکترە و جوانتر دەبینرێت. گوندێک بە قەدپاڵی کێوێکەوە و لەنێو باوەشی دارستانێکی چڕی پڕ لە داربەڕوو، هەڵکەوتووە. گوندنشینان لە دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام ،خانووی نوێیان بنیادناوەتەوە. سەدانساڵە منداڵانی گوند، کاتێک پێ دەخەنە ئەودیو ماڵەکانیان، ڕاستەوخۆ دەچنە ناو دارستانە سەرسەوز و بەپیتەکانەوە. مرۆڤ و دارستانەکان پێکەوە دەژین و دەمێنن. بەدرێژایی دەیان سەدە منداڵانی ساوا بە سنگەخشکێ و گاگۆڵکێ لە ماڵەکانەوە خۆیان دەگەیاندە نێو دارستان، قەد و لقی داربەڕووەکان، دەبوونە ڕەوڕەوە و داردەستێک بۆ پێگرتنیان. منداڵانی گوند چەندین سەدەیە پێیان لەم هەوارگە دڵڕفێنە چەقاندووە. هەوارگەیەک کە تا کۆتایی تەمەن لەبیری ناکەن.

تەها عەبدوڵڵا فەرەج، یان تەها کوڕی حاجی عەبدوڵڵا کوڕی فەرەج کوڕی حەسەن. هەر وەک باوک و باپیرانی، لەم گوندەدا هاتووەتە دونیاوە. تەها لە نێو خەڵک و پێشمەرگە دێرینەکاندا بە "تەها سێکانیانی" ناسراوە. لە ساڵی ١٩٦٠ هاتۆتە دونیاوە. باوکی تەها ناوی عەبدوڵڵایە. عەبدوڵڵا، تەمەنی یەک مانگ بووە کاتێک باوکی کۆچی دوایی کردووە. دایکی عەبدوڵڵا شوو بە حاجی ئەحمەد دەکاتەوە، واتە شوو بە شوبرای خۆی دەکاتەوە، عەبدوڵڵا بە بێ باوک گەورە دەبێت، عەبدوڵڵا خۆشەویستی هەموو بنەماڵەکەی بووە. کەسوکار هەموو خۆشیاندەویست، عەبدوڵڵا گەورە و گەورەتر بوو، پیاوێکی ئازا و بەهێز بوو، کاری کشتوکاڵ و باخداری

و ئاژەڵ بەخێوکردن و شوانی دەکرد. لە دارستانەکان داری وشکی دەهێنا و خەڵوزی لێ دروست دەکرد. دارەکانی بەجۆرێک دەبڕینەوە کە دوبارە هەڵبدەنەوە. بەزۆری درەختە لاوشک و پەککەوتەکانی دەبڕی. زۆربەی زۆری خەڵکی گوندەکە ئەو کارەیان دەکرد. حاجی عەبدوڵلا لاوێکی هەڵکەوتوو بوو، دواتر لەگەڵ ئامینەدا زەماوەندیان کرد. عەبدوڵلا لە دایکبووی ١٩٢٧ بوو، ئامینەش لەدایکبووی ١٩٣١ بوو. یەکەمین منداڵیان کچێکی جوان بوو، ناویان لێنا "شەمسە"، شەمسە ساڵی ١٩٥٥ لە دایکبووە، شەمسە لەو ناوچە بەهەشتیەدا گەورە بوو، زۆر منداڵ بوو لەگەڵ باوکیدا دەڕۆیشتە دەرەوە، کاری دەکرد و هاوکاری باوکی دەکرد. بژاری دەکرد و گیاخۆراکی کۆدەکردەوە و چیلکە و داری وشکی لە کێو دەهێنایەوە بۆ ماڵەوە. شەمسە خۆشەویستی دایک و باوکی بوو، بەردەوام یارییان لەگەڵدا دەکرد و نازیان دەکێشا. شەوانە دایکی تاکو خەو دەیبردەوە چیرۆکی بۆ دەگێڕایەوە. دایکی جلوبەرگی جوان و ڕەنگاوڕەنگی بۆ دەدوری و سەری بۆ شانە دەکرد. تاکو تەمەنی پێنج ساڵی، شەمسە تاکە منداڵی ئەو ماڵە بوو. خۆشەویستی دایک و باوکی بوو، باوکی لە کێو باڵندە و کەروێشکی بۆ دەگرت و بۆی دەهێنایەوە، شەمسە بەردەوام لەگەڵ بەرخ و کاریلە و مریشک و کەڵەشێرەکاندا یاریی دەکرد. تەمەنی چوار ساڵ بوو کە بەیانیان زوو هەڵدەستا و سەردانی کولانەی مریشکەکانی دەکرد. هێلکەکانی کۆدەکردەوە و دەیبردەوە بۆ دایکی. هەمیشە پێدەکەنی، پێکەنینەکەشی هەروەک خۆی جوان بوو، خزمان هەموو شەمسەیان خۆشدەویست. شەمسە خۆری بنەماڵەکەیان بوو. ئەوان ماڵێکی هەژار بوون، خەڵکی گوندەکە بە گشتی هەژار بوون، لە گوندێکی کوێستانی دوورەدەست دەژیان. گوندێک کە هیچ شتێکی نەبوو، گوندێک کە ڕێگای ماشێن و کارەبا و قوتابخانە و نەخۆشخانەی نەبوو، بەڵام دانیشتووانی شاد و دڵخۆش بوون. شەمسە هیچی دەربارەی خەم و خەفەت و ڕەنج و ماندبوون نەدەزانی. شەوانە میوانیان دەهات و لەدەوری یەکدی کۆدەبوونەوە. ژن و پیاو هەموو خزم و کەسی یەکدی بوون. شەوچەرە و چاییان دەخوارد. خوێندەوارەکان کتێبیان دەخوێندەوە و منداڵ و گەورە گوێیان دەگرت، شەمسە بە بیستنی چیرۆک و بەسەرهاتەکان گەورە دەبوو.

کاتێک تەها هاتە دونیاوە شەمسە تەمەنی پێنج ساڵ بوو. ئێستا شەمسە بووە بە خاوەنی برا. شەمسە خوشکێکی میهرەبان و دڵسۆز بوو بۆ تەها، تەهاش لەو کەشوهەوا بەهەشتیەدا گەورە بوو. شەمسە بەردەوام تەهای لە کۆڵ دەکرد و دەیبردە نێو سەوزە گیاکەی خوار ماڵی خۆیان، لەوێ لە نێو گوڵ و گوڵزاردا یارییان دەکرد. بەهاران چەندین جۆر گوڵ و گیا سەریان لەخاک دەردەهێنا و ڕووی زەوییان دادەپۆشی. ئەو سەرزەویە وەک تابلۆیەکی نەخشاوی لێدەهات. وەک ئەوەی فەرشی زومرودی لێ ڕاخرابێت. فەرشێکی نەخشێندراو بە سەدان گوڵی ڕەنگاوڕەنگ. خەڵکی گوندەکەش سروشیان لە و سروشتە جوانەوە وەردەگرت. جلوبەرگی ژنانیش هەر وەکوو سروشتەکەیان پڕ گوڵ بوون. شەمسە جلوبەرگی جوان و ڕەنگاوڕەنگی دەپۆشی. خانووەکانی ئەو گوندە هەمووی کەلتووریی بوون، دیواری خانووەکانیان بەقوڕ و بەرد دروستکرا بوون. سەری خانووەکانیشیان بە داری دارستانەکان گرتبوو، پەنجەرەی ماڵەکانیان بچووک بوون و چێشتلێنانیش بە ئاگر و داری دارستانەکان بوو. زستانانیش ژوورەکانیان بە زۆپای دار گەرم دەکرد. پێشتر نێو ماڵەکانیان هەر بە ئاگرکردنەوە ڕووناک دەکردەوە، بەڵام دواتر فانۆس و لەمپای نەوتی داهات.

شەمسە تەمەنی حەوت ساڵ بوو، تەهای دوو ساڵەی لە کۆڵ دەکرد و لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ نێو ڕەز و باخەکان و یاریی لەگەڵدا دەکرد. تەها منداڵێکی خۆشەویست بوو. خزمان، تێکڕا بە ژن و بە پیاوەوە خۆشیان دەویست. تەها ڕەنگوڕوورییەکی سووروسپی جوانی هەبوو. چاوەکانی جێی متمانە و بڕوا بوو. منداڵێکی زرنگ و بەهۆش بوو. دانیشتووانی گوندەکە هەموو خزم و کەسی یەکدی بوون. خاڵ و ئامۆزا و پوورەکانی هەموو یارییان لەگەڵدا دەکرد و دەیانلاواند. خاڵە عەبدوڵڵا، خاڵی تەها بوو هاوتەمەنی یەکدیش بوون. هەمیشە پێکەوە یارییان دەکرد. ئەگەرچی هیچ کەرەستەیەکی یارییکردنیان نەبوو، تاکو یاریی پێبکەن، بەڵام لە کەشێکی ئارامدا ڕۆژیان دەبردەسەر. خەڵکی گوندەکە بەگشتی لە دۆخێکی ئارامدا دەژیان. شەڕ و ئاژاوە نەبوو. دزی و ڕاووڕووت نەبوو، خواردن کەم نەبوو، نەخۆشی نەبوو، سروشت پاک و خاوێن بوو، ئەو خەڵکە بە گشتی تەنها دۆستایەتی و خۆشەویستی لە نێوانیاندا هەبوو.

لە سێکانیان و زۆربەی گوندەکانی دیکە قوتابخانە نەبوو، شەمسە نەدەچوو بۆ قوتابخانە، هەموو تەمەنی بە نەخوێندەواری بەڕێکرد. تەها تەمەنی چوار ساڵ بوو، ڕۆژێک لەگەڵ شەمسە پێکەوە چوون بۆ نێو دارستانەکەی خوار گوندەکەیان. چەند منداڵێکی دیکەش لەوێ بوون. لەناکاو دەنگێکی زۆر بەهێز لە ئاسمانەوە هات منداڵان تا ئەو کاتە تەنها گوێیان لە دەنگی کەو، کۆتر و باڵندەکان ببوو، بەڵام ئەم دەنگە زۆر لە قاسپەی کەو و دەنگی باڵندەکان جیاوازتر بوو. ئەو دەنگە، دەنگی هەورەگرمەش نەبوو. دەنگە ناسازەکە بەلای منداڵانەوە نامۆ بوو، لەناکاو لەسەر کێوەکەی ئەو بەرەوە چەند باڵندەیەکی گەورەیان بینی، منداڵەکان چیرۆکی دێوی باڵداریان بیستبوو. کە بە باڵە گەورەکانیان بە ئاسماندا دەفڕین و خەڵکیان دەرفاند و بە چنگە تیژەکانیان خەڵکیان هەڵدەگرت و دەیانبردن بۆ سەر کێوەکان، لەوێ بە دەندووکە تیژەکانیان بێبەزەییانە پارچە پارچەیان دەکردن و دەیانخواردن. منداڵەکان پێیان وا بوو کە ئەو باڵندە گەورانە، هەمان دێوەکانی نێو چیرۆکەکانن کە پێشتر بیستبوویان.

منداڵەکان لەترسی ئەو باڵندە گەورانە لە نێو دار و درەختی دارستانەکەدا خۆیان شاردەوە، لەترسا هەڵدەلەرزین، هەندێکیشیان دەگریان، لە پڕێکدا چەند ژن و پیاوێک هاواریان کرد: خۆتان بشارنەوە! خۆتان بشارنەوە! هەر کەس لەژێر بەردێک یا لەژێر درەختێکدا خۆی شاردەوە، لەناکاو گرمەیەکی گەورە ئەو ناوەی لەرزاند، دەنگەکە هێند بەرز بوو، شاخەکان دەنگیان دایەوە، گاشەبەردێکی گەورە لە شاخەکەوە بەربووەوە و بەرەو دۆڵە قوڵەکەی خوارەوەی گوند گلبووەوە. دەنگی بەربوونەوەی تاشەبەردەکە لە دەنگی ئەو باڵندانە کەمتر نەبوو. چەند کەسێک هاواریان کرد بۆمبایە! بۆمبایە!. تکایە بەزوویی خۆتان بشارنەوە. ئەو باڵندە دێو ئاسایانە بەئاسماندا دەسووڕانەوە. باڵندەکان دوو دوو دەهاتن، بۆمبەکانیان فڕێ دەدا و دەڕۆیشتن، بۆمبەکان (ناپاڵم) بوون و لە دڵی ئەو باڵندانەوە دەردەچوون.

ئەو باڵدارە گەورانە فڕۆکەکانی دوژمن بوون، دوژمنێک کە دەیویست کورد لەناوبەرێت، دوژمنێک کە دەیویست هاووڵاتیانی خۆی لەناوبەرێت. ئەو باڵدارە دێو ئاسایانەی بە ئاسماندا دەسووڕانەوە، دەنگێکی دیکەیان لێوە دەهات دەنگێک کە لە دەنگی یەکەم هێواشتر بوو. هاوار بەرزبووەوە گوتیان: ئەوە بۆردوومان دەکات،

بە شەستیر بۆردوومان دەکات! هەموو بۆردوومانەکە ماوەی دە خولەکی خایاند. دواتر ئارامی گەڕایەوە بۆ گوندەکە، خەڵکەکە لە پەناگەکان هاتنە دەرەوە و هەریەکە و بەلایەکدا ڕایدەکرد و بەدوای منداڵەکانیاندا دەگەڕان. خۆشبەختانە هیچ کەسێک نەکوژرا بوو. تەنها چەند سەر مەڕ و بزن کوژرابوون، چەند خانوویەکیش زیانیان پێگەیشت بوو، شوانێک بریندارببوو، سەگێک قاچی بریندار ببوو، ئەو خانووانەی کە زیانیان پێگەیشت بوو، بە هاوکاری خەڵکی گوندەکە چاک کرانەوە.

لەماڵەوە باس باسی سیاسەت بوو، باسی جەنگ بوو، تەها بۆ یەکەمین جار زانی ئەو باڵندە گەورانەی بە ئاسمانەوە بوون دروستکراوی خوداوەند نەبوون، بەڵکو مرۆڤ دروستی کردوون. باس باسی "مەلا مستەفا" و پێشمەرگە بوو، تەها تەمەنی چوار ساڵ بوو، هیچ لەو قسە و باسانە تێنەدەگەیشت، بەڵام دەیزانی کە حەمەی شوان لە تاو دەرد و ئازاری برینەکەی هاوار دەکات. بەچاوی خۆی ئەو مەڕ و بزنانەی دەبینی کە بە بۆردوومانی فڕۆکەکان کوژرا بوون. خەڵکەکە باسی حەرام و حەڵاڵیی گۆشتی ئاژەڵە کوژراوەکانیان دەکرد. تەها بە چاوی خۆی ئەوەی بینی کە چەند ماڵێک لە ماوەی دە خولەکدا ڕووخان، تەها تێگەیشت کە تەنها بەفر و باران لە ئاسمانەوە نابارێت، بەڵکو هەندێک جار بۆمب و گوللەی ئاگرینیش لە ئاسمانەوە دادەبارێت، هەندێک جار گوللەی مەرگ دێت. لەو ڕۆژە بەدواوە تەها بەردەوام سەیری ئاسمانی دەکرد، سەیرکردنێکی نهێنی و بەترسەوە. تەها شەوانە خەوی دەبینی، خەونی بە باڵندە گەورەکانەوە دەبینی کە چۆن مرۆڤ و ئاژەڵی بێتاوانیان دەکوشت.

شەمسە و منداڵانی دیکەی گوندەکە، شەوانە خەونی ترسناکیان دەبینی. گەورەکانیش لە نیگەرانیدا بوون، ئامینە شەوانە شەمسە و تەهای بێدار دەکردەوە، دایکیان دەیزانی کە منداڵەکانی خەونی ترسناک دەبینن. دەبوو قسەیان لەگەڵدا بکات و هێمنیان بکاتەوە. هەموو دایکانی گوندەکە بەو جۆرە بوون، دایکەکان پێکەوە باسی خەونی ترسناکی منداڵەکانیان دەکرد، ئەگەر ئەم سەردەمە بووایە دەیانبردنە لای دکتۆری دەروونیی، بەڵام لە سێکانیان و تەواوی گوندەکانی دیکەش هیچ پزیشکێک نەبوو، چ جای دکتۆری دەروونیی!

دوای چەند ڕۆژێک لە هاتنی فڕۆکەکان و بۆردوومانکردنی گوندی سێکانیان، تەها لەگەڵ چەند منداڵێکی دیکە بۆ یارییکردن چوونە دەرەوەی گوند. ئەوان هەمیشە دەڕۆیشتنە دەرەوەی گوند، بەڵام ئەو ڕۆژە لە ڕۆژانی دیکە جیاوازتر بوو، زۆر جار منداڵان بۆ خۆشیی ئاگریان دەکردەوە و بەدەوری ئاگرەکەدا یارییان دەکرد. لەو کێو و دەشت و دەرە، هیچ هۆکارێکی یارییکردنی منداڵان نەبوو. تەنها سروشت بوو کە دەبوو لەو سروشتە جوانەدا یارییان بکردایە. لەو سروشتە بەهەشت ئاسایەدا تەنها هۆکاری یارییکردنیان ئاگرکردنەوە و یارییکردن بوو بەدەوری ئاگرەکەدا. نزیکی نیوەڕۆ بوو، تەها لەگەڵ چەند منداڵێکی دیکە ڕۆیشتن بۆ خوار گوندەکە، ئەو شوێنە درەختی بەرز و گەورەی تێدا نەبوو، تەنها دەوەن هەبوون، دەوەن واتە بنەداری بچوک. شوێنەکە زۆر لەبار بوو بۆ یارییکردنی منداڵان، منداڵەکان هەریەکەیان لە ئاستی خۆیەوە دەستیکرد بە کۆکردنەوەی دار و چیلکەی وشک، زۆریان کۆکردەوە، پاشان بە دەنکە شقارتەیەک ئاگرێکی گەورەیان کردەوە، هەموو شاد و دڵخۆش بەدەوری ئاگرەکە هەڵدەپەڕین و یارییان دەکرد. گشتیان گەرم داهاتبوون. هەر سێ چوار مەترێک لە ئاگرەکەوە دوور بوون؛ گڕی ئاگرەکە تەواو بەرز ببووەوە. تەهای بچکۆلە لە ئاگرەکەوە نزیک بوو، شیرینی کچۆڵەش نزیکی تەها بوو، شیرینماڵیان دراوسێی ماڵی تەها بوو. شەمسە لەوێ نەبوو، خۆ ئەگەر شەمسە لەوێ بووایە، نەیدەهێشت تەهای بچکۆلانە هێندە نزیکی ئاگرەکە ببێتەوە. لەپڕ دەنگێکی بەهێز هات، دەنگێک لە نێو ئاگرەکەوە، دوکەڵ و پشکۆ بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە. منداڵان هەموو ڕایانکرد، شیرینیش ڕایکرد، تەهاش ڕایکرد، بەڵام لە پڕێکدا کەوت و نەیتوانی هەڵسێتەوە، شیرینیش هەستی بە ئازاری دەستی کرد، خوێن بە پەنجەکانیدا هاتە خوارەوە، چەند گوللـە شەستیرێکی نەتەقیوو لەژێر ئاگرەکەدا بوون، بە گەرمیی ئاگرەکە تەقینەوە. تەها هەستی بە ئازاری قاچ و قۆڵی دەکرد. منداڵان بەرە و ناودێ ڕایانکرد و هاواریان دەکرد تەها و شیرین بریندارن! دەنگی تەقینەوەکە گەیشتبووە گوێی هەموو خەڵکی ئاوایی. باوکی تەها بەزوویی خۆی گەیاندە لای تەها، تەها شەلاڵی خوێن ببوو. خوێن لە قۆڵ و قاچیەوە فیچقەی دەکرد، بەڵام برینی شیرین کەمتربوو، ئەو تەنها دەستی بە سووکی بریندار ببوو. باوکی، تەهای لەباوەش کرد و

بردیەوە بۆ ماڵەوە. سەرەتا هەستیان نەکرد کە برینەکانی تەها قوڵن. کاتێک گوتیان: تەها هەستە سەر پێ، ئیتر زوو زانییان کە برینەکانی قوڵ و مەترسیدارن. شەو داهات، چرا نەوتییەکانیان داگیرساند. شیرین برینەکانی سووک بوون، جێی مەترسی نەبوون، بە پارچە پەڕۆیەکی خاوێن برینەکەیان بۆ پێچا؛ بەڵام برینەکانی تەها قوڵ بوون، شەمسە هاتبووە تەنیشت براکەیەوە و دەگریا و هەنیسکی هەڵدەدا. ئامینە زۆر نیگەرانی برینەکانی کوڕە پێنج ساڵەکەی بوو، فرمێسکی نەدەوەستا. تەها هەموو جلوبەرگەکانی لە خوێن هەڵکشابوون، بە ئاوی گەرم و پارچە قوماشێکی خاوێن هێواش هێواش برینەکانیان پاک دەکردەوە و بۆیان دەبەست. ژنان و پیاوانی گوند بە نیگەرانییەوە لێی کۆببوونەوە. یاسینی تەمەن سێ ساڵی برای تەهاش دەگریا. ئامینە، ستاری تەمەن یەک ساڵی لە باوەش گرتبوو، ئامینە چوار منداڵی هەبوو، شەمسە نۆ ساڵ بوو، ستار یەک ساڵ بوو، هەموو کەسوکار و خزمانی ئاوایی کۆببوونەوە، بڕیاریاندا بە زوویی تەها بگەیەننە شار بۆ نەخۆشخانە، بەڵام چۆن بیگەیەننە شار، جادە نەبوو، ماشێن نەبوو، دووری گوندەکە تاکو سەر ڕێگای ماشێن، پێنج تا شەش کاتژمێر دەبوو. توند برینەکانی تەهایان پێچا، ئیتر خوێن لە برینەکانیەوە نەدەهات، بەڵام تەها ڕەنگی سپی ببوو، هەندێک کەس دەیانگوت: دەبێت بە زوویی بگەیەنرێتە نەخۆشخانە، تاکو پارچەی گوللەکان لە لەشی دەربکەن. بڕیاریاندا تەها بە سواری هێستر بەرەو شار بەرن.

بەرەبەیان بوو تەهایان سواری هێستر کرد، تەها لەسەر پشتی هێسترەکە خۆی نەدەگرت. هەم منداڵ بوو، هەم هەموو لەشی زامدار بوو، شەمسە و ئامینە ماوەیەک بە دوایاندا ڕۆیشتن و دواتر گەڕانەوە. ئەو کات تەها ئەوەندە بچووک بوو، لە زۆر شوێنی ڕێگاکە باوەشیان دەکرد. خزم و کەس هەموو نیگەرانی تەها بوون، ڕێگای ماشێن نەبوو تەنها ڕێی پیادە و هێستر و وڵاخ هەبوو. دەبوو چەندین بەرزی و نزمی ببڕن، سەرەتا دەبوو لە گوندەکە دابەزن بۆ دۆڵێکی قوڵ و لەوێوە سەربکەون بۆ سەر گەردەنەیەکی بەرز، دوبارە لەوێوە داگەڕێنەوە بۆ دۆڵێکی دیکە و پاشان سەربکەون بۆ بەرزاییەکی دیکە تا بگەنە گوندی سەرگەڵوو. ئەم گوندە بە ناوەکەیدا دیارە کە دەکەوێتە پشتی گەروویەکی تەنگەوە. سەرگەڵوو واتە سەر گەرووەکە.

ئەو کات گوندی سەرگەڵووش ڕێگای نەبوو. بەناچاری زۆریان لە هێسترەکە دەکرد تاکو زووتر بگەنە سەر ڕێگای کۆتەڵ. بە هەورازی دابان‌دا سەرکەوتن، هێستری بەستەزمان تەنگە نەفەس ببوو. تەها خەریک بوو لەهۆش خۆی دەچوو، هەرچۆنێک بێت گەیشتنە سەر شاخی دابان. لە دابانەوە بەرەو سورداش و کۆتەڵ بەڕێکەوتن. دوای پێنج کاتژمێر ڕۆیشتن گەیشتنە کۆتەڵ. واتە سەر ڕێگای سلێمانی- دوکان. لە کۆتەڵ ماوەیەک پشوویان دا و چاوەڕێی ماشێن بوون تاکو بەرەو سلێمانی بڕۆن، ئەو کات ماشێن کەم بوو، دوای نیو کاتژمێر چاوەڕوانی، ماشێنێک لە "دوکان" ـەوە هات، ئەوانیش سەرکەوتن و بەرەو سلێمانی بەڕێکەوتن. ئەو کات، ساڵی ١٩٦٤ بوو سلێمانی شارێکی بچکۆلانە بوو، تەنها یەک نەخۆشخانەی بچکۆلانەشی تێدابوو، هێشتا نەخۆشخانەی گەورەی تێدا نەبوو.

لە نەخۆشخانەکەدا دکتۆرێکی میسری هەبوو ناوی دکتور "جان" بوو، دکتۆر جان، زۆر بە میهرەبانییەوە نەشتەرگەریی بۆ برینەکانی تەها کرد. تەهایان بردە ژووری نەشتەرگەریی و پارچەکانی نێو لەشیان بۆ دەرکرد و برینەکانیان بە لەفاف و لۆکە بۆ پێچا. دکتۆر گوتی: ئەم منداڵەتان درەنگ هێناوە، دەبوو دوێنێ شەو بتانگەیاندایەتە ئێرە. حاجی عەبدوڵڵا گوتی: دکتۆر گیان گوندەکەمان دوورە و ڕێگای ماشێنیشی نییە، پێنج کاتژمێر ڕێگا بە سواری وڵاخ هێناومانە. ئەوە جاری دووەم بوو تەها شاری سلێمانی ببینێت. جارێکی دیکە لە تەمەنی سێ ساڵیدا هاتبوو بۆ سلێمانی، ئەو کاتە باوکی نەخۆش بوو، هەر لە هەمان ئەو نەخۆشخانەیەی ئەوی لێبوو، خەوێنرابوو. ئەو کاتە حاجی عەبدوڵڵا باری تەندروستی خراپ تێکچوو بوو، گوتبویان لەوانەیە بمرێت، با پێش ئەوەی بمرێت منداڵەکانی ببینێت. ئەو کاتە تەها ئەوەندە بچووک بوو کە لە زۆربەی کاتی ڕێگاکەدا بە کۆڵ هەڵیانگرتبوو. تەها نەیدەزانی بۆچی هاتووە بۆ شار، تەنانەت نەیدەزانی شار چییە! ئەم جارەیان بە گیانی خوێناوییەوە هات بۆ شار، تەها بە منداڵی وای دەزانی شار واتای شوێنی قەرەباڵغ و کۆبوونەوەی خەڵکی زۆر. شوێنێک کە نەخۆش و برینداری لێ چارەسەر دەکرێت، واتە شوێنێک کە نەخۆشخانەی تێدایە.

تەها خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو، جەستەی لە چەند جێیەکەوە بریندار ببوو. نەشتەرگەریی بۆ برینەکانی کرابوو. ماوەی یەک مانگ لە نەخۆشخانە مایەوە. دایکی زۆر نیگەرانی بوو، ئەو کەسانەی لە شارەوە دەگەڕانەوە، هەواڵیان بە دایکی تەها دەدا کە وا کوڕەکەی باشتر بووە، بەڵام دایکی دەیگوت ئەگەر باش بووە ئەی بۆچی نایهێننەوە؟ دوای یەک مانگ دکتۆر "جان" تەهای ڕەوانەیماڵەوە کردەوە. دکتۆر جان دەیگوت: تەها بەختی هەبووە کە نەمردووە، ئەوە ویستی خودا بووە زیندوو ماوەتەوە. تەهایان بەرەو گوند بەڕێخست، تاکو "کۆتەڵ" بە سواری ماشێن و لەوێشەوە بە سواری هێستر بردیانەوە، ئەو ماوەیەی تەها لە نەخۆشخانە بوو، دایکی نەچوو بووە سەردانی، ئەو نەیدەتوانی سێ منداڵ و ماڵەکەی جێبهێڵێت، یاسین تەمەنی سێ ساڵ بوو، ستار شیرە خۆرە بوو، بۆیە بەردەوام چاو لە ڕێگا بوو کەسێک لە شار بێتەوە و هەواڵێکی کوڕەکەی بۆ بهێنێت. بە ئامینەیان گوتبوو کە تەها بەرەو باشی دەڕوات و دکتۆرێکی میسری نەشتەرگەریی بۆ کردووە، بەڵام خۆ دایک تاکو ڕۆڵەکەی بە چاوی خۆی نەبینێت ئارام ناگرێت. شەمسەش زۆر نیگەرانی تەها بوو، شەمسە تەمەنی نۆ ساڵ بوو، لە کاروباری ناوماڵدا هاوکاری دایکی دەکرد. کاتی ئێوارە بوو کە هێستر لە گەردەنەی "قەڵاقوچ" شەکەت و ماندوو سەرکەوت و گەیشتنەوە سێکانیان، منداڵان هاواریانکرد حاجی عەبدوڵڵا و تەها هاتنەوە، ئامینە و شەمسە بەزوویی چوون بۆ پێشوازییان. دایک گەیشتە لای کوڕەکەی لە باوەشی گرت و تێر ماچی کرد. شەمسە براکەی لەباوەش گرت و ماچی دەکرد و دەیگوت: کاکە گیان شکور چاکبوویتەوە. تەهاش بە بینینی دایک و خوشکەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو، تەهای تەمەن پێنج ساڵ قوربانی ناڕاستەوخۆی جەنگ بوو، کام جەنگ، جەنگی نابەرامبەری زۆردارانە بە بۆمب و فڕۆکە لەگەڵ خەڵکی بێ چەک.

خەڵکی ئاوایی هەموو سەردانی ماڵی حاجی عەبدوڵڵایان کرد. حاجی عەبدوڵڵا باسی دۆخی شار و نەخۆشخانە و دکتۆر جانی بۆ کردن. تەهاش هێواش هێواش باسی نەخۆشخانە و ئەو کەسانەی دەکرد کە بینی بوونی، بەڵام تەها لە میانی قسەکانیدا گوێی بۆ میوانەکانیش گرتبوو کە باسی جەنگی پێشمەرگە و مەلا مستەفایان دەکرد لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا. ئەو کاتە تەواوی کێوە بەرزەکان و

دۆڵەکان لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوون. سەربازانی عێراقی نەیاندەتوانی بە پیادە بە کێوەکاندا سەربکەون، لە پشت هەر بەردێکەوە پێشمەرگە بۆیان لە کەمیندا بوون. پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان زۆر ئازایانە بەرگرییان دەکرد. تەها لە باوکی بیستبوو کە دەیگوت: مەلا مستەفا لەگەڵ حکوومەتی عێراقیدا لە شەڕدایە، سەربازەکانی حکوومەت ناتوانن خۆیان بگەیەننە گوندی سەرگەڵوو، هەربۆیە حکوومەتی عێراق فڕۆکە هەڵدەسێنێت و بە بۆمبی ناپاڵم و شەستیر پێشمەرگە و گوندەکان بۆردوومان دەکات. میوانەکان دەیانگوت دووریی نێوان سێکانیان و سەرگەڵوو تەنها پێنج کیلۆمەترە، بارەگای هێزی ڕزگاریش لە سەرگەڵووەوە دیارە، بەهۆی ئەو نزیکیەوەیە کە گوندی سێکانیانیش بەردەوام لە مەترسیدایە و فڕۆکەکانی حکوومەت کە دێن ئێرەش بۆردوومان دەکەن. دیارە ئەم جەنگە جەنگێکی نابەرامبەرە، جەنگی سەربازانی پۆشتە و پڕ چەکی عێراقە لەگەڵ خەڵک و پێشمەرگەدا. یەکێک لە میوانەکان گوتی: پێشمەرگە لە گیانی خۆیان بوردوون بۆیە هیچ هێزێکی پڕ چەک دەرەقەتیان نایەت. یەکێکی دیکە دەیگوت: پێویستە ئێمە زیاتر هاوکاری پێشمەرگە بکەین و خواردن و سووتەمەنیان بۆ دابین بکەین. پیاوێکی پیر لەولاوە هەڵیدایە و گوتی: پێویستە مەلا مستەفا هەوڵبدات ئەم جەنگە کۆتایی پێبهێنێت. ئەو دەیگوت: جەنگ هیچ سوودێکی نییە جگە لەماڵوێرانی و کوشتن. ئەو دەیگوت کوردستان هیچ سەرچاوەیەکی ئابووریی و سیاسیی نییە، تاکو حکوومەتی عێراقی تووشی شکست بکات. پیرەمێردەکە قسەی بۆ لاوەکان دەکرد. لاوەکان لایەنگری شەڕ بوون و دەیانگوت پێویستە مەلا مستەفا بەردەوام بێت لە جەنگ دژی حکوومەتی عێراقی. ئەو پیاوە پیرە دەیگوت جەنگ لەپێناوی ململانێکانی ئەمریکا و ڕووسیادایە، شای ئێران بەدوای سیاسەتەکانی ئەمریکاوەیە و بەغدایش بەدوای سیاسەتەکانی ڕووسیاوەیە، هەر کاتێک ئەمریکا و ڕووسیا ڕێکبکەون مەلا مستەفا تەنها دەمێنێتەوە. خەڵکەکە دەیانگوت بۆ بەردەوامبوونی جەنگ پێویستە یان هاوکاری لە ئەمریکا وەربگرین یان لە شای ئێران، ئاکامی ئەم هاوکاریەش نابێتە هۆی سەربەخۆیی و ئازادی، کاتێک ئەمریکا و ڕووسیا و شای ئێران بە مەرامی خۆیان گەیشتن، پشتی کورد بەردەدەن. گەنجەکان دەیانگوت ئێستا شەڕ دەستی پێکردووە، فڕۆکەکانی بەغدا

دێن و گوندەکانمان بۆردوومان دەکەن، خەڵکەکەمان دەکوژن، ئەی ئێمە دەبێت چی بکەین؟ ئێمە ئەمریکاییەکان نابینین، دەستیشمان ناگاتە شا، بەڵام مەلا مستەفا لە وڵاتی خۆمانە و دەستمان دەیگاتێ.

تەهای بچکۆلەی تەمەن پێنج ساڵ، هیچ لەو قسانە تێنەدەگەیشت تەنها ئەوەندەی دەزانی کە برینەکانی باش بوون، چاوەڕوان بوو بەیانی لەگەڵ هەمزە و شیرین و شەمسە و منداڵانی دیکەدا بڕۆنە دەرەوەی گوندەکە بۆ یارییکردن. تەها سەری لێ تێکچوو بوو نەیدەزانی ئەو قسانە چ پەیوەندییەکی بە برینداربوونی ئەوەوە هەیە. شەو کاتی خەو تەهایان بردە سەر جێگاکەی و خەوت. تەها لە خەونیدا باڵدارە گەورەکانی دەبینی کە لە ئاسمانەوە دەهاتنە سەر زەوی و چنگی ئاسنینیان لە درەختەکان گیر دەکرد و لەبندا هەڵیان دەکەندن، درەختەکانیان بەرزدەکردنەوە بۆ ئاسمان و لە ئاسمانەوە بەریاندەدانەوە بەسەر گوندەکەدا. تەها لە خەونیدا هاواری دەکرد، دایکی و شەمسە بە زوویی دەچوونە لایەوە و لە خەو هەڵیان دەستاند. شەمسەی خوشکی کاتێک تەها و شیرینی بە برینداری بینی بوو خەونی ترسناکی دەبینی. بۆردوومان و برینداربوونی شیرین و تەها، کاری کردبووە سەر دەروونی تێکڕای منداڵانی گوندەکە، پێش ئەوەی بە هۆی جەنگەوە کەسەکان بریندار ببن ئەوان دەروونیان تووشی ئازار دەبێت.

ڕۆژی دواتر تەها و شەمسە و شیرین و هەمزە بۆ هێنانی دار و چیلکە ڕۆیشتن بۆ دارستانەکە، بەڵام ئەو منداڵانە ئاگادار بوون و ئاگریان نەدەکردەوە.

بەدووریی پێنج کیلۆمەتر لە خۆراوای سێکانیانەوە ڕێگایەکی سەخت و هەوراز و ترسناک هەبوو، پێشمەرگەکان لەو ڕێگایەوە هاتوچۆیان دەکرد، پارتیزانەکان لە ڕێگایەکەوە هاتوچۆیان نەدەکرد کە تەواو لێی شارەزا نەبن. کاروانچییەکانیش بە هێستر و وڵاخەوە، هەر لەو ڕێگا سەختەوە هاتوچۆیان دەکرد. پێشمەرگەکان لەو ڕێگایەوە بەرەو سێکانیان دەهاتن و لەوێشەوە بەرەو سەرگەڵوو دەڕۆیشتن. واتە پێشمەرگەکان کە بەرەو سەرگەڵوو دەهاتن، لە ڕێگا سەختەکەی پشت سێکانیانەوە دەهاتن، هەر ئەوەش ببووە هۆی ئەوەی کە هەمیشە سێکانیان لەژێر ڕەحمەتی فڕۆکە و بۆردوومان‌دا بێت، هەڵبەت هەڵکەوتەی جوگرافیای گوندەکەش بەو شێوەیە بوو، هەر

بۆیە بەردەوام فڕۆکەکان بەسەریدا دەسوڕاونەوە. ڕێگایەکی سەخت، هەوراز و لێژ بە شاخێکی بەرزەوە. لە لایەکەوە دەڕوانێت بەسەر دەشتی قەڵاسێوکە و دەشتی کۆیەدا، لە لایەکی دیکەشەوە دەڕوانێت بەسەر دەشتی مەرگە و جافایەتیدا. ژیان بەردەوامی هەیە و خەڵکی نیگەرانن و دەڵێن پێویستە هەمیشە ئاگاداری بۆردوومان بین، دەبێت ئاگاداری منداڵەکانمان بین. دەیانگوت لە نێو دارستانەکەدا، لای تاشەبەردەکانی نزیک دۆڵەکە، بۆمب و گوللە شەستیری نەتەقیو هەن. ئامۆژگاری منداڵەکانیان دەکرد ئەگەر هەر شتێکی گوماناوییان بینی هەرگیز دەستکاری نەکەن، ئەوان منداڵەکانیان فێر دەکرد شتی گوماناوی واتای چیە. تەها دەیزانی هەواڵێک هەیە، هەواڵێک کە هیچ کەس بە باشە باسی نەدەکرد. ناوە ناوە تۆپباران هەبوو. ژمارەیەک لە خەڵکی گوندەکە کۆچیان کرد، ڕوویان کردە شارەکانی سلێمانی و کەرکووک. خاڵەکانی تەهاش یەک بە یەک ڕۆیشتن و سێکانیانیان جێهێشت. خاڵە سەعدون بەماڵەوە ڕۆیشت بۆ کەرکووک، خاڵە سەعید ڕۆیشت بۆ گوندی کەڵکە سماق، سەلیم و سەلام و عەبدوڵڵاش لەگەڵ دایک و باوکیاندا ڕۆیشتن بۆ گوندی کوێرەکانی.

حاجی عەبدوڵلا و خەڵکەکەی دیکە ڕۆژانە دەچوون بۆ ناو دارستانەکان و خەڵوزیان دروست دەکرد. خەڵوزەکەیان بە پشتی وڵاخ لەو ڕێگا سەخت و هەڵدێرەوە دەبرد بەرەو شاری کەرکووک، ئەو ڕێگایە زۆر نزیکتر بوو لە ڕێگاکەی سەرگەڵوو، هەرچەندە ڕێگاکە سەخت و ترسناک بوو، بەڵام لە ڕێگای سەرگەڵوو بێ مەترسیتر بوو.

سەرگەڵوو بەردەوام جێگای بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە بوو، بارەگای هێزی ڕزگاری‌یش هەر لەوێ بوو، هەر لەوێشەوە بەرنامەکانی هێرشکردنە سەر سوپای عێراق دادەڕێژرا. دوای کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلول‌یش، سەرگەڵوو دوبارە بووەوە بە جێگای بارەگاکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان. بارەگای مەڵبەندی دوو لەوێ دامەزرا، ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان و دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە و چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، هەر لە سەرگەڵوو و بەرگەڵوو بوون. ئەشکەوتەکانی سەرگەڵوو و ئەو خانووانەی لەو دۆڵەدا دروستکرابوون، جێگای ڕاهێنانی پێشمەرگە و ئیداریی بوون، هەربۆیەش بەدرێژایی سی و پێنج ساڵ سەرگەڵوو و بەرگەڵوو و

گوندەکانی دەوروبەریان، بەردەوام لەژێر تۆپباران و بۆردوومانی فڕۆکەکانی ڕژێمی بەعسدا بوون.

خەڵکی سێکانیان دەیانزانی کە ئەو ڕێگایە، سەخت و دژوارە، بەڵام لە ڕووی سەلامەتییەوە زۆر لە ڕێگاکەی سەرگەڵوو باشترە.

ژنانیش بەردەوام لە کارکردندا بوون، ئەوانیش هەر وەکوو هێزی پێشمەرگە بەردەوام لە کار و خەباتدا بوون. ژنانی گوندی سێکانیانیش وەک ژنانی تەواوی گوندەکانی کوردستان، ڕۆژانە دەڕۆیشتنە دەرەوەی گوند و گیاخۆراکییان کۆدەکردەوە، دار و چیلکەیان دەهێنا، بە مەڕ و ئاژەڵەکانیشیان ڕادەگەیشتن، شیرەمەنییان دروست دەکرد، خواردنیان بۆ پێشمەرگە ئامادە دەکرد. ژنان پشتیوانی تەواوی هێزی پێشمەرگە بوون. ژنی دێنشینی کورد، شێرە ژنن هەر لە بەیانی زووەوە لە کارکردندان تاکو نیوەشەو، بەیانیان کاتێک لە خەو هەڵدەستن ئاژەڵەکانیان دەدۆشن و نان و چایی بەیانی ئامادە دەکەن. دواتر شیر دەکوڵێنن و ماستی لێ دروست دەکەن. ناو ماڵ گسک دەدەن و جێی مەڕ و ماڵات خاوێن دەکەنەوە، جلوبەرگی هاوسەر و منداڵەکانیان دەشۆرن و مەشکە دەژەنن و کەرە و دۆ، لیک جیا دەکەنەوە، لە کاتی بێکاریدا دەستدەکەن بە چنینی گۆرەوی و کڵاو و پارچەی جۆراوجۆر. هەندێک لە ژنان بەرهەمەکانی خۆیان دەبەن بۆ شار و دەیفرۆشن، منداڵەکانیان پەروەردە دەکەن. لە هەمووی گرنگتر ئاگاداری هاوسەرەکانیانن، پیاوانێک کە بەردەوام لە کاردان یان لە جەنگدا بوون. ژنانی کورد ئازاترین و قارەمانترین ژنانی جیهانن. ژنانێک شاد و بەکەیف بە ڕەنگێکی جوان و بە دەروونێکی پاک هەروەک پەری ئاسمان، ژنانی جەنگاوەر و بەرگریکار لە ئازادی، شانبەشانی پیاوانیان دەجەنگن. کاتێک پیاوەکانیان دەچوون بۆ جەنگ، ئەوانیش دەکەوتنە جەنگەوە. بەرگرییان لە ماڵ و سامانیان دەکرد و گەشەیان بە ئابووریی خۆیان دەدا. ژنانێک کە لە کار و تێکۆشاندا نموونەیین.

ساڵی ١٩٦٧ تەها تەمەنی حەوت ساڵ بوو، هاوکاری باوکی دەکرد، ئەو ئیتر نەدەچوو بۆ یارییکردن. لەگەڵ باوکیدا دەڕۆیشت بۆ دروستکردنی خەڵوز. هەر کاتێک، بارێک خەڵوزیان ئامادە دەکرد. باوکی خەڵوزەکەی لە وڵاخەکە باردەکرد و تەها بە ڕێگا سەختەکەدا دەیبرد بۆ سەر جادە بۆ گوندی "کانیخان"، لەوێ خەڵوزەکەی

دەفرۆشت و دەگەڕایەوە بۆماڵەوە. ئەم منداڵە تەمەن حەوت ساڵە، هێندەی کەسێکی پازدە ساڵ کاری دەکرد، کوڕە گەورەی ماڵ بوو، لەو تەمەنە بچووکەدا هاوکارێکی باشی باوکی بوو.

سەرەتای وەرزی پاییز بوو، تەها لەگەڵ باوکیدا لە نزیک ماڵی خۆیان وەستابوون. چەند منداڵێک بەلای ئەواندا هاتن، بەرەو سەرگەڵوو دەڕۆیشتن، تەها لێی پرسین بۆ کوێ دەچن؟ منداڵەکان وەستان، وەڵامی تەهایان دایەوە و گوتیان: دەچین بۆ سەرگەڵوو، خۆمان ناونووس دەکەین بۆ قوتابخانە. تەها گوتی ئێوە دەچن بۆ قوتابخانە؟ تەها ڕووی کردە باوکی و گوتی: منیش دەچم بۆ قوتابخانە! باوکی گوتی: نانا تۆ مەڕۆ بۆ قوتابخانە، تەها دەستیکرد بەگریان و گوتی من هەر دەچم بۆ قوتابخانە. منداڵەکان کەمێک چاوەڕێی تەهایان کرد. تەهاش خێرا خێرا بەگریانەوە دەیگوت منیش دەڕۆم بۆ قوتابخانە.

باوکی بەناچاری ڕازی بوو، حاجی عەبدوڵڵا خوێندەواریی نەبوو، بەڵام زۆربەی شەوان لە ماڵی ئەواندا خەڵکی کۆدەبوونەوە و کتێبیان دەخوێندەوە، محەمەدی مامی تەها، کتێبی دەخوێندەوە و ئەوانی دیکەش گوێیان بۆ ڕادەگرت. کتێبەکانی ئەمیر ئەرسەلان، لەیل و مەجنون، شیرین و فەرهاد، چل توتی، قەڵای خەیبەر و هۆنراوەکانی قانع و بێکەس یان دەخوێندەوە. تەها زۆر حەزی دەکرد خۆیشی کتێب بخوێنێتەوە. ئەو چەندین جار بە دایکی گوتبوو، من حەزدەکەم کتێب بخوێنمەوە، چەندین جار لە دایکی پرسی بوو مامم چۆن فێربووە کتێب بخوێنێتەوە؟ دایکی پێی گوتبوو بۆ ئەوەی بتوانیت کتێب بخوێنیتەوە دەبێت بڕۆیت بۆ قوتابخانە. بەردەوام لای هەموو کەسێک گوتبووی من حەزدەکەم بڕۆم بۆ قوتابخانە، بەڵام چەندین کەس بە باوکیان گوتبوو ئەم منداڵە مەنێرن بۆ قوتابخانە، لە قوتابخانە وانەی شەیتانیان فێر دەکەن، بینێرە بۆ لای مەلا، با فێری قورئان خوێندن بێت. حاجی عەبدوڵڵا بەردەوام بیری لەوە دەکردەوە کە ئایا تەها بنێرێت بۆ قوتابخانە یان بینێرێت بۆ لای مەلا و قورئان بخوێنێت. یان بۆ هیچیان نەچێت و ببێتە شوانی کار و بەرخەکان.

حاجی عەبدوڵڵا خاوەنی چوار منداڵ بوو، ئامینەش دوگیان بوو، ئەرکێکی زۆری لەسەر بوو، داهاتیشی هەر وەکوو داهاتی تەواوی خەڵکی ناوچەکە داهاتێکی کەم

بوو، ئەو دەیویست تەها گەورەتر ببێت و لە کارەکانیدا هاوکاری بکات، بەڵام تەها دەگریا و هاواری دەکرد من حەزم لە قوتابخانەیە و دەڕۆم بۆ قوتابخانە.

حاجی عەبدوڵڵا پارەی دا بە یەکێک لەو منداڵانەی کە لە تەها گەورەتر بوو، پێی گوت بەو پارەیە دەفتەر و قەڵەمی بۆ بکڕە و لە ڕێگا ئاگادارییە. حاجی عەبدوڵڵا بۆ تۆمارکردنی ناوی تەها لە قوتابخانە خۆی لەگەڵیدا نەچوو. حاجی عەبدوڵڵا وا بیری دەکردەوە کە چوونی تەها بۆ قوتابخانە ئارەزوویەکی کاتیە و دوای چەند ڕۆژێک ئەو ئارەزووەی نامێنێت و واز لە قوتابخانە دەهێنێت. هەڵبەت حاجی عەبدوڵڵا دواتر بۆ بەردەوامبوونی تەها لە خوێندن، هەر کارێکی لەدەست هات کردی، جگە لەوەش دوو منداڵی دواتریشی نارد بۆ قوتابخانە، هەر کاتێکیش دەچوو بۆ سلێمانی، دەفتەر و کتێب و قەڵەمی بۆ دەکڕین و وەک دیاریی بۆی دەهێنانەوە.

لەو ساڵانەدا بەشی زۆری منداڵان وازیان لە قوتابخانە هێنا. دووریی قوتابخانە، سەختی ڕێگاکە، پێویستبوونی منداڵ بۆ ئیشوکاری ماڵەوە و لەوەڕاندنی کار و بەرخەکان، هۆکار بوون بۆ وازهێنانی منداڵان لە قوتابخانە.

جەمال، قەڵەم و قەڵەمدادەر و لاستیکی سڕینەوە و دەفتەرێکی شەست پەڕەیی بۆ تەها کڕی. جەمال دوو ساڵ لە تەها گەورەتر بوو، تەها یەکەمجار وایزانیبوو لاستیکی کوژاندنەوە، جۆرێکە لە بنێشت، جەمال تەهای فێرکرد چۆن بنووسێت و چۆن نووسینە هەڵەکان بکوژێنێتەوە. تەها هەرگیز قوتابخانە و پۆلی خوێندنگەی نەبینی بوو، کاتێک بۆ یەکەمجار چووە نێو پۆل، پێڵاوەکانی دانا و بە پێی پەتی چووە ژوورەوە. منداڵەکانی دیکە پێیان گوت ئەوە بۆچی، پێڵاوەکانت داناوە؟ دەبێت بە پێڵاوەوە دابنیشیت! قوتابخانەکە کۆن و داڕووخاو بوو. زەوی ژوورەکان هەر گڵ بوو، پڕ بوون لە خۆڵ، دیوارەکانی درزی دابوو، دەرگاکان شکاو و بێکەڵک بوون. کورسی دانیشتن کەم بوو، چوار منداڵ لەسەر یەک کورسی دادەنیشتن، هەندێک لە منداڵەکان لەسەر تەنەکە دادەنیشتن. پۆلەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، قوتابخانەکە لە نێو خانووی ماڵێکدا بوو، بریتی بوو لە سێ پۆل. قوتابییەکان هەموو خەڵکی گوندی سەرگەڵوو بوون، جگە لە چەند قوتابییەکی خەڵکی سێکانیان. قوتابیانی پۆلی یەکەم و دووەم لەیەک ژووردا بوون. قوتابیانی پۆلی سێیەم و چوارەمیش لەیەک پۆلدا

دەیانخوێند. قوتابیانی پۆلی پێنجەمیش تەنها سێ کەس بوون. چەند قوتابییەک لە سێکانیانەوە دەچوون بۆ سەرگەڵوو، بەڵام دوای ماوەیەک هەموویان وازیان لە خوێندن هێنا، تەنها تەها و جەمال مانەوە، دوای مانگێک ژمارەی قوتابیان بەتەواوی کەمبووەوە و تێکڕا وازیان لە خوێندن هێنا. قوتابخانەکەش تەنها دوو مامۆستای هەبوو، مامۆستا عەلی و مامۆستا فوئاد.

قوتابیانی پۆلی پێنجەم، تەنها سێ قوتابی بوون. عەزیز عەبدوڵلا عوسمان، محەمەد جەلال عوسمان و عەبدوڵلا عزیز عەبدوڵلا. پۆلی چوارەم چوار قوتابی بوون عەبدوڵلای حمە سوران، عەبدولڕەحمان ئەحمەد مەلا، محەمەد سدیق خالید و محەمەد سدیق ئیراهیم. پۆلی یەکەم نزیکەی چل قوتابی بوون. تەنها دوو قوتابی سێکانیان مابوونەوە. ئەوانیش تەها عەبدوڵلا فەرەج و جەمال محەمەد ساڵح بوون.

### قوتابخانەی سەرگەڵوو

جەمال کوڕێکی جوان و گورجوگۆڵ بوو، دووسێ ساڵ لە تەها گەورەتر بوو، منداڵێکی چالاک بوو. قوتابخانەکەیان لە سێکانیانەوە نزیکەی پێنج کیلۆمەتر دوور بوو، ئەو کاتە لە نێوان سەرگەڵوو و سێکانیاندا جادە نەبوو، تەنها ڕێگایەکی بەردەڵان و پڕ هەوراز و نشێو هەبوو. سەرگەڵوو کەوتۆتە دۆڵێکی قوڵی دووورودرێـژەوە، درێژی دۆڵەکە دە تا دوازدە کیلۆمەتر دەبێت. ئاوێکی زۆر بە دۆڵەکەدا دەڕواتە خوارەوە، لە خوار گوندەکەوە، دۆڵەکە بە دارستانێکی چڕ داپۆشراوە. چڕییەکەی بە جۆرێکە ئەگەر کەسێک لەنێو دارستانەکەدا خۆی بشارێتەوە بە هیچ شێوەیەک نابینرێت.. ئاوێک بەنێو قوڵایی دۆڵەکەدا دەڕواتە خوارەوە، نێو دۆڵەکە زۆر سەختە، خەڵکی زۆر بەئەستەم دەتوانن بەنێو قوڵایی دۆڵەکەدا بڕۆن، بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا. کە ئاوەکە زۆر ساردە. ڕۆیشتن بەنێو درەختەکانیشدا سەخت بوو. ڕێگای نێوان سەرگەڵوو - سێکانیان دارستانێکی زۆر چڕە، بەهۆی چڕی دارستانەکەوە جۆرەها ئاژەڵی دڕندە هەبوو، ورچ، بەراز، گورگ، چەقەڵ و ڕێوی. تەها و جەمال لە هیچ شتێک نەدەترسان، ئەگەر جەمال نەبووایە ڕەنگە تەهاش نەچووبایە بۆ

قوتابخانە، هاتوچۆی بەردەوامی ئەو دوو منداڵە بەو ڕێگا سەخت و پڕ مەترسیەدا، کارێکی دژوار بوو. لە ڕێگادا بینینی پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ سەرنجی ئەو منداڵانەی ڕادەکێشا. دۆزینەوەی هەنگوینی شەمەترێنکە دەمی ئەوانی شیرین دەکرد. هەندێک جار لەبری دەم شیرینکردنیان چزووی شەمەترینکە لەگیانیان هەڵدەچەقی. دوو منداڵ بەنێو گژوگیا و گوڵزاردا ڕایاندەکرد و هەڵدەپەڕین و پێدەکەنین. ئەگەر لە ڕێگادا تووشی شوانە مەڕێک یان کەسێک ببوونایە ناوی جۆری گیا و سوودی گیاکانیان لێ دەپرسی. نموونەی گیا بەسوودەکانیان هەڵدەگرت و لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد، بەڵام نەدەکرا لە قوتابخانە و وانەکانیان دوابکەون. ئەگەر جارێک دوابکەوتنایە ناچار دەبوون بەخێرایی ڕابکەن و خۆیان بگەیەننە قوتابخانەکە.

گرمەیەکی گەورە لە کێوەکانەوە دەنگی دایەوە، دێوەزمەی دۆزەخ لە ئاسمانەوە بۆمبی فرێدا، فڕۆکەکان دەرکەوتن، سەرگەڵوویان بۆردوومان کرد، سەرگەڵوو کەوتۆتە شوێنێکی چاڵەوە و هەر چوارلای بە شاخ دەورەدراوە. فڕۆکەکان نەیاندەتوانی نزم ببنەوە. بۆمب و ناپاڵمی دەیەی ١٩٦٠ وەک بۆمبی ئەم سەردەمە نەبوون. فڕۆکەوانەکان بە شێوەیەکی کوێرانە بۆمبەکانیان فڕێدەدایە خوارەوە، بەلایانەوە گرنگ نەبوو بەر هەر شوێنێک بکەوتایە، دوور نییە فڕۆکەوانەکان نەیانویستبێت بۆمبەکان بەر شوێنی ئاوەدانی بکەوێت.

ئەو ڕۆژە تەها و جەمال لەپاڵ گاشەبەردێکی گەورەدا خۆیان شاردەوە و لە ترسا هەڵدەلەرزین. بۆمبەکە جۆری ناپاڵم بوو، کاتێک بۆمبەکە لە زەوی دا، ئەو ناوە یەک پارچە بوو بە ئاگر و دوکەڵ. فڕۆکەکان ماوەی پازدە خولەک بە ئاسماندا دەسوڕانەوە و بۆمبیان فڕێدەدا. دواتر فڕۆکەکان ناوچەکەیان بە دەستڕێژی شەستیر داگرتەوە، بەوهۆیەوە، پوش و پاوانی ناوچەکە هەمووی ئاگری گرت و سووتا. گوللەی شەستیرەکان دەیدا لە بەردەکان و هەڵدەبەزینەوە. لەو کاتەدا ئەو دوو منداڵە لە گوندی سەرگەڵوو نزیکتر بوون تاکو گوندەکەی خۆیان. فڕۆکەکان ڕۆیشتن، ترس و دڵەڕاوکێی ئەو دوو منداڵە کەمتر بوو. قەیتانی پێڵاوەکانیان توندکردەوە و بەخێرایی بەرەو سەرگەڵوو بەڕێکەوتنەوە. پێڵاوەکانیان لە لاستیکێکی تەنک دروستکرابوون و قاچیانی ئازار دەدا، کاتێک بەنێو ئەو دار و دەوەن و بەردانەدا

دەڕۆیشتن، جلوبەرگیان هەر ڕۆژە و لەلایەکەوە دەدڕا. دەبوو شەوانە دایکیشیان جل وبەرگەکانیان بۆ بدوورنەوە یان بۆیان پینە بکەن.

بۆردوومان بەردەوام دوبارە دەبووەوە، دوای یەک مانگ و نیو مامۆستاکان لەبەر سەلامەتی خوێندکارەکان ناچاربوون قوتابخانەکە دابخەن.

تەها، دەبوو سەرلەنوێ لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە هاوکاری باوکی بکات لە دروستکردنی خەڵوزدا. باوکی دەیگوت تۆ وردە وردە کۆتەرە و دار کۆبکەرەوە و من خۆم دەیخەمە کوورەوە. پاشان تۆ خەڵوزەکە ببەرە سەر جادەی کانیخان بیفرۆشە. من ناتوانم هەر خۆم خەڵوز بکەم و خەڵوزەکەش ببەمە سەر جادە. تۆ وا گەورە بوویت، دەبێت تۆ خەڵوزەکە بەریت بۆ فرۆشتن. هەڵبەت ئەو کاتانەی کە تەها دەچوو بۆ قوتابخانەش، لە خزمەتکردنی مەڕو بزن و مانگاکان و ئیشوکارەکانی ماڵەوەشدا هاوکاری دایک و باوکی دەکرد. ئەوان دوو مانگا و چەند سەر بزن و مەڕ و گوێدرێژێکیان هەبوو. شەمسەش بەردەوام لە کارکردندا بوو، هەم لە ئیشوکاری ناو ماڵدا هاوکاری دایکی دەکرد، هەم لەکاروباری دەرەوەی ماڵیشدا هاوکاری باوکی دەکرد. ئامینەی دایکی تەهاش، خواردنی بۆ دروست دەکردن و پاکوخاوێنی ماڵەکەشی ڕاگرتبوو. هاوین تێپەڕی و دوبارە قوتابخانە کرایەوە. سەرەتای مانگی تشرینی یەکەم بوو، هەواڵ هات کە قوتابخانە کراوەتەوە، تەها حەزی دەکرد بڕواتەوە بۆ قوتابخانە. باوکی گوتی: ئەی کێ کارمان لەگەڵدا بکات؟ تەها و جەمال، ئەمجارەش بەرەو سەرگەڵوو کەوتنەڕێ بۆ قوتابخانە. ماوەی بیست ڕۆژ کەشوهەوا لەبار بوو، بەڵام دواتر باران دەستی پێکرد. زەوی بوو بە قوڕ، جۆگەلەکان پڕ بوون لە ئاو، پەڕینەوە لە چەمە گەورەکەی خوار گوندەکە بۆ ئەو دوو منداڵە، کەمێک ئەستەم بوو، دەبوو بەسەر بەردەکاندا بازبدەن. هەندێک جاریش باوکی تەها دەهات و بەکۆڵ لە چەمەکە دەیپەڕاندنەوە. ڕۆژانی دیکەش ئەگەر ئاوەکە کەم بووایە و باران نەبارییایە، خۆیان بە بەردەباز دەپەڕینەوە. جەمال و تەها هاوکاری یەکدییان دەکرد. ئەوان دوو هاوپۆل و دوو هاوڕێی دڵسۆزی یەکتر بوون. هەندێک جار تا دەگەیشتنە قوتابخانە بە هۆی بارانەوە هەموو جلەکانیان تەڕ دەبوو، لەبەر زۆپای قوتابخانە خۆیان وشک دەکردەوە. قوتابییەکانی دیکە هەموو خەڵکی سەرگەڵوو بوون. کۆتایی

پاییز بەفربارین دەستی پێکرد، بەفرێکی زۆر باریبوو، لەسەر کێوەکان زیاتر لە یەک مەتر کەوتبوو. بەفر بەسەر بەفردا دەبارییەوە، دایک و باوکیان دەیانگوت دەبووایە بەهۆی ئەم بەفرە زۆرەوە بۆ ماوەیەک قوتابخانە دابخرایە. بەڵام تەها و جەمال بەو بەفرەش بەردەوام بە ڕێگای قوتابخانەوە بوون.

کەشوهەوا زۆر سارد بوو، بایەکی بەهێز هەڵی کردبوو، لاپاڵی گرد و شاخەکان بەفر تەواو داپۆشی بوو، شیو و دۆڵەکان ببوونە سەهۆڵبەندان، هاتوچۆکردن کارێکی سەخت و ئەستەم بوو، بەهۆی سەهۆڵبەندانەوە جار جارێک دەخزین و دەکەوتن. تەها و جەمال جار جارێک دەستی یەکدییان دەگرت و جار جاریش دەستی یەکدییان بەردەدا و بەهێواشی و لەسەرخۆ دەڕۆیشتن. لە هەندێک شوێن جەمال تەهای ئاگادار دەکردەوە کە ئاگاداری خۆی بێت و بەهێواشی هەنگاو بنێت. ڕۆژی زستان زۆر کورتە، ئەو دوو منداڵە بەیانیان زوو بەڕێدەکەوتن، تاکو بەزوویی بگەنە قوتابخانە. هیچیان جلوبەرگی باشیان لەبەردا نەبوو. سەرما، تا سەر ئێسقان کاری تێدەکردن. بەردەوام دەستەکانیان لەسەرمادا دەتەزین. ئامینە دەستکێشی خوریی بۆ تەها دروستکردبوو، بەڵام تەها ناچار بوو لە هەندێک شوێن دەستکێشەکانی دابکەنێت. بەفر تا ئەژنۆی ئەو منداڵانە دەباری، ڕێگاکەش سەهۆڵبەندان بوو. حاجی عەبدوڵڵا ئامۆژگاری تەهای دەکرد و دەیگوت: ئەگەر ڕێگاکە بەستبووی تۆ بە لێواری ڕێگاکەدا و بەنێوان بەفر و سەهۆڵەکەدا بڕۆ، با نەکەویت. بەدرێژایی ئەو زستانە فڕۆکەکان تەنها دوو جار هاتن. زۆربەی ڕۆژەکان هەور بوو، تەمتومان ئەو ناوەی دادەپۆشی، هەر بۆیەش فڕۆکەکان کەمتر دەهاتن، چونکە هیچ شوێنێکیان نەدەبینی. هەر کاتێک ئاسمان ساف و ساماڵ بووایە فڕۆکەکان پەیدا دەبوون. بەڵام بەهاری ساڵی ١٩٦٨ بۆردوومان زیادی کرد، سەرەتای بەهار بوو، بەڵام هێشتا هەوا سارد بوو، هەواڵ هات بۆ سێکانیان کە پێشمەرگەکان پێویستیان بە دار و خەڵوز و خواردەمەنی هەیە، پێویستە هەر ماڵێک لە ئاست خۆیەوە بارێک دار و هەندێک ئازوخە بگەیەننە پێشمەرگەکان. هەموو گوندەکە بەبێ جیاوازی هاوکاری خۆیان گەیاندە پێشمەرگەکان، چونکە گوندی سێکانیان سەرە ڕێگا بوو، ڕۆژانە پێشمەرگە بەسێکانیاندا تێدەپەڕین، هەر لەنێو گوندەکەدا بەسەر ماڵەکاندا دابەش دەبوون و نان و چایان دەخوارد،

بەو هۆیەوە ئەرکێکی زۆر کەوتبووە سەر دانیشتووانی سیکانیان. بەهۆی نزیکی لە گوندی سەرگەڵووەوە، بەردەوام فڕۆکەکان سیکانیانیشیان هەر وەکوو سەرگەڵوو بۆردوومان دەکرد. هەر بەهۆی ئەو هەموو بۆردوومانەوە جارجارێک قوتابخانە دادەخرا. تەها گەورەتر ببوو تەمەنی ببووە دە ساڵ، هەر بۆیە، زیاتر دەیتوانی هاوکاری باوکی بکات. ساڵی ١٩٧٠ ژمارەی دانیشتووانی سیکانیان نزیکەی سەد و بیست کەس دەبوون، ژمارەی ماڵەکانی گوندەکەش تەنها سی ماڵ دەبوون، زۆرێک لە خەڵکی گوندەکە ماڵیان بار کردبوو بۆ کەرکووک و سلێمانی و شوێنەکانی تر، زەوی کشتوکاڵ و پێویستییەکانی ژیان لە سیکانیان کەم بوون، گوندەکە قەرەباڵغی زیادی هەڵنەدەگرت، بەردەوامیش تۆپباران دەکرا. حاجی عەبدوڵڵا حەزی نەدەکرد ماڵی بار بکات و سیکانیان جێ بهێڵێت. گوندەکە جگە لە مزگەوتێکی بچکۆلە هیچ شتێکی دیکەی نەبوو. کارەبا و ئاوی بۆریی و قوتابخانەی نەبوو، حاجی عەبدوڵڵا پێی باش بوو هەر لەوێ بمێنێتەوە، حەزی دەکرد لە دەشت و دەر کار بکات و چەند سەر ئاژەڵێک بەخێو بکات، ئەو دەیگوت: من بە پێنج سەر خێزانەوە ڕوو بکەمە کوێ؟ هەرچۆنێک بێت سیکانیان بۆ من باشترە، بڕۆم لە شار چی بکەم؟.

هاوین بوو، تەها تەمەنی نزیکی یازدە ساڵ بوو، باوکی پێی گوت ئێستا دەبێت تۆ خۆت بارە خەڵوزە ببەیتە سەر جادە و بیفرۆشیت! تەها دەیگوت من بەس دەچم لەو کێوانە دار و کۆتەرە کۆ دەکەمەوە بۆ خەڵوز. باوکی دەیگوت نەخێر دەبێت بڕۆیت بارە خەڵوزەکەش ببەیت و بیفرۆشی. تەها زۆر لەو ڕێگا سەختە دەترسا، لەوە دەترسا لە ڕێگا گوێدرێژەکەی بکەوێت و نەتوانێت ڕاستی بکاتەوە، چۆن بەتەنیا ئەو بارە خەڵوزە باربکاتەوە. بەڵام چار نەبوو، قسە هەر قسەی باوکی بوو. تەها بارە خەڵوزی لە گوێدرێژ بارکرد و گوێدرێژی پێش خۆیدا، تەها خەیاڵی ئاسوودەبوو، چونکە بارکردنی خەڵوز لە گوێدرێژ، ئاسانتر بوو لە هێستر. هێستر ئاژەڵێکی کەمێک چەمووشە، تەها لە ڕێگا سەختەکەوە گوێدرێژەکەی دەبردە خوارەوە. ڕێگاکە دووروودرێژ و هەوراز و چۆڵەوانیی بوو، تەنانەت مرۆڤی گەورە و ئازاش لەو ڕێگا سەختە هەستی بەترس و دڵەڕاوکێ دەکرد. حکوومەت عێراقی لەبری ئەوەی ڕێگاکان چاک بکات و ئاسانکاری بۆ خەڵکی بکات، بەپێچەوانەوە زۆر جار ئەو ڕێگایەی

تۆپباران دەکرد، خۆ ئەگەر حکوومەت لەبری بۆردوومان کردن، جادەی دروست بکردایە، یان ئەگەر ئازادی بدایەتە ئەو خەڵکە، هەڵبەت ڕەوشەکە بەجۆرێکی دیکە دەبوو، گەشەکردن و پێشکەوتن بەبێ ئازادی کارێکی مەحاڵە. هەر بۆیەش گەشەکردن واتە ئازادی، ئازادیش واتە گەشەکردن.

تەها هەر بە دوو ڕۆژ جارێک لەو ڕێگا سەخت و هەڵدێرەوە بارێک خەڵوزی دەبرد بۆ گوندی کانیخان. کانیخان گوندێکە لەسەر جادەی سلێمانی - دوکان کەوتۆتە باشووری گوندی سێکانیان، دووریی نێوان سێکانیان و کانیخان، نزیکەی شەش کاتژمێر دەبێت ئەو گوندە شوێنی فرۆشتنی خەڵوز، ترێ، هەنجیر، هەنار و بەروبوومەکانی دیکە بوو. تەها دەبوو لەوێ خەڵوزەکە بفرۆشێت و پارەکەی وەربگرێت و بگەڕێتەوە. لە پشتی کانیخان گوندی جاسەنەیە، تەها دەبوو بەلای ئەو گوندەدا بڕوات بۆ کانیخان و بگەڕێتەوە بۆ سێکانیان. لە نزیک جاسەنە، منداڵان دەهاتنە سەر ڕێگای تەها و لەخۆڕا شەڕیان پێ دەفرۆشت. تەها بۆ کۆکردنەوەی کۆتەرە و دار دەڕۆیشتە نێو دارستانەکان، هەندێک جار، شەو درەنگ دەگەڕایەوە بۆماڵەوە، لە دارستانەکەدا ئاژەڵی دڕندە هەبوو، تەها لەو ئاژەڵە دڕندانە نەدەترسا، بەڵام بە ڕۆژی ڕووناک لە منداڵانی ئەو گوندە دەترسا. تەها لەوە نەدەترسا بەدار و بەرد لێی بدەن، بەڵکو لەوە دەترسا پارەکەی لێ بسێنن. منداڵەکان دەهاتن بەزۆر گوێدرێژەکەیان لێ دەسەند و خۆیان سواری دەبوون، تەهاش بە گریانەوە لێیان دەپاڕایەوە گوێدرێژەکەی بدەنەوە. دواتر چەند دارێکیان بە تەهادا دەکێشا و گوێدرێژەکەیان دەدایەوە. تەها منداڵێکی ئازا بوو، بەڵام تەمەنی یازدە ساڵ بوو، منداڵەکان لەو گەورەتر بوون. تەها بەدەست ئەو منداڵانەوە زۆر پەرێشان بوو. ڕۆژێک تەها بڕیاری دا و گوتی: ئەمجارە بێنەوە سەر ڕێگام، ئەگەر تێهەڵدانیش بخۆم، دەستیان لێ دەکەمەوە و منیش لێیان دەدەم.

کاتێک تەها لە نشێوەکەوە دەهاتە خوارەوە و گوێدرێژەکەی بە بارە خەڵوزەوە پێش خۆی دابوو، بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر لەوسەرەوە منداڵەکان ڕێگای پێبگرن، چۆن بە گژیاندا بچێتەوە. ئەو ڕۆژە تەها خەڵوزەکەی فرۆشت و پارەی خەڵوزەکەی لە کۆپانی کەرەکەیدا شاردەوە و دەیویست بەرەو سێکانیان بگەڕێتەوە، خۆی بۆ شەڕ ئامادە کردبوو، گەیشتە نزیک گوندی جاسەنە، غاری بە گوێدرێژەکەی کرد،

بینی چەند منداڵێک دەهاتن تاکو ڕێگای پێبگرن، بۆیە دەیویست بە زوویی تێپەڕێت و منداڵەکان فریای نەکەون، هێندەی پێنەچوو چوار منداڵ هاتنە سەر ڕێگای، پێشتر یەکێک لەو منداڵانە تەهای بینی بوو کە بەرەو کانیخان ڕۆیشتبوو، دەیزانی کە لەهەمان ڕێگاوە دەگەڕێتەوە. منداڵەکان تەمەنیان ١٢-١٣ ساڵ دەبوو، ڕێگایان بە تەها گرت و دەیانویست بیوەستێنن، بەڵام تەها دارێکی درێژی بەدەستەوە بوو، هەر لەسەر پشتی گوێدرێژەکەوە بەهەموو هێزی خۆی دارێکی لە یەکێکیان سرەواند و دای بە زەویدا، تەها لە گوێدرێژەکە هاتە خوارەوە و ئامبازی سەری بوو، نەیهێشت هەڵسێتەوە، منداڵەکانی دیکە پەلاماری تەهایاندا، تەهاش بەخێرایی هەڵسایەوە و بەهەموو هێزی دارێکی بە منداڵێکی دیکەدا کێشا ئەویش کەوتە سەر زەوی، دوو منداڵی دیکە پەلاماریاندا تەهاش دارەکەی دەستی هەڵدەسوڕاند و چەند دارێکی لە ئەوانیش دا و ڕایانکرد. تەها بەخێرایی سواری گوێدرێژەکەی بووەوە، پێی گوتن جارێکی دیکە بێنەوە سەر ڕێگام لەوە خراپترتان لێ دەکەم. لەو کاتەدا دوو پیاو لە سەرەوە دەهاتنە خوارەوە، چاویان لە شەڕی تەها و منداڵەکان بوو، پیاوەکانیش خەڵکی جاسەنە بوون، تەها سەرەتا لێیان ترسا، بەڵام ئەوان دەیانزانی کە ئەو منداڵانە، ڕۆژانە ڕێ بەتەها دەگرن و شەڕی پێدەفرۆشن. یەکێک لە پیاوەکان گوتی: دەستت خۆشبێت کە لێتدان، من دەزانم منداڵەکانی ئێمە ڕێگات پێدەگرن، ئیتر هەر کاتێک هاتنە سەر ڕێگات مەترسە و بە ئارەزووی خۆت لێیان بدە.

پاشان تەها بۆی دەرکەوت، ئەو پیاوەی هانی دا و دەستخۆشی لێکرد باوکی یەکێک لە منداڵەکان بوو، لەو ڕۆژە بەدواوە ئیتر منداڵەکان نەهاتنەوە سەر ڕێگای تەها، ئەگەر تووشیشی ببوونایە هیچ قسەیەکیان نەدەکرد. تەها لەوە تێگەیشت کە پێویستە مرۆڤ لە ژیانیدا بەهێز بێت، پشت بەخۆی ببەستێت و چۆک دانەدات.

تەها کەم کەم گەورە بوو، لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو، وەرزی زستان بوو بەفرێکی زۆر باری بوو، هێشتا هەتاو نەکەوتبوو، تەها پێڵاوە کۆن و دڕاوەکانی کردە پێی و بەزوویی هەستا و ڕۆیشت، جەمالیش ئامادەبوو. پێکەوە بەرەو سەرگەڵوو بەڕێکەوتن. ڕێگا بەفر و زوقم و سەهۆڵبەندان بوو، ڕێگاکە خز و خلیسک بوو، لە گەردەنەی یەکەم سەرکەوتن و بەرەوخوار بوونەوە، تەواو شەکەت و ماندوو ببوون.

کەمێک ڕۆیشتنیان هێواش کردەوە تاکو ماندوویێتیان دەربچێت. لەناکاو دەنگی گورگ هاتە گوێیان، جەمال داردەستێکی گەورەی بەدەستەوە بوو، دارێکی باشی بۆ تەهاش ئامادەکرد، هەردوکیان ئامادەبوون بۆ بەرگری، بەردێکی گەورە نزیکیان بوو. تەها گوتی: ئەگەر گورگ بۆمان هات. دەچینە سەر بەردەکە، هەردوکیان خۆیان ڕادەهێنا چەند جارێک چوونە سەر بەردەکە و هاتنە خوارەوە، بەردەکە لوس و خز بوو، گورگ بەلایاندا نەهات، ئەوانیش بەرەو قوتابخانە بەڕێکەوتنەوە. دەبوو زۆر بەوریایی بەڕێگادا بڕۆشتنایە نەکا لەو ڕێگا سەهۆڵبەندانە بکەون و شوێنێکیان بشکێت.

ئاسمان سامالٚ بوو، دنیا خۆرەتاو بوو، پەڵە هەورێک بە ئاسمانەوە نەبوو، بەلام بەفر ڕووی زەوی داپۆشی بوو، مرۆڤ حەزی دەکرد تا دەتوانێت هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژێت و هەوای خاوێن لە سینەیدا بهێڵێتەوە. دووبەدوو بەناو بەفردا دەڕۆیشتن، نزیکەی سێ سەد مەترێکیان مابوو بگەنە گوندی سەرگەڵوو، گوێیان لە دەنگێکی نامۆ بوو، وایانزانی دەنگی گورگە، بەلام لەناکاو دەنگەکە لە ئاسمانەوە زیادی کرد، کە سەیری ئاسمانیان کرد دوو فڕۆکە بوون. چەند گاشە بەردێک لە نزیک دێکەوە هەبوون، بەزوویی ڕایانکرد و خۆیان گەیاندە پەنا بەردەکان، جەمال دارەکەی دەستی وەکوو چەکێک ڕووە و فڕۆکەکان درێژ کردبوو. فڕۆکەکان چەند بۆمبێکیان بەسەر سەرگەڵوودا فڕێدایە خوارەوە، ئەو ناوە یەکسەر بوو بە ئاگر، تەها و جەمالِ دوو سەد تا سێ سەد مەتر لە شوێنی بۆمبەکانەوە دوور بوون، هێزی تەقینەوەکە ئەوانیشی تەواو ڕاچڵەکاند، خۆ ئەگەر لەبن ئەو بەردانەدا خۆیان حەشار نەدایە، سەلامەت نەدەبوون. فڕۆکەکان چەند جارێک گوندەکەیان بۆردوومان کرد. هەوڵیاندەدا بارەگاکانی پێشمەرگە وێران بکەن، فڕۆکەکان دوورکەوتنەوە، ئەو دوو منداڵە چەند خولەکێک لەبن بەردەکاندا مانەوە، دواتر هەڵسان و بەخێرایی خۆیان گەیاندە قوتابخانە. کاتژمێرێک بەسەر کاتی کردنەوەی قوتابخانەدا تێپەڕی بوو، بەلام هێشتا دەرگای قوتابخانە نەکرابووەوە، مامۆستاکان لە ترسی بۆردوومان قوتابییەکانیان لە قوتابخانەکە دوور خستبووەوە، دواتر قوتابیان گەڕانەوە بۆ قوتابخانە، چەند منداڵێکی پۆلی یەکەم لەترسا دەگریان و دەلەرزین. منداڵەکانی دیکە دڵیاندەدانەوە، قوتابییەکان هەر چەند هەفتە جارێک، بە چاوی خۆیان ئەو بۆردوومانەیان دەبینی. ڕۆژی دواتر

یەکێک لە قوتابییەکان نەهات بۆ قوتابخانە، دیاربوو باوکی بە بۆردوومانەکە شەهید ببوو، هەموو قوتابی و مامۆستاکان خەفەتبار بوون، مامۆستا عەلی گوتی: پێشمەرگە و خەڵک، خەبات بۆ ئازادی کوردستان دەکەن، ئەو بە قوتابیانی گوت لێپرسراوانی ئێمە کەسانی قارەمان و تێکۆشەرن، ئێوەش کە گەورە بوون دەبێت لایەنگری ئازادی بن. هەر جارێک کە بۆردوومان ببوایە کەسوکاری قوتابییەک شەهید یان بریندار دەبوو. چەند ڕۆژێک دوای بۆردوومانەکە، دوو پێشمەرگە هاتن بۆ قوتابخانەکە هەواڵی هەموو قوتابییەکانیان پرسی، بڕیاریاندا دوای چەند ڕۆژێکی دیکە بێنەوە و قوتابیان فێری خۆپاراستن لە فڕۆکە و خۆحەشاردان و چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ بۆمبە نەتەقیوەکاندا بکەن.

لە هاویندا، بۆردوومانەکان چڕتر بوون و کاتی نێوان بۆردوومانەکان کەمتر بوو. تەها لە پۆلی پێنجەم بوو، دواتر لە هەموو لایەک شەڕ دەستیپێکردەوە. فڕۆکە بەردەوام بەسەر گوندەکانی سێکانیان، سەرگەڵوو، بەرگەڵوو و دەوروبەریاندا دەسوڕایەوە و بۆردوومانی دەکردن. پێشمەرگەکان بە مامۆستاکانیان گوتبوو لەبەر باری قوتابیان وا پێویست دەکات قوتابخانە دابخەن. قوتابخانە داخرا و تەهاش وازی لە قوتابخانە هێنا و لە ئیشوکاری ماڵدا هاوکاری باوکی دەکرد. لە دروستکردنی خەڵوزدا هاوکاری دەکرد، گەورەبوونی تەمەن و سروشتی ناوچەکە هۆکاربوون بۆ پەروەردەکردنی تەها، تەها لە دروستکردنی خەڵوز و بارکردنی بارە خەڵوزدا شارەزایی پەیدا کردبوو، هەرزەکارێکی بەهێز و زرنگ بوو، ئیتر منداڵانی گوندی جاسەنە ئازاریان نەدەدا. جەمالی هاوڕێی تەهاش هاوکاری باوکی دەکرد، تەها بەردەوام کتێبی دەخوێندەوە، زۆر حەزی بە خوێندنەوە بوو، هەرکاتێک باوکی دەچوو بۆ شار کتێبی بۆ دەهێنا.

کاتێک تەها منداڵ بوو شەوانە خزمەکانی لە ماڵێک کۆدەبوونەوە و کەسە خوێندەوارەکان بەتایبەت مامە محەمەدی تەها، کتێبی دەخوێندەوە و ئەوانی دیکەش گوێیان لێ دەگرت. کتێبەکانی ئەمیر ئەرسەلان و قەڵای خەیبەر و لەیل و مەجنونیان دەخوێندەوە. ئەگەر شەوێک کەسێک کتێبی نەخوێندایەتەوە ئەوا کەسێکی بەتەمەن چیرۆکی بۆ دەگێڕانەوە. تەها لە منداڵیەوە حەزی لە چیرۆکی قارەمانێتی بوو، حەزێکی زۆری بۆ خوێندنەوە و ئاشنابوون بەجەنگ و قارەمانەکانی جەنگ هەبوو.

ماوەی دوو ساڵ قوتابخانە داخرا، دوای ئەو ماوەیە جەنگ کۆتاییهات و دوبارە قوتابخانە کرایەوە. بەڵام زۆربەی قوتابییەکان بە یەکجاری نەچوونەوە بۆ قوتابخانە. لە دوای ئەو دوو ساڵە بەشی زۆری گوندنشینان بەرەو شارەکان کۆچیان کرد. بەهۆی جەنگەوە چەندین کەس شەهیدبوون، چەندین ماڵ سووتان و خەڵکی بەگشتی هەژارکەوتن. لە ماوەی چەند ساڵی جەنگدا ئەو خەڵکە ورەیان بەرنەدا و سەریان بۆ حوکمی بەعس نەوی نەکرد. سەدام وا یدەزانی بە شەڕ و کوشتار کوردانی شاخ و کوێستانەکان دەستەمۆ دەکات، بەڵام نەیتوانی ئەو کارە بکات.

تەها ڕۆیشتەوە بۆ قوتابخانە و پۆلی شەشەمی تەواو کرد. بەهۆی شەڕ و بۆردوومانی فڕۆکەوە تەها بە ماوەی هەشت ساڵ پۆلی شەشی سەرەتایی تەواو کرد. دوو ساڵی داخستنی قوتابخانە، هۆکار بوو بۆئەوەی تەها زیاتر کتێبی جۆراوجۆر بخوێنێتەوە. هەر لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا بەردەوام خەریکی کارکردن بوو هاوکارێکی باشی دایک و باوکی بوو.

بەهاری ساڵی ١٩٧٥ڕێکەوتننامەی جەزائیر لە نێوان سەدام حوسێن و شای ئێراندا بە نێوەندگیریی "هەواری بۆمیدیەن" واژۆ کرا، شای ئێران و سەدام حوسێن گەیشتنە ڕێککەوتن، پێشبینی پیرەپیاوەکانی گوندی سێکانیان ڕاست دەرچوو، کاتێک شای ئێران و سەدام حوسێن ڕێککەوتن هاوکارییەکانی ئێران بۆ مەلا مستەفا کۆتایی هات، لەو کاتەدا سەدام بڕیاری دا، هێرشەکانی بۆ سەر هێزی پێشمەرگە زیاد بکات تاکو مەلا مستەفا ناچار بکات دەستبەرداری شۆڕش بێت، شای ئێران بەڵێنی بە مەلا مستەفا دا، کە سەدام ڕازی بکات، هێرشەکانی ڕابگرێت. ئەو کاتە ئەحمەد حەسەن بەکر، سەرۆک کۆمار بوو، بەڵام هەموو کارەکان لەژێر دەسەڵاتی سەدامدا بوون. مەلا مستەفا چیتر بەرگری نەکرد، بڵاوەی بە هێزەکەی کرد و خۆیشی ڕۆیشت لە کەرەج دانیشت، چەند ساڵێک لەوێ مایەوە، هەر لەوێش نەخۆشکەوت و بۆ چارەسەر ڕۆیشت بۆ ئەمریکا. مەلا مستەفا دوای شەست ساڵ خەبات لەپێناو ئازادیدا لە ساڵی ١٩٧٩ لە وڵاتی ئەمریکا کۆچی دوایی کرد. ناوی مەلا مستەفا بارزانی لە مێژوودا وەک دیارترین سەرکردە لە یادەوەرییدا دەمێنێتەوە.

تەها تەمەنی پازدە ساڵ بوو کە قۆناغی سەرەتایی تەواو کرد، ئەوکاتە ببووە لاوێکی ئازا و بەهێز. حەزی دەکرد لە خوێندن بەردەوام بێت، بەڵام خوێندنگەی ناوەندی لە گوندی سەرگەڵوو نەبوو. باوکی بڕیاری دا، تەها لە سێکانیان بمێنێتەوە و لە ئیشوکاردا هاوکاری بێت، دەستکورت بوون، توانای دابینکردنی ئەو خەرجیەیان نەبوو کە تەها بچێت لە شار بخوێنێت. هەر بۆیە تەها گوتی: دەچم لە شار کاریش دەکەم و دەشخوێنم. هەر ئەو ساڵە شەمسەی خوشکی شووی کرد بە زراری خاڵۆزای خۆی و ڕۆیشت بۆ کەرکووک. دواتر بڕیاردرا تەها بڕوات لە شار بخوێنێت. تەها، بەو بڕیارە خۆشحاڵ بوو. نزیکترین شار لە سێکانیانەوە شاری سلێمانی بوو، بەڵام تەها لە سلێمانی هیچ خزم و کەسێکی نەبوو، هەربۆیە دواتر بڕیاڕیاریاندا تەها بڕوات بۆ کەرکووک و لە ماڵی خاڵی بمێنێتەوە و لەوێ بخوێنێت. خاڵە سەعدونی لە کەرکووک، خەرجی خوێندنی تەهای لە ئەستۆ گرت و گوتی: پێویست ناکات تەها کاربکات، تەنها با بخوێنێت.

ساڵی ١٩٧٧ بوو، تەها تەمەنی ببووە هەژدە ساڵ زوبێدە تەنها یەک مانگ لە تەها گەورەتر بوو، کچێکی جوان و ئازا بوو، بەهەموو واتایەک کچە کوردێکی تەواو بوو، ئەو کچی خاڵی تەها بوو، کچی سەعدونی حەمەشوان بوو. تەها خوێندنی تەواو نەکرد بوو، پۆلی سێیەمی ناوەندی بوو، بڕیاڕ وابوو زوبێدە و تەها پێکەوە زەماوەند بکەن. تەها نەڕۆیشتبوو بۆ سەربازی، بۆئەوەی نەچێت بۆ سەربازی بڕیاری دا، تەمەنی خۆی چوار ساڵ بچووک بکاتەوە.

تەها لەگەڵ زوبێدەی کچە خاڵیدا زەماوەندی کرد. حەزی لە کارکردن بوو، کتێبی زۆری خوێندبووەوە. زوبێدەش کەسێکی کارا بوو، شارەزاییەکی باشی لە کاری درووماندا هەبوو. تەها بێکار بوو کاری نەبوو، دەستی هاوسەرەکەی گرت و پێکەوە ڕۆیشتنەوە بۆ سێکانیان. ئەگەرچی لە سێکانیانیش کار نەبوو، گوندەکە زەوی کشتوکاڵی کەم بوو، حەزیشی نەدەکرد ببێتە بارگرانی بەسەر باوکیەوە.

دوای ڕێکەوتننامەی جەزائیر، بۆ ماوەی ساڵێک کوردستان ئارام بوو. مەلا مستەفا و پێشمەرگەکانی ڕۆیشتبوون، بەڵام هەستی نەتەوایەتی کورد زیندوو بوو. حیزبێکی تازە بە نێوی "یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان" دامەزرا بوو، "پارتی دیموکراتی

کوردستان"یش، خەریکبوون دوبـارە خۆیان ڕێکدەخستەوە. لە ڕێگەی یەکێتیی نشتمانیی کوردستانەوە، کەم کەم پێشمەرگە دەچوونەوە شاخەکان، هەرێم و کەرت و مەفرەزەیان پێکهێنایەوە، شەڕی پارتیزانی دەستی پێکردەوە، پێشمەرگە لە تەواوی ناوچەکاندا خۆیان نیشانی خەڵکی دەدا و دوبارە شۆڕش دەستی پێکردەوە.

ئـازادی و سەربەخۆیی و یەکسانی سێ وشـەی جوانن، ئـەم وشانە چەندین ساڵە چەندین شۆڕشیان بەدوای خۆیاندا هێناوە و چەندین گەنج و لاویان بەرەو مەرگ بردووە، بەڵام زۆر وڵات و شوێنیش ئازاد کراون. وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی داگیرکاری بریتانیا، فەرەنسا، هۆڵەندا و بەلجیکا بە دروشمی نیشتمانپەروەری ئازادی و سەربەخۆیی ئازاد بوون، زۆرێک لە وڵاتانی جیهان بەهەمان دروشم سەربەخۆییان وەرگرتووە. کوردەکانی کوردستانی عێراقیش بۆ ئازادی و دیموکراسی و یەکسانی لە بەرامبەر یاسای نادادپەروەریدا دەجەنگان، بەڵام حکوومەتی عێراق بەتایبەت لە دوای وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن سەدام حوسێنەوە. حکوومەتێکی زۆر دڵڕەق و بێبەزەیی بوو، حکوومەتێکی دیکتاتۆری بوو، سەدامیش یەکێک لە دڵڕەقترین دیکتاتۆرەکانی سەر ڕووی زەوی بوو، باوەڕی بە دانوستان و وتووێژ نەبوو، بە پارەی نەوت تەواو مەغروور ببوو، وایدەزانی بەهێزی سەربازی دەتوانێت گەلێک لەناوبەرێت، ئەو نەیدەویست پەند لە مێژوو وەربگرێت، ئەویش وەک هەموو دیکتاتۆرەکانی تر، دەیویست کێشەی مۆدێرنیزم بە زیندان و لێدان و کوشتن و بۆردوومان چارەسەر بکات. دەیویست وڵات بەزەبروزەنگ بە ڕێوەبەرێت. لە سەردەمی سەدامدا ڕێگاوبانێکی زۆر و فرۆکەخانە، نەخۆشخانە و زانکۆی زۆر بنیادنران. هێزی سەربازیشی پڕچەک و بەهێزی کرد، زیندان و ئەشکەنجەخانەیەکی زۆریشی بنیادنا. لە سەردەمی ئەودا خزمەتگوزارییەکی زۆر ئەنجامدرا، بەڵام ئەشکەنجە و مەینەتێکی زۆریش بەرهەمهاتن. هەموو دیکتاتۆرەکان خزمەتگوزارییان هەیە، بەڵام خزمەتگوزارییەک ئاوێتەی شەڕ. بیرکردنەوەی شەڕەنگێزیی و کپکردنی ئازادی خەڵکی، هەموو شتێک لەناودەبات. هەرکاتێک ئازادی و دادپەروەریی نەبێت هەموو پایە و دامەزراوەکان هەرەس دەهێنن. سەدامیش یەکێک بوو لەو دیکتاتۆرانە، هەروەها قەزافیش، گرووپی خەمیرە سوورەکانی کەمبۆدیاش لە ئەوان بەدتر و خراپتربوون. هەروەها لە ڕوانگەی

دیکتاتۆرەکانەوە هاوولاتی هیچ شتێک نییە، شای ئێرانیش هەر ئەوها بیری دەکردەوە، دروشمی سەردەمی شا چی بوو؟ خودا، شا، ولات لەم دروشمەدا گەل هیچ بایەخێکی نەبوو، شا و ولات بەبێ گەل بە کەلکی چی دێن؟

ئەگەر سەدام لەگەڵ کوردەکان رێکبکەوتایە، رێگە چارەیەک دەدۆزرایەوە، ئەگەر بەرنامەی خزمەتگوزاریی و ئازادی رادەربرینی لە کوردستانی عێراقدا جێبەجێ بکردایە، ئەوە باشترین چارەسەر بوو. بەلام ئەو تەنها بۆچوونەکانی خۆی بەراست دەزانی. هیچ دیکتاتۆرێک بە گفتوگۆ و دانوستان دەستبەرداری کورسی دەسەلات نەبووە. هیچ دیکتاتۆرێک بەئامۆژگاری و قسەی دڵسۆزەکانی خۆی وازی لە دەسەلات نەهێناوە. دیکتاتۆرەکان گوێ لەکەس ناگرن، تەنها زماندرێژی دەکەن و بڕیاردەدەن، هەر کەسێک وابیر بکاتەوە و بڵێت دیکتاتۆرەکان ئامۆژگاری لە گوێ دەگرن، ئەوە خۆی بێ ئەقڵە، ئەوانە ڕووداوە مێژووییەکانیان قبوڵ نییە، قسەی ڕاوێژکارەکانیان قبوڵ نییە و باوەڕیان بە هەڵبژاردن و دەنگدان نییە. گرنگترینیئەوانەی کە پێی دەنازن پارە، تەکنۆلۆژیا و سوپایە. سەدام زیندانەکانی پڕکردبوو لە خەڵکی ئازادیخوداز، هەر ڕۆژە و ژمارەیەکی گوللەباران دەکرد و ژمارەیەکی لە سێدارە دەدا. بەلام ڕۆژانە گەنج و لاوانی دیکە چەکیان هەڵدەگرت و بەرەو مەیدانی نەبەردی دەڕۆیشتن. لاوان و گەنجانی کورد لە زوڵم و چەوسانەوەی سەدام نائارام بوون، ئەوان لەبری خوێندن و قوتابخانە قەڵەمیان وەلا دەنا و چەکیان هەڵدەگرت و دەبوونە پێشمەرگە. لە شاخ و دۆڵەکاندا بەرامبەر بە سوپا و بەکرێگیراوانی سەدام دەجەنگان.

چەند کەسێک لە هاوڕێیان و خزمەکانی تەهاش پێشمەرگەبوون، دیارە ئەگەر تەها بۆ خوێندن نەڕۆیشتایە بۆ کەرکووک، ئەویش چەکی هەڵدەگرت و دەبووە پێشمەرگە، جەمالیش لەگەڵ ئەبوبەکری برای ببوونە پێشمەرگە.

لە ساڵەکانی ١٩٧٨-١٩٧٩ تەها و زوبێدە ماڵیان لە سێکانیانەوە گواستەوە بۆ سورداش، سورداش ناحیەیەک بوو سەر بەقەزای دوکان و پارێزگای سلێمانی. تەها لەوێ کرێکاری دەکرد، تەها بیری لەوە دەکردەوە کە بچێتە شوێنێک تاکو بتوانێت شەوانە درێژە بە خوێندن بدات، لە سورداش خوێندنگەی شەوانە نەبوو، هەمان ساڵ تەها و زوبێدە ماڵیان گواستەوە بۆ سلێمانی، لە شار ژوورێکی بچکۆلانەیان بە کرێ

گرت، مانگی بە دوازدە دیناری عێراقی. تەها کرێکاری دەکرد و زوبێدەش کاری بەرگدروویی، بەڵام چونکە کەسێک نەیدەناسی کاری بەرگدروویی کەم بوو. حاجی عەبدوڵڵا و خاڵە سەعدون جاروبار هاوکاری تەهایان دەکرد، تەها پۆلی سێیەم، چوارەم و پێنجەمی ناوەندی و ئامادەیی لە سلێمانی تەواو کرد.

### هەواڵێک بڵاو دەبێتەوە

کۆتایی ساڵی ۱۹۷۸ بوو، تەها تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، ڕۆژێک تەها بۆ کارکردن بە شەقامێکدا دەڕۆیشتە خوارەوە، کەسێکی ناسیاوی خۆی بینی، کەسەکە لە تەهای پرسی ئایا زانیوتە جەمال و ئەبوبەکری برای شەهید کراون؟ ئەو هەواڵە وەک تیرێک لە دڵی تەهای دا، بەبیستنی ئەو هەواڵە زۆر خەمبار بوو، چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو، لە تاواندا هێندەی نەمابوو سەری خۆی بە دیواردا بکێشێت. هاواری دەکرد و دەیگوت: چۆن شتی وا دەبێت! هیوادارم ئەم هەواڵە ڕاست نەبێت. ئەو کات تەلەفۆن نەبوو، تاکو تەلەفۆن بکات، تەها هەواڵەکەی لە چەند کەسی دیکە پرسی هەر یەکە و بە جۆرێک وەڵامیان دەدایەوە. تەها بە دڵێکی خەمبارەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. زوبێدەش باوەڕی بە هەواڵەکە نەدەکرد، دەیگوت خەم مەخۆ ئەو هەواڵە ڕاست نییە. بەڵام هەواڵەکە ڕاست بوو، جەمال و ئەبوبەکری برای هەردوکیان پێکەوە شەهید کرابوون. هەردوکیان هاوڕێ و کەسی تەها بوون. هاوڕێی قوتابخانە و ڕێگای نێوان سێکانیان و سەرگەڵوو. هاوڕێی ناو بەفر و سەرما، ئەو هاوڕێیەی کە بەردەوام هاوکاری بوو. جەمال کوڕێکی ئازا و قارەمان بوو، کاتێک بوو بە پێشمەرگە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، ئەو قەڵەمی دانابوو چەکی هەڵگرتبوو، کێ ئەوی ناچار کردبوو قەڵەم دابنێت و چەک هەڵبگرێت؟ ئەبوبەکر پێشتر لە سەردەمی شۆڕشی مەلا مستەفاشدا پێشمەرگە بوو، پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان و نموونەیی بوو. دوای هەرەسی شۆڕش، دوبارە لەگەڵ جەمالی برایدا لە ڕیزەکانی یەکێتیی نشتمانییدا چەک هەڵدەگرنەوە و دەبنەوە پێشمەرگە. ئەوانیش وەکوو سەدان کوردی ئازای دیکە بۆ ئازادی دەجەنگان. سەرگەڵوو شوێنی شەهیدبوونی چەندین کەسی ئازا و قارەمان بوو. چەندین قارەمان

لەم گوندە بەهەشت ئاسایەدا خوێنیان ڕژاوە، ئەو شیو و دۆڵەی کە بنکەکانی مەلا مستەفا و مام جەلالیان لێ بووە، پێویستە بکرێتە شوێنێکی گەشتیاری، گەشتیاری پەندوەرگرتن، گەشتیاری خەبات لەپێناوی ئازادیدا.

جەمال لاو بوو، کۆمەڵێک حەز و ئارەزووی هەبوو، دەیویست بە چاوی خۆی ئازادی ببینێت. تەها و جەمال لە سەردەمی منداڵیدا بەردەوام پێکەوە بوون، دوای قوتابخانەش پەیوەندییان بەهێز بوو. تەها بەردەوام لەگەڵ پێشمەرگەکاندا پەیوەندی هەبووە. شەهید بوونی جەمال و ئەبوبەکر خەمێکی کاریگەر بوو لە دڵی ئەودا. تەها شەوانە نەیدەتوانی وانەکانی بخوێنێت، لە خەودا جەمالی دەبینی و قسەی لەگەڵدا دەکرد، بەردەوام ڕوخساری جەمالی لەبەر چاو بوو، مەگەر دەکرێت هاوڕێیەکی خۆشەویستی سەردەمی منداڵی لەبیر بکرێت. خۆ ئەگەر جەمال نەبووایە تەها هەرگیز نەدەچوو بۆ قوتابخانە، جەمال هاوڕێی گیانیبەگیانی تەها بوو، بەڵام بەداخەوە لەپێناوی ئازادیدا بە گوللەی کە سێکی ناحەز و خۆفرۆش لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ دا شەهید کرا.

مرۆڤ لە سەردەمی لاوێتیدا بیر لە مردن ناکاتەوە، بەڵام کاتێک کەسێکی خۆشەویستی لەدەست دەدات هەست بە تەنهایی دەکات، مرۆڤ هەرچەندە بەتەمەنتر بێت، مردنی کەسانی دیکە بەلایەوە ئاسایی ترە کەسێکی تەمەن هەشتا و پێنج ساڵ مردنی کەسێکی زیاتر بەلاوە ئاساییە تاکو کەسێکی پەنجا ساڵ.

بە شەهیدبوونی جەمال، تەها بڕیاری دا زیاتر هاوکاری پێشمەرگەکان بێت، ئەو بڕیاری دا بوو ڕێگای جەمال ون نەکات و لەسەر ڕێبازەکەی بەردەوام بێت، ئەو ژن و ژیانی خۆی وەلاوە نابوو، بەڵام لەنێو شاردا و بە نهێنی سوور بوو لە خەبات و تێکۆشان.

لە ڕێڕەوی مرۆڤەکاندا سەختترین ڕێگا، ڕێگای ئازادییە، بە درێژایی مێژوو هیچ ڕێگایەک ئەوەندەی ڕێگای ئازادی کوشتن، برینداری، ماڵوێرانی و سەرگەردانی بەخۆیەوە نەبینیوە. هیچ ڕێگایەک ئەوەندەی ڕێگای ئازادی تاڵانی، ڕاووڕووت، دیلی، زیندانی و ئەشکەنجەی نەبینیوە. ڕێگای ئازادی و سەرفرازی ترسناکترین ڕێگای جیهانە. لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ڕێڕەوی ئازادی تا ڕادەیەک تەخت بووە، بەڵام هێشتا پڕ لە کۆسپ و چەڵەمەیە.

تەها و زوبێدە بە داهاتی کرێکاری و داهاتی بەرگدروویی و هاوکاری دایک و باوکیان، ڕۆژگاریان دەگوزەراند، زوبێدە دەیزانی تەها بەهۆی شەهیدبوونی جەمالی هاوڕێیەوە نائاساییە، دەیزانی هاوسەرەکەی هاوکاری پێشمەرگە دەکات. لەسەر ئەم هەموو گرفتارییەشەوە تەها بەردەوام کتێبی دەخوێندەوە، پاشنیوەڕوان، دوای تەواو بوونی کار، ڕۆژانەکەی وەردەگرت و سەردانێکی کتێبخانەکانی دەکرد، ئەگەر کتێبێکی تازەی بدیبایە دەیکڕی، هەندێک جار هەموو پارەکانی خۆی دەدا بە کتێب، زوبێدەش دەبوو بۆ کڕینی پێداویستییەکانی ماڵ هەوڵبدات. زوبێدە، بەو ژیانەی لەگەڵ تەهادا دەیگوزەراند، ڕازی بوو. ئەو ژنێکی ئازادیخوداز بوو، هەرگیز هاوسەرەکەی خۆی سەرزەنشت نەدەکرد، هەرگیز نەیدەگوت بۆچی لەبری نان و پێویستیەکانی ناوماڵ، دەچێت کتێب دەکڕێت.

ساڵی ١٩٧٩ تەها بۆ سەردانی دایک و باوکی ڕۆیشت بۆ سێکانیان، ئەو بەردەوام لە خەمی لەدەستدانی جەمالی هاوڕێیدا بوو، دیارە بەردەوام پێشمەرگە و ناسیاوی دیکەی تەها، شەهید دەبوون. بەڵام خەمی جەمال خەمێکی تایبەت بوو، تەها سەردانی کەمالی برا بچووکی جەمالی کرد، کەمالیش پێشمەرگە بوو تەمەنی بیست ساڵ دەبوو. کەمال گوتی: جەمالی برام دەیویست ژن بخودازێت، بەڵام لەبری جلی زاوایی، کفنی سپی پۆشی. هیچ ڕێگایەک وەک ڕێگای خەبات نییە، باشە سەدام ڕێگایەکی دیکەی نەبوو، جگە لە ڕێگای توندوتیژی و چەوساندنەوە.

ژمارەیەک لە کادر و پێشمەرگەکان لە سێکانیان بوون. گوندی سێکانیان سەرڕێگای هاتوچۆی پێشمەرگە بوو، هەر لەوێشەوە ڕێگاکە دەڕۆیشت بەرەو سەرگەڵوو. پێشمەرگەکان لەسەر شاخ، پاسەوانی ناوچەکە بوون، سوپای عێراقی توانای ئەوەیان نەبوو بەشاخەکانەدا سەربکەون و خۆیان بگەیەننە بنکەکانی پێشمەرگە لە سەرگەڵوو. چونکە بەتوندی ڕووبەڕووی بەرگریی پێشمەرگە دەبوونەوە.

## جیڤارای کوردستان

یەکێک لەو پێشمەرگانەی لە سیکانیان، هاتوچۆی ماڵی باوکی تەهای دەکرد کادرێک بوو بەناوی «دڵشادی حاجی بەنگینە»، کاتێک پێشمەرگەکان بۆ نانخواردن بەسەر ماڵاندا دابەش دەبوون، هەموو جارێک ئەو دەچوو بۆ ماڵی حاجی عەبدوڵڵا، بەبێئەوەی حاجی عەبدوڵڵا ئاگاداربێت، دڵشاد لەگەڵ تەهادا دەکەوتە گفتوگۆ، ڕۆژێک دوو دانە نامیلکەی دا بە تەها، یەکێکیان بەنێوی «کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان» ئەوی دیکەشیان بەنێوی «یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی؟» ئەو کاتە کە پێشمەرگەکان بەسەر ماڵاندا دابەش دەبوون، ئەم کارەیان هەم بۆ نانخواردن بوو، هەم بۆ خۆپارێزی بوو لە دوژمن، خۆ ئەگەر هەموویان بە یەکەوە لە یەک ماڵدا یان لە یەک شوێندا پێکەوە بوونایە، ئەوا دوژمن زۆرتر پەی پێ دەبردن. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بەسەرۆکایەتی «مام جەلال تاڵەبانی» تازە دامەزرا بوو، تازە پێشمەرگە پەیدا ببووەوە و پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا، وازیان لە شۆڕش هێنابوو. ئەو سەردەمە زۆربەی پێشمەرگەکان بۆ بژێوی خۆیان و ماڵ و منداڵیان کاریان دەکرد، خەڵکەکە بە گشتی میواندۆست بوون و خواردنیان لە دەمی ماڵ و منداڵی خۆیان دەگرتەوە دەیاندا بە پێشمەرگە. لە سیکانیان، پێشمەرگە بەزۆری ڕوویان لە ماڵی حاجی عەبدوڵڵا دەکرد لەوێ نانیان دەخوارد، دەربارەی شۆڕشی نوێ گفتوگۆیان دەکرد. تەهاش گوێی لە هەموو گفتوگۆکانیان دەگرت. دڵشادی حاجی بەنگینە کادرێکی زیرەک و بەتوانا و زمانپاراو بوو، شارەزاییەکی باشی لە مێژوودا هەبوو، ئەو خوێندکاری زانکۆ بوو، دوای ئەوەی لەلایەن پیاوانی بەعسەوە ئاشکرا دەبێت، زانکۆ جێدەهێڵێت و پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە دەکات، گفتوگۆی زۆری لەگەڵ تەهادا دەکرد و کاریگەرییەکی زۆری بەسەر تەهاوە هەبوو. هەر لە ڕێگای ئەوەوە تەهاش بوو بە لایەنگری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. دڵشادی حاجی بەنگینە بە بنەچە کوردی ڕۆژهەڵات بوو، چەندین ساڵ پێشتر باپیرەی شاری سەقزی جێهێشتووە و هاتووە لە سلێمانی نیشتەجێ بووە، دڵشاد خۆیشی و باوکیشی لە شاری سلێمانی لەدایک بوون، دڵشادی حاجی بەنگینە بۆ خەبات و تێکۆشان سنوورەکانی نەدەناسی، هەر بۆیە ئێمەش دەڵێین جیڤاراکان کەم نین.

سەرگەڵوو، بەردەوام لەژێر تۆپباراندا بوو، سوپای عێراق بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر سەرگەڵوو. ئەوان دەیانزانی سەرگەڵوو پێشتر شوێن و بنکەی بارەگاکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە و ئێستاش بارەگاکانی یەکێتیی نیشتمانیی لەو گوندەدا جێگیر کراون، ئەو دۆڵە چڕ و قوڵەی خوار گوندەکە ئێستا بووە بە شوێنی بارەگاکانی یەکێتیی، باش دەیزانی لەپاڵ هەر بەردێکدا پێشمەرگەیەک بەچەکەوە ئێشکگرە و هەر هێرشێک بۆ ئەو ناوچەیە جگە لە خۆکوژیی هیچی دیکە نییە، لە هەر لایەکەوە هێرشیان بکردایە جگە لە خۆبەکوشتدان و تێکشکان هیچی دیکەیان بۆ نەدەمایەوە. هەر بۆیە بیریان لەوە دەکردەوە کە بەردەوام بەشێوەیەکی کوێرانە بۆردوومانی گوندی سەرگەڵوو و دێهاتەکانی دەوروبەری بکەن. هەر بەو هۆیەشەوە لە سەرگەڵوو و گوندەکانی دیکە چەندین ژن و پیاو و منداڵ شەهید کران.

**خاڵە سەلام**

یەکێک لە خاڵەکانی تەها ناوی سەلام بوو، سەلام پیاوێکی ئازا و قارەمان بوو، زستانی ساڵی ١٩٧٩ بوو، بەفر هەموو شیو و دۆڵێکی داپۆشیبوو، منداڵان لە کۆڵانەکان و لەنێو بەفردا یارییان دەکرد، لەسەر بەفر خلیسکێنە و شەڕە تۆپەڵیان دەکرد. شاخ و دەشت و دۆڵەکان بە بەفر سپی ببوون، بەڵام ئاسمان شین و ساماڵ بوو، پەڵە هەورێک بە ئاسمانەوە نەبوو.

خەڵکی ڕەنجدەر و تێکۆشەری کوێستانەکان کەوتبوونە ژێر تەوژمی سەرماوە، بەڵام بەردەوام شاد و دڵخۆش بوون، هەواڵی هێرشی سوپای سەدام حوسێن بەنێو خەڵکیدا بڵاو بووەوە، سەرباز بە پاڵپشتی هەلیکۆپتەری جەنگیی لە گوندەکانی جوبڵاخ و قەڵەمپاشاوە هێرشیان هێنابوو بەرەو گوندی قەرانگوێ، ژنان و پیاوانی گوندەکانی تر، زۆر لە خەمی پێشمەرگەدا بوون. ژنان نان و پێخۆریان دەپێچایەوە و دەیاندایە دەست پیاوان و پیاوانیش بەزوویی دەیانگەیاندە پێشمەرگە.

ڕۆژی هەینی ١٩٧٩/٢/٢ بوو مەفرەزەیەک لە پێشمەرگە بۆ تەمێکردنی بەکرێگیراوان، دەچنە ناو سەیرانگەی دوکان، دوای ئەنجامدانی کارەکەیان دەگەڕێنەوە

گوندی جوبلاخ، کات لە نیوەشەو تێپەڕیکرد بوو، پێشمەرگەکان بەنیازبوون پشوو بدەن و دواتر بەڕێبکەون بەرەو گوندی قەرانگوێ. پێشمەرگەکان بەسەر چەند ماڵێکدا دابەش ببوون. درەنگانێکی شەو لەلایەن هێزە بەکرێگیراوەکانی بەعسەوە، چواردەورەیان دەگیرێت و هەر لەوێدا سێ پێسمەرگە شەهید دەبن کە بریتی بوون لە سەلام حەمەشوان و سەلام سابونکەرانی و مستەفا کوێرەکانی. دواتر سوپای عێراق بەرەو گوندی قەرانگوێ دەکێشێت و بەهەلیکۆپتەر سەرباز لە دەوروبەری گوندەکە دادەبەزێت، شەڕێکی قورس ڕوودەدات پێشمەرگەکان توانیان فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەر بپێکن و بیخەنە خوارەوە و چەندین سەربازیش بکوژن. لەوێش دوو پێشمەرگەی تر، بەناوەکانی عبدولرەحمان حەسەن مارف و مەجید حەمەعەزیز شەهید دەکرێن. ڕۆژێک دوای شەهیدکردنی خاڵە سەلام، لەکاتی هێرشەکەی سەر گوندی قەرانگوێ، عەلی حوسێن کە ئەویش خەڵکی سێکانیان و خزمی نزیکی تەها بوو. بۆ هەواڵپرسین و هاوکاری پێشمەرگەکان، بە بێ چەک بەرەو قەرانگوێ ڕۆیشتبوو، بەڵام سەربازانی ڕژێم تەقەی لێدەکەن، بە برینداری دەستگیری دەکەن و بە هێلیکۆپتەر دەیبەنە ئیستیخباراتی سلێمانی، دوای چەند ڕۆژێک لەوێ گوللەبارانی دەکەن و هەموو جەستەی بەفیشەک دادەبێژن.

سەلام، خاڵی تەها و شەمسە بوو، سەلام چوار منداڵی لەدوای خۆی جێهێشت، بەناوەکانی موحسین، یاسین، بورهان و بەهیە. تەها بۆ کۆچی خاڵی زۆر نیگەران بوو. خاڵێکی دیکەی تەها ناوی عەبدوڵلا بوو، عەبدوڵلا گوتی: بڕیارم داوە بۆ تۆڵە کردنەوەی براکەم چەک هەڵبگرم و ببمە پێشمەرگە، ئەویش دۆست و لایەنگری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، بەنهێنی خەباتی دەکرد و هاوکارێکی باشی پێشمەرگەبوو، عەبدوڵلای خاڵی تەها، ساڵی ١٩٨٣ چەکی براکەی کردە شان و بوو بە پێشمەرگە، دژی ڕژێمەکەی سەدام دەجەنگا. عەبدوڵلا پێشمەرگەیەکی نموونەیی بوو، مووچەی لە یەکێتیی وەرنەدەگرت و جگە لە پێشمەرگایەتی کاری جوتیاری دەکرد و ئاژەڵیشی بەخێو دەکرد.

تەها، بەردەوام بیری لەوە دەکردەوە ڕۆژێک ببێتە پێشمەرگە و بەشداری شەڕەکانی دژی سەدام بکات. موحسین کوڕە گەورەی سەلام گەورە بوو، ئەویش

بوو بە پێشمەرگە. موحسین کاتێک لە ماڵی مامە سەعیدی بوو، کە خاڵی تەهاش بوو، لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٥/٣ لە گوندی گۆپتەپە لەگەڵ مامی و ئامۆزاکانی بە چەکی کیمیایی شەهید کران. بەزۆری بڵاوکراوەکانی شۆڕش و یەکێتیی دەخوێندەوە و لەنێو خەڵکیدا کاری ڕێکخراوەیی دەکرد.

تەها، سەرەتا تەنها کتێبی دەخوێندەوە. ئەوسا پێشمەرگەی خوێندەوار کەم بوون، زۆربەی زۆری پێشمەرگەکان نەخوێندەوار بوون و خوێندن و نووسینیان نەدەزانی، بەڵام کەسانی زیرەک و ڕووناکبیریش زۆر بوون، خوێندەواری بەتەنها ناتوانێت هۆشیاری و ڕۆشنبیریی بە مرۆڤ ببەخشێت. فرۆکەوانێک کە وڵات و شار و گوند و هاووڵاتیانی خۆی بۆردوومان دەکات، کەسێکی زۆر خوێندەوارە، بەڵام ئایا کەسێکی هۆشیار و ڕووناکبیرە؟

پێشمەرگەکان پێشوازییەکی زۆریان لە لاوە خوێندەوارەکان دەکرد، دڵشادی حاجی بەنگینە مامۆستا و ڕێنیشاندەر بوو بۆ تەها، تەها لە سێکانیانەوە گەڕایەوە بۆ سلێمانی و لە گەڕەک و نێو هاوڕێکانیدا جموجۆڵێکی زۆری هەبوو، زوبێدەی هاوسەریشی باش دەیزانی کە تەها خەریکی کاری ڕێکخستنە.

### چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ

ئیبراهیم عەزۆ، ئەفسەرێکی کوردی سوپای عێراق بوو، ڕیزەکانی سوپای جێهێشت و پەیوەندی کرد بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە، دەرچووی کۆلێژی سەربازیی بوو، شارەزای جەنگی پارتیزانی بوو، هاوکات زۆر گرنگیی بە کاری ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندن، دەدا. ئەو ساڵی ١٩٧٦ بوو بە پێشمەرگە و ساڵی ١٩٧٨ لە ناوچەی بادینان شەهید کرا.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە بەرگەلوو دەزگای ڕاگەیاندنی دامەزراند و چاپخانەیەکی بەناوی «چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ»وە دامەزراند. تەها و ساڵح بێچار لە سلێمانی، پێکەوە کتێبیان دەفرۆشت. نووسراوی نووسەرانی لایەنگرانی یەکێتیی‌یان کۆدەکردەوە و تەها دەیگەیاندە چاپخانەکە. هەر لەوێشەوە نامیلکە و

بڵاوکراوەکانی دەهێنایەوە بۆ سلێمانی و بەسەر خەڵک و دۆستان و لایەنگرانی یەکێتیی‌دا دابەشیان دەکرد. تەها بەردەوام لە نێوان شاری سلێمانی و چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆدا، لە هاتوچۆ و پەیوەندیدا بوو. ئەوەش کارێکی زۆر ترسناک بوو.

ئەو نامیلکانەی کە دڵشادی حاجی بەنگینە بە تەهای دابوون. لە سێکانیان لە ماڵی باوکی حەشاریدا بوون. تەها هەر کاتێک لە سلێمانییەوە سەردانی سەرگەڵووی دەکرد، لەوێوە سەرێکی لە سێکانیانیش دەدا. سەردانی دایک و باوک و کەسەکانی دەکرد. دووریی دەزگای ڕاگەیاندن تاکو سێکانیان تەنها چوار بۆ پێنج کیلۆمەتر دەبوو. ڕۆژێک تەها لە سێکانیان ویستی ئەو نامیلکانە لە دایکی وەربگرێت و لەگەڵ خۆیدا بیانبات بۆ سلێمانی، بەڵام دایکی بەپەلە نامیلکەکانی خستە سەر ئاگر و سووتاندنی. تەها بەو کارەی دایکی، زۆر نیگەران بوو. دایکی پێی گوت: بە خوێندنەوەی ئەم کتێبانە خۆت تووشی زیندان دەکەیت. تکایە دانیشە بەدەردی خۆتەوە و واز لە خوێندنەوەی ئەم جۆرە کتێبانە بێنە. خۆت تووشی زیندان مەکە. بەڵام تەها ڕۆژانە لەسەر ئەو کارە بەردەوام بوو. ئەو سەردەمە هێزی پێشمەرگە و یەکێتیی زۆر بێپارە بوون، پێشمەرگە و لایەنگرەکانی یەکێتیی هیچ مووچەیان نەبوو. پێشمەرگە بە نان و جلوبەرگ و چەکی خۆی؛ پێشمەرگایەتی دەکرد. تەها هیچ داهاتێکی نەبوو، دەبوو کرێکاری بکردایە، ئەو زیاتر کرێکاری کۆنکرێتکردنی باڵەخانە و خانووی دەکرد. دەبوو هەر بە کاری کرێکاری بژێوی خۆی و خێزانی دابین بکات و کرێی خانووش بدات.

ساڵی ١٩٨٢ خۆپیشاندان لە هەموو شارەکانی کوردستان دەستی پێکرد. بەتایبەتی لە شاری سلێمانی، خۆپیشاندان زۆر بەرفراوان دەستی پێکرد. تەها ئەو کات ماڵی لە گەڕەکی مەجیدبەگ بوو، بەردەوام خەریکی سازکردن و جۆشدانی خۆپیشاندان بوو، تەها لەو ماوەیەدا زۆر بێپارە بوو، دەبوو کرێ خانووشی بدایە، بە هاوسەرەکەی گوت من دەڕۆم بۆ کرێکاری تۆ لەبری من خەڵکی گەڕەک کۆبکەرەوە و خۆپیشاندان بکەن، تەها ڕۆیشت و زوبێدە خەڵکی گەڕەکی کۆکردەوە و خۆپیشاندانیان دروست کرد.

لە گەڕەکەکەیاندا ژنێک هەبوو ناوی باجی ناسکە بوو، دراوسێی ماڵی تەها بوو، ئێوارە کاتێک تەها لە کار دەگەڕێتەوە، باجی ناسکە تەها دەبینێ و دەچێت ڕێی پێدەگرێت و دەڵێ کە ڕۆیشتیتە ماڵەوە زوبێدە بکوژە؟ چونکە ئەمڕۆ لەگەڵ تەواوی ژنانی گەڕەک چووە بۆ خۆپیشاندان، خۆت دەزانیت خۆپیشاندان کارێکی خراپە! تەهاش گوتی، بەڕاست، چووە بۆ خۆپیشاندان؟ ژنەش گوتی بەڵێ چووە! تەهاش پێی گوت بڕوا بکە ئەگەر نەچووایە بۆ خۆپیشاندان دەمکوشت.. بەڵام مادام چووە ئەوا دەستخۆشی لێ دەکەم! باجی ناسکە لە قسەکانی تەها سەری سوڕما و گوتی: ئاخر، زوبێدە هاواری دەکرد بژی پێشمەرگە، مردن بۆ سەدام و بڕوخێت بەعسی فاشی! خۆت دەزانیت ئەم کارە کارێکی باش نییە.. تەها گوتی: ئەگەر وای نەگوتایە بەدڵنیاییەوە دەمکوشت! باجی ناسکە لچێکی هەڵقورچاند، تەها پێی گوت ڕۆژێکی دیکە تۆش بەشداری بکە و هاواربکە مردن بۆ سەدام و حیزبی بەعس.

ئەو ڕۆژە تەها کاری کردبوو پارەی لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە بۆ ماڵەوە. ڕۆژانە هەواڵی شەڕ و پێکدادانی سەربازانی ڕژێم و هێزی پێشمەرگە بڵاودەبووەوە، ڕۆژانە هەواڵی شەهیدبوون و بریندارbوونی پێشمەرگە دەگەیشتە گوێی تەها، ڕۆژانە هەواڵی سووتاندن و وێرانکردنی گوندێک دەبیسترا.

### دڵشادی حاجی بەنگینە

ساڵی ١٩٨٢ هەواڵێک بڵاو بووەوە، هەواڵێک کە تەهای تووشی شۆک کرد، هاوڕێکەی، مامۆستاکەی، ڕێکخەرەکەی شەهید ببوو، ئەو بۆ تەها برا گەورەیەکی خەمخۆر بوو، دڵشادی حاجی بەنگینە مامۆستایەکی دڵسۆزی تەها بوو، تا ئەو کاتە تەها لە خەمی لەدەستدانی جەمال و خاڵە سەلامدا بوو، ئێستا دڵشادیشی هاتەسەر، بە لەدەستدانی ئەم کەسە خۆشەویستانەی، تەها بەردەوام لە خەم و پەژارەدا بوو. دڵشاد لە گوندی شارستێن شەهید کرابوو.

تەها تەمەنی ببووە بیست و دوو ساڵ. بە لەدەستدانی هاوڕێکانی ڕۆژ بە ڕۆژ هەستی شۆڕشگێری کڵپەی دەسەند. زیاتر بەردەوام دەبوو لەسەر خەبات و تێکۆشان.

هەرگیز بە درێژایی مێژوو هیچ دیکتاتۆرێک نەیزانیوە کە بەکوشتن و ترس و تۆقاندن، هیچ کێشەیەک چارەسەر نابێت. یەکێک دەکوژرێت، چەندین کەسی دیکە چەک دەکەنە شانیان. بەناهەق کەسێک زیندانی دەکەن، بەڵام چەند کەسێکی دیکە هەڵدەستن و درێژە بەڕێگاکەی دەدەن. تەها بەردەوام بوو لەسەر کارە مەترسیدارەکانی خۆی. ڕۆژانە دەچوو بۆ کرێکاری و بە ڕۆژانەکەی نان و پێویستییەکانی دیکەی دەکڕی و دەگەڕایەوە بۆماڵەوە. زوبێدە نان و پێویستییەکانی لە تەها وەردەگرت. نانێک کە بەپارەی ئارەقەی نێوچەوان کڕدرابوو. کرێکارێک کە دەبوو لە بەیانی زووەوە تاکو ئێوارە کار بکات، بەیانی تا ئێوارە دەبوو خاکەنازی بەدەستەوە بووایە، چیمەنتۆی بگرتایەتەوە، بەرد و بلۆک بە شان سەربخات بۆ سەر خانوو، ئێوارەش شەکەت و ماندوو نان و پێداویستی ماڵ بکڕێت و بگەڕێتەوە، بەڵام خۆشحاڵ بوو بەوەی کە ئەو ئەرکەی بە هاوسەرەکەی سپاردووە ئەنجامی داوە. کام ئەرک؟ بەشداری کردن لە خۆپیشاندان لە دژی دیکتاتۆر، خۆپیشاندان بۆ ئازادی و سەربەخۆیی، ئەو لاوە تەمەن ٢٢ ساڵە، ئێواران بەلای ژنە جوانەکەیەوە دادەنیشت و نانی ئێوارەیان پێکەوە دەخوارد، ئەوان پێکەوە هەستیان بەئارامی دەکرد. تەها خۆشحاڵ بوو کە لەلای هاوسەرە قارەمان و ئازاکەیەوە دانیشتووە، هاوسەرێکی بوێر و ژیر، کە بۆ تێکۆشان لەپێناو ئازادیدا هاوبیری ئەوە.

هەندێک کەس خانووی گەورە لە شێوەی کۆشک دروست دەکەن، هەندێک لەو خاوەنکارانە لەوانەیە بەچاوی سووک سەیری کرێکار بکەن، پێویستە ئەوان ئاگاداربن کە هەر یەکێک لەو کرێکارانە لەوانەیە ببێتە پێشمەرگە و جەنگاوەر و خەبات لەپێناو ئازادیدا بکات. لەنێو کرێکاراندا چەندین کەسی ئازا و قارەمان هەڵدەکەوێت کە دژی دیکتاتۆرەکان دەوەستنەوە، پێویستە ئاگاداربن کە هەر کرێکارێک ژنێکی ئازا و بەجەرگی لە ماڵەوە هەیە. زۆرێک لە خەڵکی هەژار خەباتگێڕی ڕێگای ئازادی و سەربەخۆیی و دادپەروەریی و نان و کارن. لەوانەیە ڕۆژێک بێت هەر کرێکارێک کۆشکێک بەسەر سەرمایەدارێکدا بڕوخێنێت. بۆیە پێویستە بەویژدانەوە ماف و کرێی خۆیان پێبدرێت.

خەبات و تێکۆشانی کوردەکان دژ بە ڕژێمی سەدام حوسێن ڕۆژ بەڕۆژ لە پەرەسەندندا بوو، دیکتاتۆر لەبری ئازادی و دادپەروەریی و نان و دروستکردنی

ڕێگاوبان و نەخۆشخانە و خزمەتگوزارییەکانی دیکە گوللە و ئاگری بەسەردا دەباراندن، دیکتاتۆرەکان دەڵێن سەرەتا ملکەچی، دواتر پارووە نانێک. ئەو کاتە و هەمیشە و بەدرێژایی مێژوو، خەڵکیی خەبات و تێکۆشان دەستپێدەکەن و دەڵێن سەرەتا ئازادی و دادپەروەریی، دواتر پارووە نانێک و تەنانەت گیانیش.

تەها، تەنها کەسێکە، تەنها نموونەیەکە، سەدان و هەزاران ژن و پیاوی کورد هەر وەک تەها خەباتیان کردووە. تەها بەردەوام لە نێوان سلێمانی و سێکانیان‌دا لە هاتوچۆدا بوو، دەبوو بەڕێگای سەرگەڵوودا بڕۆیشتایە، هەموو جارێک کاربەدەستانی حکوومەت پێشیان بە ماشێنەکەیان دەگرت. لە سەرنشینانی نێو ماشێنەکانیان دەپرسی ئێوە بۆچی دەچن بۆ سەرگەڵوو؟ تەها وەڵامی دەدانەوە، دەیگوت دایک و باوکم لە گوندی سێکانیانن، دەیگوت من هیچ کارێکم لە سەرگەڵوو نییە بەڵکو من دەچم بۆ سێکانیان.

چەند نووسەرێک هەبوون، ئەوان بەناوی خودازراوەوە وتار و بابەتیان دەنووسی بۆ نموونە وەک دکتۆر مارف عومەر گوڵ "بەناوی دلاوەر مەحموود" شیعری دەنووسیی. ڕەئوف بێگەرد "بەناوی ڕێبوار" چیرۆکی دەنووسیی. ئەوان نووسینەکانی خۆیان دەدا بە تەها و سالّح بێچار، تەهاش دەیگەیاندنە چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، لە بەرگەڵوو. جگە لەو بابەتی نووسینانە تەها کاغەز، ستێنسڵ، مەرەکەب و پێویستییەکانی دیکەشی دەگەیاندە چاپخانەکە. هەر چاپکراوێکیش هەبووایە، لەگەڵ خۆی هەڵیدەگرت، دەچوو سەردانێکی سێکانیانیشی دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی. زۆر جار نامە و نووسراوی پێشمەرگەشی دەهێنایەوە بۆ سلێمانی، دەیگەیاندە دەستی کەسوکاری پێشمەرگەکان. نامیلکە و بڵاوکراوەکانیشی دەهێنایەوە سلێمانی خۆی و چەند هاوڕێیەکی نزیکی بەسەر لایەنگران و هاوڕێکانیاندا دابەشیان دەکرد.

عەبدوڵلای خاڵی تەهاش، هاوکاری پێشمەرگەکانی دەکرد. بەتایبەت دوای شەهیدبوونی سەلامی برای، هاوکارییەکانی زیاتر کردبوو. بەڵام حاجی عەبدوڵلای باوکی تەها، ئامۆژگاری عەبدوڵلای ژنبرای دەکرد و دەیگوت ئاگاداری خۆتبە، ئەم شەڕانە ماڵوێرانکەرن. حاجی عەبدوڵلا، ئامۆژگاریی تەهای کوڕیشی دەکرد و دەیگوت تۆ ئەم هاتوچۆیەت لەچییە، وازبێنە و بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە، دەترسم

ڕۆژێک بگیرێیت و لەسێدارە بدرێیت. دانیشتووانی گوندی سێکانیان نزیکەی سەد و بیست کەس دەبوون. لە گوندەکەدا مزگەوتێکی بچکۆلە هەبوو، وەرزی زستان و کاتی بێکاری پیاوانی ئاوایی لە مزگەوت کۆدەبوونەوە و لەبارەی شۆڕش و پێشمەرگەوە وتوویژیان دەکرد. هەندێک دەیانگوت ئەم ڕژێمی بەعسە ئەوەندە زوڵم دەکات، کوڕەکانمان ناچار دەکات چەک هەڵبگرن و بچنە ڕیزی پێشمەرگەوە. کەسوکاریش ئامۆژگاریی تەهایان دەکرد و دەیانگوت ئەوەتا خاڵت و چەند کەسێکی ترمان لێ شەهید کراوە، پێویستە تۆش ئاگاداری خۆت بیت، خۆ ئەگەر ڕژێم بزانێت تۆ ئەو نامە و نووسراو و بڵاوکراوانە دەبەیت بۆ سلێمانی، ئەوا دەستگیر دەکرێیت و دەتخەنە زیندان، ڕەنگە لەسەر ئەو کارانەت لە سێدارەت بدەن. شەمسەی خوشکیشی ئامۆژگاریی دەکرد و دەیگوت ڕێگای شەهیدەکان ون نەکەیت، بەڵام زۆر ئاگاداری خۆتبە. گوندی سێکان بەردەوام ڕەشپۆش بووە. دوای نزیکەی ساڵێک پێشمەرگەیەکی دیکەیان بەناوی خالید حەمە مستەفا، شەهید دەکرێت. هەڵبەتە تەنها هەر گوندی سێکانیان نەبوو کە تەرمی شەهید لە دوای شەهیدیان بۆ دەهاتەوە. بەڵکو هەزاران گوندی کوردستان بەو جۆرە بوون.

تەها دەبوو بەردەوام لە دژی هێزەکانی سەدام لە تێکۆشاندا بێت، دەبوو کاری بکردایە، خەرجی ماڵ و کرێ خانووی دابین بکردایە، شەوانەش لە قوتابخانە درێژەی بە خوێندن بدایە. ئەو هیچ مووچە و داهاتێکی نەبوو جگە لەو ڕۆژانەیەی کە بە کرێکاری پەیدای دەکرد. ئەگەر ڕۆژێک کاری نەکردایە، کاریگەری لەسەر گوزەرانی دادەنا، هاوسەرەکەشی بە پارەی بەرگدروون، پارەیەکی ئەوتۆی دەست نەدەکەوت.

ڕۆژی ١٩٨٤/٤/١٠ بەلای تەها و زوبێدەوە ڕۆژێکی خۆش بوو، لەو ڕۆژەدا یەکەم منداڵیان هاتە دونیاوە، کوڕە نۆبەرە کەیان ناونا "ڕەوکان"، ئیتر تەها و زوبێدە بوون بە خاوەنی منداڵ، لێپرسراوێتییەکی دیکەش کەوتە ئەستۆیان. تەها و زوبێدە هەمیشە لەلایەن کەسوکاریانەوە ئامۆژگاریی دەکران کە نەچنە نێو خۆپیشاندانەکانەوە، بەڵام ئەوان لەسەر کار و چالاکییەکانیان بەردەوام بوون. چونکە، ئەوانیش وەک هەزاران کوردی دیکە تینووی ئازادی بوون. حاجی عەبدوڵڵا بۆخۆی زۆر خزمەتی پێشمەرگەی دەکرد، بەڵام هەمیشە دەیگوت ڕژێمی سەدام زۆر بەهێزە، بە گوللەی چەند کلاشینکۆفێک ناڕوخێت.

## شەهید زوهێر

١٩٨٥/٢/٧ڕۆژێکی سەخت و ناخۆش بوو، ئەو ڕۆژە خاڵە سەعدون و هاوسەرەکەی زۆر نیگەران بوون، زوبێدە بەسەری خۆیدا دەکێشا و هاواری دەکرد براکەم، برا جوانەکەم شەهید بوو، تەها دەیتوانی چی بکات و چی لەدەست دەهات؟ کەسێکی نزیک و خۆشەویستی خۆی لەدەستدا بوو، تەها نەیدەزانی دڵی کێ بداتەوە، دڵی خۆی بداتەوە یان دڵی هاوسەرەکەی، دڵی خاڵ و پووری بداتەوە یا خاڵۆزاکانی دیکەی. هەموو خزم و کەسوکار، خەم و ماتەم دایگرتبوون. لەو ڕۆژەدا حکوومەت هێرشێکی گەورەی کردبووە سەر گوندی گۆپتەپە و شەڕێکی قارەمانانە ڕوویدابوو، سێ پێشمەرگە شەهید ببوون، بەناوەکانی زوهێر سەعدون، حاکم کەمال و ئیراهیم. نزیکەی چل چەکداری ڕژێمی بەعس یش لەو شەڕەدا کوژران.

## تەها دەستگیر دەکرێت

تەنها دوو مانگ بەسەر شەهیدبوونی زوهێردا تێپەڕی بوو، زوبێدە ڕەشپۆش بوو. ژنانی بنەماڵە هێشتا لە ماتەمینی زوهێردا بوون. ڕەوکان تەنها شەش ڕۆژی مابوو تەمەنی ببێتە ساڵێک. تەها ڕۆژی پێنجشەممە ١٩٨٥/٤/٤، کارتۆنێکی گەورە کاغەزی سپی، ستێنسڵ و مەرەکەبی برد بۆ چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ لە بەرگەڵوو. بڕیار بوو، دوای دوو ڕۆژ، واتا ١٩٨٥/٤/٦ سەردانی چاپخانەکە بکاتەوە، هەندێک نامیلکە و گۆڤار و بڵاوکراوەیان لێ وەربگرێت و لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە بۆ سلێمانی. دوای چاپخانە، ڕاستەوخۆ چوو بۆ سێکانیان. دوو شەو، لە ماڵی باوکی مایەوە. باوکی زۆر ئامۆژگاریی کرد. باوکی گوتی: چەند ڕۆژێکی دیکە ساڵڕۆژی لەدایکبوونی کوڕەکەتە. لە خەمی ژن و کوڕەکەتدا بە. دایک و باوکی گوتیان ئێمە هێشتا لە پرسەی زوهێرداین. تۆ دەتەوێ چی بکەی؟ ئاگاداربە. حاجی عەبدوڵڵا گوتی سەدام، مرۆڤ نییە، مرۆڤکوژە. کەسانێک بزانن تۆ هاتوچۆی سەرگەڵوو دەکەیت، زیندانی دەکرێیت و ئەشکەنجە دەدرێیت. دوور نییە بشتکوژن. لە کاتی ماڵاواییدا، دایکی نیگەرانی تەها بوو، کوڕەکەی ماچ کرد. شەمسە، خوشکی تەها زیاتر لە جاران دڵتەنگی تەها بوو.

شەمسە خاوەنی چوار منداڵ بوو. تەها ماڵاوایی کرد و ماڵی باوکی بەجێهێشت، شەمسە بە حەسرەتەوە بۆ براکەی دەڕوانی. زراری هاوسەری پێشمەرگەیەکی چالاک بوو، زرار برای شەهید زوهێر بوو، کوڕی خاڵ و ژنبرا و مێردی خوشکی تەها بوو. خۆی پێشمەرگە بوو، ژن و منداڵەکانیشی لە سێکانیان جێهێشتبوو.

تەها، دوو شەو لە سێکانیان مایەوە، لەکاتی دیاریکراودا گەیشتەوە چاپخانە و کۆمەڵێک گۆڤار و بڵاوکراوەی خستە نێو کارتۆنێک و پێنج نامەی بچووک و پێچراوەشی لە نووسەرانی پێشمەرگە وەرگرت، دوو نامەی لە شێرکۆ بێکەس وەرگرت بۆ هەردوو چیرۆکنووس ڕەئوف بێگەرد و مستەفا ساڵح کەریم، سێ نامەشی لە حەمەکەریم عارف، ئەحمەد عارف و دڵشاد ئەحمەد وەرگرت، بەمەبەستی گەیاندنیان بۆ نێو شار. تەها چەندین جار ئەو کارەی کردبوو. لە سەرگەڵووەوە بە تراکتۆرێک خۆی گەیاندە گوندی قزلەر، لە قزلەریش ماشێنێک بەنیاز بوو بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. تەها کارتۆنەکەی خستە نێو ماشێنەکەوە، بەڵام بە شۆفێرەکەی نەگوت ئەو کارتۆنە چی تێدایە، لەو کاتەدا شۆفێرەکەش نەیدەزانی کارتۆنەکە هی کێیە و چی تێدایە. ژنێک کە منداڵێکی بە باوەشەوە بوو، ئەویش سواری ماشێنەکە بوو. نێو ماشێنەکە هەندێک فەردە مێووژی تێدابوو، تەها کارتۆنەکەی خستە ژێر فەردە مێووژەکانەوە، شۆفێرەکە لە ڕێگا نەفەری دادەبەزاند و نەفەری دیکەشی سوار دەکرد. بەرلەوەی بگەنە نێو شاری سلێمانی، سەربازگەیەک هەبوو پێیان دەگوت "سەربازگەی سارداو". نزیک دەروازەی "پارکی هەواری شار" ی ئێستا، لە شوێنی فلکە گەورەکە بوو. لەوێ ماشێنەکەیان ڕاگرت، بازگەکە لە شۆفێرەکەیان پرسی بەزوویی پێمان بڵێ، لەنێو ماشێنەکەتدا چی قاچاخی تێدایە؟! شۆفێرەکە، کە ناوی کەریم قزلەری بوو، گوتی: هیچ شتێکی قاچاخم بار نەکردووە، تەنها چەند فەردە مێووژم بارکردووە کە ئەویش قاچاخ نییە. سەربازەکان هەموو سەرنشینەکانیان دابەزاند و بەوردی نێو ماشێنەکەیان پشکنی. سەماوەرێکی ئێرانی‌یان دۆزییەوە. سەربازەکان گوتیان: ئەم سەماوەرە ئێرانییە و قاچاخە تۆ چۆن دەڵێیت شتی قاچاخم پێ‌نییە؟ دەی خێرا، فەردە مێووژەکانیش دابگرن. هەر کە فەردە مێووژەکانیان داگرت و کارتۆنەکەی تەها دەرکەوت. لە شۆفێرەکەیان پرسی ئەم کارتۆنە هی کێیە؟ گوتی: نازانم! لە

سەرنشینەکانیان پرسی ئەم کارتۆنە هی کێیە؟ هەموو گوتیان نازانین! هەڵبەت هەندێک لە سەرنشینەکان دەیانزانی کارتۆنەکە هی تەهایە، ئەوان لە سەرگەڵووەوە لەگەڵ تەها پێکەوە هاتبوون، پێشتر کارتۆنەکەیان بەدەستی تەهاوە بینی بوو، بەڵام هەموو گوتیان نازانین. شۆفێرەکە گوتی چەند کەسێک لە ڕێگا دابەزین، ڕەنگە هی ئەوان بووبێت. تەها، زۆر بەنهێنی، سێ نامەی لە پێنج نامەکەی گیرفانی، دا بەو ژنەی کە لەگەڵیاندابوو، ناوی فاتیمەی حاجی جوانە بوو، خەڵکی سەرگەڵوو بوو. دوو نامەش لەلای خۆی مایەوە. سەربازەکان کارتۆنەکەیان هەڵپچڕی نامیلکە و بڵاوکراوەکان دەرکەوتن. ئەم جارە بە هاوارێکی بەرز و بەجوێندانەوە گوتیان: ئەم کارتۆنە هی کێیە؟ شۆفێرەکە گوتی: لە ڕێگا دوو کەس دابەزین، لەوانەیە هی ئەوان بووبێت. داوای ناسنامەیان لە تەواوی سەرنشینەکان کرد، ناسنامەی تەهاشیان وەرگرت. تەها ناسنامەی خوێندنگەی پێدان، سەربازەکان عەرەب بوون نەیاندەتوانی کوردی بخوێننەوە، بە تەهایان گوت تۆ خوێندەواریت، وەرە ئەم بڵاوکراوانەمان بۆ بخوێنەوە. تەها سەیرێکی کردن و گوتی: ئەمانە هی پێشمەرگەی حیزبە ئێرانییەکانن، دژی ڕژێمی ئێران نووسراون. سەربازەکان گوتیان: هەمووتان بڕۆن بۆ ژێر ئەو خێمەیە، هەموو ڕۆشتن بۆ ژێر خێمەکە. هاوکات بە بێتەل داوای ماشێنیان لە ئیستیخباراتی سەربازیی سلێمانی کرد. فاتیمەی حاجی جوانە بە سەربازێکی گوت: منداڵەکەم خۆی تەڕ کردووە، دەمەوێت پاکی بکەمەوە. ئەویان لە خێمەکە کردە دەرەوە. کاتێک گەڕایەوە بەهێواشی بە تەهای گوت: نامەکانم خستە ژێر قوڕەوە. تەها لەبەر خۆیەوە گوتی: خۆزگە ئەوسا هەموو نامەکانم بدایە بە فاتیمە. دوای سی خولەک، سێ ماشێن هاتن. هەر لەوێ ژنەکانیان ئازاد کرد و پیاوەکانیشیان سواری ماشێنی ئیستیخبارات کرد. تەها دوو نامە لە گیرفانەکانیدا مابوو. لەنێو ماشێنەکەدا هێواش هێواش دەستی کرد بە خواردنی نامەکان، هەڵبەت ئەو نامانە لە کتێب و گۆڤارەکان مەترسیدارتر بوون. خۆ، ئەگەر نامەکان بەردەستی ئیستیخبارات بکەوتنایە، دۆخەکە زۆر خراپتر دەبوو، ئەو کات داوای ئەو کەسانەشیان دەکرد کە نامەکانیان بۆ نووسراوە. ئەگەرچی نووسەری نامە و وەرگری نامە بە ناوی خودازراوەوە بوو.

سەرجەم، هەشت کەس مابوونەوە، بردیانن بەرەو ئیستیخباراتی سەربازی، کە دەکەوتە تەنیشت کارگەی جگەرەی سلێمانی. لەنێو ئەو هەشت کەسەدا مەلا عومەر، مەلای گوندی قزلەر و کوڕێکی دوازدە تەمەن ساڵی مەلاکەشی تێدا بوو. لە ئیستیخبارات، هەر هەشتیان لە یەکدی جیاکردنەوە، هەریەکەو کرانە ژوورێکەوە و دەرگایان لەسەر داخستن. کاتژمێر دوانزەی شەو تەهایان بانگ کرد، بە پشتێنەکەی خۆی چاویان بەستەوە و بردیان بۆ ژووری لێکۆڵینەوە. تەها وا هەستی کرد لە ژوورەکـەدا، کامێرای شـاراوە هەیە. هەڵبەت ئەو سەردەمە کامێرای بچووک و پێشکەوتووی وەک ئێستا نەبوو. ئەفسەری لێکۆڵەر لە تەهای پرسی، ئایا تۆ دەزانیت ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە هی کێیە؟ تەها گوتی: نەخێر نازانم. ئەفسەرەکە گوتی: تۆ، بۆچی چوویت بۆ قزلەر؟ تەها گوتی: من خەڵکی گوندی سێکانیانم، دایک و باوکم لەوێ دەژین، باوکم نەخۆشە و چووم بۆ سەردانی باوکم. ئەفسەرەکە گوتی: بۆچی نەچوویت بۆ سەربازی. تەها گوتی: من خوێندکاری شەشەمی ئامادەییم، ناسنامەی خوێندنگەم لە لای ئێوەیە، ئەفسەرەکە دوبارە گوتی: پێم بڵێ ئەو گۆڤار و بڵاوکراوانە هی کێن؟ تەها گوتی من نازانم. تەها نەیدەزانی سەرنشینەکانی دیکەی ماشێنەکە لەکاتی لێکۆڵینەوەدا چیان گوتووە. ئەفسەرەکە گوتی: شۆفێر و سەرنشینەکانی دیکە دەڵێن ئەو بڵاوکراوانە هی تۆن. تەها، زانی کە ئەفسەرەکە درۆ دەکات و سەرنشینەکان قسەی وایان نەکردووە. ئەفسەرەکە وەک تەواوی ئەفسەرانی ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان، دەیویست خۆی فش بکاتەوە. دواتر تەهایان بردەوە ژوورەکەی خۆی. تەها ماوەی یازدە ڕۆژ بەتەنیا لەو ژوورەدا بوو، لە ماوەی ئەو یازدە ڕۆژەدا تەنها دوو جاری دیکە بانگکرا بۆ لێکۆڵینەوە، ڕۆژانە سێ ژەمە کەمێک خواردنیان پێ دەدا، لەو ماوەیەدا نە هەوایەکی پاکی هەڵمژی نە گەرماوێک هەبوو بۆ خۆشۆرین، نە گۆڕینی جلوبەرگ. دوای دوازدە ڕۆژ هەر هەشت کەسەکەیان لە ژوورێکدا کۆکردەوە، ئەو ژوورە چەند زیندانییەکی دیکەشی تێدابوو. چەند ڕۆژێک هەموویان پێکەوە لەو ژووردا مانەوە. ژوورەکە تەنها جێگای هەشت کەس دەبوو، بەڵام شازدە کەسی تێدا بوو. لە ئیستیخبارات، تەها و هیچ یەک لە سەرنشینەکان لێیان نەدرابوو، تەنها شۆفێرەکە لێدانی خواردبوو. دواتر هەموویان چاویان بەسترا و دوو دوو پێکەوە کەلەپچە

کران. هەموویان بە چاوی بەستراو و دەستی کەلەپچەکراوەوە سواری ماشێن کران، ماشێنەکە چارەکە کاتژمێرێک ڕۆیشت و لە شوێنێکدا وەستا، دایانبەزاندن بەچاوی بەستراوەوە بە چەند پلیکانەیەکدا سەریانخستن، هەریەکەیان بە جیا، کرانە ژوورێکی بچکۆلەوە. تەهاش کرایە ژوورێکەوە، ژوورەکان ئەوەندە بچووک بوون، جێگە نەبوو کەسەکە تێیدا ڕابکشێت، زیندانییەکە کاتی خەویش نەیدەتوانی قاچی درێژ بکات. تەها ماوەی چوار ڕۆژ لەو ژوورە بچووکەدا مایەوە، ڕۆژی یەکەم بانگیان کرد، چاویان بەستەوە و بردیان بۆ لێکۆڵینەوە. ئەفسەری لێکۆڵەر دەیگوت ئەو کارتونە کتێبە هی کێیە؟ تەهاش دەیگوت من نازانم هی کێیە. زوو زوو بانگ دەکرا بۆ لێکۆڵینەوە، هەموو جارێ نکۆڵی لەوە دەکرد ئەو کارتۆنە هی ئەو بێت. دوای چەند ڕۆژێک دیسان بانگ کرایەوە، ئەم جارە بەکێبڵی کارەبا زۆریان لێدا. ئەو ئەفسەرەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرد، ئەفسەرەکەی پێشوو نەبوو، ئەم ئەفسەرە زۆر بێبەزەیی و ستەمکار بوو، ستەمکارێکی پەروەردەی بەعسی خوێنخۆر و دڵسۆزێکی سەرسەختی سەدام. ئەم ستەمکارە دڕندەیە بەردەوام بە کێبڵ لە تەهای دەدا و دەیگوت ئەو کارتونە هی کێیە؟ ئەو کتێب و گۆڤارانە هی کێن؟ جەللادی ئەشکەنجەدەر تەواو ماندوو ببوو، کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دابوو، ئیتر نەیدەپرسی ئەو کارتونە کتێبە هی کێیە، بەردەوام لێی دەدا و جوێنی دەدا. لەدوای لێدانێکی زۆر تەهایان بردە ژوورێکی گەورە کە هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵیدا گیرابوون، لەو ژوورە بوون، یەکێک لەو هەشت کەسە پیاوێکی بە تەمەن بوو، یەکی دیکەشیان لاوێک بوو، لاوێکی دوازدە ساڵی خۆڕاگر. ئەو پیرەپیاوە، خەریک بوو دەمرد. دوای چەند ڕۆژێک پیرەپیاوەکە و کوڕە منداڵەکەی ئازاد کران. شەش کەسیان مانەوە. خواردن و ئاو کەم بوو، شوێنی برینی کێبڵەکان خەریک بوو هەوی دەکرد جلوبەرگەکانیان پیس و دڕاو بوون، لەشیان چڵکن و پیس بوو. زیاتر لە مانگێک بوو لە زینداندا بوون. کەریم قزلەری شۆفێری پیکابەکە، زۆری لێدرابوو، تەنگە نەفەس ببوو، بەڵام کەسێکی ئازا و ورە بەرز بوو. تەها لە خۆی دەپرسی ئەو پیاوانە بەهۆی منەوە زیندان کراون و ئەوەندەیان لێ دراوە. ئەوان هەمووشیان دەزانن کە کارتۆنە کتێبەکە هی منە، بەڵام لە لێکۆڵینەوەدا کەسیان باسی ئەویان نەکردووە. تەها دوای سی و پێنج ڕۆژ، بڕیاری دا کە دان بەوەدا بنێت، کارتۆن و

کتێبەکان هی ئەون، لای هاوڕێکانی باسی هیچی نەکرد. بە زوویی پاسەوانی زیندانی ئاگادار کرد و پێی گوت: من دەمەوێت بچمەوە بۆ لای ئەفسەری لێکۆڵەر، هەندێک ڕاستی هەیە، دەمەوێت باسی بکەم. چاوی تەهایان توند بەست و بردیان بۆ ژووری لێکۆڵینەوە. تەها بە ئەفسەری لێکۆڵەر گوت: ئەو کارتۆنە و هەموو کتێب و گۆڤارەکان هی منن. ئەفسەر گوتی: ئەو کەسانەی لەگەڵتدا بوون دەیانزانی هی تۆن؟ تەها گوتی: هیچ کەسێک نەیدەزانی، من، بێ ئاگاداری شۆفێرەکە کارتۆنەکەم خستە ژێر فەردە مێووژەکانەوە، ئەفسەرەکە بانگی کەسێکی کرد ئەو کەسە دەستی تەهای گرت و بردی بۆ ژوورێکی تر، دوبارە دەستیان کردەوە بە لێدان و ئەشکەنجەدانی. دەیانگوت بەڕاست پێمان بڵێ، شۆفێر و سەرنشینەکانی دیکە دەیانزانی کە ئەو کارتۆنە هی تۆیە؟ تەها دەیگوت نەخێر هیچ کەسێک نەیدەزانی. دواتر بردیانەوە بۆ ژووری زیندان. پاش چەند کاتژمێرێک دوبارە بردیانەوە بۆ ژووری لێکۆڵینەوە، ئەفسەرەکە لێی پرسیی بۆچی زووتر نەتگوت کە کارتۆنەکە هی تۆیە؟ تەها گوتی: چونکە زۆر ترسام، لەوە ترسام ئێوە لێم بدەن و بمکوژن، ئێستاش بەهۆی ئەوەی کە زۆرتان لێ داوم، ئازارێکی زۆرم هەیە. لە ترسی ئەو لێدان و ئەشکەنجەیە دوبارە پێتان دەڵێم کارتۆنەکە و تەواوی کتێب و گۆڤارەکان هی منن. تەهایان برد بۆ ژوورێکی بچووکی تاکە کەسی، دوای چەند ڕۆژێک تەها زانی کە ئەو کەسانەی لەگەڵیدا گیرابوون، هەموویان ئازاد کراون. دیسان تەهایان بردەوە بۆ لێکۆڵینەوە ئەفسەر گوتی: ئێمە دەزانین تۆ ئەو کتێب و ڕۆژنامانەت لە سەرگەڵوو وەرگرتووە، ئێستا تۆ پێمان بڵێ لە سلێمانی ئەوانەت دەدا بە کێ؟ ناوی ئەوانمان پێ بڵێ کە بەنیاز بووی ئەو کتێب و گۆڤارانەیان بدەیتێ. تەها گوتی: من ئەو چاپکراوانەم تەنها بۆ فرۆشتن هێناوە، من هەژارم، خێزاندارم و کرێچیم. شەوانەش لە قوتابخانە دەخوێنم. ئەفسەر گوتی: بە کێیان دەفرۆشیت؟ تەها گوتی: خۆشم نازانم بە کێی دەفرۆشم لەنێو بازاڕ دایاندەنێم هەر کەسێک بێت و داوای بکات پێی دەفرۆشم. ئەفسەرەکە گوتی ئەگەر منیش بهاتمایە و بمگوتایە ئەو کتێبەم پێ بفرۆشە، پێتدەفرۆشتم؟ تەها گوتی بەڵێ من ئەوانەم بۆ فرۆشتن هێناوە، هەر کەسێک بێت پێی دەفرۆشم، هەر بۆئەوەش کڕیومە تا بیفرۆشم و قازانجێکم دەستبکەوێت. نەشم زانیوە ئەوانە یاساخن، من خۆم ئەوانەم

نەخوێندووەتەوە نازانم چیان تێدا نووسراوە. کاتێک سەربازەکانی ئێوە ئێمەیان گرت ئەوکات زانیم ئەم کتێب و گۆڤارانە یاساخن. ئەفسەرەکە دوبارە بەهێواشی گوتی: ئەگەر منیش بهاتمایە پێت دەفرۆشتم؟ تەها گوتی: ئەگەر باوکی تۆش بهاتایە و بیگوتایە من گۆڤار دەکڕم من پێم دەفرۆشت. ئەفسەر هەروەک سپرینگێک لەجێگای خۆی بەرزبووەوە و بەجۆرێک هاواری کرد، پەنجەرەی ژوورەکەی لەراندەوە و بەهەموو هێزی خۆی زللەیەکی لە بناگوێی تەها دا، تەها کەوتە سەرزەوی و هەر لەوێ چەند کەسێک بەشەق و پێلەقە و کێبڵ کەوتنە وێزەی تەها، هێندەیان لێدا، لەتاو ئازار ڕشایەوە، دواتر بوورایەوە. ئێستاش دوای ٣٦ ساڵ تەها گوێی چەپی بەردەوام هاژە هاژی لێ دێت و بیستنی باش نییە.

ئەفسەری لێکۆڵەر، بەڕواڵەت کەسێکی هێمن دیار بوو، بەڵام لە ناخدا گورگێکی دڕندە بوو، بە تەواوی واتا ئاژەڵێکی دڕندە بوو. تەها، گێژ ببوو لەسەر زەوی کەوتبوو، ئەفسەرەکە هەڵسا و بەشەق و لەقە کەوتە تێهەڵدانی، ئەو دڕندەیە ئەوەندە بەهێز زللەکەی لە تەها دابوو، کە تەها لەتاو ئازار هەموو لێدان و ئەشکەنجەکانی پێشووتری لەبیرچووەوە. ئەفسەرەکە بە کەسێکی گوت، تەزووی کارەبا لە تەها لێبدەن.

چەند جارێک کارەبایان لەسەر سنگی دا، هەموو جەستەی کەوتە لەرزین، ددانەکانی لە یەکی دەدا و موچڕک بە گیانیدا دەهات، بەرگەگرتنی تەزووی کارەبا زۆر دژوار بوو، چەند جارێکیش تەزوویان لە قوڵ و ڕوخساری دا. ڕەنگە تەنها کوڕێکی پەروەردەی شاخ و کوێستان؛ بەرگەی ئەو جۆرە ئەشکەنجەیە بگرێت و نەمرێت. لەکاتی کارەبا لێداندا، تەنها ئەشکەنجەیان دەدا و هیچ پرسیارێکیان لێ نەدەکرد.

دوای کارەبا لێدان، دوبارە بە کێبڵ هەموو جەستەیان شین کردەوە. جەللادەکان هیچ پرسیاریان نەدەکرد، تەنها لێیان دەدا. ئایا ئەو جۆرە کەسانە مرۆڤن؟ یان هەر بەو جۆرە پەروەردە کراون و لە خەسڵەتی مرۆڤبوون دەرچوون! ئایدیۆلۆژیا و تەکنۆلۆژیا و پارە و هەڵپە و خۆبەزلزانین، دەتوانن مرۆڤەکان بگۆڕن بە دڕندەترین مرۆئاژەڵ. من نازانم و تێناگەم ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان؛ منداڵ و نەوەکانی ئەم جۆرە

کەسانە لە کاری باوک، یاخود باوەگەورە جەللادەکانیان، ئاگاداربن چییان پێدەڵێن؟

ئەوەندە تەهایان ئەشکەنجە دا، تاکو لەهۆشخۆی چوو، ئاگای لەهیچ نەما و لە هیچ تێنەدەگەیشت، لەسەر زەوی کەوتبوو، کاتێک بە ئاگا هاتەوە لە ژوورێکدا ڕاکشابوو، نەیدەزانی کات شەوە یان ڕۆژە! ژوورێکی بچووک بوو، بەڵام نزیکەی دە زیندانیی تێدابوو، دوو زیندانیی بەڕێز و میهرەبان دەست و قاچیان بۆ دەشێلا و باوەشێنیان دەکرد. مامۆستا جەمال عەبدول و دکتۆر نەوزاد ساڵح ڕەفعەت لەوێ بوون. دکتۆر نەوزاد بە تەهای گوت: تۆ شەو و ڕۆژێکە بێئاگایت و هۆشت نییە. ئەوان هیچ خۆراکێکیان لانەبوو تا بیدەن بە تەها، تەنها ئاویان پێدا. دکتۆر نەوزاد گوتی: هێواش هێواش ئاو بخۆرەوە. تەها، هەموو جلوبەرگەکانی خوێناوی ببوون. جلەکانیان لەبەر داکەند و کراسە کۆنێکیان بۆ لەبەرکرد، هیچ کارمەندێکی ئاسایش نەیپرسی؟ کە ئایا ئەم کەسە مردووە یان زیندووە. تەها ماوەی دوو مانگ لەو ژوورەدا مایەوە.

هاوین بوو، کەشوهەوا زۆر گەرم بوو، هیچ ئامێرێکی فێنککەرەوە لە ژوورەکەدا نەبوو، تەها، جلوبەرگی زۆر پیس و چڵکن بوون، بۆنێکی ناخۆشیان لێ دەهات، چەند مانگ بوو، خۆی نەشۆردبوو، لەشی ئەسپێ لێی دابوو. ڕشک و ئەسپێی بە هەموو جەستەیدا بڵاو ببوونەوە، ئەوەش بۆخۆی جۆرێکی دیکەی ئەشکەنجە بوو. هەڵبەت هەموو ئەو زیندانییانەی لەو ژوورەدا بوون لە هەمان ئەو دۆخەدا بوون. ئاخۆ تەها زۆری لێدرا بوو؛ یاخود خۆی وای هەست دەکرد کە زۆرترین ئەشکەنجە دراوە.

دوای دوو مانگ، سەرلەنوێ تەهایان بردەوە بۆ ئەشکەنجەدان. ئەم جارە لە حەوشەی دەرەوە و لە بەر تیشکی خۆری مانگی تەموزدا، ڕووبەڕووی دیوارێک بەچیچکانەوە دایاننیشاند. سەربازێک لە پشتییەوە دەهات و دەچوو، هەر کە دەگەیشتە ئاستی تەها، شەقێکی توندی لە لاکەلەکەی هەڵدەدا، ئەگەر دەستی لەسەر زەوی دابنایە، پێی بە دەستیدا دەنا. لەتاو ئازار، نەیدەتوانی دەستی لە زەوی دابنێت، هەستی دەکرد پشتی شکاوە. تیشکی گەرماش ئەوەندەی دیکە شپرزەی کردبوو، لە تینوێتی و شەکەتیدا گەرووی نووسا بوو، نزیکەی چوار کاتژمێر لەو دۆخەدا خۆی ڕاگرت. دواتر هێزی نەما، کەوتە سەرزەوی و چەند شەق و پێلەقەیەکی دیکەیان لێدا.

تەها، وێڕای ئەو بارە ناهەموارەی کە تێی کەوتبوو، هێشتا لە بیری زوبێدەی

هاوسەری و ڕەوکاندا بوو، لە یادی خزم و دۆستە شەهیدەکانیدا بوو، لە یادی شەهیدان جەمال، ئەبوبەکر، خالید، دڵشادی حاجی بەنگینە، خاڵە سەلام، زوهێر و عەلی حوسێندا بوو، یادی هەموو ئەو پێشمەرگانەی دەکردەوە کە هاوڕێی بوون و دەیناسین و شەهید کرابوون.

تەها لە یەکەم ساتی دەستگیرکردنیدا لەبیری ئەوەدا بوو، کە ئەگەر پیاوانی ڕژێم بچن ماڵەکەی بپشکنن، چی ڕوودەدات. چونکە لەماڵەوەش، کۆمەڵێک نامیلکە و بڵاوکراوەی یاساغی هەبوو، بەدڵنیاییەوە زوبێدەشیان دەگرت. بەڵام زوبێدە، کاتێک هەواڵی دەستگیرکردنی تەهای زانیبوو هەموو ئەو نامیلکانەی سوتاندبوون. تەنها کتێبەکانی قوتابخانەی هێشتبوونەوە و نەیسوتاندبوون، چونکە ئەو کاتە تەها خوێندکاری شەشەمی ئامادەیی بوو.

زوبێدە بە خۆی و بە منداڵێکی بچووکەوە بێ پارەوپول مابووەوە، دایک و باوکی لە کەرکووک بوون، دایک و باوکی تەهاش لە سێکانیان بوون، جاروبار ژنانی گەڕەک جلوبەرگیان بۆ دەبرد تاکو بۆیان بدوورێت. زوبێدە دواتر ماڵەکەی پێچایەوە و چووەوە بۆ گوندی سێکانیان. چەند جارێک لە لێکۆڵینەوەدا بەتەهایان دەگوت ئەگەر پێمان نەڵێیت ئەم بڵاوکراوانە دەدەیتە کێ، ئەوا دەچین ژن و منداڵەکەت دەهێنین هەر لێرە لەبەر چاوی خۆت منداڵەکەت دەکوژین و هاوسەرەکەشت ئەشکەنجە دەدەین.

ئەو ڕۆژەی کە چوار کاتژمێر تەهایان لەبەر هەتاوی مانگی تەموز، بە چیچکانەوە هێشتەوە و ئەو هەموو شەقەیان تێهەڵدا. ئەوەندە ئازاری هەبوو وا هەستی دەکرد هەموو ئێسقانی پشت و دەستی شکاوە، ئەو جەللادە هێندە پێلەقەی لە پشتی دابوو، خۆیشی ماندوو ببوو، هاواری بەسەر تەهادا کرد و گوتی: ئەگەر ناوی دوو کەس لەوانە نەڵێیت کە ئەم کتێبانەیان پێدەدەیت، هەر ئێستا دەڕۆین ژن و کوڕەکەت دەهێنین و لەبەرچاوی خۆت کوڕەکەت سەردەبڕین، هەرچیەکیشمان لەدەست بێت بەرامبەر بە ژنەکەت دەیکەین. ئەوەندەیان لە تەها دا ئەم جارەش تەها بێهۆش کەوت، خۆی نەیدەزانی ماوەی چەند کاتژمێرە بێهۆش کەوتووە، کاتێک هۆش خۆی هاتەوە، لە ژوورێکی تاریکدا بوو، جگە لەو هیچ کەسی دیکەی لێ نەبوو. هەموو جەستەی ئازاری هەبوو، جەستەی بریندار بوو، زۆر زۆر برسی و تینووی بوو، ماوەی سێ

ڕۆژ، ڕۆژانە کەمێک خواردن و ئاویان پێدەدا. ژوورەکە بۆگەن و پیس بوو. دوای چەند ڕۆژێک کەسێک هات و دەرگای لێکردەوە و بردیە ئەو ژوورەی کە چەند زیندانییەکی دیکەی تێدا بوو. هاورێکانی بە بینینی تەها خۆشحاڵ بوون، چونکە ئەوان وایان زانیبوو بردویانە گوللەبارانی بکەن. دوای دوو هەفتە دیسان بردیانەوە بۆ لێکۆڵینەوە، لە دوای چەندین پرسیار و لێدانێکی زۆر، ئەفسەرەکە پێی گوت: دوو ڕۆژ مۆڵەتت پێدەدەم، تەنها ناوی دوو کەسمان پێ بڵێ کە تۆ ئەو گۆڤار و نامیلکانەیان پێدەدەیت، خۆ ئەگەر پێمان نەڵێیت ئەوا بە دڵنیاییەوە ژن و کوڕەکەت دەهێنینە ئێرە، ئێمە باش دەزانین ئەم گۆڤار و نامیلکانە بۆ فرۆشتن نین، ئەمانە هی لایەنگرانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانن، تۆ تەنها ناوی دوو کەسمان بدەرێ. تەها گوتی: من ئەم گۆڤار و کتێبانەم بۆ فرۆشتن هێناوە، هیچ کەسێکی تایبەت ناناسم کە بیاندەمێ.

چاوی تەهایان بەست و بردیان بۆشوێنێکی تر، لەوێ چاویان کردەوە و بردیانە لای دادوەرێک. دادوەرەکە کورد بوو، ئەوانی پێشتر لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردبوو، ئەشکەنجەیان دابوو هەموو عەرەب بوون. دادوەرە کوردەکە چەند پرسیارێکی لە تەها کرد، تەها هەستی کرد، ئەم دادوەرە کەسێکی باشە، دادوەری دادگای سلێمانی بوو، پێدەچوو سەر بە ئەمن و ئیستیخبارات نەبێت، دادوەر لە تەهای پرسی ئەم کتێب و گۆڤارانەت بۆ کێ دەبرد؟ تەها گوتی: من ئەوانەم بۆ فرۆشتن هێناوە. دادوەر بە زمانی کوردی بەهێواشی گوتی: باشە.. ئافەرین. دادوەر دەبوو ئەو وەڵامانەی لە تەهای وەردەگرێت، بە عەرەبی بینووسێت و بینێرێت بۆ دادگای شۆڕش. تەها تا ڕۆژی ١٩٨٥/٨/١٦ لە بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی بوو، دواتر گوێزرایەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەو شوێنەش بەشێک بوو لە بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی و لە گەڕەکی چوارباخ، نزیک پاریگەی سلێمانی بوو، پێیان دەگوت تەوارییەکە. تەها ماوەی بیست ڕۆژ لەو شوێنە مایەوە، لەوێ لێدان و ئەشکەنجە نەبوو، تەها و چەندین کەسی دیکە لە چاوەڕوانی دادگاییکردندا بوون. لەوێش شوێنێک نەبوو بۆ خۆشۆرین. تەها چەند جارێک لە نێو تواڵێتدا، بە بێ سابوون ئاوی دەکرد بەخۆیدا، بەڵام پاک نەدەبووەوە، هەموو جەستەی پڕ بوو لە ئەسپێ. هەموو زیندانییەکانی دیکەش وەک تەها بوون، لەش و جلوبەرگیان پڕ بوو لە ئەسپێ. ڕۆژێک سەرتاشیان هێنا، سەر

و ڕیشی زیندانییەکانیان تاشی. ڕۆژی ١٩٨٥/٩/٦ تەها و نۆ کەسی دیکەیان سواری ماشێن کرد، ڕەوانەی ئەمنی گشتی عێراقیان کردن، لە بەغدا.

زیاتر لە پێنج مانگ بوو، تەها هیچ هەواڵێکی خێزان و کەسوکاری نەدەزانی، زوبێدەش هیچ هەواڵێکی تەهای نەدەزانی و زۆر بەدوایدا وێڵ بو. باوکی هەوڵێکی زۆری دابوو بۆ دۆزینەوەی، بەڵام بێ سوود بوو، سەردانی هەر شوێنێکی کردبوو کەس وەڵامی نەدابووەوە. حاجی عەبدوڵڵا و شەمسە چەند جارێک چووبوون بۆ سلێمانی زۆر بەدوایدا گەڕابوون و سەردانی زۆر شوێنیان کردبوو، بەڵام هیچ هەواڵێکیان دەست نەکەوتبوو. زوبێدە بەدەم کاری بەرگدروونەوە فرمێسکی دەڕشت، ڕەوکان گەورەتر ببوو، مام سەعدونی باوکی زوبێدەش چەند جارێک لە کەرکووکەوە چوو بۆ سلێمانی، "سەوزە" ی دایکی زوبێدەش چەندین جار چووە سلێمانی بۆ سەردانی زوبێدە، ئەویش هەموو جارێک بە کۆڵێک خەم و مەینەتەوە دەگەڕایەوە بۆ کەرکووک.

تەها لەگەڵ هەشت زیندانی دیکەدا لە سلێمانییەوە بەرەو بەغدا بەڕێکران، هیچ کەسێک ئاگادار نەبوو کە ئەویان بەرەو بەغدا بەڕێکردووە. بردیانن بۆ بەڕێوبەرایەتی ئەمنی گشتی بەغدا. لە ئەمنی گشتی، تەها و دوو زیندانی دیکەیان بردنە ژوورێکەوە، لەو ژوورەدا سێ زیندانی دیکەی هەبوون، هەرسێکیان عەرەب بوون. دووانیان سەر بە حزبی کۆمۆنیستی عێراقی بوون، ئەوی دیکەشیان شیعە بوو، سەربە حزبی دەعوەی ئیسلامی بوو. بەیانیی ڕۆژی دواتر، بانگی تەهایان کرد، کەلەپچەیان کردە دەستی و سواری ماشێنیان کرد، لەنێو ماشێنەکەدا دوو کەسی دیکەشی لێ بوو، ئەوانیش پێکەوە کەلەپچە کرابوون و بێدەنگ لە ماشێنەکەدا دانیشتبوون. تەها بە زمانی کوردی لێی پرسین گوتن ئێوە کوردن؟ هیچ وەڵامیان نەدایەوە. هەمان پرسیاری بە زمانی عەرەبی لێی کردن، دیسانەوە وەڵامیان نەدایەوە. هەرسێکیان بردن بۆ دادگای شۆڕشی عێراق. لە هۆڵی دادگا زیاتر لە بیست و پێنج زیندانی دیکە هەبوون، ئەوانیش هێنرابوون بۆ دادگایی کردن. زیندانییەکان کەلەپچە کرابوون، یەک یەک ناوی زیندانیان دەخوێندرایەوە و لە هۆڵەکەوە دەبرانە ژوورێکی دیکە بۆ دادگاییکردن. دوای کاتژمێرێک، ناوی تەهاش خوێندرایەوە. بە کەلەپچەکراوی

بردیانە ژوورەوە. لە ژوورەکەدا قەفەزێکی ئاسنین هەبوو، کردیانە ناو قەفەزەکەوە لە بەرامبەریدا سێ دادوەر لە ڕیزێک دانیشتبوون. هەر لەو ژوورەدا دوو کەسی دیکە، یەکێکیان پارێزەر و ئەوی دیکەشیان داواکاری گشتی بوو. یەکێک لەو دوو کەسە، هەستایە سەر پێ، ئەو وتانەی تەها لای دادوەرە کوردەکەی سلێمانی گوتبووی، هەمووی بە عەرەبی خوێندەوە. دادوەری ناوەڕاست، کە ناوی "عەواد بەندەر" بوو، سەرۆکی دادگای شۆڕشی عێراق بوو، ڕووی کردە تەها و گوتی: تۆ تاوانباریت یان نا؟ تەها گوتی: من تاوانبار نیم و هیچ تاوانێکم ئەنجام نەداوە. دادوەر گوتی: چۆن تاوانبار نیت، لە کاتێکدا یەک کارتۆن کتێب و بڵاوکراوەی یاساخ و قەدەغەکراوت هێناوە بەرەو سلێمانی؟ تەها گوتی: من نەمزانیوە ئەو بڵاوکراوانە قەدەغەن. خۆ، ئەگەر بمزانیبایە هەرگیز کاری وام نەدەکرد. ناسنامەکەی تەها کە لەسلێمانی لێی وەرگیرا بوو، لە پێش دەمی دادوەر بوو، دادوەر ناسنامەکەی هەڵگرت و گوتی تۆ خوێندکاری پۆلی شەشەمی زانستییت، نازانیت چی قەدەغەیە و چی قەدەغە نییە؟ تەها گوتی بەدڵنیاییەوە ئەگەر بمزانیبایە قەدەغەیە هەرگیز نەمدەکڕین و نەمدەهێنان بۆ سلێمانی. خۆ من ئەو کتێبانەم نەخوێندۆتەوە تاکو بزانم چیان تێدا نووسراوە. من قوتابیم و کرێچیم و کرێکاری دەکەم کاتی خوێندنەوەی کتێبم نییە، تەنها کتێبەکانی قوتابخانە دەخوێنمەوە. دادوەر گوتی: جگە لە کتێبەکانی قوتابخانە چ کتێبێکی ترت خوێندووەتەوە. تەها گوتی: جاروبار ڕۆژنامەی هاوکاری و ڕۆژنامەی سەورە دەخوێنمەوە. دیارە ئەو کاتە و پێش دەستگیرکردنی، تەها بۆ جاری دووەم کتێبی دایکی دەخوێندەوە کە لە نووسینی ماکسیم گۆرگی و وەرگێڕانی کەریمی حیسامی بوو. تەها چەندین جار بیری لەوە کردبووەوە ئەگەر سەردانی ماڵەکەیان بکردایە و ئەو هەموو کتێب و نووسراوانەیان بەردەست بکەوتایە چی ڕووی دەدا، بەڵام ئەو بەپێی لێکۆڵینەوەکان بۆی دەرکەوتبوو، ئەگەر ئەوان چووبێشتن هیچیان دەست نەکەوتووە.

هەڵبەت کاتێک کە زانرابوو تەها دەستگیرکراوە، زوبێدە بەهاوکاری ساڵح بێچاری هاوڕێی تەها، هەموو نووسراو و بڵاوکراوەکانی ماڵەوەیان، سووتاندبوو. کاتێک کارمەندانی ئەمنی سلێمانی چووبوون بۆ پشکنینی ماڵەکەی تەها، دەبینن ماڵەکە جگە

لە ژنێک، منداڵێک، مەکینەیەکی بەرگدروونی جۆری پەپوولە و چەند کتێبێکی قوتابخانە، هیچی دیکەی تێدا نییە. دادگاییکردنەکەی تەها، تەنها دە خولەکی خایاند. واتا ماوەی دادگاییکردنی هیچ زیندانییەک لە دە خولەک تێنەدەپەڕی. دوای دادگاییکردنی تەواوی زیندانییەکان، دوبارە یەکبەیەک ناویان خوێندرایەوە و زیندانییەکان دەچوونەوە ژووری دادگاییکردنەکە، ناوی تەهاش خوێندرایەوە، سەرلەنوێ بردیانە ژوورەوە و کردیانەوە نێو قەفەزەکە، ئەم جارەیان دادوەرەکان هەڵسابوونە سەرپێ، دادوەری گشتی بڕیاری دادگای خوێندەوە و گوتی: دادگای باڵای شۆڕشی عێراق، بڕیاری دا بە زیندانیکردنی تەها عەبدوڵلا فەرەج، بە حوکمی هەتاهەتایی لەگەڵ دەستبەسەردا گرتنی تەواوی ئەو سامانەی کە هەیەتی. دیارە تەها لەو جیهانە پان و بەرینەدا خاوەنی هیچ شتێک نەبوو، جگە لەو مەکینەی بەرگدروونە کە ئەویش هی زوبێدە بوو. تەهایان هێنایە دەرەوە و سواری ماشێنیان کرد و بردیان بۆ بەندیخانەی ئەبوغرێب.

دادگای شۆڕشەکەی سەدام، لاوێکی کرێکاری تەمەن بیست و پێنجساڵی خاوەن ژن و منداڵی بەهۆی هێنانی چەند گۆڤار و کتێبێکەوە زیندانی کرد و بڕیارێکی حوکمێکی نادادپەروەرانەی بەسەردا دا، بڕیاری زیندانیکردنی هەتاهەتایی. ئەی دەبێت دادگاکانی شۆڕشی ستالین و ماوتسی تۆنگ، یا نازیزمی هیتلەری و فاشیزمی مۆسۆلۆنی چیان کردبێت؟ ئەوان لەسەر تاوانی زۆر لەوە کەمتر خەڵکیان لە سێدارە داوە، یان بۆ هەتاهەتایی لە سیبریا کاری زۆرەملێیان پێکردون. لۆژیکی دیکتاتۆری چەوساندنەوە و دروستکردنی ترس و دڵەڕاوکێیە لەنێو دڵی هاووڵاتیاندا. لە لۆژیکی دیکتاتۆرییدا هاووڵاتیی بوون و هاوشاریی بوون، بوونی نییە. لە ڕژێمی دیکتاتۆرییدا هاووڵاتیان بە چاوێکی سووک سەیر دەکرێن و وەک هۆکارێک بەکاردێن بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات و مەرایی کردن.

دە، خولەک دادگاییکردن، بەبێ پارێزەر و حوکمی زیندانی هەتاهەتایی، هەندێک جار دادگاکانی شۆڕش بە دوو خولەک حوکمی سێدارە دەردەکەن. زیندانی ئەبوغرێب یەکێکە لە زیندانە بەناوبانگەکانی جیهان. لەسەردەمی سەدام و دوای سەدامیش ئەمریکاییەکان زۆر کەسیان لەو شوێنە زیندانی کرد.

لەو سەردەمەدا زیندانی ئەبوغرێب بریتی بوو لە سێ بەشی سەرەکی:

١- ئەحکام خاسە.

٢- ئەحکام سەقیلە.

٣- ئەحکام خەفیفە.

بەشەکانی (سەقیلە) و (خەفیفە)، شوێنی زیندانیانی ناسیاسی و زیندانیانی کاری توندوتیژیی بوو. بەشی (ئەحکام خاسە) تایبەت بوو بە زیندانیانی سیاسی. تەها بەو باوەڕەوە چووە ئەبوغرێب کە دەبوو ماوەی بیست ساڵ و شەش مانگ لەوێ بەسەر بەرێت. کاتێک لەبەردەم ئەحکام خاسە، دایانبەزاند دەستیان گرت و بردیانە نێو ئەو کۆشکە گەورەیە. لەوێ بردیانە ژوورێکەوە کە سێ کەسی دیکەی تێدا بوو. ژوورەکە گەورەبوو، نزیکەی پێنج - شەش مەتر دەبوو، هەر لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا، بە دیوارێکی یەک مەتر و نیوی، توالێتێک دروست کرابوو. تەها سڵاوی کرد و لەگۆشەیەکدا دانیشت، ئەو سێ کەسە بە زمانی عەرەبی و بەهێواشی بەخێرهاتنیان کرد، دوای ماوەیەک بێدەنگی یەکێکیان ڕووی کردە تەها و بە عەرەبی گوتی: تۆ خەڵکی کەربەلایت یان نەجەف؟ تەها وەڵامی دایەوە: من کوردم و خەڵکی سلێمانیم. یەکێک لە زیندانییەکان گوتی: بەڕاست تۆ کوردیت؟ ئێمە وامانزانی عەرەبیت. تەها گوتی: بەڵێ کوردم. ئەویش گوتی: منیش کوردم، خەڵکی ڕانیەم. ئەو سێ کەسە، زۆر ڕێزیان لە تەها گرت و پارچە بەتانییەکیان پێدا و گوتیان ئەو شوێنە شوێنی تۆیە، بۆخۆت لەو جێگایە بخەوە. ئەو زیندانییە کوردە لەگەڵ تەها کەوتە گفتوگۆ، لە تەهای پرسی دەمێکە دەستگیرکراویت؟ ئەویش پێی گوت پێنج مانگ دەبێت. ئەویش گوتی من نزیکەی یانزە ساڵە لێرە زیندانیم، کاتێک هاتمە ئێرە ڕیشم نەهاتبوو، بەڵام ئێستا ئەوەتا هەموو سەر و ڕیشم سپی بووە. من بە تاوانی سیخوڕیکردن بۆ ئێران دەستگیرکراوم، ئەگەرچی سیخوڕیش نەبووم. تەها سەرەتا گومانی لەو سێ کەسە هەبوو، بە ترسەوە قسەی لەگەڵ دەکردن، وای دەزانی ئەوانە پیاوی ڕژێمن و قسەی لێ دەردەهێنن. ئەو سێ کەسە یەکێکیان ناوی ئەبو سەعید بوو، ئەندامی حیزبی کۆمۆنستی عێراق بوو. یەکێکیشیان ناوی هادی مەولای بوو، خەڵکی بەغدا بوو، کۆمۆنیست بوو. کوردەکەش ناوی قادر باییز بوو، خەڵکی ڕانیە بوو. ئەو ژوورە کە ئەوانی تێدابوو، سەرەتا تەها دەیزانی دەبێت هەر لەو ژوورەدا بێت و

لەگەڵ ئەو سێ کەسەدا بێت، بەڵام دواتر تێگەیشت کە ئەو ژوورە پێی دەگوترێت "مەحجەر". هەر کەسێک کە لەدادگا حوکم بدرایە بۆ ماوەیەک لە ژووری مەحجەردا دەیانهێشتەوە، دواتر تێکەڵی زیندانیانی دیکەیان دەکرد. یاخود ئەگەر لەنێو هۆڵەکانی زیندانیشدا، کەسێک شەڕی بکردایە یان کارێکی دژی ڕژێمی بەعس بکردایە، ئەوا ماوەیەک دەیانکردە هەمان ژوورەوە. مەحجەر، زیندانی نێو زیندان بوو. دیارە ئەو سێ کەسە، هەڵسوکەوتیان لە نێو زینداندا باش نەبووە، بۆیە فەرمانگەی ئاسایشی نێو زیندان بڕیاریان دا بوو بیاننێرنە مەحجەر. هادی مەولای کوڕێکی بچکۆلەی لاو بوو. کەسێکی زیتەڵە و وریا بوو. لە تەها هاتە پێشەوە، سەرەتا تەها لێی ترسا، وایزانی هادی بەعسییە و دەیەوێت قسەی لێ دەربهێنێت، هادی لە تەهای پرسی: لەسەر چی گیراویت؟ تۆ چیت؟ تۆش کۆمۆنیستیت؟ تەها گوتی من هیچ شتێک نیم، هەندێک کتێب و گۆڤارم کڕی بوو، ویستم بیانفرۆشم، لەسەر ئەوە گیراوم. یەکێک لە خراپترین خەسڵەتەکانی زیندانی سیاسی، نەبوونی متمانە بەیەکدی کردنە. هەتا بەتەواوی یەکدی دەناسن، هەموو گومان لەیەکدی دەکەن و هەر یەکە و ئەوی دی بە سیخوڕ دەزانێت. زیندانییەکان چەندین ساڵ و مانگ لە ژوورێکدا پێکەوە دەبن، پێشتر یەکدییان نەناسیووە، خۆ ئەگەر متمانە بە یەکدی نەکەن ئەوا شێت دەبن، یان بەپێچەوانەوە ئەگەر کەسێک لە ژوورەکەدا سیخوڕ بێت و بیەوێت لەپێناوی پارە، یاخود ئازادبوونی خۆیدا قسە لە هاوزیندانییەکانی دەربهێنێت. زیندانیانی سیاسی لە ڕژێمی دیکتاتۆریدا دەبێت وەکوو پۆڵابن، بۆچی لە حکوومەتە نا دیکتاتۆرەکانیش زیندانی سیاسی بوونی هەیە؟

هادی مەولای گوتی: چۆن دەڵێیت هیچ نیم، من شیوعیم و لایەنگری حیزبی شیوعی عێراقم، تۆش کە بە بڵاوکراوەی یەکێتییەوە گیرابیت، دیارە یەکێتیيت، ئێمەش یەکێتیی‌مان خۆشدەوێت، لێرە لەگەڵ ئەندامانی یەکێتیی هاوڕێیەتیمان هەیە. هادی مەولای لە تەهای پرسی تۆ خەباتی عەلی کەباب دەناسیت؟ تەها گوتی: بەڵێ زۆر باش دەیناسم، ماوەیەک لە ئەمنی سلێمانی پێکەوە بووین، هادی گوتی: دەزانیت ئێستا خەبات لە کوێیە؟ تەها گوتی: ئەو لە پێش مندا بەرەو بەغدا بەڕێ کرا، لەوانەیە لە سێدارە درابێت، چونکە ئەو لەکاتی دەستگیرکردنیدا، دەمانچەی پێگیرا بوو. هادی

گوتی: خەبات لە سێدارە نەدراوە، ئەویش لێرەیە و حوکمی هەتاهەتاییە. تەها هێواش هێواش، بڕوای بەقسەکانی هادی مەولای دەهێنا. هادی گوتی: تۆ سەرورێشت زۆر هاتووە، لێرە هیچ شتێکمان لا نییە سەر و ڕیشت بتاشیت. جلوبەرگیش نییە، دەتوانیت لە توالێتەکەدا خۆت بشۆیت و جلە چڵکنەکانت، لەبەربکەیتەوە.

هادی گوتی: ئەم شوێنەی ئێمە، زیندان نییە، بەڵکو زیندانی ناو زیندانە.. ئەگەر زیندانییەک قسە بکات، یان جوێن بە ڕژێم بدات یاخود هەڵسوکەوتێکی خراپ بکات، لێرە تا دەتوانن لێیدەدەن. ئێمەش لەسەر قسەکردن و جوێندان هاتووینەتە ئێرە و ماوەیەک لێرە زیندانیمان دەکەن. دواتر لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا دەکەن و بە هەڕەشە و تۆقاندن داوامان لێدەکەن کاری سیخوڕییان بۆ بکەین. بەدڵنیاییەوە بانگی تۆش دەکەن و داوات لێ دەکەن کاری سیخوڕییان بۆ بکەیت، بەڵێنی پارە و ئازادبوونت پێدەدەن، تۆ دەبێت زۆر وریابیت، بەڵێنیان پێ نەدەیت و سیخوڕییان بۆ نەکەیت، ئەوان ڕیکۆردەرێکی بچووک دەدەن بە سیخوڕەکانی خۆیان و لەژێر جلوبەرگەوە دەیشارنەوە، ئەو کەسە سیخوڕە، لە زیندانییەکان نزیک دەبێتەوە و لە دژی ڕژێم گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات، دەنگەکانیان تۆمار دەکات و پاشان ڕیکۆردەرەکە دەداتەوە بە ئەمنەکان. ئەو کات، ئەو کەسەی قسەی کردبێت، و ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆری دەدەن و ماوەی مانگیش دەیهێننە ئەم ژووری مەحجەرانەوە، تەنانەت کە کەسوکاریشیان بێن بۆ سەردانیان چاویان پێی ناکەوێت. ئەو کەسەی لە نێو زیندان، سیخوڕی بۆ ڕژێم بکات، دوای ئازادبوونی لە هەر شوێنێک بێت دەکوژرێت. تۆ جارێ شارەزای نێو زیندان و توندوتیژیی ئەمنەکان نیت، تکایە ئاگاداری خۆتبە، وریابە خۆت نەفرۆشیت و نەبیتە سیخوڕیان. هادی مەولای گوتی: لێرە ژمارەیەکی زۆر کورد هەن هەموویان کەسانی باشن و هیچ کوردێک لێرە نەبووەتە سیخوڕ و هاوکاری ئەمنەکان ناکەن، تۆش وەکوو ئەوان بکە و وریابە نەبیتە سیخوڕ.

دوای دوو ڕۆژ ئەمنێک هات، بانگی تەهای کرد و لەگەڵ خۆی بردی، بردییە ژوورێک، زۆر فێنک و خۆش بوو، تەنها کەس لە ژوورەکەدا بوو. ئەو کەسە زۆر بە میهرەبانییەوە لەگەڵ تەهادا کەوتە گفتوگۆ و بە تەهای گوت: تۆ زیندانیی هەتاهەتاییت و دەبێت ماوەی بیست ساڵ لێرە بمێنیتەوە. تۆ خاوەن ژن و منداڵیت، ژن و منداڵەکەت

پێویستیان بە خەرجیی هەیە، تۆش لێرەیت و دینارێکت پێ پەیدا ناکرێت. ئێمە بەزەییمان بەتۆدا دێتەوە، هاوکارییت دەکەین و پارەت پێدەدەین، تۆش دەتوانیت ئەو پارەیە بۆ ژن و منداڵەکەت بنێریتەوە. ئێمە مۆڵەت دەدەین هەر پازدە ڕۆژ جارێک کەسوکارت بێن بۆ سەردانت، هەموو خەرجیی هاتوچۆی کەسوکارەکەشت لە سلێمانییەوە بۆ بەغدا، ئێمە لە ئەستۆی دەگرین. دوای ماوەیەک مانەوەت لێرە، ئێمە جاروبار مۆڵەتت پێدەدەین بڕۆی چەند ڕۆژێک سەردانی سلێمانی بکەیتەوە. هەروەها ماوەی زیندانی بوونەکەشت بۆ کەم دەکەینەوە. لەنێو زیندانیشدا شوێنی باشت بۆ دابین دەکەین و چەرپات پێدەدەین لەسەری بخەویت، بەڵام ئەمانە هەمووی بەو مەرجەی تۆش هاوکاریی ئێمە بکەیت. بەڕاستی هاوکارمان بیت. تەها، لەوکاتەدا قسەکانی هادی مەولای بیرکەوتەوە. هەموو ئەشکەنجە و ئازاری ماوەی ڕابردووی ئەمنی سلێمانی هاتەوە یاد. هاوکات، خزم و هاوڕێ شەهیدەکانی خۆی بیرهاتەوە. شەهید دڵشادی حاجی بەنگینە هاتەوە بەرچاوی، کە پێیگوتبوو مرۆڤی شۆڕشگێڕ و تێکۆشەر، ئەو کەسەیە خۆی نەدۆڕێنێت. یادی چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆی کردەوە، یادی هەردوو مامۆستای دەزگای ڕاگەیاندن مامۆستا ڕەمزی قوتبەدین و مامۆستا حەیدەر حوسێن ی کردەوە. یادی بۆردوومانەکانی سەرگەڵووی کردەوە، یادی خۆپیشاندانەکانی گەڕەکی مەجیدبەگ و سلێمانی کردەوە، یادی هەموو هاوڕێکانی گەڕەکی کردەوە. پرسیاری لەخۆی دەکرد و دەیگوت: ئەگەر من ببم بە سیخوڕی بەعس و سەدام، زوبێدە پێم دەڵێت: ئاکامی کارەکانت ئەوەبوو ببیتە سیخوری دوژمن! تەها لە مێشکی خۆیدا دەیگوت "چۆن دەبێت من ئەو کارە نەشیاوە بکەم و وەفام بۆ خوێنی شەهیدان نەبێت. ئەی چۆن وەڵامی دایک و باوک و کەسەکانم بدەمەوە. چۆن وەڵامی کەسوکاری شەهیدەکان بدەمەوە". ئەمانە هەمووی لە ماوەی چەند چرکەیەکدا بە مێشکی تەهادا تێپەڕی. تەها یەکڕاست گوتی: من ناتوانم هاوکاری ئێوە بکەم! فەلاح، ئەو ئەمنەی قسەی لەگەڵ تەهادا دەکرد، گوتی: بۆچی ناتوانیت؟ تەها گوتی: دایک و باوک و کەسوکارم لە گوند دەژین، ئەو شوێنە پێشمەرگەی لێیە، ئەگەر بزانن من لێرە هاوکاری ئێوە دەکەم، ئەوان هەموو کەسوکارم دەکوژن. فەلاح گوتی: هیچ کەسێک نازانێت کە تۆ هاوکاری ئێمە دەکەیت. تەها گوتی: دوای ماوەیەکی

کەم هەموو کەسێک دەزانێت. فەلاح گوتی: ئێمە ناهێڵین کەسەکانت ئازار بدەن، ئەگەر پێشمەرگە کەسوکارت ئازار بدەن. ئێمە لەناویان دەبەین. پێشمەرگە هیچ کارێکیان پێ ناکرێت و ناتوانن هیچ کارێک بکەن. تەها لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەی قوڕتان بەسەر، ئەوە ئێوەن لە بەرامبەر پێشمەرگەدا هیچتان پێ ناکرێت. ئێوە ناتوانن بچنە گوندێکی سێ ماڵیەوە، ئێوە کە باسی سەرگەڵوو و بەرگەڵوو دەکرێت لەرزتان لێدێت، کەچی ئێستا لەم دووەرەدەستەوە هەڕەشە دەکەن". تەها لەبەر خۆیەوە گوتی: "هەر شێو و دۆڵێکی کوردستان درکێکە لە چاوی ئێوەدا. هەر ژن و پیاوێکی کورد هێمای ئازایەتی و خۆڕاگرین و ڕووبەڕووی سەدام و داروودەستەکەی بوونەتەوە. تەها بەخۆی گوت: "مەگەر لەژێر ئەشکەنجەدا بمرم یان گوللەباران بکرێم، دەنا هەرگیزاو هەرگیز نابێت هاوکاری حیزبی بەعس و داروودەستەکەی سەدام بکەم". تەها تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو، چەندین ئارەزووی هەبوو، بەڵام گەورەترین ئارەزووی ئەو، وەک هەر کوردێکی ئازادیخوداز، ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان و لەناوبردنی ڕژێمی بەعس و سەدام بوو. هەرکەسێک بکەوێتە هەلومەرجێکی ئاوهاوە کە ناچاربێت تەنها بەرگری لە یەکێک لە ئارەزووەکانی بکات، لەهەندێک کاتدا واپێویست دەکات لە نێوان خۆشبەختی ژن و منداڵ و ئازادیدا یەکێکیان هەڵبژێرێت. لەکاتی تاقیکردنەوەدا دەبێت لە نێوان ئازادی، پلەوپایە، پارە و سامان یەکێکیان هەڵبژێرێت. ئەو هەڵبژاردنەش هەروا ئاسان نییە. ئەویش ڕۆژی تاقیکردنەوە دیاری دەدات. کاتێک گەیشتیتە دوڕیانێک یان سێڕیانێک یاخود پێنجڕیانێک هەڵبژاردنی ڕێڕەوی ڕاست واتای خۆی هەیە. ئەگەر کەسێک بەرژەوەندی گشتی و ئازادی و بەرگریکردن لە خەڵکی وەلانا و تەنها بەرژەوەندی خۆی لەبەرچاوگرت، واتە ئەو کەسە بەدەستی خۆی، خۆی خستۆتە نێو زەلکاوی خۆفرۆشییەوە. تەهاش نەیدەویست خۆی بخاتە زەلکاوی خۆفرۆشییەوە. تەها بە فەلاح و کارمەندانی ئەمنی گوت: نەخێر من هاوکاری ئێوە ناکەم! فەلاح گوتی: باش بیربکەرەوە، بیست ساڵ زیندانیی کەم نییە، بێپارەیی و بێ جێگایی وا ئاسان نییە، من چەند ڕۆژێک مۆڵەتت دەدەمێ تاکو باش بیر بکەیتەوە، ئەگەر هاوکاری ئێمە نەکەیت لە ماوەی ئەم بیست ساڵەدا چاوت بە ژن و منداڵ و کەسوکارت ناکەوێت. دوبارە دادگاییت دەکەینەوە و لەوانەیە لەسێدارەش بدرێیت.

تەهایان بردەوە بۆ ژووری مەحجەر، هادی مەولای، ئەبو سەعید و قادر بابیز چاوەڕوانی بوون. لە تەهایان پرسی: چی بوو؟ تەهاش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە و گوتی: پیشنیاری ئەوەیان بۆکردم کە هاوکارییان بکەم، منیش ڕازی نەبووم. لێیان پرسی ئەشکەنجەیان دایت؟ تەها گوتی: نەخێر، چەند ڕۆژێک مۆڵەتیان داوم تاکو بیری لێ بکەمەوە. ئەوان لێیان پرسی: ئەی بۆچوونت چۆنە؟ تەها گوتی: ئەگەر پارچە پارچەشم بکەن، ئامادەنیم هاوکاری ئەوان بکەم، ئابڕووی خۆم و کەسوکار و هاوڕێ و کەسە شەهیدەکانم نابەم، با لەسێدارە بدرێم. تەها بەبێ هیچ دوودڵییەک گوتی: ئامادەم لێرە بیست ساڵ بەسەربەرم، هەرچەندە لەو باوەڕەدام کە حیزبی بەعس، ناگاتە بیست ساڵی دیکە و لە نێو دەچێت، بەدڵنیاییەوە هیچ زیندانییەک تا بیست ساڵی دیکە لێرە نامێنێت. خۆ ئەگەر سەدامیش نەڕوخێت ئەوان ناتوانن تاکو بیست ساڵی دیکە ئەم هەموو خەڵکە لێرە ڕابگرن. تەواوی خەڵکی جیهان فشاریان بۆ سەر سەدام هێناوە، هێشتنەوەی ئەم هەموو زیندانییە لەڕووی ماڵیی و سیاسیەوە تێچوویەکی زۆری دەوێت. تەها گوتی: هەر چۆنێک بێت، من بیست ساڵ لێرە نامێنم و زووتر ئازاد دەکرێم. تەها بیری لەوە دەکردەوە و دەیگوت: ئەگەر هەلێکم بۆ هەڵکەوێت لێرە ڕادەکەم. سەیری دیوارە بەرزەکان و پاسەوانەکانی ناو قوللەکان و تەلی دڕکاوی سەر دیوارە بەرزەکانی دەکرد و دەکەوتە بیرکردنەوە.

دوای دوو ڕۆژ دیسان تەهایان بردەوە بۆلای فەلاح. فەلاح لەبەر تەها هەڵسا و بە پێکەنینێکی میهرەبانانەوە، گوتی: ها دیارە باش بیرت لێ کردووەتەوە. بیرت لە ژن و منداڵەکەت کردووەتەوە.. تەها نەیهێشت ئەو لە قسەکانی بەردەوام بێت.. گوتی: من ئامادەنیم هاوکاری ئێوە بکەم!

کێبڵێک لەسەر مێزی ژوورەکەدا دانرابوو، فەلاح گوتی: ئەو کێبڵە بدەرە دەستم. تەها کێبڵەکەی نەدایە، دوبارە پێی گوتەوە ئەو کێبڵەم بدەرێ. تەها ئەم جارەش نەیدایە. فەلاح خۆی کێبڵەکەی هەڵگرت و بەهەموو هێزی چەند کێبڵێکی لە تەها دا و بانگی دوو پۆلیسی کرد و گوتی: ئەم خوێڕییە ببەن. ئەم جارە تەهایان نەبردەوە بۆ مەحجەر، بردیان بۆ شوێنێکی زۆر بەرفراوان و قەرەباڵغ، زیندانییەکی زۆر لەوێ هەبوون، ئەو شوێنە، پێیان دەگوت "جەمەلۆنی یەک". نزیکەی پێنج سەد زیندانیی تێدابوو. دوو

پۆلیسەکە تەهایان گەیاند و خۆیان گەڕانەوە. زۆربەی زیندانییانی ئەو شوێنە عەرەبی شیعە بوون. تەها تاکو ئەو کاتە هیچ زانیارییەکی لەبارەی کەسوکاریەوە نەبوو، کەسوکاریشی نەیاندەزانی تەها لە کوێیە؟ تەها هیوادار بوو، لە ڕۆژانی سەردانی زیندانییەکاندا کەسێک بناسێت و هەواڵێک بۆ کەسوکاری بنێرێت.

ڕۆژێک کاتی سەردانی زیندانییان بوو. زیندانییەکان چوونە حەوشە، لەوێ چاوەڕوانی کەسوکاریان دەکرد. تەها ڕۆیشتە حەوشەکەوە و لەگۆشەیەکدا ڕاوەستا، چاوی دەگێڕا بەڵکو ناسیاوێکی خۆی ببینێت و هەواڵێک بنێرێت بۆ خێزان و کەسوکاری. ژنێک کە هاتبوو بۆ سەردانی زیندانییەک، بینی تەها بە تەنها لەولاوە وەستاوە و کەس نەهاتووە بۆ سەردانی، لە تەهای پرسی: برا گیان لەوە دەچێت کەس نەهاتبێت بۆ سەردانی تۆ؟ تەها گوتی: نەخێر هیچ کەسێک نەهاتووە، چونکە من تازە دادگایی کراوم و کەسوکارم نازانن لێرەم. لەگەڵ ژنەکەدا کەوتنە گفتوگۆ، دوای کەمێک ژنەکە گوتی: کاکە گیان، ئێمە خزمێکمان زۆر دەمێکە گیراوە و هیچ هەواڵێکی نازانین، بڵێی تۆ لەنێو زینداندا، ئەو کوڕەت نەدیبێت؟، تەها گوتی: من لە ئەمنی سلێمانی و ئەمنی گشتی بەغدا سەدان زیندانیم بینیووە، ئەو کەسەی تۆ بە دوایدا دەگەڕێیت، ناوی چیە و خەڵکی کوێیە؟ ئەویش گوتی: ئەو کوڕە ناوی بەڵام عەبدوڵڵا فەرەجە و خەڵکی ناوچەی سورداشە. تەها ئەو ژنەی نەدەناسی، تەها چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و هەر بۆ خۆشیی گوتی: دەیناسم ئەو لەسێدارە درا. ژنەکە دەستی کرد بەگریان، تەها تێگەیشت ئەو ژنە کەسێکی نزیکە، بەڵام یەکدی ناناسنەوە. تەها گوتی: دادە گیان مەگری من ئەو تەهایەم کە تۆ باسی دەکەیت! ژنەکە بەخۆشحاڵییەوە گوتی: ئەی بۆچی وا منت ترساند؟ تەها گوتی: ئەی من بۆ تۆ ناناسم؟ ژنەکە گوتی: من فاتیمەم، هاوسەری مەلا ئەحمەدم، ئێمە ماڵمان لە سەرگەڵوو بوو، ساڵێکیش ماڵمان لە سێکانیان بوو، لەگەڵ دایک و باوکتدا هاتوچۆمان زۆرە. منیش هاتووم بۆ سەردانی ئەو خزمەمان دایکت پێی گوتم: ئەگەر چوویت بۆ ئەبوغرێب، هەواڵی تەها لە زیندانییەکان بپرسە، بزانە هیچ هەواڵێکی هەیە. تەها گوتی ڕاستدەکەیت ئێستا دەتناسمەوە، من ماوەی دە ساڵ زیاترە تۆم نەبینیووە، بۆیە نەمناسیتەوە. تەها بە بینینی ئەو ژنە زۆر خۆشحاڵ بوو، هەواڵی کەسوکارەکەی لێ پرسی. ئەویش بە بینینی تەها خۆشحاڵ

بوو، بە تەهای گوت: زوبێدە لە سلێمانی نەماوە و ڕۆشتووەتەوە بۆ سێکانیان. پاشان تەها نامەیەکی بۆ باوکی نووسیی و دایەدەست ئەو ژنە.

بەهۆی ئـەو ژنـەوە، کەسوکارەکەی زانییان کە تەها زیـندووە و لە زیندانی ئەبوغرێبە. هەموو لایەک بە بیستنی هەواڵی تەها، خۆشحاڵ بوون. زوبێدە بە بینینی نامەکە زۆر خۆشحاڵ بوو، لە نامەکەدا کاتی سەردانکردن نووسرابوو، زوبێدە و ڕەوکان و دایک و باوکی تەها و ژمارەیەک خزم و کەسوکار، نزیکەی بیست کەسێک لە سلێمانییەوە بەڕێکەوتن بۆ بەغدا، ڕۆژی سەردانکردن، بەیانییەکەی لە زیندانی ئەبوغرێب ئامادەبوون. لەوێ چاویان بە تەها کەوت و هەموو بە بینینی خۆشحاڵ بوون.

ڕۆژی شەممە ١٩٨٥/١١/٩، ڕۆژی سـەردان بوو، ئەم سەردانەش هەندێک لە کەسوکار و هاوڕێیانی تەها لە سلێمانییەوە چوون بۆ سەردانی، یەکێک لە میوانەکانی ئەو ڕۆژەی تەها، ساڵح بێچاری هاوڕێی هەرە نزیکی بوو، هەردوو هاوڕێ بەبینینی یەکدی زۆر خۆشحاڵ بوون، لەکاتی یەکتربینیندا باوەشیان کرد بە یەکدیدا و بەچاوی پڕ فرمێسکی خۆشییەوە تێر ئەملاولای یەکدییان ماچ کرد. ئەو ڕۆژە تا نیوەڕۆ، تەها و ساڵح بێچار پێکەوە زۆر گفتوگۆیان دەربارەی دۆخی سیاسیی و هەواڵی هاوڕێیانیان کرد، بەتایبەت قەدەغەی هاتوچۆی ڕۆژی ١٩٨٥/١٠/١٧ ی سلێمانی. کە لەو ڕۆژەدا زۆر کەس گیران و گوللـەباران کران، زۆر ماڵ و خانووش لەلایەن ڕژێمەوە ڕوخێنران. ساڵح بێچار پێشتر بە هەردوو چیرۆکنووس ڕەئوف بێگەرد و مستەفا ساڵح کەریمی گوتبوو کە دەچێتە سەردانی تەها بۆ زیندانی ئەبوغرێب، ئەوانیش دیاری خۆیان بە ساڵح بێچاردا نارد بۆ تەها. ڕەئوف بێگەرد "دە دینار"ی عێراقی و مستەفا ساڵح کەریمیش "پێنج دینار"ی عێراقی. هەڵبەت، دووان لەو نامانەی ڕۆژی دەستگیرکردنەکەی تەها لە گیرفانیدا بوون، نامەی شێرکۆ بێکەسی شاعیر بوون بۆ هەردوو چیرۆکنووسی ناوبراو.

بێچار و تەها، جگە لەوەی هاوڕێ و هاوگەڕەک بوون، لە کاری سیاسی و نهێنیشدا هەر پێکەوە بوون، تەنانەت تا ڕۆژی دەستگیرکردنی تەهاش، ئەم دوو هاوڕێیە، لەسەر شەقامی مەولەوی شاری سلێمانی پێکەوە کتێبیان دەفرۆشت. هەڵبەت هەموو

ئەو کتێبانەی تەها لە ناوچە ئازادکراوەکانی شۆڕش دەیهێنانە سلێمانی، بەو کارتۆنە کتێبەشەوە کە بووە هۆی گیران و حوکمدانی؛ زۆرتر سالّح بێچار دەیگەیاندە دەست هاوڕێیان و کەسانی باوەڕپێکراو. ئەم دوو هاوڕێیە دوا دیداریان پێش ئەم سەردانەی ئەبوغرێب، شەوی ٣ لەسەر ١٩٨٥/٤/٤ بوو، لە مەجیدبەگ لە ماڵی سالّح بێچار.

"جەمەلۆنی ژمارە یەک" ئەو شوێنەی تەهای لێ زیندانی کرابوو، نزیکەی پێنج سەد زیندانیی تێدابوو، لەوانە نزیکەی سی کەسیان کورد بوون و چەند عەرەبێکی سوننەش هەبوون، بەڵام زۆربەی زۆری زیندانییەکان عەرەبی شیعە بوون. لەوانە بەشی هەرە زۆریان لایەنگری حیزبی دەعوەی ئیسلامی بوون. ژمارەیەکی کەم لایەنگرانی حیزبی شیوعی عێراقیشی لێ بوو. تەها لەگەڵ عەرەبە شیعەکان پەیوەندییەکی باشی هەبوو، بەردەوام لەگەڵیاندا وتووێژی دەکرد، بەڵام زیاتر لەگەڵ کوردەکاندا تێکەڵاو بوو. لە نێو کوردەکاندا کەسانی ڕووناکبیر و خوێندەواری باش هەبوون لەوانە دکتۆر نەورۆزی حاجی کەریم، خەڵکی گوندی "زێوێ" ی بناری پیرەمەگروون بوو. ئازاد عەلی، خەڵکی هەڵەبجە بوو. دکتۆر زاهیر تاریق نیعمەت، خەڵکی خانەقین بوو، بەڵام لە سلێمانی دادەنیشت. فاروق جەمیل، خۆی و برایەک و برازایەک و خزمێکی دیکەی بەناوی مام ڕەشید، خەڵکی هەولێر بوون. ئەوانیش کەسانی بەڕێز و میهرەبان بوون. فاروق جەمیل زیندانییانی هاندەدا کە خەریکی خوێندنەوەبن، ئەگەرچی لە نێو زینداندا ڕۆژنامە و کتێب ئازاد نەبوو. بەڵام ڕۆژنامەکانی حیزبی بەعس و ئەدەبیاتی بەعس، زۆر بوون. فاروق جەمیل و کەسەکانی لایەنگری یەکێتیی و دۆستی "مام جەلال تاڵەبانی" بوون. ماوەی ساڵێک تێپەڕی بەسەر حوکمی تەهادا.

ڕۆژی ١٩٨٦/٤/٢٨ بەبۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونی سەدام حوسێنەوە، لێبووردنی تایبەتی بۆ ئەو زیندانییانە دەرکرا کە دادگایی کرا بوون و لە کاتی دەستگیرکردنیاندا چەکیان پێ نەگیرا بوو. هاوڕێ کوردەکانی تەها، بەر ئەو لێبووردنە کەوتن و ئازاد کران. فاروق جەمیل -دوای ڕاپەڕین لە یەکێک لە کابینەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو بە وەزیری داد- ئەویش بە خۆی و برا و برازا و مام ڕەشیدی خزمیەوە، ئازاد کران. زیندان بۆ تەها قوتابخانەیەک بوو، ئەو بەهۆی زیندانەوە کۆمەڵێک کەسی ڕووناکبیر و بەئەزموون و خوێندەواری ناسی. فاروق جەمیل و برا

و برازا و مام ڕەشید و هەموو هاوڕێ کوردەکانی تەها، دوو ڕۆژ پێش تەها، ئازاد کران. کاتی ئازاد بوونیان مام ڕەشید تەهای لەباوەش گرت و ماڵاوایی لێ کرد و گوتی: بەئومێدی ئەوەی دوای ئازادبوون، لە شاخ یەکدی ببینینەوە. مام ڕەشید تەنها یەک مانگ بە ئازادی لە هەولێر مایەوە، شەوێک ئەمن و ئیستخبارات دەدەن بەسەر ماڵەکەیدا و لە ماڵ دەریدەکەن و دەیبەن، دوای دوو ڕۆژ لاشەکەی لە دەرەوەی شاری هەولێر دۆزرایەوە. تەها دوای شەش مانگ هەواڵی شەهیدبوونی مام ڕەشیدی زانی.

تەها لە زینداندا زۆر بێپارە بوو، زوبێدەش کاری بەرگدروونی نەبوو، ئەویش هەر بێپارە و دەستکورت بوو، هەرکاتێک کە دەچووە سەردانی تەها بۆ ئەبوغرێب، پێویستی بە پارە بوو بۆ خەرجیی ڕێگا، زۆرتر لەگەڵ دایک و باوکی خۆی یاخود لەگەڵ خەزوریدا دەچوو بۆ سەردانی تەها، بەڵام بەداخەوە هێشتا تەها لە زیندانی ئەبوغرێب بوو کە خاڵە سەعدون -باوکی زوبێدە- لە کەرکووک ماشێنێکی سەربازیی لێی دەدات و هەر لەچێدا گیانی سپارد. تەها بۆ دابینکردنی خەرجیی، ناچار بوو لە زیندان دەستبکات بە کاری چنین. ڕۆژانە خەریکی چنینی مەدالیا و جزدانی ژنانە بوو، مەدالیایەکی لە زەنگیانە بۆ ساڵح بێچاری هاوڕێی چنی، جزدانێکی جوانی بۆ زوبێدە دروست کردبوو، زوبێدە گوتی: من جزدانم بۆ چییە؟ جزدان بۆ ئەوەیە پارەی تێبکەیت. تەها گوتی: دڵنیابە ڕۆژێک دێت ئازاد دەکرێم و دەبینەوە بە خاوەنی ماڵ و پارەشمان پێدەبێت.

### ئازادبوونی تەها

دەستە دەستە زیندانیانی سیاسی ئازاد دەکران، کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆی ١٩٨٦/٥/١٨ تەها لە زیندان ئازادکرا. هەر لەوێ بەڵێننامەیان لێ وەرگرت کە هیچ کارێکی دژی یاسا و حکوومەت و حیزبی بەعس نەکات، هەروەها بەڵێننامەیان لێ وەرگرت کە نەبێتە ئەندامی هیچ حیزب و گرووپێکی سیاسی، تەنها حیزب کە بۆی هەبێت کاری لەگەڵدا بکات حیزبی بەعسە.

تەها کاتێک لە زیندانی ئەبوغرێب هاتە دەرەوە، تەنها دە دیناری عێراقی پێبوو، کە بە زەنگیانە چنین پەیدای کردبوو، لەگەڵ چەند عەرەبی شیعەدا، پێکەوە لە زیندان هاتنە دەرەوە، هەموو یەکدییان دەناسی، ئەوان تەکسیەکیان بەکرێ گرت بۆ بەغدا. ئەوسا زیندانی ئەبوغرێب، نزیکەی بیست کیلۆمەتر لە بەغداوە دور بوو، بەڵام ئێستا بەهۆی گەورەبوونی شاری بەغداوە ماوەکە کەمترە، ئەو عەرەبانە تەهاشیان لەگەڵ خۆیاندا سواری تەکسی کرد و کرێی ئەویشیان دا. تەکسیەکەیان بردە گەراجی عەلاوی، ئەوان خەڵکی نەجەف و کەربەلا بوون. تەها دەیویست بڕوات بۆ گەراجی نەهزە و لەوێشەوە بڕواتەوە بۆ سلێمانی. عەرەبەکان کرێی تەکسی تەهاشیان دا بۆ گەراجی نەهزە. تەها پێشتر چەند جارێک چوو بوو بۆ بەغدا، شارەزای گەراجی نەهزە بوو، لەوێوە ماشێن دەچوو بۆ سلێمانی. تەها کە لە زیندان ئازاد کرا، هیچ ناسنامەیەکی پێ نەبوو، ناسنامەی قوتابخانەشیان پێنەدایەوە، بەڵام زیندانییەکان کاتێک لە ئەبوغرێب ئازاد دەکران، مۆرێکیان لە قوڵی ڕاستیان دەدا. ئەو مۆرە لەبری ناسنامە بوو، ماوەیەک بە دەستەوە دەمایەوە. لە بازگەکانیش هەر کەسێک مۆری بەدەستەوە بووایە، لێپێچینەوەیان لەگەڵدا نەدەکرد و مەرەخەسیان دەکرد. لە گەراج، تەکسیەک ئامادەی ڕۆیشتن بوو بەرەو سلێمانی، تەنها دوو سەرنشینی تێدا بوو. تەها گوتی: منیش دێم بۆ سلێمانی نزیکەی پازدە خولەک وەستان سەرنشینی دیکە پەیدا نەبوو. شۆفێرەکە گوتی: بەهەمووتان پارەی دوو کەسی دیکە بدەن و با بە زوویی بڕۆین. ئەگەر کات درەنگتر بێت لە بازگەکان ڕێگەمان نادەن بڕۆین. شۆفێرەکە گوتی: ناسنامەکانتان ئامادە بکەن و لە بازگەکان نیشانیان بدەن، بەڵکو زوو بەڕێمان بکەن. تەها ناسنامەی پێ نەبوو، بەشۆفێرەکەی گوت: من لەبری ناسنامە ئەو مۆرە لەدەستم دراوە، شۆفێرەکە گوتی: ئەوە زۆرباشە، لە بازگەکان مۆرەکەی دەستتیان نیشان بدە بەزوویی بەڕێمان دەکەن. شۆفێرەکە بە تەهای گوت: تۆ پێنج دینار بدە و لە پێشەوە دانیشە. کرێی یەک کەس لە بەغداوە تاکو سلێمانی دوو دینار و نیو بوو، شۆفێرەکە دوو کەسی لە پێشەوە سوار دەکرد، تەها پارەی دوو کەسی دا کە دەیکردە پێنج دینار، دوو سەرنشینەکەی دواوەش پارەی سێ کەسیان دا.

نزیکی بانگی ئێوارە بوو گەیشتنە سلێمانی، تەها دەیزانی زوبێدەماڵی بردووەتەوە

بۆ سێکانیان، بۆیە ویستی بڕوات بۆ ماڵی حاجی عومەری ئامۆزای، لە گەراجەکە تووشی هاوڕێیەکی بوو بەناوی جەزای حاجی غەریب. جەزا خەڵکی سلێمانی بوو، هاوڕێ و دراوسێی تەها بوو. بە بینینی تەها زۆر خۆشحاڵ بوو، بە گەرمی بەخێرهاتنەوەی کرد، نەیهێشت تەها بڕوات بۆ ماڵی ئامۆزای گەورەی، بە زۆر بردییەوە بۆ ماڵی خۆیان و گوتی: شەو دەچین بۆ ماڵی حاجی عومەر، سبەی منیش لەگەڵت دێم بۆ سێکانیان. ئێوارە ڕۆشتنەوە بۆ ماڵی جەزا، ژەمی ئێوارەیان دۆڵمە بوو. تەها دوای دوو ساڵ زیندانی و ئەشکەنجە و خواردنی زیندان، ئەو دۆڵمەیە زۆر بەلەزەت بوو بەلایەوە. دوای نانخواردنی ئێوارە تەها گوتی: دەمەوێت بڕۆم بۆ ماڵی حاجی عومەر. جەزا گوتی: پێکەوە دەڕۆین و سبەی دێمەوە بە شوێنتا و پێکەوە دەڕۆین بۆ سێکانیان. تەها ڕۆیشت بۆ ماڵی حاجی عومەر. حاجی عومەر قادر، برای عەلی و ئەبوبەکر بوو. تەها شەو لە ماڵی حاجی عومەر مایەوە.

تەها دوانیوەڕۆی دوایین ڕۆژی مانەوەی لە سلێمانی، واتا ڕۆژی ١٩٨٥/٥/٢٦، چوو بۆ شەقامی مەولەوی بۆ سەردانی ساڵح بێچاری هاوڕێی، کاتێک تەها گەیشتە لای کتێبفرۆشەکان، ساڵح بێچار سەرقاڵ بوو، تەها بە دەنگێکی تایبەت گوتی: ئەم "گۆڤاری بەیانە بایی چەندە؟" کاتێک ساڵح بێچار سەری هەڵبڕی تا وەڵامی بداتەوە، کە سەیری کرد خۆ ئەوە تەهایە! هەردوو هاوڕێ لەو سەر جادەیە، زۆر بەتامەزرۆییەوە باوەشیان کرد بە یەکدیدا. چەندین جار ئەملاولای یەکدییان ماچ کرد، زۆر زۆر خۆشحاڵ بوون بە بینینەوە و دیداری یەکدی. بەتایبەت لەو شوێنەدا، کە زۆرترین بیرەوەریی و یادگارییان لێی هەبوو.



تەها سێکانیانی و ساڵح بێچار، سەرەتای ساڵی ١٩٨٤ سەردەمی کتێبفرۆشی
لە جادەی مەولەوی تەنیشت دیواری فەرمانگەی بەدالەی ئەوسا.

دوای کەمێک، مەحموود خاکی و مارف ناسراویش هاتن. ئەوانیش هاوڕێی تەها و ساڵح بێچار بوون، هەڵبەت ئەوانیش هەر زیندانیی سیاسیی بوون و تازە ئازاد کرابوون. هەردوکیشیان لە هاوڕێیانی نێو زیندانی تەها بوون. لەگەڵ تەهادا چەند بیرەوەرییەکی تاڵی نێو زیندانیان گێڕایەوە. بۆ ئێوارە و شەوەکەی تەها لە ماڵی ساڵح بێچار مایەوە و دایک و باوکی ساڵح بێچاریش زۆر بە ئازادبوونی تەها خۆشحاڵ بوون. تەها، شەو تا درەنگ، هەموو بەسەرهات و بیرەوەرییەکانی نێو زیندانی سلێمانی و بەغدا و ئەبوغرێبی بۆ ساڵح بێچار گێڕایەوە.

ڕۆژی دواتر تەها لەگەڵ کاک عەلی و خاڵە شەریف و جەزادا ڕۆیشتن بۆ سێکانیان. لە سوسێ، تووشی محەمەدی ئامۆزای تەها بوون، ئەویش لەگەڵیاندا چوو بۆ سێکانیان. لە "کۆتەڵ" لە ماشێن دابەزین و بەپێ بەرەو سورداش ڕۆیشتن و بەسەر شاخدا سەرکەوتن. جەزا، لەسەر شاخەوە هاواری کرد: هۆ خەڵکینە تەها

هاتەوە.. تەها لە زیندان ئازاد کراوە! ئەو کاتە ناوچەکە هەموو لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوو، خەڵکەکە بە گشتی چەکدار بوون. هەر کەسە و لەلای خۆیەوە دەستی کرد بە تەقەکردن و فیشەکی بەرەو ئاسمان دەتەقاند. ئەو ڕۆژە ئێوارەکەی لە خۆشی ئازادبوونی تەها، هەزاران فیشەک بەرەو ئاسمان تەقێنران. ئەو کەسانەی کە دوورەدەست بوون و گوێیان لە دەنگی تەقەکان بوو، بەبێ ئەوەی بزانن چی ڕوویداوە، ئەوانیش دەستیان کردبوو بە تەقەکردن. خەڵکی سێکانیان پێشوازییەکی بێوێنەیان لە تەها کرد. ئامینە، شەمسە و زوبێدە بیریان دەکردەوە، دەبوو تەها تا هەژدە ساڵی دیکە لە زینداندا بێت، بەڵام بە ئازادبوونی ئەوەندە خۆشحاڵ بوون لە خۆشیدا نەیاندەزانی چی بکەن. "ڕەوکان" تەمەنی سێ ساڵ بوو، تەهای نەدەناسیەوە. حاجی عەبدوڵڵای باوکی تەها، بزنێکی گەورەی سەربڕی و پێشوازی لە میوانان کرد. دانیشتووانی گوندی سێکانیان هەمووی خزم و کەسی یەکدی بوون. خەڵکەکە بە خۆشحاڵی لە ماڵی حاجی عەبدوڵڵا کۆببوونەوە، خەڵکی گوندی سەرگەڵوو، قەرانگوێ و دێهاتەکانی دیکەش دەستە دەستە دەهاتن بۆ بەخێرهاتنەوەی تەها.

تەها لەبارەی لێدان و ئەشکەنجەوە هیچی بە زوبێدە نەگوت، نەیدەویست هاوسەرەکەی دڵتەنگ بکات، بەڵام زوبێدە هەر زوو برین و شوێن کێبڵەکانی بە جەستەی تەهاوە بینی. هۆن هۆن فرمێسکەکانی دەهاتنە خوارەوە. تەها، بەهۆی لێدان و پیسی ناو زیندانەوە، تووشی نەخۆشی پێست ببوو، هەڵبەت ماوەیەکی زۆر لە زیندان خۆی نەشۆری بوو. جلوبەرگە پیسەکەی ڕشک و ئەسپێ لێی دابوو. کاتێک کە چوو بۆ ئەبوغرێبیش، بەهۆی قەرەباڵغیەوە زۆر بەکەمی دەیتوانی خۆی بشوات. هەڵبەت یەکێک لە هۆکارەکانی لێبووردنەکەی سەدام، قەرەباڵغی زیندانەکان و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی پێست بوو لە نێو زیندانەکاندا. دیکتاتۆر بەبۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونی خۆیەوە لێبووردنی تایبەتی دەرکرد بوو، بەڵام لە پشت لێبووردنەکەوە ڕاستییەکی دیکە هەبوو؛ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و هێزە بەرهەڵستکارە نێوخۆییەکان، فشاری زۆریان بۆ سەدام هێنابوو. پزیشک و نەخۆشخانەکانیش ترسی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییان هەبوو، ئیتر سەدامیش بەناوی لێبووردنەوە ژمارەیەک لەو زیندانییانەی ئازادکرد کە بەبێ چەک دەستگیر کرابوون.

تەها، دەیویست زیاتر پەرە بەخەبات و تێکۆشان بدات. دەیویست ببێتە پێشمەرگە، هەڵبەت پێش ئەوەی دەستگیربکرێت و بچێتە زیندانەوە لایەنگری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. کاری ڕێکخستن و بڵاوکردنەوەی بیر و ڕێبازی یەکێتیی بوو. بەڵام دوای ئازادبوونی، دەیویست ببێتە پێشمەرگە و بە چەک دژی ڕژێمی سەدام بجەنگێت. لەخۆی دەپرسی چی بکات باشە؟ بیری کردەوە سەرەتا بڕوات بۆ سەربازی. بڕیاری دا بوو، چەند ڕۆژێک سەربازی بکات و چەک وەربگرێت، دواتر بە چەکەوە لە سەربازی ڕابکات و پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە بکات. ئەو بەردەوام بیری لە ئازادی خاک و وڵات دەکردەوە، بیری لە ئازادی کوردستان و لەناوچوونی ڕژێمی بەعسی زۆردار دەکردەوە، ئەویش وەک شەهید دڵشادی حاجی بەنگینە، شەهید جەمال، شەهید کەمال، شەهید زوهێر و خاڵە سەلام، بیری لە ئازادی کوردستان دەکردەوە.

تەها، دەفتەری خزمەتی سەربازیی و هیچ بەڵگەنامەیەکی سەربازیی نەبوو، جگە لەو مۆرەی لە مەچەکی ڕاستی درابوو، هیچ بەڵگەنامەیەکی دیکەی پێ نەبوو. دەبوو لە پێش هەموو شتێکدا بچێت بۆ تەجنید "دەفتەری خزمەتی سەربازیی" وەربگرێت و ئەوکات بڕوات بۆ سەربازی. تەها، خۆی پارەی پێنەبوو تا پێی بچێت بۆ سلێمانی. زوبێدە کەمێک پارەی لابوو، پێی دا، باوکیشی کەمێک پارەی پێدا. زوبێدە بە ئازادبوونی هاوسەرەکەی، زۆر خۆشحاڵ بوو، لەو باوەڕەدا بوو ئەگەر هاوسەرەکەی لە زینداندا هاوکاری ئەمنەکانی بکردایە، ئێستا ئازاد نەدەکرا، بەعس لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا دەیانهێشتەوە، دەیانکرد بە سیخوڕ بەسەر زیندانییانی ترەوە. هەڵبەت هەر کەسێک لە زینداندا سیخوڕی بکات، واتە ئەو کەسە خۆی فرۆشتووە و تا کۆتایی ژیانی لەنێو زینداندا دەمێنێتەوە. ئەگەر تەهاش ئەو ڕۆژە بڕیاری بدایە هاوکاری فەلاح بکات، ئەوا ماوەی بیست ساڵ لە زینداندا دەمایەوە. هەندێک کەس کە خۆیان فرۆشت و هاوکاری ئەمن و ئیستخبارات بوون تاکو لەناوچوونی سەدام و ڕژێمەکەی بە ئەڵقە لەگوێی مانەوە و هەندێکیان لەلایەن زیندانییانی ئازادبووەوە، لە دەرەی زیندان کوژران و لەناوچوون.

زوبێدە، ئامینە، شەمسە و هەموو خوشک و براکانی لە دەوری تەها کۆببوونەوە، هەموویان نیگەران بوون. یاسین، ستار، سوعاد، سەعدی، محەمەد، هاشم، دایک و باوکیشیان. هەموو لەسەر خوانی بەیانی، ئارام دانیشتبوون و پێکەوە نانی بەیانییان دەخوارد، بەڵام هەموو نیگەرانی ئەوە بوون کە تەها دەڕوات بۆ شار، تەها تازە دەیویست بڕوات بۆ سەربازی. سەردەمی "جەنگی عێراق - ئێران" بوو، چوونە سەربازیی کارێکی ترسناک بوو. تەها، پێدەچوو وەک ئەوەی بیری لێکردبووەوە؛ نەتوانێت وا بەئاسانی لە سەربازی ڕابکات. تەها تەمەنی بیست و حەوت ساڵ بوو. ڕابوردووی زیندانیی سیاسیی هەبوو، یاسینی براشی سەربازی هەڵاتوو بوو، هەموو بە تەهایان گوت ئاگاداری خۆتبە. هەموو تێکڕا ڕوویانکردە تەها و گوتیان ئێمە پێمان باشە، نەڕۆیت بۆ شار. تەها گوتی: دەڕۆم بەڵام، بەزوویی دەگەڕێمەوە.

شەمسە زۆر نیگەرانی براکەی بوو، زراری هاوسەری شەمسە پێشمەرگە بوو، ئەو فەرماندەی کەرت بوو، بەردەوام دژی هێزەکانی سەدام لە شەڕدا بوو، زرار، برای زوبێدە بوو. تەها و زرار چەندین جار لە بارەی پێشمەرگە و دڕندەیی هێزەکانی سەدامەوە گفتوگۆیان کردبوو. ئەوان هاوبیروبۆچوون بوون، هەردووکیان لایەنگری یەکێتیی بوون. زرار بە تەهای گوت: من بەچاکی نازانم تۆ بڕۆیت بۆ سەربازی. سوعادیش دەگریا و دەیگوت: نابێت بڕۆیت! سەعدی و محەمەد و ستاریش نیگەرانی برا گەورەکەیان بوون. سەعدی دەیگوت: ئاگاداری خۆتبە و وریابە کارێک نەکەیت کە دوبارە دەستگیر بکرێیتەوە. تەها ماڵاوایی لە هەمووان کرد و ڕۆی بەرەو سلێمانی.

تەها، گەیشتە سلێمانی، سەرەتا چوو بۆ ئەو قوتابخانەیەی پێشتر لێی دەخوێند، تاکو لەوێوە نووسراوێکی پشتگیری وەربگرێت و بیبات بۆ تەجنید. ئەو هێشتا وەک خوێندکارێک ناوی لە قوتابخانەکە هەبوو، ئەگەرچی بەهۆی ماوەیەکی زۆر دابڕانی لە قوتابخانە، بڕیاری دەرکردنی بۆ دەرچوو بوو. بەڕێوبەری قوتابخانە بە گەرمی بەخێرهاتنەوەی لە تەها کرد. ئەو دەیزانی کە تەها زیندانیی سیاسی بووە. پاش دانیشتن و هەواڵپرسین، تەها بە بەڕێوبەری گوت: هاتووم نووسراوێکم بۆ بکەن بیبەم بۆ تەجنید، تاکو دەفتەری خزمەتی سەربازی وەربگرم و بڕۆم بۆ سەربازی. بەڕێوبەر بەسەر سووڕمانێکەوە سەیری تەهای کرد، دەیزانی تەها زیندانیی سیاسیی

بووە. چۆن زیندانییەکی سیاسیی دەیەوێت بڕوات بۆ سەربازیی!. ئەویش لە کاتێکدا کە عێراق لەگەڵ ئێراندا لە جەنگێکی خوێناویدایە. بەڕێوبەر دەیزانی تەها بەرنامەیەکی دیکەی لەسەردایە، بەڵام هەر نووسراوەکەی بۆ نووسیی و پشتگیری کرد، هەڵبەت ئەو نووسراوە لەبری ناسنامە بوو.

تەها لە سلێمانییەوە ڕۆیشت بۆ شارۆچکەی دوکان، سێکانیان لەڕووی کارگێڕییەوە سەر بە قەزای دوکانە، دوکان قەزایەکی جوان و ئاوەدانە لەسەر ڕووباری زێی بچووک. هەر لە دوکان و لەسەر زێی بچووک بەنداوێکی گەورە دروستکراوە، کە توانای گلدانەوەی زیاتر لە شەش ملیارد مەتر سێ جا، ئاوی هەیە. تەها لە دوکان خزم و کەسوکاری هەبوو، سەردانی خزم و کەسەکانی کرد و شەوێک لە ماڵی عەبدوڵلای کوێخا حەسەنی قەرانگوێیی مایەوە، کە کوڕی خاڵی باوکی بوو. بەیانی کاتژمێر هەشت ڕۆیشت بۆ تەجنید و چووە لای ئەفسەری تەجنید. تەها ئەفسەرەکەی نەدەناسی، بەڵام دەیزانی کەسێکی عەرەبی شیعە مەزهەبە. تەها چووە لای و پێی گوت: من دەمەوێت دەفتەری خزمەتی سەربازی وەربگرم و بڕۆم بۆ سەربازی، ئەفسەرەکە سەیرێکی تەهای کرد و گوتی: بۆ ئێستا هاتوویت؟ بۆچی زووتر نەهاتوویت، تۆ تەمەنت بیست و حەوت ساڵە، دەبوو ساڵانێک پێش ئێستا لە خزمەتی سەربازیی بوویتایە. دوای ئەوەی تەها باسی زیندانیبوونی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەفسەر گوتی: تۆ زیندانیی سیاسییت و کوردیت، بەلای ئێمەوە تۆ کەسێکی باش نیت، تۆ تەمەنت زۆرە و نەڕۆیشتوویت بۆ سەربازی، ئەگەر بڕۆیت بۆ سەربازی، ڕاهێنانی سەربازییت پێناکرێت، یەکسەر ڕەوانەی بەرەکانی جەنگی دژی ئێران دەکرێیت و دەنێردرێیت بۆ بەرەی خۆرهەڵاتی بەسرە، واتە دەنێردرێیتە پێشەوەی بەرەی جەنگ. تەها تێگەیشت ئەفسەرەکە دەیەوێت ئەو نەچێت بۆ سەربازی. تەها دەیزانی بەشێک لە ئەفسەرەکان شیعەن و دۆست و لایەنگری حیزبی بەعس و سەدام نین. لەو ژوورەدا جگە لە ئەفسەرەکە کەسی دیکەی لێ نەبوو، ئەفسەرەکە گوتی: بڕۆ دەرەوە دوای نیو کاتژمێری دیکە بانگت دەکەمەوە، جارێ بڕۆ، من کەمێک کارم هەیە. تەها تێگەیشت ئەفسەرەکە هیچ کارێکی نییە و بێهۆ ئەو دەکاتە دەرەوە، تەها لە ژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە.

تەها پاش هاتە دەرەوەی لە ژووری ئەفسەری تەجنید، دوو خولەک لە هۆڵەکە وەستا، دواتر هاتە دەرەوەی تەجنید و بەجادەکەدا ڕۆیشت، دوای پێنج خولەک، پیکابێک لەولاوە هات کە بەرەو سلێمانی دەچوو، تەها دەستی لێ ڕاگرت، ماشێن وەستا، تەها سەرکەوت و لە کۆتەڵ دابەزی، بە شاخی باوێدەدا سەرکەوت، دوانیوەڕۆ گەیشتەوە سێکانیان. هەموو کەسوکاری بە هاتنەوەی تەها خۆشحاڵ بوون. ڕۆژی دواتر ڕۆیشت بۆ سەرگەڵوو، چوو سەردانی شاعیری گەورەی کورد، مامۆستا شێرکۆ بێکەسی کرد. شێرکۆ بێکەس زۆر باش تەهای دەناسی و دەیزانی کە زیندانی سیاسیی بووە. بەخێرهاتنەوەی کرد و زۆر خۆشحاڵ بوو بە ئازادبوونی. شێرکۆ بێکەس ڕێزێکی زۆری لە تەها گرت و سوپاسی کرد کە لە زینداندا خۆڕاگر بووە و ناوی هیچ کەسێکی لە هاوڕێیانی شار، نەدرکاندووە.

هۆنراوە شۆڕشگێڕییەکانی شێرکۆ بێکەس لە چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ چاپ دەکران. شێرکۆ بێکەس دەیزانی کە تەها چاپکراو و بڵاوکراوەکان لە چاپخانەوە دەگەیەنێتە نێو شاری سلێمانی. شێرکۆ بێکەس بە تەهای گوت: هەر کارێکت هەبێت من بۆت ئەنجام دەدەم. تەها گوتی: بڕیارم داوە ببمە پێشمەرگە، ئایا تۆ پێت باشە ببمە پێشمەرگە؟ شێرکۆ بێکەس گوتی: تۆ کەسێکی هۆشیار و ڕووناکبیریت.. بەڵێ، من پێم باشە تۆ ببیتە پێشمەرگە!

ڕۆژی ١٩٨٦/٦/١ تەها لە تیپی مەڵبەندی دوو، خۆی ناونووس کرد و بوو بە پێشمەرگە، بارەگای تیپی مەڵبەندی دوو لە سەرگەڵوو بوو، بارەگای مەڵبەندی دووش هەر لە سەرگەڵوو بوو، تیپی مەڵبەندی دوو ئەرکی پارێزگاریکردنی مەڵبەندەکەیان پێسپێردرا بوو. هیچ جۆرە ڕاهێنانێکی پێشمەرگانە نەبوو، تەها بەبێ ئەوەی هیچ ڕاهێنانێک ببینێت، بوو بە پێشمەرگە. کلاشینکۆفێک و پێنج مەخزەنی پڕ لە فیشەکیان پێدا. تەها لە پێشمەرگایەتیدا مووچەیەکی کەمی پێدەدرا، بەڵام مووچەکەی ئەوەندە کەم بوو، بەشی گوزەرانی نەدەکرد. هەربۆیە هاوکات لەگەڵ پێشمەرگایەتیدا، ئەگەر شەڕ و هێرشی دووژمن نەبووایە، کاریشی دەکرد و دەیتوانی کەمێک پارە پەیدا بکات. مووچەی پێشمەرگەی خێزاندار حەفتا دینار بوو، مووچەی پێشمەرگەی زگوردییش پەنجا دینار. تەها بە زوویی فێری بەکارهێنانی چەکی کلاشینکۆف بوو. حکوومەتی

عێراقی بەردەوام ئەو ناوچەیەی تۆپباران دەکرد و فڕۆکەش بۆردومانی دێهات و بنکە و بارەگاکانی پێشمەرگەی دەکرد. سوپای عێراقیش بەردەوام لە هەوڵی هێرشکردندا بوو تاکو دەست بەسەر بارەگاکان و ناوچەکەدا بگرێت. پێشمەرگەش بەرگری دەکرد. پێشمەرگە زیاتر شەڕی پارتیزانی دەکرد و لەناکاو هێرشیان دەکردە سەر بنکەکانی سوپا یان کاروانێک یاخود ڕەبیە و بارەگاکانی سەربازانی بەعس.

لە مانگی ئەیلولی ١٩٨٦دا سوپای عێراقی هێرشێکی گەورە و بەربڵاوی بۆ ناوچەی ماوەت و شارباژێڕ دەستپێکرد، جەنگەکە ماوەی سەد و یەک ڕۆژی خایاند لەو ماوەیەدا بەردەوام هێزەکانی پێشمەرگە لە شەڕدا بوون. شەڕەکە دواتر بە "شەڕی قەیوان - ماوەت" ناسرا، شەڕەکە لە نێوان سوپای عێراق و پێشمەرگەکانی یەکێتیی‌دا بوو، تەواوی پێشمەرگەکانی یەکێتیی لە دەشتی هەولێر، باڵەکایەتی، کەرکووک، گەرمیان و شارەزوور بەشدارییان لەو شەڕە گەورەیەدا کرد. سوپای عێراق جۆرەها فڕۆکەی هەلیکۆپتەری جەنگی و تۆپی دوورهاوێژی بەکارهێنا. بەردەوام ناوچەکە لەژێر بۆردوومباندا بوو. سوپای عێراق کاتێک زانی لە بەرامبەر پێشمەرگەدا هیچیان پێ ناکرێت، ناچاربوون لە زۆر شوێنی شەڕەکە چەکی کیمیایی بەکاربهێنن. پێشمەرگە نەیدەتوانی لەبەرامبەر چەکی کیمیایی بەرگری بکات. پێشمەرگە شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی نەبوو، هاوکات دەرمان و پێویستیەکانیش بەردەست نەبوون. ماوەیەک پێشمەرگە پاشەکشەی کرد و خۆیان ڕێکخستەوە و نەخشەی هێرشێکی گەورە و چڕوپڕیان دانا. ئەوەبوو لە مانگی مایسی ١٩٨٧ پێشمەرگە هێرشێکی کتوپڕی دەستپێکرد و توانییان تەنها لە شەوێکدا دەستبگرن بەسەر زیاتر لە سەد و دوازدە ڕەبیە و بارەگای گەورەی سوپای عێراقدا. ئەو شەڕە گەورەیەش ناونرا "داستانی ڕزگاری" لەو شەڕەدا پێشمەرگە توانی هەموو ئەو شوێنانەی لە ماوەی سەد و یەک ڕۆژدا سوپای عێراقی دەستی بەسەردا گرتبوو، ڕزگاریان بکات، لەسەر شاخی ئەزمڕەوە تاکو سەر سنووری ئێران ناوچەکە کەوتەوە دەست هێزی پێشمەرگە.

جەنگی عێراق - ئێران تەواو ببوو، سەدام هیچ ترسێکی سوپای ئێرانی نەمابوو، لەو کاتەدا نەخشەی هێرشی بۆسەر کوردەکان داڕشت، نەخشەیەکی وێرانکەری

شەیتانی لەلایەن سەدام و هاوپەیمانەکانییەوە. نەخشەیەک کە دارێژەرەکەی دیکتاتۆرێکی کەم عەقڵ بوو. نەخشەیەکی وێرانکەر بۆ لەناوبردنی ژن و منداڵ و پیر و گەنج. نەخشەیەکی دارێژراو کە بە چەند قۆناغێک جێبەجێ کرا. قۆناغەکانیش بە یەکەوە ئەنجام دەدران.

١- شەڕ و بۆردوومانی کیمیایی بەربڵاو.

٢- هێرشی ئەنفال، واتە دەستبەسەرداگرتنی هەموو سامان و لەناوبردنی تەواوی دانیشتووان و زیندە بەچاڵ کردنیان.

٣- وێرانکردنی گوندەکان.

٤- دروستکردنی کۆمەڵگەی زۆرەملێ.

٥- کۆچی زۆرەملێ بۆ کۆمەڵگەی زۆرەملێ.

٦- جیاکردنەوەی منداڵ لە کەسوکاریان و فرۆشتنیان.

٧- مینرێژکردنی تەواوی ناوچە کوردنشینەکان.

٨- کەمکردنەوەی بەشە بودجەی کوردستان.

٩- دەرکردنی کارمەندانی کورد لە کارەکانیان.

١٠- جۆرەها ئازاردان و ئەشکەنجەی دەروونیی.

لە جەنگی عێراق - ئێراندا سەربازانی میسر، سودان، یەمەن و ئەردەن هاوکاری سەدامیان دەکرد. بەشێک لە سوپای ئەو وڵاتانە بەشداربوون لە هێرشکردنە سەر کوردەکان، هەروەها ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێران، لەگەڵ سوپای عێراقدا بەشدار بوون لە هێرشکردنە سەر کوردەکان.

یەکەمین هێرشی بەربڵاوی سوپای عێراق ڕۆژی ١٩٨٨ /٢/١٦ لە ناوچەی دوکان دەستی پێکرد، بۆ دەستبەسەرداگرتنی بارەگاکانی یەکێتیی لە سەرگەڵوو و بەرگەڵوو. هەروەها سەرکردایەتی یەکێتیی لە گوندی یاخسەمەر. هێشتا جەنگی عێراق - ئێران کۆتایی نەهاتبوو، فڕۆکە و هەلیکۆپتەر گوندەکانی سێکانیان، سەرگەڵوو، بەرگەڵوو، هەڵەدن، یاخسەمەر، چاڵاوا و گوندەکانی دیکەی بە کیمیایی بۆردوومان دەکرد. خەڵکی سڤیلی وەک و ژن و منداڵ و پیر، کەوتبوونە بەر ئەو هێرشە وەحشیگەرییە. دکتۆر و دەرمانی چارەسەرکردنی بریندارانی کیمیایی بەردەست نەبوو. پێشمەرگە نەیدەتوانی

خۆی لەو جۆرە چەکە کوشندە و قەدەغە کراوە بپارێزێت، توانای بەرگریکردنیشیان نەمابوو. یەکێتیی داوای لە جەماوەری ناوچەکە کرد ماڵ و سامانیان جێبهێڵن و بەرەو سنوورەکانی ئێران کۆچ بکەن. خەڵکەکە بەناچاری بەرەو سنوورەکانی ئێران ملیان نا، لە ماوەیەکی کەمدا دەیان هەزار کەس، هەر لە منداڵی شیرەخۆرەوە تاکو پیرەژن و پیرەپیاو، بەرەو ئێران ڕۆیشتن. تەهاش لەو شەڕانەدا کە بە "ئەنفالی یەک" ناسرابوو، بەشداری کرد.

تەها دوای ئازادبوونی لە زیندان، تووشی نەخۆشی پێست ببوو، پێش هێرشەکانی ئەنفال بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی چووبوو بۆ مهاباد و ورمێ.

سوپای سەدام بە فڕۆکە و تۆپی دوورهاوێژ و کیمیایی، گوندی سێکانیان و تەواوی گوندەکانی دەورو بەری بۆردوومان کرد، خەڵکی ناوچەکە بەخێرایی گوندەکانیان چۆڵ کرد، تەنانەت نەپەرژانە سەر ئەوەی کەلوپەلەکانیشیان کۆبکەنەوە. تەنانەت ئەو کەسانەی سەردانی ماڵەکانیان دەکردەوە بۆ هەڵگرتنی بەتانییەک، ئەوا بەگازی کیمیایی دەمردن. خەڵکەکە نەیاندەزانی چۆن خۆیان لە کیمیایی بپارێزن، هیچ جۆرە خۆپارێزییەک نەدەکرا، تەنها ڕێگای ڕزگاربوونیان هەڵهاتن بوو.

لەو کاتەدا هەواڵێکیان دا بە تەها کە شەمسەی خوشکە گەورەی لە ڕێگای ڕۆیشتن بەرەو ئێراندا، بە هۆی تۆپبارانی سوپای بەعسەوە بریندار بووە. تەها مۆڵەتی وەرگرت و ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ لە سێکانیانەوە بەرەو سنووری ئێران بەڕێکەوت، زراری هاوسەری شەمسەش پێشمەرگە بوو، لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا نەڕۆشتبوو، شەمسە، لە ترسی بۆردوومانی کیمیایی، دەستی منداڵەکانی گرت و وەک سەرجەم خەڵکی سێکانیان و گوندەکانی دیکە بەرەو ئێران ڕۆیشتن. تەها، کە هەواڵی برینداربوونی خوشکەکەی زانی، بە زوویی بەرەو سنووری ئێران کەوتەڕێ، تاکو شەمسە و منداڵەکانی بدۆزێتەوە. ئەو خەڵکە ڕەشوڕووت و لێقەماوە تەنها ئەوەندەیان دەزانی بەرەو سنوورەکانی ئێران بڕۆن، خۆ ئەگەر بەردەستی سوپای سەدام بکەوتنایە وەکوو هەزاران کوردی دیکە ئەوانیش ئەنفال و زیندە بەچاڵ دەکران.

**بەسەرهاتی شەمسە**

نەورۆزی ساڵی ٢٠١٩ گەشتێکم کرد بۆ عێراق، ڕۆژی ٢٦-٣-٢٠١٩ لە سلێمانی شەمسە گوتی: ئەم جیهانە، بۆ ئێمە جگە لەخەم و خەفەت، هیچی دیکە نەبوو، ڕۆژانە شەڕ لە دوای شەڕ دروست دەبوو، هەررۆژە و کەسێکمان شەهید دەبوو، هەر ڕۆژە و کەسێک بریندار دەکرا. ڕۆژانە کۆڵبەکۆڵ بە کونە شاخەوە دەگەڕاین. شەمسە خوشکە گەورەی تەهایە و ساڵی ١٩٥٥ هاتۆتە دونیاوە، لە تەمەنی بیست ساڵیدا لەگەڵ زراری خاڵۆزای خۆیدا زەماوەندیان کردووە. زرار کوڕی خاڵە سەعدون بوو، هەروەها برای زوبێدەی هاوسەری تەهاش بوو.

خاڵە سەعدون ماڵی لە کەرکووک بوو، ساڵی ١٩٧٥ شەمسە لە سێکانیانەوە بە بووکی بردیان بۆ کەرکووک. هەر هەمان ساڵ فڕۆکەکانی ڕژێمی بەعس چەند جارێک سێکانیان بۆردوومان کردبوو، لە دوو بۆردوومان‌دا چوار کەس لە گوندەکە شەهید کرابوون. جاری یەکەم حاجی حەسەن مەحموود و مریەم ڕەسوڵ لەگەڵ چەند بریندارێک. جاری دووەم مام حسێن مەحموود و مام مەحموود خدر لەگەڵ چەند بریندارێک. هەر هەمان ساڵیش بوو کە عەلی حاجی سەعید بە تەقینەوە گیانی سپاردبوو. گوندی سێکانیان بریتی بوو لە سی ماڵ، هەمووشیان خزم و کەسی یەکدی بوون. ڕۆژ ١١-٣-١٩٧٥ جەنگی بەعس و کوردەکان کۆتاییهات، دوای کۆتاییهاتنی جەنگ، شەمسە بە بووکی ڕۆیشت بۆ کەرکووک. کەرکووک شارێکی گەورە و فراوانە، زراریش تا ساڵی ١٩٧٥ و تەواوبوونی شۆڕش، پێشمەرگە بوو. دواتر ئەویش گەڕایەوە بۆ کەرکووک، بەڵام پاش هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ، زرار لەگەڵ شەمسە و منداڵەکانی گەڕایەوە سێکانیان و بووەوە بە پێشمەرگە.

شەمسە تەمەنی سی ساڵ بوو، فڕۆکەکان بە ئاسمانەوە بوون، بۆمبیان بەسەر گوندەکاندا دەباراند، بە تۆپی دوورهاوێژ، ناوچەکە تۆپباران دەکرا، شوێن نەمابوو گوللەتۆپی بەرنەکەوێت، زۆربەی گوللەتۆپەکان کە دەتەقینەوە گازی کیمیایی بوون، خەڵکی ناوچەکە بەگشتی هەناسە بڕکێیان پێ کەوتبوو. خەڵکەکە ویستیان لەپێناو دەربازکردنی گیانی خۆیاندا، بەرەو سنووری ئێران ڕەو بکەن. شەمسەش بە خۆی و پێنج منداڵەوە بەرەو ئێران ڕۆیشت، کوڕە گەورەکەی ناوی ڕزگار بوو، بەڵام ڕزگار

لە کەرکووک لەلای دایە گەورەی بوو. باوکی زرار و زوبێدە، ساڵی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کردبوو.

کۆتایی وەرزی زستان بوو، بەفر دونیای داپۆشی بوو، سەرمایەکی زۆر توند بوو. تەنانەت شەمسەش نەیتوانی چەند پارچە جل و بەتانییەک بۆ منداڵەکانشیی هەڵبگرێت، لەپێناو پاراستنی گیانی خۆی و منداڵەکانیدا، زۆر بەخێرایی لە ماڵ دەرچــوون. زراری هاوسەریشی لەماڵ نەبوو، لەو کاتەدا حکوومەت لە هەموو لایەکەوە هێرشی دەستپێکرد بوو. زراریش دەبوو وەک تەواوی پێشمەرگەکانی دیکە لە بەرگریدا بێت. تەهاش بەهۆی بەشداریکردنی لەشەڕدا لە ماڵەوە نەبوو، زوبێدە و ڕەوکـان ماوەیەک بوو ڕۆیشتبوون بۆ کەرکووک. ئـەوان لە کاتی ئەو هێرشە بەربڵاوەی ئەنفالدا لە سیکانیان نەبوون. شەمسە لەگەڵ هەندێک لە خەڵکی سیکانیان، پێکەوە بەرەو سنووری ئێران بەڕێکەوتن. فڕۆکەکانی سەدام لە ماوەی چەند ساڵی ڕابـردووی شەڕ لە دژی ئێران، ئەزموونێکی باشیان وەرگرتبوو، ئێستا بۆمب و کیمیایی بەسەر هاووڵاتیانی خۆیاندا دەبارێنن. زانست و ئەزموون هەرگیز ناتوانن، مرۆڤایەتی بهێننە ئاراوە.

ڕۆژێکی ڕەش بوو، کەس ئاگای لەکەس نەبوو، هەزاران ژن و پیاو و منداڵ بەنێو بەفردا و لە ژێر تۆپباران و بۆردوومانی فڕۆکەکاندا، بەنێو شاخ و کوێستانەکاندا بەرەو ئێران دەڕۆیشتن. خەڵکی بەپەلە ماڵ و گوندی خۆیان جێدەهێشت، هەوا سارد، زەوی بەفر و سەهۆڵبەندان بوو. خەڵکی لە دامێنی چیا سەخت بەرزەکانەوە سەردەکەوتن. هەر کەسێک کەمێک توانای هەبووایە، هاوکاری کەسانی دیکەی دەکرد. فڕۆکە و هەلیکۆپتەر بەسەر سەریانەوە بوو، لە هەر شوێنێک کەسێکیان ببینیایە بۆردوومانیان دەکرد. زۆر بەبێ ڕەحمانە وەکوو کەو ڕاویان دەکردن. فڕۆکەوانە بێویژدانەکان لە ئاسمانەوە لەنێو فڕۆکەکانیاندا دانیشتبوون و مرۆڤەکانی سەر زەویان ڕاو دەکرد، خەڵکانی بێتاوان و بێ چەکی خۆیان ڕاو دەکرد.

شەمسە بە پێنج منداڵەوە، لە مـاڵ دەرچــوو بــوو، خۆیشی و منداڵەکانیشی جلوبەرگیان کەم پێ بوو، بەتانییان پێ نەبوو، لە نێو بەفر و سەهۆڵبەنداندا بە ئومێدی ژیان و زیندوو مانەوەیان، ڕێگای وڵاتێکی دیکەیان گرتبووەبەر. شەمسە و هەزاران

کەسی دیکە ئاوارەی ئێران ببوون، هەموویان وەکوو یەک وابوون، نە جلوبەرگی پێویستیان پێبوو، نەخواردن. تەنانەت هەندێ کەس پێڵاویشی لەپێدا نەبوو، بە پێی پەتی و پێڵاوی لاستیکی دڕاوەوە بەڕێکەوتبوون. لە ڕێگا قاچیان بە پارچە قوماشێک یاخود بە نایلۆن پێچابوو. گوتن و نووسین سادەیە، زیندوو مانەوە لەژێر کیمیایی و بۆردوومانداا گرینگترە لە هونەر و ئازایەتی. خەڵکەکە نەیاندەزانی لەسەر سنوور چی ڕوودەدات، شەمسە نەیدەزانی ئێرانییەکان لەسەر سنوور هەڵسوکەوتیان چۆن دەبێت لەگەڵیاندا. ئایا هاوکاری خۆی و منداڵەکانی دەکەن؟ هەموو خەڵکەکە لەسەر سنوور چاولەدەستی خەڵکە میهرەبانەکەی ئێران بوون. شەمسەش وەک هەزاران کەسی دیکە بە ئومێدی ڕزگاربوون لە دۆزەخی سەدام حوسێن، بە ئومێدی گەیشتن بە وڵاتی ئێران ڕووی لە کێو و شاخەکان کردبوو.

شەمسە، منداڵە دوو ساڵەکەی کردبووە کۆڵی، منداڵە شیرەخۆرەکەشی لە باوەشیدا بوو، دەستی منداڵە چوار ساڵەکەشی گرتبوو. فەرەیدوون تەمەنی دە ساڵ بوو ئەو تاکە پیاوی ماڵ بوو، منداڵێکی تەمەن دە ساڵ، دەبوو وەکوو پیاو هەڵسەوکەوتی بکردایە. منداڵەکەی دیکەش هەشت - نۆ ساڵ بوو، ئەویش هەوڵی دەدا هاوکاری منداڵانی لەخۆی بچووکتر بکات. ئەی دەبێت خەڵکانی دیکە لەچ بارێکدا بووبن؟ کەس لە کەس باشتر نەبوو، هەمووان هاوکاری یەکدییان دەکرد. تێکڕا دوازدە ماڵی سێکانیان بە یەکەوە بوون. شەمسەش لەگەڵ خزم و کەسوکاری خۆیدا بوو، خۆ ئەگەر ئەو خەڵکە بە گشتی لەو ڕێگە دووروودرێژە و لەو نێو بەفر و سەرمایەدا هاوکاری یەکدی نەبوونایە، بێگومان چەندین کەس لە بەفردا ڕەقدەبوونەوە و گیانیان لەدەست دەدا. بە ڕۆژ دەبوو زۆر ئاگاداری فڕۆکە و بۆردوومانبن بوون، بە شەویش وریای سەرما و قاچ خزین و هەڵدێرانبن. لەو ڕێگا کوێستانییەدا گورگ و ئاژەڵی دڕندە زۆر بوون، بەڵام لە هەموویان خراپتر، ئەو «مین» ـە چێنراوانەی سەرڕێگا و ناوچەکە بوون. لە ڕێگادا چەندین کەس مینیان پێدا تەقیەوە و شەهید بوون، هەزاران کەس بەسەر شاخەکانەوە سەرگەردان بوون، چەندین کەس بەهۆی بەفر و سەرماوە، قاچەکانیان تووشی نەخۆشی بوون. لە سەرڕێگە چەندین لاشەی مردوو، جێمابوون، کەسێک توانای ئەوەی نەمابوو دووریان بخاتەوە و لە شوێنێک بە خاکیان بسپێرێت. ئەو

خەڵکە دەبوو بە زوویی بڕۆن خۆیان ڕزگار بکەن. هەلیکۆپتەرەکان لە ئاسمانەوە بە شەستیر دەستڕێژیان دەکرد، مینەکانیش لەسەر زەوی دەتەقینەوە.

شەمسە دەترسا، لەهەموو شوێنێک دەترسا، لە گیانی منداڵەکانی دەترسا، ئێوە دەتوانن چاوەکانتان بنوقێنن و هەست بەهەستی شەمسە بکەن، بۆ پاراستنی گیانی منداڵەکانت کەمێک بیربکەرەوە و وا هەستبکە، لە گوندێکی دوورەدەستی کوێستان لە ماڵی خۆت دانیشتوویت، شەڕ بەردەرگای پێگرتوویت و لە ئاسمانەوە گوللەتۆپ و کیمیاییت بەسەردا دەبارێنن. لە نێو ماڵ و گوند و کۆڵان و دەوروبەر لاشەی ژن و منداڵ و کەسوکاری نزیکت لەسەر زەوی کەوتوون. ترس هەموو لایەکی گرتۆتەوە. ترس لە مردن، ترس لە بریندار بوون و کەمئەندام بوون، ژنێک بە پێنج منداڵەوە بەبێ هاوسەر. هەموو خەڵکی گوندەکە دەیانەوێت ڕابکەن و بڕۆن، فڕۆکە دێت و بۆردوومان دەکات. کات نییە، ئەگەر ئەو ژنە کەمێک دوا بکەوێت خۆی و منداڵەکانی گازی کیمیایی دەیانکوژێت. کاتی بیرکردنەوەش نییە، تەنانەت کاتی ئەوە نییە دەرگای ژووری ئاژەڵەکان بکەیتەوە و بەبێ زیان بڕۆنە دەرەوە، هەتا کاتی ئەوەت نییە دەرکەی کولانەی مریشک و کەڵەشێرەکان بکەیتەوە. پێویستە هەرچی زووە ڕابکەیت و خۆت ڕزگار بکەیت. لە هەموو لایەکەوە هاوار دەکرا بەخێرایی ڕابکەن و بڕۆن. هەوا سارد و سەر زەوی یەکپارچە بەفر. زۆر ئەستەم بوو بە ڕێگەکاندا بڕۆن، ڕێگەکان بەردەوام بۆردوومان دەکران. دەبوو بە تولە ڕێگاکاندا بڕۆن. دەبوو بە شاخێکدا سەربکەون و دابەزنەوە، دوبارە و چەندبارە لەم شاخ بۆ ئەو شاخ بڕۆن، هەزاران کەس بەڕێگاوە بوون، هەرچەندە لە کێوە بەرزەکانی سەرسنوور نزیکتر دەبوونەوە سەرماکە زیادی دەکرد، بەفر و سەهۆڵبەدان زیاتر دەبوو.

پێنج منداڵ، کە گەورەکەیان تەمەنی دە ساڵ بوو، بچووکەکەشیان شیرەخۆرە بوو، منداڵەکان هاواری دایکیان دەکرد و نەیاندەتوانی بە ڕێگەدا بڕۆن، نەیاندەتوانی خێراتر هەنگاو هەڵهێننەوە. منداڵی تەمەن دوو ساڵ و پێنج ساڵ، چۆن دەتوانن بەرگەی ئەو بەڵا گەورەیە بگرن، ئەو منداڵانە مینە چێندراوەکانیان نەدەبینی و مینەکانیان نەدەناسی، گەورەکانیش مینەکانیان نەدەبینی. شەمسە چۆن دەیتوانی لەژێر بەفرەوە مینەکان ببینێت. چەندین پێشمەرگە و شارەزاش لەگەڵ خەڵکەکەدا، بەرەو ئێران

دەڕۆیشتن، ئەوان هاوکاری خەڵکیان دەکرد تاکو بەسەر مینەکاندا نەڕۆن، سەرباری ئەوەش چەندین کەس بە تەقینەوەی مین شەهید و بریندار بوون.

ژنێک کە هاوسەرەکەی لە بەرەکانی جەنگدا بوو، خۆیشی لەبەرەی ژیاندا، ژنێکی ئازا، هاوسەرەکەی لەپێناو ئازادیدا دەجەنگا، خۆیشی لەپێناو زیندوو هێشتنەوەی منداڵەکانی لەگەڵ سروشتی تووڕەدا لە جەنگدا بوو. بە هەژاری و بە نەداری لە دەست حکوومەت و سەربازەکانی هەڵهاتبوو. حکوومەت و ئەفسەر و سەربازانێک کە دەبوو پشتیوانی و لایەنگری لێ بکەن، کەچی ببوونە دوژمنی گیانی ئەو. خواردن نەبوو، خەڵکی هەموو بەدوای خواردندا وێڵ بوون. هیچ خواردنێک پەیدا نەدەبوو، تاکو نرخێکی بۆ دیاری بکرێت. منداڵان لە برسێتی و سەرمادا دەگریان. لەو شاخ و کێوە، ئاو زۆر بوو، بەڵام خواردن نەبوو، خەڵکی هەرچی شتێکیان بەردەست کەوتایە دەیانخوارد، لەژێر بەفرەوە دەگەڕان بۆ بنچکە گیایەک. شەوانە لە ترسی هێرشی سەربازەکانی سەدام، ئاگریان نەدەکردەوە. لەو شاخ و نێو بەفرە زۆرەدا، خێمەیەک نەبوو بچنە ژێری و پەنا بگرن. بەتانییەک یان پەتۆیەک نەبوو خۆیانی پێ داپۆشن. ئەگەر کەسێک لەژێر شاخێکدا بەرنوایەکی دەستبکەوتایە، ئەوا بەختی هەبوو کەمێک خۆی لەسەرما دەپاراست. دێهاتەکانی سەرڕێگەش هەموو چۆڵ کرابوون و دانیشتووانی ئەو گوندانەش بەرەو ئێران ڕێگایان گرتبووەبەر، هەرکەسێک لە سەرڕێگە هەر شتێکی سادەی ببینیایە هەڵی دەگرتەوە. نەوەک لە کاتێکدا پێویستی پێی هەبێت.

### قەیتانی کۆنە پۆستاڵێک

سێ ڕۆژ بوو لەو شاخ و بەندەنە بە ڕێگاوە بوون، ڕۆژێک شەمسە لە ڕێگا، قەیتانی کۆنە پۆستاڵێکی بینی، دانەوییەوە قەیتانەکەی هەڵگرتەوە. یەکێک لەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون، پرسی: ئەو قەیتانە کۆنەت بۆچییە.. بەکەڵکی چی دێت؟ شەمسە گوتی: نازانم، کێ دەڵێت ڕۆژێک بەکەڵکم نایەت؟ ئەو خەڵکە تەنانەت قەیتانە کۆنیشیان بەشتێکی بەنرخ دەزانی. شەمسە قەیتانەکەی خستە گیرفانیەوە، خۆ ئەگەر

بەفر و تۆپباران نەبووایە لە ماوەی دوو ڕۆژدا دەگەیشتنە سەر سنوور. هەزاران کەس لە دامێنی کێوەکاندا لە ڕووبەڕێکی کەمی بەر تەسکدا بەڕێوەبوون. کێوە بەرز و سەرکەشەکانی سەرسنووری عێراق - ئێران، دوو وڵات لە یەکدی جیا دەکەنەوە، چەند لە سنوور نزیکتر دەبوونەوە بەرزییەکە زیادی دەکرد. چەند بەرزاییەکەش زیاتر بووایە، سەرکەوتن ئەستەمتر بوو. دەبوو هەموو بە گەردەنەکەدا سەربکەون. لەسەر گەردەنەکە ترسیان زیاتر دەبوو، ترسی بینینیان لەلایەن دوژمنەوە، ترسی قەرەباڵغی سەر گەردەنەکە، ترسی کەمبوونی خۆراک، لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو، تاکو لەسەری گەردەنەکەوە نزیکتر دەبوونەوە، ئەستووریی بەفرەکە زیادی دەکرد. لە هەندێک شوێندا بەرزی بەفرەکە دوو مەتری تێپەڕاند بوو، لەو دۆخە هەر کەس دەیویست بەزوویی خۆی لە سەرما ڕزگار بکات. بەڵام زۆربەی خەڵکەکە هاوکاری یەکدییان دەکرد، خزم و کەسوکار هاوکاری شەمسە و منداڵەکانیان دەکرد. فەرەیدوونی تەمەن دە ساڵ، هاوکاری خوشک و برا بچووکەکانی دەکرد و دایکی دەکرد. شۆڕشی تەمەن هەشت ساڵیش کاری پیاوانەی دەکرد. شۆڕش و فەرەیدوون لەگەڵ سروشتدا لەشەڕدا بوون. کوردەکان بێکەس و بێ پشتوپەنا بوون، هەموو جیهان ئەو کارەساتەیان دەبینی، بەڵام بێدەنگیان لێدەکرد. پەیامنێرە نێودەوڵەتییەکان هەواڵەکانیان بە کورتی بڵاو دەکردەوە. زیاتر لە دە هەزار کەس بەهۆی کیمیابارانەوە ئاوارە ببوون، بەڵام کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی هیچ کاردانەوەیەکیان نەبوو.

ڕێگاکە بەردەڵان و هەڵدێر و پڕ بەفر بوو، زۆر کەس پێڵاوەکانیان دڕابوون و هەندێکیش پێڵاویان لە پێدا نەمابوو. زۆربەی زۆری خەڵکەکە بەهۆی سەرماوە نەخۆش کەوتبوون و تووشی کۆکەیەکی قورس ببوون، "تا"یان هەبوو، بەڵام هیچ چارەیەکیان نەبوو، دەبوو بەردەوامبن لە ڕۆیشتن، یان دەبوو بمرن. هەندێک کەس شوێنەواری کیمیایی بەجەستەیانەوە دەبینرا و تووشی ڕشانەوە ببوون. هەندێکیان "گازی ئەعساب" کاریگەری لەسەر دروست کردبوون، ئەوان نیوە شێت ببوون، خۆیان دەخستە سەر زەوی و هاواریان دەکرد، پەلاماری کەسانی دیکەیان دەدا و جوێنیان دەدا. دەرزی و دەرمان بۆ بریندارانی چەکی کیمیایی نەبوو. خەڵکەکە بە میهرەبانی لەگەڵیان دەجوڵانەوە. توڕەبوونی ئەوانیان بەهۆی کاریگەری کیمیاییەوە

دەزانی، تا لە تواناياندا بووايە، هاوكاری ئەو نەخۆشانەيان دەكرد. هەندێكيان بەگازی خەردەل سووتابوون. ئەوان جەستەيان دەسووتايەوە، لەتاو ئازاری جەستەيان لەو سەرما زۆرەدا برينەكانيان بە بەفر دەشۆری، منداڵان تووشی لەرزوتا ببوون، بەڵام هەر دەبوو هەر برۆن و ڕێگاكە ببڕن. كوڕێك دايكە پيرەكەی لە كۆڵ كردبوو، زۆربەی دايكان و باوكان منداڵەكانيان لە كۆڵ كردبوو، هەندێكيشيان منداڵەكانيان لە قەڵا دۆشكان كردبوو.

لەو كەشە ناهەموارەدا، بەردەوام تۆپبارانيان لەسەر بوو، تا لە سنوور نزيكتر دەبوونەوە تۆپباران چڕتر دەبوو. سەربازانی سەدام دەيانزانی بە نزيكبوونەوەيان لە سنوور، ناچار دەبن ماوەيەك لەگەردەنەكە بووەستن و قەرەباڵغيەكی زۆر دروست دەبێت، چونكە لەو شوێنەدا ڕێگاكە بەرتەسك دەبووەوە. گوللەهاوەن يەك لەدوای يەك لە ئاسمانەوە دەهاتە خوارەوە. منداڵ هەموو شەكەت و برسی بوون. لە سنووری ئێران نزيك ببوونەوە، لە دوورەوە چاويان لە سەربازانی ئێرانی بوو، هێليكۆپتەرە عێراقييەكان، لەترسی موشەكی ئێرانييەكان نەياندەوێرا لە سنوور نزيك ببنەوە، بەڵام تۆپباران زيادی كردبوو، چەند كەسێك بەهۆی تۆپبارانەوە شەهيد بوون و چەندين كەسی ديكەش بريندار بوون، بەفرەكە بەخوێنی كوردەكان سوور ببوو.

بەڕۆژ ئەگەر ئاسمان ساماڵ بووايە، تيشكی خۆر لە بەفرەكەی دەدا و لەسەر بەفرەكەوە تيشكەكە دەيدايەوە لە چاوی ئاوارەكان، ئەوەش ئەوانی بێزار كردبوو، چاويان باش نەيدەبينی، گەورەكان چاوی منداڵەكانيان بە پارچە پەڕۆيەك دادەپۆشی. بەهۆی تيشكی خۆرەكەوە پيادەڕۆيی دژوارتر بوو، هەڵبەت ئەگەر بەفر نەبووايە، ڕێگە ڕۆشتن ئاسانتر بوو.

چوار ڕۆژ بوو بەڕێگاوە بوون، لە سنووری ئێران نزيك ببوونەوە، شەكەتی و برسێتی پەرێشانی كردبوون، هێزی ڕۆيشتنيان نەمابوو، شەويش تاريك و مەترسيدار بوو. حافزی شيرازی دەفەرموێ:

شەو تاريكە و ترسم لە شەپۆل و گێژاوی دەريايە

كەنار نشينی ئاسوودە كەی لە حاڵم بەئاگايە

منداڵەكانی شەمسە دەگريان، ئەوانيش وەك منداڵانی ديكە شەكەت و برسی

بوون. هەندێک منداڵ لەتاو سەرما و برسێتی لەهۆش خۆیان چووبوون. پیرەکان بە گەنجەکانیان دەگوت: ئێمە تەمەنێکمان کردووە لەنێو ئەم بەفرە جێمان بهێڵن، بڕۆن و منداڵە بچووکەکان لەگەڵ خۆتاندا بەرن. خێرا بڕۆن و لە سنوور ئاودیوبین. ئێرانییەکان کەسانی میهرەبانن و هاوکاریتان دەکەن. بەڵام کوردانی میهرەبان و دڵسۆز، چۆن دەیانتوانی خۆشەویستانی خۆیان جێبهێڵن؟ چۆن دەیانتوانی خۆیان بڕۆن و ئەوان جێبهێڵن؟

گرووپێکی چل - پەنجا کەسی کە شەمسەش لەگەڵ ئەواندا بوو، تەواو شەکەت و ماندوو ببوون، بڕیاریان دابوو لە شوێنێک دابنیشن و پشوویەک بدەن، بەهەموویان کەمێک نانە وردەیان پێمابوو، لە نێوان خۆیاندا بەشیان کرد، ئەوە دوایین پارووە نان بوو، بەتانی زۆر کەم بوو، چەند کەسێک بەتانییان بەسەر سەری خۆیاندا دابوو، لەژێر هەر بەتانییەک چەند کەسێک هەبوون، لەژێر بەتانییەوە باوێشکیان دەدا و خەویان دەهات. پیاوە پیر و بە ئەزموونەکان ئاگاداریان دەکردنەوە کە نەخەون. ئەگەر لەو سەرمایە بخەون دەتانبەستێ. منداڵەکانی شەمسە لەپاڵ دایکیاندا بوون. فەرەیدوون و شۆڕش دڵی هێرش و ڕۆژگاریان دەدایەوە. بەشە نانەکەی خۆیان دەدا بە ئەوان. "شالاو"ی یەک ساڵە، لە باوەشی دایکیدا بوو، لەسەرمادا تەزی بوو، دایکی شیری تێدا نەبوو تاکو بیداتێ. شەمسە هیچی نەخواردبوو هەتا شیری تێدابێت. چوار ڕۆژ بوو ئاوی گەرمیشی نەخواردبووەوە. لە ترسا ئاگریان نەدەکردەوە. دایکە، منداڵە کۆرپەکەی توند لە ئامێز گرتبوو، شالاوی خۆشەویستی دەنوساند بە سنگییەوە، مەمکی بێ شیری خۆی خستە نێو دەمی کۆرپەکەیەوە. کۆرپەکە مەمکی دایکی دەمژی بەڵام شیری تێدا نەبوو. منداڵەکە برسی بوو، شەکر نەبوو تا قەنداوییدەنێ، ئاگرێک نەبوو تاکو کەمێک ئاوی بۆ گەرم بکەن و بیدەنێ. منداڵەکە بەبرسێتی لە ئامێزی دایکیدا بوو. دایکە بەهیوای شیرپێدانی کۆرپەکەی لە هەوڵدا بوو. دەستی خستبووە سەر نێوچەوانی منداڵەکەی، دەیویست بە لەپی دەستی سەری منداڵە یەک ساڵەکەی گەرم بکاتەوە. لەناکاو تۆپباران دەستی پێکرد. گوللە هاوەنەکان لێرە و لەوێ دەکەوتن. هاوار بەرز بووەوە. ئاخێک لە هەوادا بەرز بووەوە. ناڵەیەک لەنێو شاخەکاندا دەنگی دایەوە. جەستەیەک کەوتە سەر زەوی. مرۆڤێک کوژرا یان بریندار بوو.

ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٣ بوو هێشتا لە خاکی عێراقدا بوون و گەیشتبوونە نزیک گوندی گەلاڵە، لە ترسی بۆردوومان نەچوونە نێو گوندەکە. هەر لە کێو مابوونەوە. لەناکاو ویزەی گوللە هاوەنێک هات و لە نزیک شەمسەوە دای لـەزەوی، پارچەی گوللە هاوەنەکە و پارچە بەرد بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، شەمسە ئاخێکی کرد و خوێن لە دەستیەوە فیچقەی کرد، منداڵەکان هاواریان کرد دایکە دایکە، چەند کەسێک هاواریان کرد شەمسە، شەمسە بریندارە، پارچەی گوللە هاوەنەکە لە قۆڵی ڕاستی دلبوو، ئێسقانی قۆڵی شکاندبوو، دەستی چەپیشی بریندار ببوو، بەڵام برینەکەی سووکتر بوو. دەستی ڕاستی، ئێسقانەکانی ورد ببوو، خۆ ئەگەر شەمسە دەستی لەسەر سەری شالاو نەبووایە، بەدڵنیاییەوە پارچەکە لەسەری شالاوی دەدا و شالاوی یەکساڵە هەر لەوێ دەمرد. دەستی دایکی ببووە سپەر بۆ سەری ئەو. خوێن بە خوڕ لە دەستی شەمسە دەهات، لەوبارە ناهەموارەدا، هاواری دەکرد و دەیگوت کوا منداڵەکان؟ ئایا ئەوان سەلامەتن؟ کوان منداڵەکانم لە کوێن؟ شالاو چۆنە؟ فەرەیدوون و شۆڕش هاواریان دەکرد دایکە گیان خەمت نەبێت، ئێمە سەلامەتین. یەکێک هاواری کرد لە پشت برینەکەی دەستیەوە قۆڵی بەتوندی ببەستن، با تووشی خوێنبەربوون نەبێت. لەو کاتەدا هیچ شتێک نەبوو تاکوو قۆڵی پێ ببەستن. بە لەچکێک قۆڵیان بۆ بەست، بەڵام خوێن نەدەوەستا. چەندێک هەوڵیان دا نەیانتوانی خوێنی دەستی بووەستێنن، شەمسە خەریکبوو لەهۆش خۆی دەچوو، هێزی دایە خۆی و گوتی: قەیتانێکی پۆستاڵ لەنێو گیرفانمدایە. کەسێک دەستی بەگیرفانیدا کرد و قەیتانە کۆنەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، لەو کاتەدا هیچ شتێک لەو قەیتانی پۆستاڵە باشتر نەبوو کە بتوانێت فشار لە دەمارەکانی دەستی بکات و خوێنی دەستی بووەستێنێت. بە قەیتانەکە توند قۆڵیان لە پشت برینەکەوە بەست. قەیتانی کۆنە پۆستاڵ بەکەڵکی خۆی هات، "لە بیاباندا، تاکە پێڵاوە کۆنێکیش بەرەکەتە".

گەیشتبوونە نزیک سنووری ئێران، تۆپباران بەردەوام بوو، دەنگی وەڵامدانەوەی تۆپخانەکانی ئێرانیش بەباشی دەبیسترا. تۆپخانەکانی ئێران ماوەی پازدە خولەک بەبەردەوامی تۆپبارانی هێزەکانی عێراقیان کرد. دواتر تۆپخانەکانی عێراق بێدەنگ بوون. خەڵکەکە بەردەوام هاواریان دەکرد. شەمسە لە نزیک سنوور بوو. سەربازانی

ئێران لەوێ بوون. یەکێک گوتی: هەر چۆنێک بێت، دەبێت شەمسە بگەیەنینە لای سەربازەکان. ژنەکان و خزمەکانی هەوڵیان دەدا. ژنێکی میهرەبان شەمسەی گوت: نیگەران مەبە. من ئاگام لە منداڵەکانت دەبێت. ژنێک شاڵاوی لە باوەش گرت. ژنێکی دیکەش هێرشی لە باوەش کرد. پیاوێکی گەنجیش ڕۆژگاری خستە سەر شانی. شۆڕش و فەرەیدوون شپرزە ببوون. منداڵەکان لە برینداربوونی دایکیان ترسا بوون. برسێتی و سەرمایان لە بیرچووبووەوە. بەدوای دایکیاندا ڕایان دەکرد. خزمانئاگاداری منداڵەکان بوون. گوتیان مەترسن. دایکتان چاک دەبێتەوە. ئێوە ناتوانن لەم شەو تاریک و بەفراوییەدا بڕۆن. فەرەیدوون و شۆڕش ویستیان بڕۆن. ژنێک گوتی ئێوە دەبێت ئاگاداری منداڵە بچووکەکان بن و بەرپرسیارێتییان هەڵبگرن. بەرپرسیارێتی چاودێریکردنی خوشک و برا بچووکەکانتان.

شەمسە نەیدەتوانی بە ڕێگەدا بڕوات، دوو ژن چووبوونە ژێر باڵی و لە ڕۆیشتندا هاوکاریان دەکرد. شەمسە چاوی لە ڕەشەوە دەهات، ژنێکی گەنجی بەهێز، لەوێ بوو. ژنێک لەو شێرەژنە کوردانەی کە ئازایەتی بەرامبەر بە سەد پیاو بوو. شەمسەی کردە کۆڵی و بردی بۆ بنکەی هێزەکانی ئێران. دیار بوو کە چەند سەرباز و پاسدارێکی ئێرانیش بریندار ببوون. سەربازەکان بە میهرەبانییەوە پێشوازییان لێ کردن. کۆمەکیان کردن، دەستی شەمسەیان تیمارکرد و خوێنبەربوونەکەیان وەستاند. دەرزییان بۆ کرد. گوتیان مەترسە. هەر ئێستا هێلیکۆپتەر دێت تا بریندارەکانی خۆمان ببات. تۆش دەبات. سەربازەکان ئاوی گەرم، خواردن و بەتانییان دەدایە ئەو کەسانەی دەگەیشتنە سەرسنوور. ئەوان بەرەو ئێران دەڕۆیشتن. لەو شوێنەوە جادە بۆ نێو ئێران نزیک بوو. ژن و منداڵیان سواری ماشێن دەکرد و بەرەو شاری بانە بەرێیان دەکردن. شەمسە زۆر ئازاری هەبوو، سواری هەلیکۆپتەریان کرد و بردیان بۆ بانە. شەمسە زۆر پەرێشان بوو. ئەویان بە هێلیکۆپتەر برد بۆ بانە. شەمسە، زۆر نیگەرانی منداڵەکانی بوو. نەخۆشخانەی بانە پڕ بوو لە بریندار. زۆر سەربازی برینداری لێ بوو. کوردانی ئاوارەی برینداریش زۆر بوون. کەسانێک دەست و قاچیان سەرما بردبووی، چەند کەسێک بریداری مین بوون، دەبوو قاچیان ببڕدرێتەوە. نەخۆشخانەکە قەرەباڵغ بوو. هەندێکیان هەوکردنی سییەکانیان هەبوو. جگە لە پزیشک و پەرستاران،

زۆر کەسی لە خۆبەخشیش یارمەتیدەر بوون. خەڵکی ئەو شارە زۆر میهرەبان بوون. کوردانی ئێرانی بەگشتی هاوکاری بریندار و نەخۆشەکانیان دەکرد. خەڵکی بانە هەر کەسێک لە نەخۆشخانە بەرەو چاکبوونەوە دەچوو، ئەوان دەیانبردنەوە بۆ ماڵی خۆیان، خۆ ئەگەر باشی و میهرەبانی ئەو خەڵکە نەبووایە نەخۆشخانە نەیدەتوانی فریای ئەو هەموو نەخۆش و بریندارە بکەوێت.

کۆتایی وەرزی زستان و نزیکی نەورۆز بوو، بەڵام سەرما بەفر بانەی گرتبوو. سەرماکە زۆر بەهێز بوو. سەربازان و پاسداران زۆر هاوکارییان دەکرد. پزیشکان و پەرستارانی ئێرانی، لە گیانی خۆیان بوورا بوون. لە نەخۆشخانە، ئێرانی و عێراقی، شیعە و سوننە، کورد و فارس و تورک هەموویان پێکەوە خزمەتیان دەکرد. هیچ جیاوازییەک لەنێوان هیچ کەسێکدا نەدەکرا. کوردانی ئێرانی خواردن و پێداویستییەکانی دیکەیان دەهێنا بۆ نەخۆشەکانی نەخۆشخانە.

باری تەندروستی شەمسە فریاگوزاریی بوو، دکتۆر گوتی: بەزوویی بیبەنە ژووری نەشتەرگەریی. پەرستارێک هات تاکو ڕەزامەندی برینەوەی دەستی شەمسە وەربگرێت. پەرستار پرسیی: خزمی نزیکی شەمسە عەبدوڵلا فەرەج کێ لێرەیە؟ گوتیان: کەسێکی نزیکی لێرە نییە. منداڵەکانیشی بەڕێگاوەن؛ بەڵام منداڵەکانیشی بچووکن، گەورەکەیان تەمەنی دە ساڵە. هاوسەرەکەشی لەگەڵدا نییە. هاوسەرەکەی پێشمەرگەیە و کەس نازانرێت لە چ بەرەیەکی شەڕە. پەرستارەکە، چاوی پڕ بوو لە ئاو. ڕۆیشت و دکتۆری نەشتەرگەری هێنا. دکتۆر بە جلوبەرگی نەشتەرگەرییەوە لە ژووری نەشتەرگەریی هاتە دەرەوە. پرسیی: کێ لەگەڵ ئەم ژنەدایە؟ ئەو پاسدارەی کە شەمسەی هێنابوو گوتی: کەسی لەگەڵدا نییە. لە هەلیکۆپتەرەکەدا جێگە نەبوو، خزم و منداڵەکانی بەڕێگاوەن. دکتۆر گوتی: کەواتە کێ دەڵێت کە ئەو پێنج منداڵی بچووکی بەڕێوەیە؟ سەربازەکە گوتی: من وا دەڵێم. هەموو دەزانن کە ئەو پێنج منداڵی هەیە. دکتۆر گەڕایەوە بۆ ژووری نەشتەرگەریی. بە هاوکارەکەی خۆی گوت دەستی نەخۆشەکە مەبڕەوە. سبەینێ ئەویش لەگەڵ نەخۆشە هیلاکەکان ڕەوانەی تەوریز بکەن. ڕەنگە لە تەوریز بیرێک لە دەستی ئەم ژنە بکرێتەوە. چۆن دەکرێت دەستی ئەم ژنە خاوەن پێنج منداڵە ببڕینەوە، بەڵکو لە تەوریز ڕێگەچارەیەک بۆ

دەستی بدۆزنەوە. دوو بتڵ خوێنیان کردە شەمشەوە. پاشان پلازمایان بۆ هەڵواسی. چەند ئەمپولی تریان لێدا. دوای تێکردنی خوێن و پلازما، خواردنیان پێدا. گەرمی بووەوە. تەندروستی شەمسە بەگشتی باشتر بوو. بەردەوام هەواڵی منداڵەکانی دەپرسی. دەیگوت خۆزگە زرار لێرە دەبوو. خۆزگە تەها لێرە دەبوو. خۆزگە یەکێک لە خزمەکانم لای منداڵەکانم بووایە.

ڕۆژی دواتر شەمسەیان بە ئامبولانس ڕەوانەکرد بۆ تەورێز. ، پەرستارێکی میهرەبان هاوەڵی ئەو بوو بۆ ڕێگا. زۆر ئاگاداری بوو. پەرستارەکە کورد بوو. بەردەوام دڵی دەدایەوە،. شەمسە نیگەرانی منداڵەکانی بوو. هیچ هەواڵێکی نەدەزانین. پەرستارەکە پێی گوت خزمەکانت چاودێری منداڵەکانت دەکەن. پەرستارەکە گوتیشی سەربازەکان هەمووانیان لە سنوور تێپەڕاندووە. ئێستا منداڵەکانت لەنێو خاکی ئێراندان. جێگەیان گەرمە و برسییش نین.

شەمسەیان برد بۆ نەخۆشخانەی شوهەدای تەورێز. دکتۆرە پسپۆڕە کارامەکان، دەستیان نەبڕییەوە. شەمسە پێنج کاتژمێر و نیو لە ژووری نەشتەرگەریی بوو. دواتر گواستیانەوە بۆ ژوورێک. هەردووک دەستی لە گەچ گیرابوون. پەرستارەکان زۆر لەگەڵیدا میهرەبان بوون. شەمسە هاتبووەوە هۆش خۆی، پرسیاری دەکرد: منداڵەکانم لە کوێن؟ دیپرسی: شالاو لە کوێیە؟ فەرەیدوون، شۆڕش، ڕۆژگار و هێرش لە کوێن؟ پەرستاری میهرەبان، مژدەی پێدا کە منداڵەکانی هەموو ساغ و سەلامەتن. ئەوان لە شاری بانەن. لای خزم و کەسەکانتن. ئێمە لە نەخۆشخانە، جێگامان نییە منداڵەکانت بهێنینە ئێرە. ئەوان لە شاری بانەن و تۆش باشدەبیت و دەگەڕێیتەوە بۆ بانە. نەخۆشخانەی تەورێز، پڕبوون لە کوردانی بریندار و کیمیایی لێدراو. ئەو کوردانەی کە لە ڕێگادا سەرما کاری تێکردبوون و نەخۆش کەوتبوون. ئەو کوردانەی لە شاخەکانەوە هەڵدێرابوون. ئەو کەسانەی بەمین بریندار ببوون. پیاوێک و ژنێک و منداڵێک کە قاچیان بڕدرابووەوە.

ڕۆژی دووەم و سێیەم، نەخۆشە کوردەکانی نەخۆشخانەکە، سەردانی شەمسەیان کرد. هاوڕێیانی زرار و تەها ئاگادار بوون کە شەمسە عەبدوڵڵا فەرەج بریندارە. هاوڕێکانی خاڵ و مامەکانیشی زانییان کە شەمسە لە نەخۆشخانە کەوتووە. ئەوان

هەموویان سەردانی شەمسەیان کرد. شەمسە هەستی بە تەنیایی نەدەکرد؛ بەڵام ئەو منداڵەکانی دەویست. خەڵکێکی زۆر لەوێ شەمسە و هاوسەرەکەی، زراری فەرماندە و خاڵەکانی: سەعدون، سەعید و عەبدوڵلایان دەناسی. بەڵام میهرەبانی هاوزمان و هاوشاری و دۆستان، نەیدەتوانی کەمێک خەمی دووریی منداڵەکانی کەم بکەنەوە. ئەو نیگەرانی منداڵە وردەکانی بوو. ئەمانەتەکانی هاوسەرەکەی. دڵدانەوەکان، کەمێک دڵی شەمسەیان ئاسوودە دەکرد. دەیزانی کە منداڵەکانی سەلامەتن. ئەو کاتە، تەلەفۆنیش زۆر بەئەستەم پەیدا دەبوو.

**ڕۆیشتنی تەها بۆ ئێران**

تەها بیستی کە شەمسەی خوشکی لە نزیک سنووری بانە بریندار بووە و بردویانە بۆ بانە. تەها بەتوانا بوو. ئەویش بەرکەوتەی بۆمبی کیمیایی بوو. جەستەی دەسووتایەوە. نەخۆشی پێستیشی هەبوو، دوبارە سەری هەڵدابووەوە. مۆڵەتی وەرگرت و بەرەو ئێران بەڕێکەوت. تەها شاخ و بەفر و سەهۆڵبەندانی زۆری دیبوو. ئەو هەر لە منداڵیەوە پەروەردەی ناو شاخ و بەفر بوو. دەیان جار لە سلێمانییەوە بە پێ ڕۆیشتبوو بۆ سەرگەڵوو و سێکانیان. ئەو چەندین جار بە شاخ و کێوە بەفراوییەکاندا تێپەڕیبوو. چەند جار بەپێ ڕۆیشتبوو بۆ سەردەشت و بانە. تەها کەسێک نەبوو سڵ لە بەفر و باران و سەرما بکاتەوە. ئەو بۆ دۆزینەوەی خوشکەکەی بە پیادەڕۆیی ڕێگای ئێرانی گرتەبەر. تەها دەیزانی کە ناکرێت بە چەک و کلاشینکۆفەوە بڕواتە نێو خاکی ئێران، هەربۆیە کلاشینکۆف و فیشەکدانی لای هاوڕێکانی جێهێشت و بۆخۆی بەرەو ئێران بەڕێکەوت. لەو تاشەبەرد بۆ ئەو تاشەبەرد بازی دەدا و بەفر تا ئەژنۆی دەهات. بەڵام تەها وەک بەوری سیبریا، لەنێو بەفردا بازی دەدا. ئەو نەیدەزانی بەچی هێز و توانایەکەوە بەرەو پێش مل دەنێت. شەمسە، خوشکی بوو، خوشکێک کە بە منداڵی چەندین جار کۆڵی کردووە و بۆ نێو دارستانەکانی بردووە. خوشکێک هەمیشە هاوڕێ و هاوکاریشی بوو. خوشکێک کە هاوسەری زراری خاڵۆزای بوو. خوشکێک کە براژنی زوبێدە بوو. بۆ پیاوێکی کورد هەر یەکێک لەم پەیوەندییانە

بەسە کە گیانی خۆی لەپێناویدا ببەخشێت. تەهاش نیگەرانی منداڵەکانی خوشکەکەی بوو. خوشکەکەی شەش منداڵی هەبوو. پێنج لە منداڵەکان لەگەڵ خوشکەکەیدا بوون. تەها نەیدەزانی ئەو منداڵانە لای کێن؟ کێ چاودێری شاڵاوی یەک ساڵە دەکات؟ فەرەیدوون و شۆڕش چی دەکەن؟.

خەڵکی زۆری دیکەش بە ڕێگاوە بوون، ئەوانیش بۆ گەیشتن بە ئێران لە جوڵەدا بوون. تەها بوخچەیەک، نان و مێووژ و پەنیری وشک و مەتارەیەک ئاوی پێبوو. جوتێک پێڵاوی توندوتۆڵی لەپێ کردبوو. جلوبەرگی گەرمی لەبەرکردبوو. جەمەدانەیەکی لە ملی پێچابوو. بەکێواندا ڕایدەکرد، تاکو خۆی بگەیەنێتە لای خوشکە میهرەبانەکەی. تەها لەڕێگادا پێش خەڵکەکەی دیکە دەکەوت. بەنێو بەفردا دەڕۆی، زۆر خەمی "مین"ـە چێنراوەکانی سەرڕێگای بوو. هەرکاتێک هێلیکۆپتەرەکانی سەدام نزیک دەبوونەوە، لەشوێنێکدا خۆی پەنادەدا. خەڵکێکی زۆر بەڕێگاوە بوون. تەها دەیزانی کە زرار لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانیدا نییە. زراری فەرماندە، هاوسەری خوشکەکەی، لە جەنگێکی سەخت بوو. سوپای سەدام بڕیاری دا بوو کە ڕێگە نەدرێت کوردەکان بگەنە نێو خاکی ئێران.

سوپای سەدام بەنیازبوو کوردەکان لەڕێگا، لەنێوبەرێت. دەستی لەکەس نەدەپاراست ژن و منداڵ و پیاوی دەکوشت. مەگەر کاتێک چەکی کیمایی بەکاردەهێنا مەبەستیان چی بوو؟ مەبەستیان زیاتر لە جینۆساید بوو. مەبەستیان تەنانەت کوشتنی ئاژەڵەکانیش بوو. بەبۆمبی کیمیایی، ئاو، خاک و ڕووەکیشیان ژەهراوی کردبوو. درەختەکانیان تووشی نەخۆشی کردبوو. بۆمبی کیمیایی تەنانەت شوێنەواری لەسەر بەردەکانیش جێهێشتبوو. پێشمەرگەکان دەبوو بەرگری بکەن تاکو خەڵکی ئاسایی بگەنە سنووری ئێران. زراری فەرماندەش لەو بەرگرییەدا بەشدار بوو.

تەها ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ گەیشتە ئێران، دوای چەند ڕۆژێک، هێزەکانی سەدام دەستیان بەسەر سەرگەڵوو، بەرگەڵوو سێکانیان و سکرتاریەتی مام جەلال لە یاخسەمەردا گرت. شەپۆلی دووەمی ئاوارەکان گەیشتە ئێران.

تەها گەیشتە بانە، منداڵەکانی شەمسەی دۆزییەوە، فەرەیدوون و شۆڕش و منداڵەکانی دیکە کە خاڵە تەهایان بینی زۆر خۆشحاڵ بوون. وەکوو پەپوولە

بەدەوریدا دەسووڕانەوە. تەها لە شوێن و جێگای منداڵەکان دڵنیابوو. پارەی دا بە خزمەکانی تا بۆ منداڵەکانی خەرج بکەن. مام ئەوڕەحمان ئامۆزای تەها، هەروەها ڕووناک کە خوشکی زوبێدە و زرار بوو، ئەویش لە بانە بوو، ئەوان هەموویان ئاگاداری منداڵەکانی شەمسەیان کردبوو. دەبوو تەها بەرگە "مۆڵەت" وەربگرێت. تەها لەگەڵ ڕووناک و هاوسەرەکەی و منداڵەکانی شەمسە بەرەو سەردەشت ڕۆیشتن. مزگەوتەکانی بانە و سەردەشت و تەواوی شار و دێهاتەکانی دیکە پڕ ببوون لە ئاوارەی عێراقی. ڕووناک ژنێکی ئازا و لێهاتوو بوو، پووری منداڵەکانی شەمسە بوو، زۆر باش چاودێری منداڵەکانی دەکرد.

تەها، بۆ ئەوەی بتوانێت بڕوات بۆ تەورێز دەبوو بەرگەی هاتوچۆ وەربگرێت. فارسی و تورکیشی نەدەزانی. لە سەردەشت هاوڕێیەکی خۆی بینی بە ناوی عەلی حەمەڕەش، ئەو هاوکاری تەهای کرد تاکو بەرگە وەربگرێت بۆ سەقز. تەها بەرگەی وەرگرت و ڕۆیشت بۆ سەقز. لەوێ هاوڕێیەکی بینی، بە ناوی شێخ سەربەست، شێخ سەربەست، برایەکی بەناوی مامۆستا کەمال و ئامۆزایەکیشی بەناوی تانیا خان، بە برینداری ڕەوانەی تەورێز کرابوون. شێخ سەربەستیش دەیویست بۆ سەردانی برا و ئامۆزاکەی بڕوات بۆ تەورێز. تەها لەگەڵ شێخ سەربەست بەرەو تەورێز بەڕێکەوتن. ئەوان شارەزای تەورێز نەبوون، زمانەکانی فارسی و تورکیشیان نەدەزانی. هیچ کەسێکیان نەدەناسی. ناونیشانی هیچ شوێنێکیان پێ نەبوو. نەیاندەزانی شەمسە و مامۆستا کەمال و تانیا لە کام نەخۆشخانەن. تەها نزیکەی هەزار دیناری عێراقی پێبوو. تەها پێشمەرگەبوو، بەڵام کاریشی دەکرد. کاری کرێکاری دەکرد. کڕین و فرۆشتنی دەکرد. کەمێک پارەی کۆکردبووەوە، نەیدەتوانی بە مووچەی پێشمەرگایەتی خەرجی ژن و منداڵ بکێشێت. تەها گوتی با بچینە بازاڕ. بەڵکو لەوێ ناسیاوێک بدۆزینەوە. تەها سەیری کرد چەند کوردێک پێکەوە قسەدەکەن، بەشێوازی قسەکردنەکەیاندا، تێگەیشت ئەوانە خەڵکی هەولێرن. تەها لێیان چووە پێش و گوتی: ئێوە خەڵکی کوێن؟ گوتیان ئێمە خەڵکی هەولێرین. تەها گوتی: دەزانن کوردە بریندارەکان لە کوێن؟ ئەوان گوتیان هەموو کوردە بریندارەکان، لە شوێنێکن پێی دەڵێن "کوی لالە". تەها ناونیشانی لێ وەرگرتن و لەگەڵ شێخ سەربەست تەکسیەکیان گرت و خۆیان گەیاندە

"کوی لاله". سەیریان کرد لەوێ زۆر کوردی لێیە، تەها و شێخ سەربەست، مامۆستا کەمالیان دۆزیەوە، مامۆستا کەمال گوتی: شەمسە و تانیا پێکەوەن لە نەخۆشخانەیەک بە ناوی "نەخۆشخانەی شوهەدا".

سبەینێ زوو، تەها و مامۆستا کەمال و شێخ سەربەست ڕۆیشتن بۆ نەخۆشخانەی شوهەدا، شەمسەیان دۆزییەوە و سەردانیان کرد. شەمسە بەبینینی براکەی زۆر خۆشحاڵ بوو لە خۆشیدا دەستی کرد بەگریان شەمسە لە براکەی پرسی منداڵەکانم لە کوێن؟ تەها گوتی: خەمی منداڵەکانت نەبێت، ئەوان لای ڕووناکن، ئێستا لە سەردەشتن. تەها زانی کە دکتۆرە ئێرانییەکان هەوڵێکی زۆریان داوە. بۆئەوەی دەستی شەمسە نەبڕدرێتەوە. دەبوو شەمسە هەتا سێ مانگی دیکە لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە، بەگشتی حاڵی باش بوو. دەستێکی، تا شانی لە گەچدا بوو. دەستەکەی دیکەشی تا مەچەکی. دەبوو دواتر چەند نەشتەرگەرییەکی دیکەی بۆ بکرێت. تەها دڵنیابوو کە شەمسە جێگاکەی باشە و پەرستارەکان زۆر بە میهرەبانی لەگەڵیدا دەجوڵێنەوە و هاوکاری دەکەن.

شەمسە پێویستی بە بەتانی هەبوو. لە نەخۆشخانەکەدا بەتانی کەم بوو، تەها چوو بەتانییەک و هەندێک شەربەت و پسکیت و کەمپوتی بۆ خوشکەکەی کڕی. شەمسە تەواو ئارام بووەوە، بەهەواڵی منداڵەکانی خۆشحاڵ بوو. ئەوەشی دەزانی کە چەند ڕۆژێکی دیکە زراریش دەگاتە ئێران.

نەخۆشخانەکانی تەورێز، ورمێ، سەردەشت، بانە، مهاباد و هەموو ئازەربایجان و کوردستانی ئێران پڕ ببوون لە نەخۆش و بریندارانی کوردی عێراقی. تەها هەوڵی دەدا فێری چەند وشەیەکی فارسی ببێت. شەمسەش بەهەمان شێوە، تەها هەستی بە میهرەبانی و باشی پەرستارە تەورێزییەکان کرد. هەر بەڕاستی پەرستارەکان میهرەبان و دڵسۆزبوون. تێکڕای نەخۆش و بریندارەکان دەیانگوت ئەم دکتۆر و پەرستارانە زۆرباشن لەگەڵماندا و زۆر بەدڵسۆزانە کاردەکەن. تەنانەت هەندێک لە پەرستارەکان لە ماڵەکانی خۆیانەوە کەلوپەل و پێویستییان بۆ نەخۆشەکان دەهێنا. ئەو منداڵانەی کە چاک دەبوونەوە، لە نەخۆشخانەکانەوە دەیانبردنەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان. هەندیک لە منداڵەکان لە کەسوکاریان ون ببوون، یان هەندێکیان کەسوکاریان

بەتەواوی لەنێو چووبوون. خەڵکیی ئەو منداڵانەیان دەبردەوە ماڵی خۆیان و ئاگاداریان دەکردن تاکو کەسوکاریان بۆ پەیدا دەبوو. پەرستارەکان رۆڵێکی گرینگیان دەبینی، لە ئارامکردنەوەی بریندارەکان. هەندێک لە دکتور و پەرستارەکان لەبەر زۆری ژمارەی بریندارەکان، کاری زیادەیان دەکرد، بەبێ ئەوەی مووچەی زیادە وەربگرن. تەورێزییە میهرەبانەکان بریندارە دەرچووەکانی نەخۆشخانەیان، دەبردنەوە بۆ ماڵی خۆیان و خزمەتیان دەکردن تاکو کەسوکارەکانیان پەیدا دەبوون.

تەها، دڵنیابوو کە لەنەخۆشخانە هاوکاری شەمسە دەکرێت، جگە لەوەش لە نەخۆشخانەکە چەندین کوردی بریندراری دیکە هەبوون. ئەو بریندارانە باری تەندروستیان باش بوو، سەردانی شەمسەیان دەکرد. شەمسەش کە دەیتوانی بڕوات سەردانی ئەوانی دەکرد. "تانیا"ش لە هەمان نەخۆشخانە و لەگەڵ شەمسە لە یەک ژووردا بوون. تانیا کچی شێخ ستاری کانی هەنجیر و ئامۆزای مامۆستا کەمال بوو. ئەویش بە گوللەتۆپی سوپای عێراق قاچی شکابوو. شەمسە بە تەهای گوت خەمی منت نەبێت، من لێرە تەنها نیم، لێرە کەس و ناسیا و زۆرە. تۆ بڕۆرەوە بۆ عێراق و بەڵکو هەرچۆنێک بێت زوبێدە و ڕەوکان بدۆزیتەوە و بیانهێنیت بۆ ئێران. لە ڕێگادا سەردانێکی منداڵەکانی منیش بکە. تەها ماڵاوایی لە خوشکەکەی کرد و بەرەو سەردەشت گەڕایەوە.

### گەڕانەوەی تەها بۆ کوردستان

هاوکات هەواڵ گەیشت کە سوپای عێراق بەناوی "ئەنفال"ەوە پەرەی بە چالاکییە سەربازییەکانی داوە. چ لێکدانەوەیەکی شەیتانیانەیە بۆ سورەتی ئەنفال. سەدامییەکان هەتا لە تواناياندا هەبووایە کوردەکانیان دەستگیر دەکرد. هەر کەسێک کە لە بۆردوومانی کیمیایی گیانی لەدەست نەدابوو، یان توانای ڕاکردنی نەبوو، دەستگیریان دەکرد. هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان ژن، منداڵ، گەورە و بچووکدا نەدەکرد. هەموویان کە دەستگیر دەکرد و دەیانناردن بۆ باشووری عێراق. لە پرۆسەیەکی زنجیرەییدا لانیکەم ١٨٢ هەزار کورد ئەنفال کران. ئەو دەستگیرکراوانە یان گوللەباران کران

یا زیندەبەچاڵ کران، یاخود لەبرسێتی و تینوێتیدا مردن. تەها زۆر نیگەرانی ژن و منداڵەکەی خۆی بوو، پێش دەستپێکردنی هێرشەکانی بەناو ئەنفال، زوبێدە لەگەڵ ڕەوکاندا چوو بوو بۆ کەرکووک، بۆ سەردانی دایک و خوشکەکانی. کەرکووک لەو کاتەدا شارێکی ئارام بوو. تەها نیگەرانی ژن و منداڵ و دایک و باوکی و خوشک و برا و کەسوکارەکانی بوو. دەیویست بە زوویی خۆی بگەیەنێتەوە کوردستانی عێراق. تەها دوای سێ ڕۆژ لە تەورێزەوە گەڕایەوە بۆ سەقز. ئاوارەی کوردستانی عێراق، لە تەواوی شار و شارۆچکەکانی کوردستان و ئازربایجان زۆر بوون. لە شار و گوند و سەرجادەکان. لە هەموو شوێنێک کوردی ئاوارەی عێراقی هەبوو. خەڵکی ئێران زۆر میهرەبان بوون لەگەڵیاندا. حکوومەتی ئێران خواردن و پێداویستییە سەرەتاییەکانی پێدەدان. شوێنی نیشتەجێبوون کەم بوو، خێمە کەم بوو. ڕۆژانە شەپۆلی ئاوارەکان بە ڕێگاوەبوون و دەگەیشتنە مزگەوتەکان، هۆڵەکان پڕببوون لە ئاوارە. کوردانی ئێرانییش دەرگای ماڵەکانیان بە ڕووی هاوزمانانی خۆیاندا واڵا کردبوو.

تەها لە سەقز زرار و ستاری بینی، زرار نیگەرانی شەمسە و منداڵەکان بوو، تەها بە زراری گوت: منداڵەکان لە سەردەشت لای ڕووناکن. هەموویان ساغ و سەلامەتن، زرار بیستبووی کە شەمسە بریندارە، کاتێک هێرشی کیمایی بەچڕی دەستی پێ کردبوو سەرکردایەتی و پێشمەرگەکان ڕووە و ئێران هاتبوون. زرار دەیزانی شەمسە لە تەورێزە، بەڵام ناونیشانی نەدەزانی. تەها ناونیشانی نەخۆشخانەی شوهەدا و کوی لالەی دا بە زرار و ستار و گوتی: هیچ خەمتان نەبێت، مەترسی لەسەر بڕینەوەی دەستی نەماوە. نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتووی بۆ کراوە و لە نەخۆشخانە زۆر هاوکاری دەکرێت. لە ژوورێکی گەرمدایە و سێ ژەمە خواردنی باشی دەدەنێ، هەموو پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکرێت، ئەو ژیانی گەلێک لە ژیانی ئاوارەکان باشترە. ئاوارەکان ژمارەیان زۆرە، لە مزگەوت و هۆڵەکاندا، لە بارودۆخێکی زۆر خراپدان. خواردنیشیان وەک پێویست نییە. ڕۆژانەش ژمارەیان زیاد دەکات. زرار و ستاریش لەگەڵ تەها گەڕانەوە بۆ سەردەشت. سەردانی ڕووناک و منداڵەکانیان کرد. ڕووناک بە براکەی گوت: تۆ هیچ خەمی منداڵەکانت نەبێت، من وەک چاوم دەیانپارێزم، خزم و کەسیش لێرە هاوکاریمان دەکەن، تۆ و ستار بڕۆن بۆ تەورێز

سەردانی شەمسە بکەن. شۆڕش و فەرەیدوون گوتیان باوکە تۆ هیچ خەمی ئێمەت نەبێت، تۆ بڕۆ بۆ لای دایکمان. ڕۆژی دواتر زرار و ستار ڕۆیشتن بۆ تەورێز.

تەها بڕیاری دا بوو لە سنووری مەڵبەندی سێ وە بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق. نزیکەی بیست پێشمەرگە بوون، پێکەوە لە سەردەشت و قاسمە ڕەشەوە بەڕێکەوتن. تەها دەیویست خۆی بگەیەنێتە گوندی "گۆپتەپە" لە سنووری ناحیەی قەڵاسێوکە. ماوەی سیازدە ڕۆژ بەڕێگاوە بوون، پێشمەرگەکانی دیکە هەندێکیان لە ناوچەی بالیسان مانەوە، هەندێکی دیکەشیان هەتا دەشتی کۆیە هاتن. تەهاش خۆی گەیاندە گوندی گۆپتەپە. تەها لە گۆپتەپە پەیوەندی کرد بە تیپی بیست و نۆی کەڵکە سماقەوە، کە ئەوکات شێخ هاوڕێی کاکەحەمەی مامەڕەزا سەرتیپ بوو، خاڵە سەعید جێگری تیپ بوو. خاڵە سەعید ماڵەکەشی هەر لە گوندی گۆپتەپە بوو. خاڵە سەعید و ژن و منداڵەکانی بەهاتنی تەها زۆر خۆشحاڵ بوون. ئەوان هیچ هەواڵی شەمسەیان نەدەزانی تەنها دەیاندەزانی کە بریندار بووە. تەها باسی سەردانەکەی خۆی بۆلای شەمسە، بۆ کردن.

تەها دەیویست لەگوندی گۆپتەپە بمێنێتەوە، دەیویست بەڵکو لەوێوە پەیوەندی بکات بە زوبێدەوە و ئاگاداری بکاتەوە کە ئەویش بێت بۆ گۆپتەپە. گۆپتەپە شوێنێکی ستراتیژی و گرنگی هەبوو، خەڵکی ئەو گوندەش وەکوو خەڵکی گوندەکانی دیکە کەسانی ئازا و خۆڕاگر و بەرچاوتێر بوون. لە ١٩٨٥/٢/٧ لە گوندی گۆپتەپە شەڕێکی گەورە لە نێوان پێشمەرگە و سەربازانی عێراق و جاشدا ڕوویدا، لەو شەڕەدا کە ماوەی دوازدە کاتژمێری خایاند، دەیان کەس لە جاش و سەربازی عێراقی کوژران، سێ پێشمەرگەش شەهید کران. زوهێر برای زوبێدە یەکێک بوو لە شەهیدەکانی ئەو شەڕە، زوهێر کاتێک کە شەهید بوو، تەمەنی نۆزدە ساڵ بوو.

تەها دەیزانی زوبێدە لە کەرکوکە و لەلای دایکێتی، تەنانەت هەلی ئەوەی بۆ هەڵنەکەوت هەواڵی بۆ بنێرێت و ئەویش بێت بۆگۆپتەپە، تا پێکەوە برۆن بۆ ئێران. تەها ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٠ گەیشتە گۆپتەپە و چووە ماڵی خاڵی، سەعیدی حەمەشوان. خاڵی تەها و مامی زوبێدە و زرار بوو. نزیکەی بیست پێشمەرگە لە گوندەکەدا بوون، پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکە زانیبوویان کە سوپای عێراقی هێرشی کردووە

بۆ ناوچەی گەرمیان و قەرەداغ، لەوێش چەکی کیمیایی بەکارهاتبوو، چەندین کەس بەهۆی کیمیاییەوە شەهید و بریندار ببوون. هەرچیش بەر چەکی کیمیایی نەکەوتبوو، سوپای عێراق هەموویانی ئەنفال کردبوو. لەو هێرشانەدا سوپای عێراق ڕوحمی بەکەس نەکردبوو. ئەو کەسانەی بە برینداری کەوتبوونە دەست سوپا، هەر لەجێگەی خۆیاندا گوللەبارانیان کردبوون. هەر کەسیش فریای ڕاکردن نەکەوتبوو، دەستگیر و زیندەبەچاڵ کران. خەڵکە ڕزگار بووەکەی گەرمیان و قەرەداغ دەهاتنە گۆپتەپە، دەیانویست لەوێوە خۆیان بگەیەننە ئێران، بەڵام دوای قەرەداغ و گەرمیان هێرش بۆ سەر ناوچەکانی قەڵاسیوکە، شوان و شێخ بزێنی، دەشتی کۆیە، خۆشناوەتی و بالیسان دەستی پێکرد.

### هێرشی کیمیایی بۆ سەر گۆپتەپە

لە چەند لایەکەوە حکوومەتی عێراقی هێزەکانی ڕووە و گۆپتەپە جوڵاند بوو. خەڵکی گۆپتەپە دەیانویست گوندەکە چۆڵبکەن و بڕۆن. گوندەکە زۆر کەم ماڵی تێدا مابوو. چەند ماڵێکیان پێشتر گوندەکەیان چۆڵ کردبوو. خەڵکی گۆپتەپە زیاتر کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییان دەکرد. سەعیدی خاڵی تەهاش هەندێک ئاژەڵی هەبوو. خۆیشی پێشمەرگە بوو، جێگری فەرماندەی تیپی بیست و نۆی کەڵکە سماق بوو. هەندێک کەس دەیانگوت سوپای عێراقی هێرش ناکاتە سەر گۆپتەپە، دەزانێت هێرشەکەی سەرکەوتوو نابێت. خۆ ئەگەر هێرش بکەن ئەوا بەخراپی تێکدەشکێن. پێشمەرگەکان دەیانگوت ئەگەر هێرش بکات و بە بۆمبی کیمیایی لێمان بدات، ئێمە ناتوانین بەرامبەر بە چەکی کیمیایی بووەستینەوە. بۆیە وا باشترە، تەواو خۆمان ئامادە بکەین و شەڕی مانونەمان بکەین. هەندێک کەس باوەڕیان بە دڕندەیی سەدام نەبوو، باوەڕیان نەدەکرد سەدام چەکی کیمیایی بەکار بهێنێت، زۆر کەسیش ترسناکیی بۆمبی کیمیاییان هەست پێنەدەکرد. خەڵکەکە نەیاندەزانی کە چەکی کیمایی ڕوحم بەکەس ناکات. لە کۆتاییدا خەڵک و پێشمەرگە بڕیاریاندا پێکەوە لەگوندەکەدا بمێننەوە و چۆڵی نەکەن. بەردەوام هەواڵ دەهات کە حکوومەت لە چەندین لاوە هێزی

کۆکردۆتەوە تاکو هێرش بەرەو گۆپتەپە بکات.

تەها لە گۆپتەپە جێگیر ببوو، پێشمەرگەکان لە گۆپتەپە بنکە و بارەگایان دانەنابوو، هەر کەسە و لە ماڵی خزم و کەسی خۆی بوو. هەندێک لە پێشمەرگەکانیش، خەڵکی گۆپتەپە نەبوون، بەلام ماڵیان هێنابووە گۆپتەپە. چەند کەسێک هەواڵیان ناردبوو گوندەکە چۆڵ بکەن، چونکە حکومەت بەنیازی هێرشکردنە. سەعیدی حەمەشوان کە خاڵی تەها بوو، لێپرسراوی پێشمەرگەکانیش بوو گوتی: من لێرە ناڕۆم تا بتوانم بەرگریی دەکەم.

هەواڵ هەبوو کە حکوومەت هێرشی گەورەی کردووەتە سەر ناوچەی گەرمیان و قەرەراخ.چەکی کیمایی بەکارهێناوە و چەندین کەس بە کیمیایی گیانیان لەدەستداوە. ئەوانەشی کە مابوونەوە، بەتایبەت ژن و منداڵ و پەککەوتەکان، حکوومەت هەموویانی دەستگیر کردبوو بە ماشێنی سەربازی بەرەو باشوور و ناوەڕاستی عێراق ڕەوانەی کردبوون، هیچ کەسێک ئاگاداری چارەنووسیان نەبوو. خەڵک دواتر زانیان ئەنفال واتای چییە؟ ئەنفال واتە کوشتن و سڕینەوەی ئاسەواری کورد، واتە ڕاپێچکردنی خەڵکی کورد بۆ باشووری عێراق، لەوێ هەندێکیان زیندەبەچاڵ کردن و هەندێکیان لە بەرهەتاوی گەرمی باشووری عێراق فڕێیاندان تاکو لە ناخۆشترین دۆخدا لەبرسا و لە تینوویێتیدا دەمردن. زیاتر لە ۱۸۲ هەزار کورد بەو جۆرە لەنێوبران. لەسەر ئەم تاوانی قڕکردنە، هیچ یەکێک لە وڵاتانە زلهێزەکانی جیهان ورتەیان لێوە نەهات و بێدەنگییان لێکرد. جیهان لەبەرامبەر جینۆسایدەی کورددا تەنها بێدەنگییان هەڵبژارد. ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، چەند جارێک هاواریان لێ هەڵسا، بەڵام بێ سوود بوو. دیکتاتۆر ئەوەندە هێز و سوپا هەبوو، کە بتوانێت لەسەر کارە قێزەونەکەی بەردەوام بێت. سەدام باش دەیزانی ئەگەر لەبەرامبەر وڵاتانی خۆراوادا نەوتەکەی ڕانەگرێت، دەتوانێت هەموو کارێک بکات و کەس ڕێگری لێ نەکات. دوای ڕاگرتنی جەنگ لەگەڵ ئێراندا. دیکتاتۆر دەستکراوەتر بوو بۆ لێدان و لەناوبردنی کوردەکان. لەبری ئەوەی ڕێکەوتن لەگەڵ سەرکردە کوردەکاندا بکات، زیاتر دەستی کرد بەکۆمەڵکوژی.

ئایا هەموو شارستانێتییەکانی مرۆڤایەتی لەسەر دەریای خوێن دامەزراون؟ ڕۆڵی زانست و پسپۆڕیی لەم دەریای خوێنەدا چیە؟ ڕۆژێک شمشێری تیژ و گورزی گران

و مەنجەنیق و قەڵا دروست دەکەن. ڕۆژێک بۆمبی کیمیایی و بۆمبی ناپاڵم و ئەتۆم. گرنگ ئەوەیە ژمارەیەک کەس ئامادەی ئەوەیان تێدایە خەڵکی لەناوبەرن. خۆزگە هەموو بارەگا سەربازییەکانی جیهان دەبوون بە پارک و سەربازەکانیشیان دەبوونە قارەمانیماڵی خۆیان و بیریان لە ژیان دەکردەوە.

ڕۆژی ۱۹۸۸/۵/۳ بوو تەها بە خاڵە سەعیدی گوت: من و سەردار سەرمۆردی، تاکو گوندی قزلۆو دەچین، وای بەباشدەزانم تۆش منداڵەکانت لێرە دووربخەیتەوە. با ئەوان لێرە نەمێنن، واپێدەچێت سبەی حکوومەت هێرش بکاتە سەر ناوچەکە. ئەگەر لێرە شەڕ ڕوویدات ئێمە چی لەم ژن و منداڵانە بکەین؟ خاڵە سەعید گوتی: خەمت نەبێت، سبەی بەڕێیان دەکەم بۆ شوێنێک. تەها و سەردار ڕۆیشتن بۆ قزلۆو، لەوێش هەواڵەکان زۆر ناخۆش بوون. خەڵکی گوندەکەیان چۆڵ دەکرد. چەند کەسێک دەیانگوت هەواڵمان هەیە سبەی حکوومەت لە تەقتەق و کۆیە و ئاغجەلەر و دوکانەوە هێرش دەکات. تەها و سەردار دوانیوەڕۆ گەڕانەوە بۆ گۆپتەپە. خاڵە سەعید هەواڵی ئەوێی لێ پرسین. تەها گوتی: بەدڵنیاییەوە، سبەی حکوومەت هێرش دەکات. خاڵە سەعید گوتی: ڕاستە، ئەوەتا سوپای عێراق لە سەری کەڵکەسماقە و سبەی هێرش دەکەن.

سوپای عێراق، لە چوار لاوە خۆی ئامادەکردبوو بۆ هێرش کردنە سەرگۆپتەپە، ناوچەی قەڵا سێوکە، شوان و شێخ بزێنی و دەشتی کۆیە. سەعید دەیگوت: خۆتان ئامادە بکەن، دەبێت سبەی زۆر ئازایانە بەرگری لێرە بکەین. سەعید پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو، بەشداری چەندین شەڕی گەورەی کردبوو، ساڵی ۱۹٦۱ لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولدا چەکی پێشمەرگایەتی هەڵگرتبوو. فەرماندەیەکی شارەزا و لێهاتوو بوو. تەها گوتی: ئێمە چۆن دەتوانین لەبەرامبەر سەدان تۆپ و دەبابە و تانکدا بووەستینەوە؟ ئێمە تەنها بیست پێشمەرگە دەبین. خاڵە سەعید گوتی: خەڵکی گوندەکەش چەکدارن و چەک و تەقەمەنییان زۆرە، لێرە شەڕی مانونەمان دەکەین.. شەڕ دەکەین هەتاکو دەکوژرێین. تەها گوتی: ئەی ئەم ژن و منداڵانە چی لێبکەین. خاڵە سەعید گوتی: خەمت نەبێت خودا گەورەیە.

سەعیدی حەمەشوان، حەوت منداڵی هەبوو. سێ کوڕ و چوار کچ، ئەو ماڵانەی لە گۆپتەپە بوون هەموو خزم و کەس و ناسیاوی یەکتر بوون. ئامینە ساڵح، هاوسەری

سەعید بوو، ئەو لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٤ بوو، ئەو کات تەمەنی پەنجا و چوار ساڵ بوو. ژنێکی ئازا و قارەمان بوو. توانایەکی باشی هەبوو. هەمیشە بەدوای هاوسەرەکەیەوە بوو. لە ئیشوکارەکانیدا پشتگیرییەکی تەواوی هاوسەرەکەی بوو. ئامینە بە تەهای گوت: تۆ خەمی ئێمەت نەبێت، ئێمەش ئێوە جێناهێڵین، ئەگەر مردین با هەمووومان لێرە پێکەوە بمرین. خۆ ئێمە لە ئێوە زیاتر نین. شوانە کوڕە گەورەی سەعید بوو، ئەویش پێشمەرگە بوو شوانە لەدایکبووی ساڵی ١٩٧١ بوو، شوانە کلاشینکۆفەکەی بەرز کردەوە و گوتی: سبەی لێرە شەڕ گەرم دەبێت، کارێکیان پێدەکەین هەرگیز بیریان نەچێتەوە. "نەجات" کچە گەورەی سەعید بوو، شووی کردبوو، سێ منداڵی هەبوو، هاوسەری ئەویش پێشمەرگە بوو، لەگەڵ ماڵی خەزوری، ئەوانیش لە گۆپتەپە دادەنیشتن. "نەبات" و "ئاورینگ" دوو کچی دیکەی سەعید بوون، ئەوان تەمەنیان منداڵتر بوو. "محەمەد" و "ئەحمەد" کوڕی بچکۆلەی بوون، بەردەوام بە دوای باوکیانەوە بوون. سەعید کچێکی دیکەی هەبوو بەناوی "پڕشنگ" ئەویش هاوسەرەکەی پێشمەرگە بوو، بەڵام ئەوان ماڵیان لە گۆپتەپە نەبوو. تەها جارێکی دیکە تکای لێ کردن کە ئەوان بڕۆن و گوتی: سبەی کە هێرش کرا، خۆ چەند کەسێک نایەن بە کلاشینکۆفەوە هێرشمان بکەنە سەر، تا ئێمە ڕووبەڕوویان ببینەوە، کلاشینکۆف لەبەرامبەر دەبابەدا، چی پێدەکرێت؟ فڕۆکە و هەلیکۆپتەر دێن. بۆمبی کیمیایی بەکار دەهێنن. سەعید، گوتی: ئێمەش شەڕ دەکەین، ئەگەر سەرکەوتوو بووین، ئەوا باشە، ئەگەر سەرکەوتووش نەبووین، با هەمووومان لێرە بکوژرێین، لە دەست زوڵم و چەوسانەوەی سەدام ڕزگارمان دەبێت.

ئایا ئەو ژن و پیاوە ئازا و دلێرانە، دڕندەیی سەدام حوسێن و سوپاکەیان نەدەزانی؟ ئایا تایبەتمەندییەکانی شەڕی کیمیاییان نەدەزانی؟ خاڵە سەعید پیاوێکی ئازا و دونیا دیدە بوو. لە شەڕ ماندوو ببوو. لە بێکەسی و داماوی کورد ماندوو ببوو. لە بێدەنگی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی ماندوو ببوو. ئەو پیاوە ئازایەی کورد باش دەیزانی لەو شەڕە نابەرامبەرەدا، سەرکەوتوو نابن، دەیزانی کە خۆی و ماڵ و منداڵەکانی لەو شەڕەدا تێدا دەچن. بەڵام بڕیاری دا بوو بەرگری لە خاک و گوند و وڵاتی خۆی بکات. دەیویست ئەویش وەک باوک و باپیری بەسەربەرزی بژی و

لەپێناو ئازادیدا تێبکۆشێت. ئەو دەیگوت ئەگەر بشمرین هێشتا ئازایەتیە بۆ ئێمە. ئەو پیاوە بە ماڵ و منداڵەوە لەو گوندە مایەوە و چاوەڕوانی هێرشی سەدامی نەفرەتی بوو، پێشبینی دەکرد سبەی بەیانی زوو سوپا هێرش بکات. خاڵە سەعید لە ماڵ چووە دەرەوە و ڕۆیشت بۆ ناو دێ، تاکو خەڵکی هانبدات بۆ شەڕ و بەرگری کردن. تەهاش ڕۆیشتە دەرەوە، خەڵکەکە بەگشتی شڵەژا بوون، نەیاندەزانی چی بکەن. هەندێکیان خۆیان ئامادە دەکرد بڕۆن و گوندەکە جێبهێڵن. خاڵە سەعید گوتی: ئێوە ئازادن هەر کەس دەڕوات با بڕوات. چەند کەسێک گوتیان: شەڕ لەگەڵ کیمیایی ناکرێت، خۆپاراستن لە کیمیایی ناکرێت. چەند ماڵ و چەند کەسێک ڕۆیشتن. چەند کەسێک دەیانگوت ئاوی ڕووبارەکە زۆرە، ئەو هەموو تانک و تۆپە چۆن دەتوانن لەو ڕووبارە بپەڕنەوە. تەنانەت سەربازەکانیش ناتوانن لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە. بەڵام مەترسییەکە لەوەدابوو، ئەو سوپایەی سەری کەڵکەسماق، تەواو بەرامبەر گوندی گۆپتەپە بوو. دەیانتوانی هەر لەوێشەوە بە تۆپباران، کاری خۆیان مەیسەر بکەن، هاوکات سوپای عێراق، لە ئاغجەلەریشەوە خۆی ئامادەکردبوو کە تەنها نیو کاتژمێر لە گۆپتەپەوە دوور بوون، ڕێگاکەش تاکو گۆپتەپە جادەی قیر بوو، زۆر بەئاسانی دەگەیشتنە گۆپتەپە.

زۆربەی خەڵکەکە بڕیاریاندا بوو، بڕۆنە دەم ڕووبار و بەرەو گوندی بوڵقامیش بڕۆن، تا خۆیان لە هێرشە چاوەڕوانکراوەکە بە دوور بگرن. باوەڕیشیان وا بوو، ئەگەر لە هێرشەکەدا بۆمبی کیمیایی بەکار نەهێنرێت، پێشمەرگەکان دەتوانن بەرگرییەکی ئازایانە بکەن. خۆ ئەگەر پێشمەرگە "بێتەل"ێکیان لابووایە و پەیوەندییان بە سەرکردایەتییەوە بکردایە، بەدڵنیاییەوە فەرمانیان پێدەکردن کە شەڕ نەکەن و گوندەکە چۆڵ بکەن. بەڵام لەو کاتە هیچ هۆکارێکی پەیوەندی نەبوو.

تەها، لەو کاتەدا چەند پارچە جلوبەرگ و بڕی هەزار دیناری عێراقی کە هەمووی لەنێو جانتایەکدا بوو، لە ماڵی خاڵی دانابوو. هەر ئەو ڕۆژە ١٩٨٨/٥/٣ کاتژمێر پێنجی ئێوارە، خاڵە سەعید لەگەڵ "کاکە مەم" لە ماڵ ڕۆیشتنە دەرەوە. تەها، شوانە، سەردار و ئامینەی خێزانی سەعید، لە ماڵەوە مانەوە. لەناکاو دەنگی فڕۆکەی جەنگیی هات. تەها هاتە دەرەوە و لە حەوشەوە سەیری ئاسمانی کرد، شەش فڕۆکەی بە ئاسمانەوە

بینی، فڕۆکەکان زۆر بە نزمی دەفڕین، دیار بوو هیچ مەترسییەکیان نییە لەوەی بە دۆشکا و چەکی قورس تەقەیان لی بکرێت. خەڵکی لە هەموو لایەکەوە هاواریانکرد و گوتیان هەر ئێستا ئەم گوندەکە بۆردوومان دەکەن. تەها بە خاڵۆژنی گوت: خێرا بڕۆنە نێو کونە تەیارەکە و ئێرە جێبهێڵن. شوانە بە زوویی ڕۆیشتە ژوورەوە و چەکەکەی هێنا. تەهاش دوای شوانە، ڕایکردە ژوورەوە و چەکەکەی خۆی هێنا و گوتی: شوانە، ڕابکە بەرەو جادە قیرەکە، منیش وا هاتم. لەو کاتەدا، لە دووریی پەنجا مەترێک لـەوان، بۆمبێک لە زەوی دا. بۆمبەکە دەنگی کپ بوو، پارچەشی نەبوو، دوکەڵێکی زەردباو، بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە. تەها، بە نیشانەکانیدا، زانی ئەو بۆمبە کیمیاییە. هەر بۆیە خێرا دەسرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لە سەتڵە ئاوێکی هەڵکێشا، تەڕی کرد و گرتی بەدەم و لوتیەوە. پێشتر مەکتەبی عەسکەریی یەکێتیی، نامیلکەیەکی بەناوی "چۆنیەتی خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی" بڵاو کردبووەوە. تەها ئەو نامیلکەیەی خوێندبووەوە، هەر بۆیە زوو هەستی پێکرد ئەو بۆمبە بۆمبی کیمیاییە. هەروەها پێشتریش لەشەڕی "داستانی ڕزگاری" و هێرشی "ئەنفالی یەک" لە سەرگەڵوو، بەرگەڵوو و دۆڵی جافایەتی، نیشانە و کاریگەرییەکانی بۆمبی کیمیایی بینی بوو.. تەها دوای ڕۆیشتنی فڕۆکەکان، کاتێک بەرەو لای جادەکە ڕۆیشت، بینی چەند کەسێکی دیکە لەو ناوە وەستاون و بە خەڵکەکەیان دەگوت ڕوونەکەنەوە ناو گوندەکە، ناو گوند پڕ بووە لە گازی کیمیایی. شوانە بەرەو جادەکە نە ڕۆیشتبوو. ئەو کەسانەی لەوێ بوون ئەوانیش هەر پێشمەرگە بوون، شێخ جەواد بێدەری، کە ئەو کات فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماق. بەڵام بەداخەوە دواتر بەهۆی کاریگەری کیمیاییەکەوە شەهید بوو. کەسێکی دیکەیان ناوی مامۆستا دیار بوو، ئەویش هەر لەوێ شەهید بوو. مامۆستا فایەقی شێخ حامیدی قەمچوغەیی، ئەویش لەوێ بوو، زۆر بەخەستی بریندار ببوو. تەها هەواڵی خاڵی، شوانە، موحسین، سەردار و منداڵەکانی خاڵە سەعیدی لە هەر کەسێک دەپرسی. کەس هەواڵێکی ئەوانی نەدەزانی. هەموو دەیانگوت نەماندیون. تەها بێئاگا بوو لەوەی کە حوسێنی حاجی شەریف، هاوسەری نەجاتی خاڵی، لە ماڵەوە لەژێر زەویدا پەناگەیەکی دروستکردووە و هەموو ماڵی خاڵی و منداڵەکانیان چووبوونە نێو ئەو حەشارگەیەوە. بەداخەوە، هەر

لەوێ جگە لە منداڵێک بە ناوی "هێمن" کە کوڕی حوسێن و نەجات بوو، ئەوانی دیکە هەموویان بە کیمیایی، شەهید ببوون. دواتر هێمن ڕزگار کرا و کاریگەری کیمیایی لەسەر نەما. لە ئێستادا خوێندنی زانکۆی تەواو کردووە.

تا ئەو کاتە تەها کیمیایی کاری تێنەکردبوو، ئەشکەوتێک لە خوار گوندەکەوە بوو، تەها وای پێی وابوو ماڵی خاڵی چوونەتە نێو ئەو ئەشکەوتە، بۆیە ئەویش بەرەو ئەشکەوتەکە ڕۆیشت، بۆ گەیشتن بە ئەشکەوتەکە دەبوو بەناو گوندەکەدا بڕوات. تەها کاتێک گەیشتە ناو گوندەکە مەلا محەمەدی بینی کە مەلای گوندەکە بوو، کاری بەرگدروونیشی دەکرد، ئەو تەهای باش دەناسی. تەها لەو کاتەدا مەلا محەمەدی نەناسیەوە چونکە لەترسی کیمیایی سەروچاوی خۆی بەست بوو، چەندین لاشەی بێ گیان لەو ناوەدا کەوتبوون، مەلا محەمەد دەرمانێکی تۆزی دژە کیمیایی پێ بوو، دەیکرد بەسەر ئەو کەسانەدا کە گیانیان تێدا مابوو، بەڵام بەداخەوە مەلا محەمەد خۆیشی هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد. مەلا محەمەد بە تەهای گوت بڕۆ لێرە دووربکەوەوە ئێرە بۆمبی کیمیایی لێدراوە. تەها گوتی: بە دوای خاڵم و منداڵەکانیدا دەگەڕێم. هەر کەسە و بەلایەکدا ڕایدەکرد و گوندەکەیان جێدەهێشت. تەها خۆی گەیاندە ئەشکەوتەکە، بەڵام جگە لە هەندێک ژن و چەند منداڵ، کەسی دیکەی لێ نەبوو. تەها ویستی بەرەو ماڵی کاکە مەم بڕوات. لەلای ئەشکەوتەکەوە سەرکەوت بۆ سەر تەپۆڵکە بەرزەکەی نزیک مزگەوتەکە "ئێستا ئەو تەپۆڵکە بەرزە، کراوەتە مۆنۆمێنتی گۆپتەپە و مەزاری شەهیدانی گۆپتەپە". هەر لەوێ لەسەر بەرزییەکە شوێنی بۆمبێک هەبوو، لەو کاتەدا تەها گێژ بوو، چاوەکانی لێڵ بوون، هێزی ڕۆیشتنی کەم بوو، لە دورەوە شتێکی سەوزی بینی، وایزانی ئەو شتە سەوزە "ئاورینگ"ی خاڵۆزایەتی، چونکە پێش هاتنی فڕۆکەکان، ئاورینگ کراسێکی سەوزی لەبەربوو. تەها خۆی گەیاندە لای، بەڵام کە سەیری کرد ئەو تارماییە سەوزە سەتڵێکی نایلۆنی گەورەی سەوز بوو، نەک ئاورینگ! تەها، هێشتا تەواو پەکی نەکەوتبوو، لەسەر قاچەکانی خۆی وەستا بوو، خوشکەکەی کاکە مەم بەگریان بەلایدا هات و گوتی: کاک تەها توخودا فریای کاکم بکەوە وا دەمرێت، تەهاش بە لۆژە لۆژ خۆی گەیاندە ماڵی کاکە مەم. کە سەیری کرد کاکە مەم لەسەر زەوی کەوتووە و دایکی و هاوسەرەکەی

بەدیاریەوە دەگرین. کاکە مەم هێشتا گیانی نەدابوو، دەمی کەفی کردبوو. چەندین کەسی دیکەی بێگیان و نیوە گیان لەو ناوە کەوتبوون. ئەو دیمەنەی هەرگیز تەها بیری ناچێتەوە، ئەو منداڵە ساوایە بوو کە دایکی گیانی لەدەست دا بوو، بەڵام منداڵەکە زیندوو بوو، هێشتا مەمکی دایکی دەمژی. هەر لەو ناوەدا چەندین بزن، کار، مانگا، گوێرەکە، کەڵەشێر و مریشکیش مردار ببوونەوە.

تەها هێزی تێدا نەمابوو، هیچ دەسەڵات و توانایەکی نەمابوو، مێشکی وەک پێویست کاری نەدەکرد، خۆیشی نەیدەزانی چی دەکات. تفەنگ و تاقمی مەخزەنەکانی لێ ببوو بەبار، توانای هەڵگرتنی ئەوانیشی نەمابوو، بەرەو ڕەندەکەی خوارەوە و بۆلای ڕووبارەکە ملی ناو ڕۆیشت. دیارە ئەوە یەکێک بوو لە هەڵەکانی تەها کە نە نەدەبوو بەرەوخوار بڕوات، چونکە گازی کیمیایی، گازێکی قورسە و دادەبەزێتە نزماییەکان. کە گەیشتە خوارەوە بە تەواوی ژێری خۆی لەدەست دا بوو، کەوتە سەر زەوی و تلۆر بووەوە، هەر لەوێ کەسێکی لێ پەیدابوو، کە تەهای نەدەناسی. ئەو کەسە گوتی: تۆ خەڵکی کوێیت و لێرە کێ دەناسی. تەها گوتی: من پێشمەرگەم و سەعیدی حەمەشوان خاڵمە، هەر لە ڕەنەکەی خوارەوە پیاوێک هەبوو هاوڕێی خاڵی تەها بوو، ئەو کەسە چاوی کەم بینا بوو، تەها گوتی: لێرە حەمەکوێر دەناسم، کەسەکە کلاشینکۆفەکەی لە تەها وەرگرت و دەستی تەهای گرت بردی بۆلای حەمەکوێر.

بانگی حەمەکوێری کرد و گوتی: کاکەحەمە وەرە ئەم برادەرە تۆ دەناسێت. حەمەکوێر تەهای ناسیەوە و بە سەری خۆیدا کێشا و گوتی: ئەی هاوار بەماڵم، تەها بۆ وای لێهاتووە.. خودایە پەنجا دینارم خێربێت، تەها هیچی لێنەیەت و نەمرێت! گوتی: بەخێرایی بیبەنە لای ڕووبارەکە با ئاوی پێدا بکەین، هەر لەوێ تەهایان ڕووت کردەوە و هەموو جلوبەرگەکەیان لەبەرداکەند، تەنها یەک شۆرتی لەبەردا مابوو. کات، نزیک بانگی ئێوارە بوو، ئەو کوڕە تفەنگەکەی دایەدەست کاکەحەمە و گوتی: ئەوە چەکەکەیەتی با، لای ئێوە بێت. کچی کاکەحەمە ناوی پەیمان بوو، تەها هەستی کرد، کلاشینکۆفەکەیان داوەتە دەست پەیمان گوتی: دادە پەیمان، تکایە فیشەکێکم پێوەبنێ و هەر لێرە بمکوژە، با بە ئەم ئازارەوە نەمرم و بەزوویی گیانم دەربچێت. پەیمان بەگریانەوە گوتی: کاکە گیان چۆن دڵم دێت بتکوژم، ئینشائەڵڵا چاک دەبیتەوە.

زۆریان ئاو بە جەستەی تەهادا کرد، دوای چەند خولەکێک تەها لەهۆش خۆی چوو، ئەوانیش وایانزانی مردووە، گوتیان چی لێ بکەین؟ خۆ ئێمە ناتوانین بیبەین، با جارێ لێرە جێی بهێڵین، بەڵکو دواتر کەسانێک بێن و تەرمەکەی لێرە دوور بخەینەوە. راستە، تەها تەنها لەهۆش خۆی چوو بوو، بەڵام گوێی لە هەموو قسەکانی ئەوان بوو، تەها نەیدەتوانی چاو بکاتەوە یان زمانی بجولێنت. دوای ڕۆیشتنی ئەوان، دوو کەسی دیکە هاتنە سەر ڕووبارەکە، تەها گوێی لە گفتوگۆی ئەوانیش بوو، یەکێکیان گوتی من پێشمەرگەی تیپی سی و یەکی سلێمانیم، هیچ شارەزای ئەم ناوچەیە نیم، تکات لێدەکەم جێم مەهێڵە، ئەوی دیکە گوتی: من پێشمەرگەی تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماقم، دڵنیابە جێتناهێڵم. یەکێک لەو دوانەش گوتی: ئەوەش کەسێکی ترە لێرە مردووە. تەها نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە و بڵێت من نەمردووم و زیندووم. تەها جوڵەی لێ بڕابوو. وەکوو کەسێکی ئیفلیج لەسەر زەوی کەوتبوو، بەڵام گوێی لە هەموو دەنگەکانی دەورووبەری بوو. گوێی لە دەنگی بۆقەکان بوو، گوێی لە هاوار هاوار و بانگکردنی خەڵکی بوو، بەڵام نەیدەتوانی بجولێت و قسەبکات. کەمێک لەهۆش خۆی چوو بوو، گوێی لە هیچ دەنگێک نەما.

تەها، وردە وردە خەریکبوو هۆش خۆی هاتەوە. کەمێک حاڵی باشتر ببوو. ڕەنگە بەهۆی دانانی لە نزیک ڕووبارەکەوە و ڕووت کردنەوەیەوە باشتر بووبێت، یان بەهۆی ئەو هەموو ئاوە ساردەی کە پێیاندا کردبوو. یاخود بەهۆی ئەو پارچە دەسرە تەڕەوە کە گرتبووی بەدەم و لوتیەوە حاڵی باشتر بووبێت. تەها تەواو هۆشی هاتەوە و گوێی لەدەنگی هاژەی ئاو و بۆق و ئاژەڵەکان بوو. لە دوورەوە گوێی لە دەنگی هاوار و بانگە بانگی خەڵکی بوو. کە هەندێکیان بە دوای خزم و کەسیاندا دەگەڕان و هەندێکیشیان داوای هاوکاریان دەکرد. ڕەنگە هێزی گەنجێتی هۆکاربووبێت بۆ زیندوو مانەوەی و نەمردنی. تەها، لەو بارودۆخەدا، ئەوی بیرهاتبووەوە کە جارێک ساڵح بێچاری هاوڕێی گوتبووی: گەورە پیاوێک گوتویەتی: "ئەگەر ملت بەپەتی سێدارەشەوەبێت، دەبێت باوەڕت بە ژیان هەبێت، چونکە لەوانەیە لەو کاتەدا پەتەکە بپچڕێت".

سەرەتای مانگی مایس بوو، شەوانە کەشوهەوای ناوچەکە ساردبوو. تەها وردە وردە دەیتوانی بجولێت. بەڵام نەیدەتوانی هەڵسێتە سەر پێ و لەسەر قاچەکانی

بووەستێت. جادەیەکی خۆڵ لە تەنیشت ڕووبارەکەوە بوو. تەها هەوڵیدا بە سکەخشکێ، خۆی گەیاندە جادەکە. لەسەر جادەکە تەواو پەکی کەوت و چیتر نەیتوانی بجولێت. لە دورەوە دەنگی تراکتۆرێک هات، شۆفێری تراکتۆرەکە تەهای بینی، دابەزی و دەستی تەهای گرت و ڕایکێشا و بردییە لێواری ڕێگاکە، بەڵام زانی تەها نەمردووە و زیندووە؛ تەها هێزیدایە بەرخۆی و گوتی: تکایە لێرە جێم مەهێڵن و منیش لەگەڵ خۆتاندا بەرن. شۆفێرەکە گوتی: من کوا دەتوانم هاوکاری تۆ بکەم، چۆن دەتوانم تۆ لەگەڵ خۆمدا ببەم، منیش تەواوی ماڵ و منداڵ و کەسوکارم دیارنین و بەدوای ئەواندا دەگەڕێم، بەڵکو بەمردوویی یان بەزیندوویی بیاندۆزمەوە. شۆفێرەکە ڕۆیشت و تەها تەنها مایەوە. شەوێکی مانگەشەو بوو، ئاسمان ساف و بێگەرد، تەنانەت پەڵە هەورێک بە ئاسمانەوە نەبوو. بەڵام کیمیایی کاری لە چاوەکانی تەها کردبوو، ئاسمانی بە چڵکە هەورەوە دەبینی. مانگیش لەبەر چاوی زۆر ناڕۆشن بوو، تەها ڕووتوقوت هیچی لەبەردا نەبوو، زۆری سەرمابوو. زوو زوو لەهۆش خۆی دەچوو، پاشان هۆش خۆی دەهاتەوە. دیسانەوە هێزیدایە بەرخۆی و بەسکەخشکێ کەمێک لە ڕێگاکە دورکەوتەوە و خۆی گەیاندە ژوورێکی بچووک، ئەو ژوورە دوکانێک بوو لە نزیک جادەکە، دەرگاکەی دانەخرابوو ماوەیەکی کەم لەنێو دەرگای دوکانەکەدا ڕاکشا. کەسێکی لێ پەیدابوو، گوتی: ئەوە تۆ بە ڕووتی، چی دەکەیت لێرە؟ تەها بە پچڕ پچڕی وەڵامی دایەوە:: کیمیایی لێی داوم، تکایە هاوکاریم بکە. ئەو کەسە دەستی تەهای گرت و بەرزی کردەوە، پاشان تەهای جێهێشت و بەخێرایی ڕۆیشت. ئەو کەسە دواتر لای خەڵکی گوتبووی من تەهام بەڕووتی بینیوە، ئەو شێت بووە، دەستی ناوەتە بینم، خەریک بووە بمخنکێنێت! هەر ئەو هەواڵەش بوو بڵاو ببووەوە، گوایە تەها شێت بووە و جلوبەرگی لەبەر خۆیدا نەهێشتووە، پەلاماری کەسێکی داوە بیخنکێنێت. هەڵبەت ئەو گازە کیمیاییەی لە گۆپتەپە بەکارهات، گازی "سارین - ئەعساب" بوو، نەک خەردەل. گازی ئەعساب، زیاتر کار لەمێشک دەکات و ژیریی مرۆڤ و گیانداران ناهێڵێت. بەڵام گازی خەردەل جەستەی مرۆڤ دەسووتێنێت. دواتر تەها بەسکەخشێ دەڕۆی، خۆیشی نەیدەزانی چی دەکات و بۆ کوێ دەڕوات. گەیشتە خانوویەکی گەورەتر، ئەو شوێنە گەوڕی ئاژەڵ بوو، هەندێک ڕەشە وڵاخ لە ژوورەکەدا بوون،

ئەوانیش کیمیایی کاری تێکردبوون و ناڵە ناڵیان بوو، لەولاتریشەوە چەند مانگایەک مردار ببوونەوە. هەوا سارد بوو، تەهاش ڕووتوقوت، لەسەرما هەڵدەلەرزی. هیچ شتێک نەبوو بیدات بەخۆیدا. لە ژوورەکەدا وەک نابینایەک دەستی گێڕا، دوو فەردە کا کەوتە بەردەستی، بەڵام هێزی ئەوەی نەبوو فەردەکان بەتاڵ بکات و گونییەکان بەخۆیدا بدات. شەو درەنگ بوو، بەڵام تەها نەیدەزانی کاتژمێرچەندە، ئەگەرچی هێشتا کاتژمێرەکەی و موستیلە ئاڵتوونەکەی لەدەست و پەنجەیدا مابوون. بەڵام چاوی کاتژمێرەکەی نەدەبینی، تا بزانێت کات چەندە. ماوەیەک لەو ژوورەدا مایەوە، کتوپڕ دوو کەس بەوێدا هاتن، ئەوانیش. وێڵی دوای خزم و کەسەکانیان بوون، کە تەهایان بەڕووتی بینی گوتیان: ئەوە چی دەکەیت لێرە؟ تەها گوتی: کیمیایی لێی داوم، تکایە هاوکاریم بکەن و لەگەڵ خۆتان بمبەن. ئەوانیش گوتیان ئێمە کوا دەتوانین تۆ بەو حاڵەوە، لەگەڵ خۆماندا ببەین، تۆ ناتوانی بە پێوە بووەستیت. تەها گوتی: زۆرم سەرمایە تکایە ئەو فەردانە بەتاڵ بکەن و گونییەکانم پێدا بدەن. ئەوانیش دوو فەردە "کا"کەیان هەڵڕشت، تەهایان لەسەر "کا"کە درێژ کرد و گونییەکانیان پێدادا، ئەوانیش ڕۆشتن و تەهایان جێهێشت. تەها ماوەیەک لە ژوورەکـەدا مایەوە. تەواو گەرمی بووەوە، بەچوار چنگۆڵە لە ژوورەکە هاتە دەرەوە، لەسەر دەست دەڕۆیشت، ئاژەڵی زیندوو و مردارەوە بوو لەو ناوە زۆر بوون، ئەو ئاژەڵانەی زیندوو بوون و کیمیایی کاری تێکردبوون، دەمیان لە زەویەکە دەکوتا و پرمە پرمیان بوو. ئاژەڵێک بە پرمە پرم، بەرەو لای تەها هات، ئەویش دەستی بۆ درێژ کرد، سەری هێسترێک بەردەستی تەها کەوت، تەهاش خۆی بەملیدا هەڵواسی و هەستایە سەرپێ، زانی ئەوە هێسترە، دەستی گێڕا ڕەشمەکەشی کەوتە بەردەستی، تەها تەواو خۆی پێوە گرتبوو، کاتێک دەستی برد بۆ لای پشتی، بۆی دەرکەوت ئەوە ئەسپە و زینی پێوەیە. ئەسپەکەش بە تەواوی کیمیایی کاری تێکردبوو، ئەسپەکە هێواش هێواش دەڕۆیشت، تەهاش بەپێی ئەو دەڕۆیشت. تەها لەگیانی خۆی بێزار بوو حەزی دەکرد ئەسپەکە لەقەیەکی لێ بدات و بیکوژێت. لەو کاتەدا کەسێکی دیکە پەیدا بوو تەهای سواری ئەسپەکە کرد و گوتی: برۆ بەڵکو ئەم ئەسپە ڕزگارت بکات، بەڵام هەوڵبدە دەستت توند بگریت و نەکەویت. ئەسپەکەی بۆ ڕاستەڕێ کرد، بەرەو ماڵی خودالێخۆشبوو حەسۆی قادر داود. گوتی:

لێرەوە برۆ بۆسەر جادەکە. تەها دەسەڵاتی بەسەر ئەسپەکەدا نەبوو، ئەسپەکە ڕێگای گرتەبەر ماوەیەکی کەم ڕۆیشت تراکتۆریک بە چەند سەرنشینەوە بەرەو ڕووی هات، کە چاویان بە تەها کەوت سەیریان کرد کەسێک بە ڕووتوقوتی سواری ئەسپ بووە سەریان سوڕما. گوتیان: تۆ مرۆڤیت، شێتیت.. تۆ چیت وا بەڕووتی سواری ئەم ئەسپە بوویت، پێمان بڵێ ناوت چیە؟ ئەویش گوتی: من ناوم تەهایە و خوشکەزای سەعیدی حەمەشوانم، شوفێری تراکتۆرەکە گوتی ئێمە بیستومانە تۆ مردوویت، کاکەحەمە کوێر ناونیشانی تۆی پێداوین ئێمە هاتووین تەرمەکەت بەرینەوە. تەها گوتی: مادام وایە، لەگەڵ خۆتان بمبەن. ئەوانیش گوتیان: ئێمە بە دوای کەسانی دیکەدا دەگەڕێین، ئەم ئەسپە بۆ تۆ زۆر باشە و ڕزگارت دەکات، ئێستا کە چوویتە سەرجادەکە، بەرەو شیوەسوور و کانی هەنجیر برۆ، وریابە بەرەو عەسکەر و ئاغجەلەر نەڕۆیت. تەها گوتی: من خۆرهەڵات و خۆراوام لێ تێکچووە، نازانم ڕووبکەمە کوێ! ئەوانیش گوتیان ڕوبکەرە مانگەکە. کە چوویتە سەر جادە قیرەکە، سەیری ئاسمان بکە بە جادەکەدا بەرەو ڕووی مانگ برۆ. ئەسپەکە ملی ڕێگای گرت و گەیشتە سەر جادەی قیر هەر خۆی بەرەو لای مانگەکە ڕۆیشت، ئەسپ زۆر بەخێرایی و بە غار دەڕۆیشت. تەها توند توند خۆی بەسەریەوە گرتبوو، ئەسپەکە زۆری هەڵتەکاند ئیتر تەها بەسەر ئەسپەکەوە هێڵنجی دا و ڕشایەوە. بەجۆرێک دەڕشایەوە هەستی دەکرد خەریکە جەرگ و دڵی دێتە دەرەوە. نزیکی بەرە بەیان بوو، گەیشتە سەر شیوەسوور لەوێ چەند کەسێکی بینی دەچوونە نێو هەردەکان، تاکو خۆیان و ژن و منداڵیان حەشار بدەن. ئەوانیش ڕێنمای تەهایان کرد و بەڕێیان کرد بۆ گوندی کانی هەنجیری برایم ئاغا.

کاتێک گەیشتە گوندی کانی هەنجیر، بەرە بەیان بوو، چەند کەسێک لەنێو دێکەدا خەریکی ماڵ بارکردن بوون، دەیانویست لەترسی هێرشی سوپای حکوومەت، بە ماڵ و منداڵەوە بڕۆنە دەرەوەی گوند، خۆیان حەشار بدەن. ئەوانیش هاوکاریی تەهایان کرد و لەسەر ئەسپەکە هێنایەنە خوارەوە، و شەرواڵ و چاکەتێکیان بۆ لەبەر کرد. تەها ئەوانی نەدەناسی "لەم ماوەیەی پێشوودا -٢٠١٩- کەسێک تەلەفۆنی بۆ تەها کرد و گوتی: من ناوم زرارە خەڵکی گوندی ئەسکەندەربەگیم و لە ئێستادا

لە تەکیە دادەنیشم ئەو کەسەم لە ساڵی ١٩٨٨ لە کانی هەنجیر هاوکاری تۆم کرد و شەرواڵەکەم پێدایت" تەها زۆر سوپاسی کرد. دوای ئەوەی شەرواڵ و کراس و چاکەتیان پێدا هەندێک ئاویان بۆ هێنا بیخوداتەوە، بەڵام هەر چەندی کرد نەیتوانی ئاوەکە بخوداتەوە، یەکسەر دەرشایەوە. پاشان سواری ئەسپەکەیان کردەوە و بەرەو گوندی گەڵناچاخ بەرێیان کرد. تەها چاوی خراپ دەیبینی، نەیدەزانی ئەسپەکە بەرەو گوندی گەڵناچاخ دەڕوا یان گوندێکی تر. لەناکاو گوێی لە دەنگی چەند کەسێک بوو کە بەرەوڕووی دەهاتن، کە لێی نزیک بوونەوە یەکێکیان گوتی: تەها ئەوە تۆیت، خۆ ئێمە هەواڵمان بۆ هات کە تۆ شەهید بوویت. ئەو کەسە قارەمان عەسکەری بوو، لێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو لە تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماق. زۆر باش تەهای دەناسی. قارەمان عەسکەری بە تەهای گوت: بڕۆ دوای کەمێکی دیکە دەگەیتە گوندی گەڵناچاخ، لەوێ بمێنەرەوە، ئێمە دەڕۆین بەڵکو دکتۆر و دەرمان بۆ تۆ و بریندارەکانی دیکەش پەیدا بکەین، بەزوویی دەگەڕێینەوە بۆ لاتان، ئەوان ماڵاواییان لە تەها کرد و ڕۆیشتن. تەها چاوی باش نەیدەبینی، نەیدەزانی ئەسپەکە بەرەو گوندی گەڵناچاخ دەڕوات یان گوندی تر، ئەسپەکە گەیشتە نێو گوند، چەند کەسێک لێی هاتنەپێش و گوتیان دیارە ئەمیش لە بەرکەوتووانی کیمیایی گۆپتەپەیە. بە تەهایان گوت، واباشترە لێرە نەمێنیتەوە، هەر بە سواری ئەم ئەسپە خۆت بگەیەنە گوندی سەرچنار، چاوەڕوانی کاک قارەمان عەسکەری مەکە، بۆ تۆ سەرچنار باشترە لە گەڵناچاخ. بەهەڵهاتنی خۆر و دەرکەوتنی هەتاو، تەها هێندەی دیکە چاوەکانی کوێر بوون، بەرچاوی تاریک بوو هیچ شتێکی نەدەبینی. لە گەڵناچاخ ئەسپەکەیان بۆ ڕاستەڕێ کرد، بەرەو گوندی سەرچناری بناری خاڵخالان. هەر لە گەڵناچاخ دەرچوو لە هەموو لایەکەوە گوێی لە دەنگی فڕۆکە و هەلیکۆپتەر بوو، لە گشت لایەکەوە گوێی لە دەنگی دەستڕێژی کلاشینکۆف و گرمەی (R.P.G) بوو. تەها بەسەر ئەسپەوە بوو، ئەسپیش بەردەوام لە ڕۆیشتندا بوو. تەها نەیدەزانی لە کوێیە و گەیشتووەتە کوێ؟ ئەوەندەی زانی گەیشتە ئاوەدانی، ئەوێ گوندی سەرچنار بوو. تەها تەواو شارەزای ئەو ناوچەیە بوو. بەڵام چونکە چاوی باش نەیدەبینی، نەیدەزانی شوێنەکە کوێیە. خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە، یەکێکیان ئیسماعیل سەید قادر بوو، دۆست و

هاوڕێی تەها بوو. بەداخەوە دواتر ئیسماعیل شەهید کرا. تەها بەخەڵکەکەی گوت: تکایە بمگەیەننە لای حوسێن ئاغا، کەسێک گوتی: حوسێن ئاغا لێرە نییە، ماڵ و منداڵی لە گوندەکە دوورخستۆتەوە وا بە ئاسانی نایگەیتێ. تەها گوتی: بمبەن بۆ لای جەوهەر ئاغا. گوتیان: ئەویش لێرە نییە. گوتی: بمبەنە لای سەربەستە درێژی جێگری فەرماندەی تیپی ٢١ کەرکووک. تەهایان بە سواری ئەسپەوە بردە لای ماڵی سەربەستە درێژ، لەوێ لە ئەسپەکە دایانگرت و هەندێک نان و ماست و چایان بۆهێنا. هەر کە یەکەم پارووی لە ماستەکە خوارد، یەکسەر دەڕشایەوە. هیچ شتێکی پێ قوت نەدەدرا. هێزی تێدا نەمابوو، چاوی هیچی نەدەبینی. بەردەوامیش بیری لە خاڵە سەعید، خاڵۆزاکانی و هاوڕێکانی دەکردەوە. هیچ هەواڵێکی ئەوانی نەدەزانی. کەسێک نەبوو بڵێت ئەوانم بینیوە. سەربەستە درێژ گوتی: ئێمەش ناچارین بچین بۆ ناوچەی شێخ بزێنی خواروو، نازانم چی لە تۆ بکەم؟ تەها گوتی: ئەگەر بتوانی بەڕێم بکەی بۆلای حوسێن ئاغا یان جەوهەر ئاغا، ئەوا کارێکی باشە، چونکە من شوێنەکەیان نازانم و چاویشم نابینێت، بەتەنهاش ناتوانم هەنگاوێک هەڵهێنم. کەسێک چووە دەرەوە و گوتی: بزانم کەسێک پەیدا ناکەم تەها بگەیەنێتە لای جەوهەر ئاغا. ئەو ڕۆیشت و دوای کەمێک هاتەوە و کوڕێکی لەگەڵدا بوو، گوتی: ئەم کوڕە خزمی جەوهەر ئاغایە و ئەو دەتباتە لای. کوڕەکە ناوی سامی زەنگین بوو، تەمەنی هەر نزیکەی پازدە ساڵ بوو، تەها پێڵاوی لەپێ دانا، جووتێک نەعلیان بۆهێنا، سامی دەستی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی. تەها نەیدەتوانی بڕوات، چاوی نەیدەبینی، سامی دەستی گرتبوو، هێواش هێواش دەڕۆیشتن. لە هەموو لایەکەوە دەنگی کۆپتەر و شەڕە تەقە بوو. حکوومەت بەنیازی هێرشکردن بوو، بۆ سووتاندن و وێرانکردنی تەواوی گوندەکان و ئەنفالکردنی تەواوی خەڵکی ناوچەکە. بەردەوام دەڕۆیشتن، تەها زۆر خەمی سامی بوو، دەترسا کۆپتەر بێتە سەریان و بیانکوژێت. تەها خەمی خۆی نەبوو، لەو کاتەدا حەزی دەکرد بمرێت و لە ژیان ڕزگاری ببێت. بەڵام زۆر خەمی سامی بوو، ئەو کوڕێک بوو لە سەرەتای ژیانیدا بوو "ئێستا -٢٠١٩- سامی لە ژیاندایە و لە تەکیە دادەنیشێت" تەها ئەوەندە ڕشابووەوە، هیچ لە گەدەیدا نەمابوو، بەردەوامیش هێڵنجی دەدا، کەمێک هۆشی پەیدا کردبووەوە، بەڵام بەباشی قسەی بۆ نەدەکرا و پچڕ پچڕ قسەی دەکرد. دوای کاتژمێرێک ڕۆیشتن، سامی گوتی: ئەوا گەیشتین.

کاتێک جەوهەر ئاغا چاوی بە تەها کەوت، زۆر خۆشحاڵ بوو، چەند پێشمەرگەیەکی دیکەش لەوێ بوون، ئەوانیش هەموو هاوڕێی تەها بوون، کە بینییان تەها زیندووە، خۆشحاڵ بوون. تەها لە پەنایەکدا ڕاکشا، توانای قسەکردنی نەبوو، محەمەدی کوێخا کاکەی سەرمۆردی، یەکێک بوو لە هاوڕێ خۆشەویستەکانی تەها. بەبینینی تەها زۆر خۆشحاڵ بوو. محەمەد بە جەوهەر ئاغای گوت تەها بۆ کوێ بنێرین؟ جەوهەر ئاغا گوتی: بڕۆن ولاخێک پەیدا بکەن، سواری بکەن و بیبەن بەرەو لای گوندی چوقلیچە. تیپی ٢٩ هەموویان لەوێن، کاکەحەمەی مامەڕەزاش هەر لەوێیە. ولاخێکیان هێنا، تەهایان سوار کرد. تەها ماڵاوایی لە سامی کرد و سامی بەرەو گوندی سەرچنار گەڕایەوە. تەهاش بەرەو گوندی چوقلیچە بەڕێکرا. پێش ئەوەی بگەنە گوندەکە، لەڕێگا تووشی پێشمەرگەکان بوون، تەهایان دایەدەست پێشمەرگەکانی تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماق و خۆیان گەڕانەوە. ئەو پێشمەرگانەش بە بینینی تەها خۆشحاڵ بوون، بەڵام تەها، هێشتا نەیدەتوانی بەباشی قسەبکات و بەردەوام هێڵنجی دەدا. کاکەحەمەی مامەڕەزا خۆی چووە لای تەها و هەواڵی پرسی. کاکەحەمە، شێخی مامەڕەزاییەکان بوو. ئەوان شێخی نەقشبەندی بوون، باوکی کاکەحەمە ناوی "مامەڕەزا بوو لە ١٩٦١/٢/٢٥ دا، کۆچی دوای کردووە، کاکەحەمەش لە ١٩٩٧/١٠/٢٤ کۆچی دوای کردووە، لە دوای کاکەحەمە کوڕە گەورەکەی بە ناوی "شێخ هاوڕێ"بووەتە جێنشینی و لە گوندی کەڵکەسماق خانەقای مامەڕەزاییەکان بەڕێوە دەبات.

پێشمەرگەکان لەبەر هێرشی فڕۆکە و کۆپتەر، چوون لە دۆڵێکی قوڵدا خۆیان حەشاردا. تەهایان لە پەنایەکدا دانا، کاکەحەمە خۆی چووە لای تەها و هەندێک قسەی لەگەڵدا کرد و دڵخۆشیی دایەوە، پێی گوت ئێمە تۆ جێناهێڵین و بۆ هەر شوێنێک ڕۆیشتین تۆش لەگەڵ خۆماندا دەبەین، لە خۆمانت جیاناکەینەوە. کاکەحەمە ڕێبەری "بزووتنەوەی حەقە" بوو. لە تەواوی کوردستان مورید و لایەنگری زۆریان هەبوو. بە درێژایی شۆڕشە یەک لە دوای یەکەکانی کوردستان، دۆست و هاوکاری شۆڕش بوون، بە تایبەت لە شۆڕشی نوێ و لەسەردەمی سەدام حوسێندا پشتوپەنای شۆڕش بوون. هیچ کات درێغیان لە خزمەتی شۆڕشی کورد نەکردووە. چەندین کتێب لەسەر مامەڕەزاییەکان نووسراوە، بەڵام هێشتا دەبێت زۆر زیاتریان لەسەر

بنووسرێت. تەها، ئەو ڕۆژە نەیتوانی هیچ بخودات، باری تەندروستی تەواو تێکچوو بوو، زۆر نیگەرانی ماڵی خاڵیشی بوو.

لەنێو پێشمەرگەکاندا محەمەدی سەید عەلی، دکتۆری تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماق بوو. ئەو پیشەی یاریدەدەری پزیشک بوو، دبلۆمی پزیشکیی هەبوو، بەردەوام هەندێک دەرمان و پێویستییە پزیشکییەکانی دیکەی بە کۆڵەوە بوو. لەکاتی بریندااربوونی پێشمەرگەکاندا، بەکاری دەهێنا. محەمەد، سەرەتا لەگەڵ یەکەم بینینی تەهادا، چەند دڵۆپەیەک دەرمانی چاوی، کردە چاوی و دەرزییەکی "ئەترۆپین - Atropine" یشی بۆکرد. دەرزیی ئەترۆپین دژی گازی "ئەعساب" - سارین" کاریگەریی لەسەر مێشکی مرۆڤ دادەنێت و دەیخنکێنێت، خۆ ئەگەر کەسەکە نە کوژێت، ئەوا بۆ ماوەیەک شێتی دەکات. ئەو ڕۆژە تا کاتژمێر شەشی ئێوارە تەها و پێشمەرگەکان لەو دۆڵەدا مانەوە. لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە، لە ئاسمانەوە فڕۆکە و هەلیکۆپتەر بەردەوام بۆمب و ساروخیان بەسەر ناوچەکەدا دەباراند. لەسەر زەویشەوە سوپا هێرشی دەکردە سەر گوندەکان، سوپا دەگەیشتە هەر گوندێک، سەرەتا خانوو ماڵەکانیان دەسووتاند. تەها، ماوەی دوو ڕۆژ بوو هیچی نەخواردبوو. هەرچی بخواردایە، دەرشایەوە. خۆی هەستی دەکرد بۆگەنی لێ دێت. تەها دەیگوت سەرەتا کە کیمیایی لێی دام، بۆنی کیمیاییەکە بۆنێکی خۆشی هەبوو، بۆنی سێو و سەوزەی لێ دەهات. بەڵام دواتر ئەو بۆنە لە مێشکمدا مایەوە و گۆڕدرا بۆ بۆنێکی پیس. ئەو کەسانەی لە تەها نزیک دەبوونەوە، هەستیان بە بۆنە ناخۆشەکە نەدەکرد. تەها پێی دەگوتن لێم دووربکەونەوە، من بۆنێکی ناخۆشم لێدێت! دواتر دکتۆر محەمەد چەند دەرزییەکی دیکەی "ئەترۆپین"ی لە تەها دا. لە نێو پێشمەرگەکاندا پێشمەرگەیەک هەبوو بەناوی ساڵحی بەگە شەل، کاکەحەمە ئەو پێشمەرگەیەی ڕاسپارد بەتایبەت ئاگای لە تەها بێت. ساڵح بە کاکەحەمەی گوت: بەسەر چاو هەر فەرمانێک لە لایەن تۆوە بێت دەیخەینە سەر سەرمان.

شێخ کەریمی شێخ تاهیر، ئەویش پێشمەرگە بوو لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بوو، شێخ کەریم هاوسەری پرشنگی خاڵۆزای تەها بوو، ئەویش زۆر هاوکاری تەهای دەکرد. ئەو شوێنە ئاوی هەبوو، شێخ کەریم زوو زوو تەهای دەشۆری، چونکە وا بڵاوببووەوە کە پێویستە کەسانی بەرکەوتووی کیمیایی، زوو زوو بشۆردرێن.

هەروەها، نان و ئاوی دەکرد بەدەمی تەهاوە، بەڵام تەها هیچی پێ نەدەخورا. هاوکات دکتۆر محەمەدیش بەوردی چاودێری تەهای دەکرد. پێشمەرگەکان لەترسی کۆپتەر نەیاندەتوانی بە ڕۆژ بەڕێگاکەدا بڕۆن، هەر بۆیە ناچار بوون بە ڕۆژ لە شوێنێکدا خۆیان بشارنەوە و بەشەو بەڕێگادا بڕۆن. شەو تەهایان سواری وڵاخ کرد و بەرەو گوندی کارێزە بەڕێکەوتن. سەدان پێشمەرگەی دیکە لە کارێزە کۆببوونەوە و بەرنامەیان دادەنا، بەرەو کوێ بڕۆن و چی بکەن.

یەکێک لەو پێشمەرگانەی لە گوندی کارێزە بوو، ناوی عەدنانی حەمەی مینا بوو، فەرماندەی تیپی۲۱ی کەرکووک بوو. کاک عەدنان تەهای دەناسی، کاتێک بە بریندار چاوی پێی کەوت زۆر خەمی بوو. کاک عەدنان گوتی: من دەرزییەکی "ئەترۆپین"ی ئەسڵیم پێیە. هەڵمگرتووە هەرکاتێک کیمیایی لێیدام، بۆ خۆمی بەکار بهێنم، بەڵام من ئێستا ئەو دەرزییە بۆ تەها بەکاردەهێنم، ئەگەر کیمیایی لێیدام خودا گەورەیە. دەرزییەکەی بۆ تەها بەکارهێنا، دەرزیی ئەترۆپین بەجۆرێک دروست کرابوو، بەرکەوتەی کیمیایی دەیتوانی هەر خۆی بۆخۆی بەکاری بهێنێت. هەر لەسەر جلوبەرگەوە لە ڕانی نەخۆشەکە دەدرا. بەڵام دەرزی ئەترۆپین زۆر کەم بوو، پێشمەرگە زۆر بە کەمی، دەرزی ئەترۆپینیان پێبوو. دواتر تەهایان سواری وڵاخ کرد و لەگەڵ پێشمەرگەکانی تیپی بیست و نۆ، بەمەبەستی خۆ حەشاردان ڕۆیشتنە نێو شیو و دۆڵێکی قوڵ. چەند ڕۆژێک لەو دەوروبەرەدا مانەوە، بە شەو جێگۆڕکێیان دەکرد و بە ڕۆژ خۆیان حەشاردەدا. هەموو پێشمەرگەکان لەجوڵەدا بوون، لەیەک شوێن نەدەمانەوە. لە نزیک کێو و یاڵ دۆڵەکان خۆیان دەشاردەوە. بەدوای دۆزینەوەی ڕێگایەکەوە بوون کە بتوانن بەرەو ئێران بڕۆن. دوای چەند ڕۆژێک تەها دەیتوانی ئاو بخوداتەوە و خواردن بخودات، بەڵام خواردن زۆر کەم بوو. خۆراک زۆر بە ئەستەم دەستدەکەوت. ئەگەر دەستیش بکەوتایە جگە لە کەمێک نانە ڕەق هیچ شتێکی دیکە نەبوو. چاویشی کەم کەم ڕوون دەبووەوە و باشتر دەیبینی. چەند پێشمەرگەیەکی دیکەش لەوێ بوون، ئەوانیش کیمیایی لێی دابوون. تەها چاوی بەهەر کەسێک بکەوتایە هەواڵی گۆپتەپە و ماڵی خاڵی لێ دەپرسین. هەواڵەکان ناخۆش بوون دەگوترا گوندەکە بە تەواوی سووتاوە و نزیکەی سەد

کەس بەهۆی کیمیاییەوە لەنێوچوون. ئەوەشی بەزیندوویی ماوە، بە ژن و منداڵ و پیاوەوە هەمووی دەستگیر کراون بە سواری زیلی عەسکەری بەرەو باشووری عێراق بەڕێکراون. ڕۆژێکیان کەسێک گوتی: تەها گیان پێویست ناکات هیچ شتێکت لێ بشارینەوە، خاڵت، خاڵۆژنت، تەواوی منداڵەکانیان، موحسین، سەردار، ماڵی حوسێنی زاوایان و هەموو منداڵەکان شەهید بوون. ئەوەی لەو بنەماڵە بە زیندوویی ماوە تەنها تۆیت! تەها زۆر پەرێشان بوو، دەستی کرد بەگریان. هەواڵی هەر کەسێکی گۆپتەپەی دەپرسی، یان شەهید ببوو، یان بەرشالاوی ئەنفال کەوتبوو. تەها زۆر خەمی خاڵی، خاڵۆژن و منداڵەکانیانی بوو. حەزی دەکرد خۆیشی لەگەڵ ئەواندا بمردایە. بەردەوام یادی خاڵ و خاڵۆژن و منداڵەکانی دەکردەوە. بیری ئەو ڕۆژانەی دەکردەوە کە پێکەوە دادەنیشتن و وتووێژیان دەکرد. یادی قسە خۆشەکانی شوانە و موحسین و سەرداری دەکردەوە.

پێشتر خاڵە سەلام لە ڕێکەوتی ١٩٧٩/٢/٢ دا، شەهید ببوو. موحسینی کوڕیشی لە کیمیاییەکەی گۆپتەپە شەهید بوو. ئێستا تەواوی خێزانی سەعیدی حەمەشوان بەکوڕ و کچەوە شەهید کراون، لەگەڵ موحسین و سەرداریش. سەردار خوشکەزای ئامینەی خێزانی سەعیدی حەمەشوان بوو، لە تەواوی خێزانی سەعیدی حەمەشوان، تەنها کچێکیان بە زیندوویی ماوە، ئەویش پێشتر شووی کردبوو، لەو کاتەدا لە گۆپتەپە نەبوو! -ئێستا ساڵی ٢٠١٩ ماڵی لە سلێمانییە-کچێک کە هەموو کەسوکارەکەی بەهۆی کیمیایی سەدامەوە لەدەست داوە. ئەو دەبێت ئێستا لە چ بارێکی دەروونییدا بێت؟ ئەگەر جارێکی دیکە بۆم ڕێبکەوێت سەردانی سلێمانی بکەمەوە، بەدڵنیاییەوە سەردانی ئەو خانمە بەڕێزە دەکەم.

تەها خەمێکی زۆری هەبوو، بەردەوام بیری لە ماڵی خاڵی دەکردەوە، گازی کیمیایی بە تەواوی دەروونی تێکدابوو، چەندین ڕۆژ بوو خواردن و ئاوی نەخواردبوو. چاوەکانی لێڵ و تارێک بوون. هەواڵەکانیش زۆر ناخۆش بوون، خوشکێکی لە نەخۆشخانەی تەورێز بوو، منداڵەکانی دەربەدەر بوون. سوعادی خوشکیشی بەرەو ئێران ڕۆیشتبوو، نەیدەزانی سوعاد ڕووی کردۆتە کام شار و کام شوێنی ئێران خاڵۆزاکانی شەهید کرابوون، زۆرێک لە هاوڕێ پێشمەرگەکانی شەهید ببوون. تەها

تەنها مابووەوە. هەڵبەت هەر تەنها تەها بەمجۆرە نەبوو، زۆربەی زۆری پێشمەرگەکان لەهەمان دۆخدا بوون. تەها قسەی لەگەڵ هەرکەسێکدا دەکرد ئەویش بەهەمان شێوەی ئەو بوو. دەیگوت چەندین کەسم شەهید کراون و کەسەکانی دیکەشم ئەنفال کراون و بێ ئاگام لە خزم و کەسوکار. خەڵک و پێشمەرگە بە تەواوی تووشی شۆک ببوون. بەڵام تەها سەرباری ئەم هەموو دڵگرانی و خەم و خەفەتە، خۆیشی کیمیایی لێی دابوو. هیچ هەواڵێکی ماڵی باوکی و ماڵی یاسین و محەمەد و هاشم و سەعدی خوشکی نەدەزانی. ئەوان هەموو بەنهێنی و بەدزیی حکوومەتەوە ڕۆیشتبوونە سلێمانی و لە ماڵی خزم و کەسوکاردا خۆیان شاردبووەوە. ئێستا دایکی، ئامینەی حەمەشوان چۆن بەرگەی ئەم هەموو ئێش و ئازارە دەگرێت. پێشتر سەلامی برای شەهید ببوو، دوای ئەو زوهێری برازای شەهید ببوو، ئێستاش سەعیدی برای بە ماڵ و منداڵەوە تیاچووە. تەها دەیزانی باوک و دایکی بەردەوام بیر لە ئەو دەکەنەوە، دەیویست ڕێگایەک بدۆزێتەوە هەواڵ بۆ دایکی و باوکی و هاوسەر و کەسەکانی دیکەی بنێرێتەوە. بەڵام چۆن و بەکێدا هەواڵ بنێرێت؟ ئەو لەخۆی دەپرسی ئەگەر زوبێدە بزانێت کیمیایی لە گۆپتەپەی داوە، دەبێت چی بکات؟ تەها، هیچ ڕێگەچارەیەکی نەبوو جگە لە دانبەخۆدا گرتن و چاوڕوانی.

پێشمەرگەکان دڵخۆشیی تەهایان دەدایەوە، بەڵام ئەوانیش هەر کەسە و چەندین کەسوکار و هاوڕێی خۆیان لەدەستدا بوو. یەکێک دایک و باوکی لەدەستدا بوو، یەکێک خوشک و برا، هەندێک لە پێشمەرگەکان وەک شێتیان لێ هاتبوو. لەو کاتە ناهەموارەدا کە بەردەوام کۆپتەر بە ئاسمانەوە بوو، ئەوان ڕووی کلاشینکۆفیان دەکردە ئاسمان و تەقەیان دەکرد! هەڵبەت لەو کاتە کارێکی زۆر ترسناک بوو، تەقە لە کۆپتەر بکرێت. چونکە هەم ژیانی بۆ خۆیان هەم ژیانی دەوروبەر و کەسانی تریان دەخستە مەترسییەوە. لێپرسراوەکان، دەبوو زۆر ئاگاداری ئەو جۆرە کەسانە بوونایە. زۆرێک لە لێپرسراو و فەرماندەکان خۆیشیان دایک و باوک و کەسوکاریان لەدەستدا بوو. هەموو خەم و نیگەرانی بەڕوویانەوە دیاربوو. هەندێکیان لەتاو خەم و نیگەرانی خۆیان، گۆرانییان دەگوت. هەندێکیان سروودی شۆڕشیان دەخوێند. هەندێکی دیکە هۆنراوەی شاعیرە گەورەکانیان دەخوێندەوە. ئەوان زیاتر هۆنراوەکانی بێکەس و قانعیان دەخوێندەوە.

هەموو ناوچەکە بە گشتی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی سوپاوە. سوپای سەدام، دەستی بەسەر هەموو گوند و شارۆچکەکاندا گرتبوو. بەڵام نەیاندەتوانی برۆنە نێو شیو و دۆڵەکان، خۆیان باش دەیانزانی هەموو شیو و دۆڵەکان پێشمەرگەی تێدایە. ئەگەر هێرشی زەمینییان بکردایە بۆ شیو و دۆڵەکان، زۆر زیانیان دەکرد، کوژراو و برینداریان زۆر دەبوو. بەردەوام هەلیکۆپتەر بە ئاسمانەوە بوو. لە‌هەر شوێنێک سووسەی پێشمەرگەیان بکردایە، ڕاستەوخۆ بۆمبی کیمیاییان ئاڕاستە دەکرد. یان بە شەستیر و دۆشکە، شیو و دۆڵەکانیان بۆردوومان دەکرد. گەورەترین کێشەی پێشمەرگەکان، نەبوونی خۆراک بوو، بەهیچ شێوەیەک خواردنیان دەست نەدەکەوت. یەک یەک و دوو دوو بەدوای خواردندا دەگەڕان، ئەگەر کەمێک ئارد یان برنج و ساوەریان دەست بکەوتایە، خێرا لەپەنایەکدا ئامادەیان دەکرد و دەیانخوارد. کێشەیەکی دیکەشیان ئەوەبوو کە چەند کەسێک برینداری کیمیایی بوون، بەڵام دەرزیی ئەترۆپین و دەرمانی چاویان دەست نەدەکەوت.

لە نێو پێشمەرگەکانی تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماقدا، فەلاح ناوێک هەبوو، فەلاح پێشمەرگەیەکی وریا و چالاک و لەشسووک بوو، زۆر شارەزای ناوچەکە بوو، هەموو شیو و دۆڵەکانی ئەو ناوچەیە شارەزا بوو. فەلاح شەوانە پێش پێشمەرگەکان دەکەوت و شوێن و پەناگەی باش و لەباری بۆ دەدۆزینەوە. بەردەوام بەدوای خواردندا دەگەڕا، هەوڵی دەدا هەرچۆنێک بێت ڕۆژانە کەمە خۆراکێک بۆ هاوڕێکانی بدۆزێتەوە. ئەویش وەکوو تەواوی پێشمەرگەکانی دیکە زۆر هاوکاری تەهای دەکرد. فەلاح نموونەی پێشمەرگەی ئازا و لەخۆبردوو بوو. بەڵام بەداخەوە لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٨/٣١، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی قارەمانی دیکەدا بەناوی عەبدولرەحمان ساڵح، لەبناری قەندیل شەهیدکرا. هەر هەمان ڕۆژ بوو کە سەرکردەی قارەمان ئازاد هەورامی‌یش شەهید کرا.

پێشمەرگەکان بۆ خۆشاردنەوە لە جاش، سەرباز، فڕۆکە و کۆپتەرەکانی سەدام، ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ لە یەک شوێن دەمانەوە. لە ترسی ئاشکرابوونی شوێنەکەیان ناچاربوون بەردەوام جێگۆڕکێ بکەن و لەو شوێنە دوور بکەونەوە و برۆنە شوێنێکی دیکە. شەوێک لە بناری خاڵخاڵان چوونە دۆڵێکی قوڵی نزیک گوندی کارێزە، بەناوی

"شیوی گەلکەمردوو"، کاکەحەمەی مامەڕەزاشیان لەگەڵدا بوو. شێخ هاوڕێی کوڕی کاکەحەمە لێپرسراوی پێشمەرگەکان بوو، بەڵام ئەو لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی دیکە لەو پێشمەرگانە دابڕابوون و کەوتبوونە شوێنێکی تر، نەیاندەتوانی یەکدی ببینەوە و پەیوەندی پێکەوە بکەنەوە. چەند ڕۆژێک لە "گەلکە مردوو" و دەوروبەری مانەوە، گەلکە واتە شتێکی بچووک واتە شتێکی بچووکی مردوو. تەها دەیگوت ئەو ناوە بگۆڕن بە "شیوی تەها مردوو" نەک "گەلکە مردوو".

تەها بەرەو باشبوون دەچوو، چاوەکانی بەباشی دەیانبینی. دەیتوانی بەهێواشی بەڕێگادا بڕوات. ڕشانەوەی نەمابوو، دەیتوانی خواردن بخودات. بەڵام، هیچ نەبوو بیخودات. چەند ڕۆژێک بوو هیچی نەخواردبوو، هەموو برسییان بوون. شەوێک تەها ڕووی کردە دکتۆر محەمەد و گوتی: دکتۆر زۆرم برسییە. دکتۆر کەمێک ساوەری وشک لە گیرفانیدا بوو، گوتی: دەمت بکەرەوە! تەها دەمی کردەوە و دکتۆر کەمێک ساوەری وشکی کردە دەمیەوە. هەڵبەت لەدوای چەند ڕۆژ، ئەوە یەکەم جار بوو تەها خواردن بخودات، ئەویش ساوەری وشک.

کاکەحەمەی مامەڕەزا لەو ناوچەیەدا دۆست و لایەنگری زۆری هەبوو. برسێتی تەنگی بە پێشمەرگەکان هەڵچنی بوو، ڕۆژێک دوو کەس لە دۆستان و لایەنگرانی کاکەحەمە گەیشتنە لای پێشمەرگەکان، هەر یەکە و یەک کۆڵ گۆشتیان هێنابوو، بەڵام نانیان نەهێنابوو، پێشمەرگەکان زۆریان برسیی بوو، چەند ڕۆژێک بوو هیچیان نەخواردبوو، هیچ شتێک نەبوو گۆشتەکەی تێدا بکوڵێنن، هەر بۆیە گۆشتەکەیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد و هەر کەسە و گۆشتی خۆی برژاند و بەبێ نان خواردیان. ڕۆژێک چەند پێشمەرگەیەک داوایان لە کاکەحەمە کرد، بەڵکو نامە بۆ سەرۆک جاشەکان، موستەشار و ئامر سرییەکان، بنووسێت بەڵکو هاوکارییان بکەن و لەو دۆخە ناهەموارە ڕزگاریان بکەن. کاکەحەمە سەیرێکی پێشمەرگەکانی کرد و گوتی: ئەوان دوژمنی ئێمەن، دوژمنی یەک بەیەکی خەڵکی کوردستانن، ئەوان کەسانی خائین و خۆفرۆشن. لەوانەیە ئەوان ڕۆژێک تۆبە بکەن و پەیوەندی بە گەل و میللەتی خۆیانەوە بکەنەوە، بەڵام ئەوان ئەمڕۆ لە دژی گەلی خۆیان بەرگری لە دوژمنانی کورد دەکەن، ئەگەر هەمووومان لێرە لەبرسا بمرین؛ من داوای هاوکاری لە ئەوان

ناکەم. من دەزانم زۆرێک لە ئەوانە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە من داوایان لێ بکەم هاوکارییمان بکەن، بەڵام من ئەو کارە ناکەم و نامەیان بۆ نانێرم.

دواتر چەند کەسێک لە خەڵکی ناوچەکە سەردانی پێشمەرگەکانیان کرد و لەگەڵ کاکەحەمەدا قسەیان کرد. داوایـان لێکرد لەبەر ئـەوەی، ئەو بەتەمەنە و توانای ڕۆیشتنی نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەواندا بڕوات، بچێت لە شارۆچکەکان لە ماڵە دۆست و ناسیاوەکانی خۆیدا بمێنێتەوە و شەوانەش بۆ هەر کارێکی پێویست کەسێک بنێرێت بۆ لای پێشمەرگەکان. پێشمەرگەکانیش داوایان لە کاکەحەمە کرد کە بڕوات و ئەو ناوە جێبهێڵێت. کاکەحەمە، لەگەڵ ئەو دوو سێ کەسەدا بەرەو شارۆچکەی تەقتەق ڕۆیشت. لەوێ لە هەوڵی ئەوەدا بوو ڕێگەچارەیەک بۆ پێسمەرگەکان بدۆزێتەوە. دواتر لەسەر ڕاسپاردەی خۆی، بەرنامە دانرا ئەو شوێنە جێبهێڵن و لە نێوان هەردوو ناحیەی ڕێدار و تەقتەق لە جادە بپەڕنەوە و بەرەو شوێنێک بڕۆن کە پێیان دەگوت هەڵەتی هەنارە، دواتر لەوێشەوە لە ڕووبار بپەڕنەوە و بەرەو دەشتی هەولێر و دەشتی کۆیە بڕۆن. ڕۆژێک نزیک کاتژمێر چواری پاشنیوەڕۆ، لەو شوێنەی لێی بوون، دوو دوو بەڕێدەکەوتن، هەر دوو کەس و پێکەوە دەڕۆیشتن، دەبوو ئەو دوو کەسە نزیکەی سەد مەتر لەپێش دوو کەسی دوای خۆیانەوە بڕۆن. بەوجۆرە هەموویان بەڕێکەوتن و بە شێوێکی قوڵدا دەڕۆیشتنە خـوارەوە. نزیکەی کاتژمێرێک دەبوو بەڕێگاوە بوون، لەناکاو سێ هەلیکۆپەر بەسەر سەریاندا تێپەڕین. ئەوانیش هەموو خۆیان بەزەوییەوە مەڵاس دا، دوای کەمێک کۆپتەرەکان گەڕانەوە، خۆشبەختانە پێشمەرگەکانیان نەبینی. دوای ماوەیەک دوبـارە بەڕێکەوتنەوە. نزیکەی کاتژمێر دەی شەو گەیشتنە سەرجادەی نێوان تەقتەق و ڕێدار، بەڵام وا هەستکرا لەسەر جادەکە کەمینی سەربازی هەیە، هەربۆیە دوو پێشمەرگە زۆر بە نهێنی لە جادەکە نزیک بوونەوە. بۆیان دەرکەوت سەربازی عێراقی لە نزیک جادەکەوە بۆسەیان بۆ پێشمەرگە داناوە، بۆیە بەزوویی گەڕانەوە بۆلای پێشمەرگەکان و ئاگاداریان کردنەوە کە بۆسەیان بۆ دانراوە. دواتر ڕێگاکەیان گۆڕی و گەیشتنە نزیک گوندێک بە ناوی گوندی حەسەن قەباغ. ئەو گوندەش وەک تـەواوی گوندەکانی دیکە سووتا بوو، ئاوەدانی تێدا نەمابوو، شەو لە خوار گوندەکەوە لایاندا، کە ڕۆژ بووەوە هەر لەو ناوە

خۆیان حەشاردا تا ئێوارە. کاتێک شەو داهات بەرێکەوتن و ڕۆیشتن، چوونە شوێنێک پێیان دەگوت هەڵەتی هەنارە، ماوەی سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە. هەر لەوێ دۆست و لایەنگرانی مامەڕەزاییەکان زۆر هاوکاریان کردن. بەنهێنی خواردنیان بۆ دەهێنان و کەڵەکیان بۆ دابین کردن کە شەو لە ڕووبار بپەڕنەوە.

دوای سێ ڕۆژ مانەوە لە هەڵەتی هەنارە، بڕیاریاندا ئێوارەیەک بڕۆنە سەر ڕووبارەکە. پێشتر کەڵەک بۆ پەڕینەوەیان ئامادە کرابوو. ئەوەی کە جێگای مەترسی بوو ئەو ڕەبیانەی سوپای عێراقی بوو کە بەسەر بەرزاییەکانەوە بوون و بەسەر ڕووبارەکەدا دەیانڕوانی. پێشمەرگەکان نزیکەی بیست و چوار پێشمەرگە بوون، زۆر بە نهێنی و لەسەرخۆ، گەیشتنە ڕووبارەکە و پەڕینەوە. ماوەیەک بەپێ ڕۆیشتن چوونە شوێنێک هەمووی دارقەیسی بوو. شەو چوونە شوێنێک تاکو نزیکی نیوەڕۆ، کاتی نیوەڕۆ گەڕانەوە بۆ لای دارقەیسییەکان ئەو ڕۆژە ١٩٨٨/٦/١ بوو خاوەنی باخە قەیسییەکە، پیاوێکی بەڕێز و میواندۆست و شۆڕشگێڕ بوو. ناوی عەبدوڵڵای لالە مەولود بوو، دۆست و خۆشەویستی کاکەحەمەی مامەڕەزا بوو. خەڵکی گوندی ئۆمەرگومەد بوۆ. ئەویش گوندەکەی سووتا بوو، ماڵیان چوو بوو بۆ تەقتەق. بەهاوکاری کوڕەکانی خواردنێکی زۆر باشی بۆ ئامادە کردبوون، ئەو نیوەڕۆیە خواردنێکی باشیان خوارد. گوندەکانی ئۆمەرگومەت، کانیلەلە و سیگرتکان، سێ گوندن بە تەنیشت یەکەوە، ئەوان لە بنچینەدا لوڕن بە شێوەزاری لوڕی قسەدەکەن، بەڵام ئێستا زمانەکەیان تا ڕادەیەک گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و بەشێوە زمانی هەولێری قسە دەکەن. نزیکەی کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ بوو، سێ کەس هاتن بۆ لایان، شەش بەڵگەی مۆڵەتیان هێنابوو. پێنج مۆڵەتییان بەناوی کەسانی ترەوە هاتبوو، بەڵام وێنەی پێنج پێشمەرگەی لەسەر بوو، مۆڵەتەکەی تەها بەناوی خۆیەوە هاتبووەوە، بەڵام، وێنەی لەسەر نەبوو. شەش پێشمەرگەکەش بریتی بوون لە دکتۆر محەمەد سەید عەلی، ئامانج مام تەها، شێخ کەریم شێخ تاهیر، هۆشیار سەرمۆردی، شەهید سلێمان ناڕوجەیی و تەها سیکانیانی. یەکێک لەو سێ کەسەی بەڵگەکانی هێنا بوو ناوی مەحموود ساڵح بوو، خەڵکی گوندی سمایل بەگ بوو. بە تەهای گوت: بەڵگەی تۆ وێنەی پێوەنییە، خۆت بیری لێ بکەرەوە، ئێمە دەڕۆین بۆ تەقتەق تۆ دێیت لەگەڵماندا

یان نا؟ تەها گوتی: منیش دێم. پاشان مەحموود سمایل بەگی پێشیانکەوت و ئەمانیش بەشوێنیدا بەرەو تەقتەق کەوتنەڕێ. پێش خۆراوابوون گەیشتنە نزیک تەق تەق، لەو کاتەدا گاگەل و بزن و مەڕ بەرەو تەقتەق دەڕۆیشتنەوە، ئەمانیش تێکەڵی ئاژەڵەکان بوون و لەگەڵ ئەواندا خۆیان بە شارۆچکەی تەقتەق دا کرد. لە دوورەوە چاویان لێبوو چەند کەسێک هاتنە سەر ڕێگاکە، تەها وایزانی ئەوان هاتوون بزن و مانگاکانی خۆیان بەرنەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام کە گەیشتنە لایان هەر یەکەیان قۆڵی کەسێکی گرت. کەسێک قۆڵی تەهای گرت و چاکوچۆنی لەگەڵدا کرد و گوتی: کاکە بابڕۆین! تەها گوتی: من تۆ ناناسم! ئەویش گوتی: پێویست ناکات بمناسیت، دەڕۆینەوە بۆ ماڵی خۆمان. دوای دە خولەک گەیشتنە ماڵەکە، تەها دانیشت و بەخێرهاتنێکی زۆریان لێکرد. دیارە پێنج کەسەکەی دیکەش هەر بەهەمان شێوە برانە ماڵان. ئەو ماڵەی تەهای لێ بوو خەڵکی گوندی سمایل بەگی بوون، ماڵێکی زۆر بەڕێز و میواندۆست بوون، ئێوارە یاپراغ -دۆڵمە- یان هەبوو خواردنێکی زۆر خۆش و بەلەزەت بوو، بەڵام خاوەن ماڵ بە تەهای گوت نەمانزانیوە تۆ دێیت، دەنا خواردنی باشترمان دروست دەکردی. تەها گوتی: باشترین خواردنتان دروست کردووە. من کەی خواردنی وا بەلەزەتم دیوە.

بۆ بەیانی کەسێک هات بە شوێن تەهادا و لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ ماڵێک لە گەڕەکێکی دیکەی تەقتەق. کە گەیشتنە ماڵەکە، تەها بینی، پێنج پێشمەرگەکەی دیکەش لەوێن. تەها پرسی بۆچی لێرە کۆکراوینەتەوە؟ کەسێک گوتی: چاوەڕوانی چەند برادەرێک دەکەین، ئەوان دێن بە شوێنماندا و دەمانبەن بۆ ڕانیە. دەبوو ئێستا بهاتنایە نازانم بۆچی درەنگ کەوتوون. دوای ماوەیەک کەسێک گوتی: ئەوا هاتن، ئێوەش هەڵسن و لەگەڵیاندا بڕۆن. دوو ماشێنی چەکدارانی کوردی سەر بەڕژێم هاتبوون. پێشمەرگەکانیان لەگەڵ خۆیاندا سوارکردن و ڕۆیشتن. بەنێو شاری کۆیەدا تێپەڕین. لە کۆیە لە ماشێنەکان شوێنێکدا وەستان، بیبسی کۆلایان بۆکڕین و بەرەو چوارقوڕنە ڕۆیشتن. یەکێک لە چەکدارەکان ناوی شەوقی مەحموود بوو. لێپرسراوی ئەو چەکدارانە ناوی ئەحمەد ساڵح بەگ بوو. ئەحمەد ڕووی کردە تەها و گوتی: تۆ دەچیتە ماڵی کێ؟ تەهاش کەسێکی دیاریکراوی لەو ناوچەیە نەدەناسی، ماڵی پووری باوکی لە ڕانیە بوو، پوورە فاتم دایکی قادر حامید. تەها گوتی: ئەگەر ئێوە بیانناسن

و ماڵیان بزانن، دەچمە ماڵی قادری حاجی ڕەسوڵی هەنجیرە. کەسێکی دیکە لەگەڵ ئەو چەکدارانەبوو ناوی بابەکر بوو خەڵکی گوندی پەڵکۆ بوو، ئەو گوتی: من ئەم برادەرە دەبەمەوە بۆ ماڵی خۆمان. ماڵی قادری حاجی ڕەسوڵ لەنێو بازاڕدان. ئەوان لە خانووەیەکی گەورەدان کە چەندین ماڵی دیکەی تێدایە، ماڵی ئەوان بەکەڵک نایەت. دەتبەمەوە بۆ ماڵی خۆمان. تەهاش زۆر سوپاسی کرد. دوای نانخواردن، تەهایان برد بۆ ماڵی بابەکر، تەها ئەوانی نەدەناسی، بەڵام ڕێزێکی زۆریان لێ گرت و خزمەتیان کرد. ڕۆژانی دواتر دایک و باوکی تەها و زۆربەی خزم و کەسەکانی هاتن بۆ ئەو ماڵە بۆ سەردانی تەها. دوای دوو ڕۆژ ناردیان زوبێدەش هات. ماوەی چەند ڕۆژێک لەو ماڵە مانەوە. خزم و کەسەکانی بابەکریش دەهاتن بۆ ماڵیان و لە هەواڵی تەهایان دەپرسی. دیارە لەو کاتەدا هیچ کەسێک نەیدەتوانی پێشمەرگەیەک داڵدە بدات، هەر کەسێک هاوکاری پێشمەرگەی بکردایە و ڕژێم پێی بزانیبایە، بچووکترین سزا، لە سێدارەدان بوو. بەڵام ئەو کاتەش کەسانی وەک بابەکر هەبوون کە هەر چەندە چەکداری ڕژێم بوون، بەڵام هەستی نەتەوەییان هەبوو.

ئەحمەدی ساڵح بەگ، خۆی چەکداری ڕژێم بوو، لە هەمان کاتدا بە نهێنی لایەنگری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، لەو کاتەدا ڕۆڵێکی باشی بینی بۆ ڕزگارکردنی ئەو پێشمەرگانەی یەکێتیی کە بەهۆی هێرشەکانی ئەنفالەوە لە هێزی پێشمەرگە دابڕا بوون، ئەو هەوڵی دەدا تەها و هاوڕێکانی بە سەلامەتی بگەیەنێتەوە لای هێزی پێشمەرگە.

کاتێک شەڕی ناوخۆ دروست بوو، ئاگری شەڕی براکوژی تاوی سەند. بەداخەوە هەمان ئەحمەدی ساڵح بەگ، لە شەڕی ناوخۆدا کوژرا. ئایا ئەم شەڕی براکوژییە بەهۆی بوونی دیکتاتۆرێکی وەکوو سەدامی نەگریسەوەیە؟ زۆرێک لە شەڕە ناوخۆییەکان پشتیوانی نێودەوڵەتییان هەیە، بەڵام هیچ وڵاتێک و نەتەوەیەکی دەرەوە بەبێ بوونی ڕژێمێکی دیکتاتۆری ناتوانێت لە هیچ وڵاتێکدا جەنگی ناوخۆیی دروست بکات. هەر وڵاتێک چارەنووسی کەوتە دەست تاکە کەسێک، چارەنووسی وەک چارەنووسی ئەڵمانیای هیتلەر، ئیتاڵیای مۆسۆلۆنی، عێراقی سەدام و لیبیای قەزافی لێدێت. تەها لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ واتە دوای سێ ساڵ، سەردانی ئەحمەدی

ساڵح بەگی کرد و خۆی پێناساند و لەسەر ئەو هەڵوێستەی ساڵی ١٩٨٨ دوبارە سوپاسی کرد. ئیتر لەو کاتەوە چاوی پێی نەکەوتەوە تاکو هەواڵی کوژرانی بیست.

دوای سی و یەک ساڵ تەها باسی کوژرانی ئەحمەدی ساڵح بەگ ی بۆ کردم، ئەو لە شەڕی براکوژیدا کوژرا بوو. تەها زۆر نیگەران بوو بۆی، فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتنە خوارەوە. تەها پێشمەرگە بوو، چەندین شەڕی بینی بوو، ئەو بۆ کوژرانی ئەحمەدی ساڵح بەگ کە گیانی ئەو و هاوڕێکانی ڕزگارکردبوو زۆر نیگەران بوو، ئەگەرچی ناوبراو سەربە پارتەکەی تەهاش نەبوو، بیرکردنەوەیان جیاواز بوو.

تەها و هەموو ئەو پێشمەرگانەی کە من بینیومن، زۆر دژی شەڕی برا کوژی بوون. ئەوەندەی من بۆم دەرکەوت، کوردەکان بەگشتی دژی شەڕ بوون، کوردەکان شەڕخوداز نین، ئەوان بەرگریکارن. ئەحمەدی ساڵح بەگ و شەوقی سەرمۆردی و بابەکر پەڵکۆیی و چەند کەسێکی دیکە هاوکاری تەها و هاوڕێکانیان کردبوو، خزمەتیان کردبوون خواردنیان پێدابوون، لە هەموو گرنگتر ئەوان گیانی تەها و هاوڕێکانیان پاراست. خۆ ئەگەر لەو کاتەدا حیزبی بەعس هەستی بەو هاوکارییانە بکردایە، ئەوا بەبێ لێکۆڵینەوە گوللەبارانیان دەکردن.

کاتێک تەها کیمیایی لێی دابوو، زوبێدە و ڕەوکان لە کەرکووک بوون. کاتێک گوندی گۆپتەپە بەر هێرشی کیمیایی کەوتبوو، دایکی و باوکی تەها بە دوای ئەودا دەگەڕان. ئەوان وایاندەزانی تەها شەهید بووە. حاجی عەبدوڵلا و ئامینە بە شار و شارۆچکەکاندا بە دوای هەواڵی تەهاوە بوون. لە هەر شوێنێک پرسیاریان دەکرد باسی کارەساتی گۆپتەپەیان دەبیست. هەر لەو گەڕانەدا ئامینە زانی ماڵی سەعیدی برای بەهۆی گازی کیمیاییەوە هەموو تێداچوون و خەڵکێکی زۆر لە گۆپتەپە بەهۆی کیمیاییەوە شەهید بوون. حاجی عەبدوڵلا و ئامینە بە بیستنی کارەساتی گۆپتەپە تەواو خەمبار بوون. ئامینە نەیدەزانی بۆ کێ بگری، بۆ براکەی یان بۆ منداڵی براکەی، بۆ کوڕەکەی یان بۆ ئەو هەموو خزم و ناسیاوانەیان. گۆپتەپە بەتەواوی وێران کرابوو، ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگە و خەڵکی گوندەکە شەهید کرا بوون. خەڵکێکی زۆریش بە زیندوویی کەوتنە دەست سوپای سەدام و ئەنفال کران. ژمارەیەکی کەمیش کە بە زیندوویی مابوونەوە، زۆر بەنهێنی خۆیان گەیاندبووە نێو شار و

شارۆچکەکان و گیانی خۆیان ڕزگار کردبوو، حاجی عەبدوڵلا لە خەم و بیرکردنەوەدا بوو، دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو، بیری لە کارەساتی گۆپتەپە دەکردەوە. هەر کەسێکی دەبینی بە جۆرێک باسی کارەساتەکەی بۆ دەکرد، ئەو بیری لەو کوشتار و ماڵوێرانییە دەکردەوە، بیری لە سەعیدی ژنبرا و هاوڕێی دەکردەوە. یادەوەرییەکانی ڕابردووی خۆی و سەعیدی بیردەهاتەوە، کە چەندین جار پێکەوە ڕۆیشتبوون بۆ کاروان و خەڵوزکردن. یادەوەرییەکانی وەک فیلمێک دەهاتەوە بەرچاوی. سەعید، خاڵی تەها و شەمسە بوو، مامی زرار و زوبێدە بوو. ئامینە لە تاواندا گێژ ببوو. نەیدەزانی چی بکات. قوڕگی گیرا بوو، قسەی بۆ نەدەکرا و دەنگی دەرنەدەهات. نەیدەزانی بۆ کێ بگری. برا و براژن و برازاکانی لەدەستدا بوو. پێش سێ ساڵ زوهێری برازای لە هەمان گوندی گۆپتەپە شەهید کرا بوو. نۆ ساڵ پێشتر سەلامی برای شەهید کرابوو. جگە لە چەندین خزم و کەسی دیکەی. بەڵام، لەچاو کارەساتەکانی پێشوودا، کارەساتی ئەم جارەی گۆپتەپە، جیاوازتر و پڕ ئێش و ئازارتر بوو. برایەکی و تەواوی بنەماڵەکەی تێداچووبوون. کەس و ئاشنایەکی زۆری تێداچووبوون، هەروەها نەیدەزانی تەهای کوڕی چی بەسەرهاتووە، مردووە یان زیندووە. هیچ کەسێکیش نەبوو دڵخۆشی ئەو ژن و پیاوە بداتەوە. حاجی عەبدوڵلا سەیری ئامینەی دەکرد و دەگریا، ئامینەش سەیری حاجی عەبدوڵلای دەکرد و فرمێسکەکانی دەهاتنە خوارەوە. چەندین کەسی دیکەش هەر وەکوو ئەوان بەدوای هەواڵی کەسوکاریاندا وێڵ بوون. ئەوانیش هەموو خەمبار و سەرلێشێواو بوون. کەسێک نەبوو کە دڵخۆشی ئەوانیش بداتەوە. چەند قسەیەکیان بۆ بکات و باری سەر شانیان سووک بکات. دەکرێت چەند کتێب و داستان لەسەر کارەساتی گۆپتەپە بنووسرێت.

ئامینە لاواز و بێهێز، پاڵی دابووەوە. هۆن هۆن فرمێسکەکانی دەهاتنە خوارەوە. حاجی عەبدوڵلاش بە بێدەنگ دەگریا و نەیدەزانی چی بە ئامینە بڵێ. کێ دەتوانێ دڵی ژنێک بداتەوە کە تەواوی برا و برازاکانی لەدەست دابێت. ئامینە پوور بوو، پوورێک کە هاوکات برا و براژن و هەشت برازای لەدەستدا بوو، ژنێک کە پێشتر برا و برازایەکی دیکەشی لەدەستدا بوو. چ کەسێک دەتوانێت لە هەستی ژنێکی کۆستکەوتووی ئاوا، تێبگات؟

## گڕ بگرە، تا بزانی چی دەچێژم

## هەستکردن بە سووتان، بە ڕوانین نابێ

هیچ کەسێک هەواڵی ڕاستی تەهای نەدەزانی، حاجی عەبدوڵلا و ئامینە زۆر خەمبار بوون. کەسێک نەبوو دڵنەواییان بداتەوە، ئەوان هەموو کەسوکار و خزمەکانیان لەدەستدا بوو، گوندی گۆپتەپە ببووە گۆڕتەپە. ئەو گردۆلکە بەرزەی دامێنی گوندەکە. کە بەسەر ڕووبارەکەدا دەڕوانێت و لەسەر ئەو گردەوە دەتوانیت بەچوار دەوری خۆتدا بڕوانیت و هەموو ئەو دەرودەشتەت لەپێشچاوە، ئێستا ئەو گردۆڵکەیە بووە بە گۆڕستانی شەهیدانی بێتاوانی کیمیاباران. بووە بە گۆڕستانی ژن و منداڵ و پیر و جوان. کە هەموویان لە ماوەی کەمتر لە یەک کاتژمێردا گیانیان سپاردبوو. لەسەر ئەو گردەوە دەتوانیت ئالآی دڕندەیی سەدام و حیزبی بەعس و لایەنگران و ئەڵقە لە گوێیانی دابنێیت. حاجی عەبدوڵلا و ئامینە بەردەوام لە گەڕاندا بوون. بەردەوام بە دوای هەواڵی تەهاوە بوون. یەکێک دەیگوت تەها کیمیایی لێیداوە، یەکێک دەیگوت بیستوومە تەها مردووە، یەکێک دەیگوت تەها ئەنفال کراوە، یەکێکی دیکە دەیگوت تەهام بینیوە شێت بووە، بەڵام بەدڵنیاییەوە تەها زیندووە. چونکە هیچ کەسێک تەرمی ئەوی نەبینیوە. حاجی عەبدوڵلا و ئامینە ئومێدی زۆریان بە زیندووبوونی تەها هەبوو. دوای ئەوەی هیچ هەواڵێکی تەهایان نەزانی بە نائومێدیەوە بەرەو سلێمانی گەڕانەوە. تەواوی گوندەکانی کوردستان لەلایەن سەربازانی بەعسەوە وێران کرابوون. هیچ کەسێک نەیدەتوانی سەردانی گوندەکان بکات. حاجی عەبدوڵلا بەردەوام لە نێوان شارۆچکەکانی دوکان، کۆیە، تەقتەق، تەکیە و چەمچەماڵدا لە هاتوچۆدا بوو. لەلایەکی ترەوە تەها هەستی دەکرد کە دایک و باوکی لە شاری سلێمانین، دەیزانی تازە ئەوان بۆیان نییە بگەڕێنەوە گوندەکەی خۆیان.

تەها لە ڕانیە بوو، ئەو بەهۆی حامید و قادرەوە هەواڵی بۆ ماڵی باوکی نارد کە وا گەیشتۆتە ڕانیە. دوای ڕۆژێک حاجی عەبدوڵلا و ئامینە و زوبێدە و ڕەوکان گەیشتنە ڕانیە و چوونە ماڵی حامید و قادر. دواتر لەگەڵ ئەواندا سەردانی تەهایان کرد. ئامینە کاتێک چاوی بە تەها کەوت زۆر گریا. تەهاش کاتێک چاوی بە ئەوان کەوت، دەستی کرد بە گریان. تەها دەیزانی دایکی زۆر پەرۆشە بۆ مەرگی برا و

برازاکانی. ئەحمەدی ساڵح بەگ، هەواڵی بۆ تەها نارد کە بە نیازی چییە؟ ئەگەر دەیەوێت لە فەوجە سوکەکاندا ناونووس بکرێت، ئەوا لە لای خۆمان ناونووسی دەکەین، ئەگەر دەیەوێت بڕوات بۆ ئێران، ئەوا ئێمە هاوکاری دەکەین و بەرەو ئێران بەڕێی دەکەین. حاجی عەبدوڵڵا لە تەهای پرسی: بە نیازی چیت؟ تەها گوتی: دەمەوێت بە ژن و منداڵەوە بڕۆم بۆ ئێران، چەکی پێشمەرگایەتی هەڵدەگرمەوە، هەرگیز کۆڵنادەم و بەردەوام دەبم لە خەبات و پێشمەرگایەتی. حاجی عەبدوڵڵا ئامۆژگاریی کوڕەکەی خۆی دەکرد و دەیگوت: بەسە ئیتر وازبهێنە، ئەم شەڕە کۆتایی نایات، شەڕی کلاشینکۆف بەسەرچووە، ئێستا حکوومەت بە کیمیایی لە پێشمەرگە دەدات، هیچ گیانلەبەرێک لەبەرامبەر کیمیاییدا خۆی ڕاناگرێت، سەدام تۆپ و تانک و دەبابەی هەیە، هەزاران سەربازی هەیە، پارەیەکی زۆری لەبەردەستە، دەست لە هیچ کەسێک ناپارێزێت، جیاوازی لە نێوان ژن و پیاو و منداڵ و پیردا ناکات، بۆیە تکات لێ دەکەم وازبێنە و هەر لێرە خۆت ڕادەست بکەرەوە، بەرەو ئێران مەڕۆ، تۆ لە ئێران چیت بۆ دەکرێت، چی لە ژن و منداڵەکانت دەکەیت؟ تەها گوتی: هەر بگەمە ئێران و لێرە ڕزگارم ببێت، من لەوێ دانامێنم، دێهاتەکانی ئێران پێویستیان بە شوان هەیە بۆ مەڕ و گاگەلەکانیان، منیش دەچم لە گوندێکدا دەبمە شوان و خۆم و منداڵم بە شوانی دەژیەنم. باوکی گوتی: تۆ لێرە شوانییت بۆ نەکراوە، لەوێ چۆن دەبیت بە شوان؟ تەها گوتی: چۆن؟ من بە منداڵی زۆر چوومە لای کار و بزنەکان، کەمێک لە شوانی دەزانم. چەند کاتژمێرێک گفتوگۆیان کرد، باوک دەیگوت مەڕۆ و لێرە بمێنەرەوە وەک ئەو خەڵکە ببە بە چەکدار و هیچی تر، ئێمەش تووشی دەردەسەریی مەکە، کوڕ دەیگوت من هەرگیز چەکداری بۆ ئەم ڕژێمە ناکەم.

تەها زۆر بێ پارەبوو، تەنانەت یەک دیناری پێ نەبوو، حاجی عەبدوڵڵا پێی گوت من دەزانم بێ پارەیت، ئەگەر لێرە بمێنیتەوە و واز لە پێشمەرگایەتی بهێنیت، چیتر تووشی خەم و خەفەتمان نەکەیت، ئەوا پارەت دەدەمێ، بەڵام ئەگەر بە قسەی من نەکەیت و لە قسەم دەربچیت، منیش ئامادەنیم یەک دینارت بدەمێ. حاجی عەبدوڵڵا پێشمەرگەی خۆشدەویست دژی شۆڕش و خەبات نەبوو، ئەو بەردەوام هاوکاری پێشمەرگە بوو، ماڵەکەی شوێنی حەوانەوەی پێشمەرگە بوو، بەڵام ئەو نیگەرانی

گیانی کوڕەکەی بوو، حاجی عەبدوڵلا دەیبینی سوپاکەی سەدام چۆن بە تۆپ و فڕۆکە بۆردوومانی گوند و ناوچەکان دەکات و بۆ قڕکردنی کورد، گازی کیمیایی بەکاردەهێنێت. ئەو شاهیدی مەرگی دەیان کەس لە خزمەکانی خۆی و سەدان کەس لە ئاشنایانی بوو. حاجی عەبدوڵلا شاهیدی مەرگی چەندین پێشمەرگە بوو کە بە گازی کیمیایی شەهید کرابوون و فریای تەقاندنی یەک فیشەکیان نەکەوتبوون. ئەو دەیگوت: چۆن بە کلاشینکۆف شەڕی فڕۆکە و کیمیایی دەکرێت! دەیگوت شەڕی کلاشینکۆف بەرامبەر بە فڕۆکە و کیمایی واتە خۆبەکوشتدان. حاجی عەبدوڵلا دەیگوت، قسەی من هەر ئەوەیە لێرە بمێنەرەوە و وەک ئەو خەڵکە لە فەوجێک خۆت ناونووس بکە. تەهاش ئەوەی ڕەت دەکردەوە کە چەکداری بۆ حکوومەتی بەعس بکات.

زوبێدە کەمێک ئاڵتوونی هەبوو، بەپارەی بەرگدروون کڕیبووی، ڕۆیشت لە بازاڕی ڕانیە ئاڵتوونەکانی فرۆشت بایی سەد و بیت دیناری عێراقی بوو، تەها جلوبەرگی نەبوو، قاتێک جلی کۆنەیان پێدابوو، زوبێدە ڕۆیشت سەرەتا قاتێک جلی بۆ تەها کڕی، ئامینە کەمێک پارەی پێدان و حاجی عەبدوڵلا و ئامینە بەرەو سلێمانی گەڕانەوە.

تەها شارەزای سنوورەکانی ئێران بوو، بەڵام ئەم جارەیان نەیدەتوانی بەو ڕێگایانەدا بڕوات کە پێشتر پێیدا ڕۆیشتبوو. ئەم جارەیان ڕێگاکە ترسناک بوو، سوپای عێراق و جاشەکان هەموو ڕێگاکانیان گرتبوو. جگە لەوەی ئەم جارەیان تەها ژن و منداڵیشی لەگەڵدابوو، گیانێکی بێهێزیشی هەبوو، هێشتا کاریگەری گازی کیمیایی لەسەر جەستەی مابوو. جاش و سوپا دەیانزانی لەو ڕێگایانەوە پێشمەرگە دابڕاوەکان و بریندارەکان خۆیان دەگەیەننە سەر سنوورەکانی ئێران و پەیوەندی دەکەنەوە بەهێزی پێشمەرگەوە. هەر بۆیەش بە توندی ڕێگاکانیان تەنیبوو، ڕۆژانە هەواڵ دەگەیشت کە سوپای عێراقی خەڵکی بێ چەک و چەکدار دەگرێت و بەکۆمەڵ بەرەو باشووری عێراق بەڕێیان دەکات و بێسەرەوشوێنیان دەکات. تەهاش دەبوو لەو ڕێگایەوە بڕوات کە بەسەلامەتی بگاتە سەر سنوور. ڕێگایەک کە کاروانچی و قاچاخچیەکان پێیدا دەڕۆیشتن. لە ڕانیە کاروانچی و قاچاخچی زۆر هەبوون کە کەلوپەل وخواردەمەنییان بەرەو ئێران دەبرد. لە شاری ڕانیە کەسێک بەناوی

محەمەد عەلی هەبوو خەڵکی گوندی مەلاسەفی بوو. ئێوارەیەک بە نهێنی تەها و زوبێدەی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان، لەوێ بە تەهای گوت ئەگەر دەتەوێت بەرەو ئێران بڕۆیت من کەسێک دەناسم هەر ئەمشەو دەڕوات بەرەو گوندی سورەدێی بناری قەندیل. ئەو کەسە دواتر چوو ئەو کاروانچییەی هێنایە لای تەها و هێسترێکیان لێ بەکرێگرت، بە شەست دیناری عێراقی. ئەو کاروانچییە ناوی عەبدول بوو، خەڵکی گوندی "ماخوبزنان" بوو، هەر لەوێ سامان ناوێکیش کە پێشمەرگەی حیزبی شیوعی عێراقی بوو، ئەویش ئامادە بوو لەگەڵیاندا بڕوات بۆ سورەدێ. تەها لە بارەی مەترسییەکانی ڕێگاکەوە پرسیاری لێکرد، عەبدال گوتی: زۆر ئاسوودەبە، ئەو ڕێگایەی ئێمە پێیدا دەڕۆین مەترسی مینی نییە. دوای نانخواردنی ئێوارە، ماوەیەک لەو ماڵە مانەوە و کاتژمێر یەکی شەو کاروانچیەکە هات و بەڕێکەوتن. بە شاخی کێوەڕەش‌دا سەرکەوتن، کاروانچییەکە زۆر شارەزا بوو، بە ڕێگایەکی سەختدا سەری خستن بۆسەر شاخەکە، دوبارە بە شاخەکەدا داگەڕانەوە خوارەوە. دەنگی فڕۆکەی جەنگی و هێلیکۆپتەر دەهات. کاروانچییەکە بە دۆڵێکدا ئەوانی سەرخست. دۆڵێکی چڕ و بەردەڵان. شوێنەکە زۆر لەباربوو بۆ خۆحەشاردان لە فڕۆکەکان. دوای هەشت کاتژمێر گەیشتنە هەواری مەڕدارەکان. لە ماڵێکدا و لەژێر ڕەشماڵێکدا لایاندا، ئەو ماڵە ماڵی خوشکی عەبدولی کاروانچی بوو، تەها و زوبێدە جگە لە کەمێک نانە ڕەقە کە لە ڕانیە لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، هیچ خواردنێکی دیکەیان لا نەبوو. نیوەڕۆ لەو ماڵە نان، پەنیر، کەرە و دۆیان خوارد. نانە ڕەقەکەی خۆیان دەست لێنەدا و هەڵیانگرت بۆ ژەمێکی تر. کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ بەرەو گوندی سورەدێ بەڕێکەوتن. بەڵام دەبوو لە بناری قەندیل لە جادەی قیر بپەڕنەوە بەرەو سورەدێ، ئەو شوێنەی کە لە جادەکە دەپەڕینەوە پێیان دەگوت "کورتەک". هەڵبەت چەندین ڕەبیەی جاش لە ئەمبەر و ئەوبەری جادەکە هەبوون، لە کۆتاییدا ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٨/٦/١٠ لە جادەکە پەڕینەوە و دوای ماوەیەکی کەم گەیشتنە گوندی سورەدێ. لەو شوێنە مەترسی نەما بوو، پێشمەرگە لەگوندەکە و دەوروبەری گوندەکەدا بوون. عەبدولی کاروانچی پارەکەی لە تەها وەرگرت و بەزوویی ماڵاوایی کرد و گوتی: ئێرە سورەدێیە ئیتر من دەگەڕێمەوە بەرەو ڕانیە و ئێوەش خوداتان لەگەڵ بێت. دنیا تاریک بوو کە گەیشتنە

سورەدێ، بەردەوام خەڵک لە ڕانیە و سەنگەسەرەوە دەهاتن و ئەوانیش هەندێکیان ژن و منداڵیان لەگەڵدابوو تەها و زوبێدە لە پەنایەکدا دانیشتبوون، چاوەڕوانیان دەکرد تا ڕۆژببێتەوە، ئەوکات بەرەو گوێژێ بەرێبکەون، بەڵام گوێژێ زۆر دوور بوو، نزیکەی دوو ڕۆژ ڕێگا دەبوو، ئەویش بە ناو بەفردا و بە چیای قەندیلدا.

لە سورەدێ کەسێک هات بۆلای تەها و لەگەڵیدا کەوتە گفتوگۆ، ئەو کەسە گوتی: من ناوم مامۆستا مەحموودە، پێشمەرگەی تیپی شەست و سێی جوتیارانم، خەڵکی گوندی باوزێم. تەهاش گوتی: منیش پێشمەرگەم و خەڵکی ناوچەی سورداشم. مامۆستا مەحموود گوتی: دوو کاروانچی لێرە هەن کوڕێکی منداڵ و ژنێکی بە تەمەن، ئەوان خەڵکی گوندی قەلەڕەشەی ناوچەی سەردەشتن، دوو وڵاخیان هەیە و من وڵاخێکم لێ بەکرێ گرتوون و تۆش وەرە وڵاخەکەی دیکەیان لێبگرە، با پێکەوە بەرەو گوێژێ بڕۆین. لەوێشەوە پێکەوە دەڕۆین بۆ گوندی ئەڵوەتان و میراوای ئێران. من پێیان دەڵێم کە تۆ پارەت نییە و کرێی کەمترت لێ وەربگرن. کرێی وڵاخ تاکو گوێژێ، حەفتا دیناری عێراقی بوو، کرێکە گران بوو، چونکە ڕێگاکە دوور بوو، دەبوو بەنێو بەفر و شاخاندا بڕۆیشتنایە. تەها ئەگەر خۆی تەنها بوایە پێویستی بە وڵاخ نەبوو، بەڵام ژن و منداڵی لەگەڵدا بوو، خۆیشی بەهۆی کاریگەریی کیمیاییەکەوە توانای ڕۆیشتنی جارانی نەمابوو. تەها پێشنیازەکەی مامۆستا مەحموودی قبوڵ کرد و لەگەڵ پوور بەسی کاروانچی، خەڵکی گوندی قەلەڕەشە، پێکهاتن. بەیانی زوو لە سورەدێ وە بەڕێکەوتن، دەبوو لە شاخی قەندیل سەربکەن. قەندیل شاخێکی درێژ و فراوان و بەرزە. کەشوهەوای ئەو شاخە زۆر ساردە، لەسەر شاخەکەوە ڕێگاکە دەبووە دوو بەش، دەستە ڕاست بەرەو خۆرهەڵات و شاری سەردەشت دەڕۆیشت، دەستە چەپیش بەرەو خۆراوا و شاری پیرانشار. لەسەر شاخەکە بەفرێکی زۆر هەبوو، کاروانچییەکی زۆر لە هاتوچۆدا بوون. لە چەند شوێنێکەوە ئاوێکی زۆری بە خوڕ لەژێر بەفرەکەوە دەڕۆیشت و پردی بەفرین دروست ببوو. خەڵک و کاروانچی و هێسترەکان بەسەر پردە بەفرینەکاندا دەپەڕینەوە، پردەکان بەهۆی سەرماوە بەجۆرێک بەستبووی و ببوونە سەهۆڵبەندان بەهیچ شێوەیەک نەدەڕووخان. ئەوان بەیانی زوو، کاتژمێر شەش بەڕێکەوتبوون هەوا زۆر ساردبوو. تەها و زوبێدە و ڕەوکان تەنها

یەک بەتانیی کۆنەیان پێبوو، ئەو بەتانییەش ئامینەی هاوسەری خاڵە سەلیم لە ڕانیە پێی دابوون. لە نێو شاخەکەدا زیاتر لە دوو مەتر بەفر کەوتبوو، کاڕوانچییەکان بەتانییان پێبوو، بەڵام بە پارە دەیاندا بە خەڵکی. تەهاش پارەی زۆری پێنەبوو. خواردنیشیان لا نەبوو، جگە لە کەمێک نانە ڕەقە هیچ خواردنێکی دیکەیان پێ نەبوو. سەرما و برسێتی، شەکەت و ماندووی کردبوون. ڕەوکانیش هێزی تێدا نەمابوو. ئێوارە دونیا تاریک داهات. بەفر هەموو لایەکی داپۆشی بوو، تەنانەت ڕێگاکەش، هیچ شوێنێک دیار نەبوو. چەند کەسێکی دیکەش لەو ناوە بوون، ئەوانیش ژیانیان لە ژیانی تەها باشتر نەبوو. ئەوانیش بێ بەتانیی و بێ خۆراک بوون. بایەکی بەهێز هەڵی کرد. تا شەو درەنگتر دەبوو، "با"کە بەهێزتر و هەوا ساردتر دەبوو. زوبێدە لە سەرمادا هەڵدەلەرزی، ڕەوکان لێوەلەرەی پێکەوتبوو. تەها هەوڵی دا کونێکی کردە بەفرەکە و هێواش هێواش بەردی لێ دەردەکرد و دەیکرد بە دیوار، بەڵام دەستەکانی هێندەی نەما بوو ببنە شەختە. دەستەکانی تەزی بوون، سەرپەنجەکانی لەگۆچوو بوون. ماوەیەک لە کارکردن وەستا و دەستی خستە ژێر پشتێنەکەیەوە تاکو کەمێک پەنجەکانی گەرم ببنەوە. هەر لەو کاتەدا لەگەڵ چەند کەسێک کەوتە گفتوگۆ، کە چی بکەن باشە! چۆن بتوانن لە نێو ئەو بەفرەدا بمێننەوە؟ یەکێکیان گوتی: من وا بەباش دەزانم هەوڵ بدەین، بەرەو خوار، بەرەو نێو خاکی ئێران بڕۆین، تاکو دەگەینە شوێنی ڕەشانی و بێ بەفر. هەر چۆنێک بێت، ئەو شوێنە لێرە گەرمترە، چونکە بەفری لێ نابێت. تەها گوتی: ئێستا شەوە ئێمە شارەزا نین، چۆن دەتوانین بەم شاخە سەختەدا بڕۆین، لەکاتێکدا هیچ توانای ڕۆیشتنمان نەماوە، خۆ ناشتوانین چەندین کاتژمێر بە هەمان ڕێگەی خۆماندا بگەڕێینەوە. بۆیە، وا باشترە ئەمشەو هەر لێرە لە نێو ئەم بەفرەدا بمێنینەوە. تەها دەستی کرد بەهەڵکۆڵینی بەفرەکە تاکو چاڵێکی لە نێو بەفرەکەدا دروستکرد، هەرسێکیان چوونە نێو کونەکەوە، تەها و زوبێدە ڕووبەڕووی یەکتر هەڵتروشکان و ڕەوکانیان لە نێوان خۆیاندا دانابوو، بەتانییەکیان بەسەر خۆیاندا دابوو. شەوێکی ساماڵ و زۆر سارد بوو، هەڵبەت وەرزەکە زستان نەبوو، ڕۆژی ١٩٨٨/٦/١٢ بوو، بەڵام شاخی قەندیل زیاتر لە دوو مەتر بەفری تێدا بوو. هەوا زۆر سارد بوو، زۆریان برسی بوو، ڕەوکان لە برسا هاواری دەکرد،

کەمێک نانەڕەقەیان کرد بەدەمیەوە، بەڵام نەیتوانی بیخودات و بەردەوام دەگریا. تەها زۆر نیگەرانی ڕەوکان و زوبێدە بوو، حەزی دەکرد ئەو شەوە خۆی بمرێت، بەڵام ئەوان بەسەلامەتی بمێنن. تەها بەتانییەکەی بەسەری ڕەوکان و زوبێدەدا دابوو خۆی لە بەردەمی کونە بەفرەکەدا وەستابوو. ڕەوکان زوو زوو خەوی لێ دەکەوت و بەئاگا دەهاتەوە و دەیگوت سەرمامە. تەهاش لە تاوی زوبێدە و ڕەوکان فرمێسک بەچاوانیدا دەهاتنە خوارەوە. ئەو پیاوە ئازایە لە داخی چەوساندنەوە و نادادپەروەریی دەگریا. زوبێدە لە نێو بەفرەکەدا تەواو سڕببوو، بڕستی لێ بڕا بوو. تەها دەستەکانی زوبێدەی خستبووە دەستی خۆیەوە، دەیگوشین تاکو کەمێک گەرم ببنەوە. زیاتر لە دە کاتژمێر لە نێو ئەو کونە بەفرەدا مانەوە کە تەها دروستی کردبوو. تا بەیانی لە سەرمادا هەڵدەلەرزین، تەنانەت یەک خولەک خەو نەچووە چاویان، لەوەش دەترسان ئەگەر خەویان لێ بکەوێت، سەرما کەسیرەیان بکات و هەر لەوێ لە نێو بەفرەکەدا ڕەقببنەوە. سەرما تەواو کاری تێکردبوون، پێست و ئێسقانیان سڕ ببوو. تەها لەسەرمادا یاریی بەدەستەکانی خۆی دەکرد. خێرا خێرا خۆی بەملاولادا دەجولاند، هەڵدەستا و دادەنیشت، بەڵام چونکە هەوا زۆر ساردبوو، "با"یەکی بەهێز هەڵی کردبوو، هەرچی دەکرد گەرم نەدەبووەوە، خۆ ئەگەر ئەوەندە جوڵەشی نەکردایە ئەوا بەبێ چاکەت و بەبێ بەتانی ڕەقدەبووەوە. چەندین کەسی دیکەش لە هەمان دۆخدا بوون، بەڵام ئەوان منداڵیان پێ نەبوو. کات، دەمەوبەیان بوو، دونیا تاریک و ڕوون بوو، هێشتا خۆر دەرنەکەوتبوو. تەها گوتی: واباشە بەزوویی بەڕێ بکەوین.

خۆ ئەگەر هەر وا بەبێ جوڵە بمێننەوە ئەوا لێرەدا دەمرین. چەند کەسی دیکەش بەڕێکەوتن، سەرما کاری لە قاچیان کردبوو، پێڵاوی باشیان لە پێدا نەبوو، زوبێدە فرمێسک بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە، فرمێسکێک لە سەرمادا و لە بێکەسی و نائومێدیدا، ڕەوکانی لە باوەش گرتبوو، هێواش هێواش بە ڕێگادا دەڕۆیشت. کاتژمێر یازدەی پێشنیوەڕۆ گەیشتنە شوێنێک پێیان دەگوت گوێزێ، لەوێوە ماشێنی ئێرانی هاتوچۆیان دەکرد بەرەو گوندی ئاڵوەتان.

لە گوێزێ چەندین ماڵ و کەسی دیکە هەبوون کە ئەوانیش دەیانویست بەرەو گوندی ئەڵوەتان و ئێران بڕۆن، هەر لەوێ پیاوێک کە ژن و منداڵی لەگەڵدا بوو،

خۆی لە تەها نزیک کردەوە و پرسیی: تۆ چەندت پارەت پێیە؟ تەها گوتی: من پارەم پێ نییە و بێپارەم! ئەو پیاوە گوتی: من سی هەزار دیناری عێراقیم لایە. دەترسم. لێم بسێنن، تکایە ئاگادارمبە. هەموو پێکەوە سواری ماشێنێکی پیکاب بوون. کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ گەیشتنە گوندی ئەڵوەتان. ئەڵوەتان لە نزیک شاری سەردەشت بوو، بارەگای یەکێتیی لەوێ بوو. شوێنێکی زۆر قەرەباڵغ بوو. خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆببوونەوە. پێشمەرگەیەکی زۆر لەو ناوەبوون، هەموویان چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد تاکو بەرگەی هاتوچۆیان بۆ بکرێت و بەرەو شارەکانی ئێران بڕۆن. هەر لەوێ دوو ژن نان و خواردنیان بۆ بارەگاکان و خەڵکەکە ئامادە دەکرد. تەها بەو شوانەیەی گوت کە سی هەزار دینارەکەی لەلابوو، بابڕۆین خواردن وەربگرین. ئەوان هیچ قاپێکیان پێنەبوو کە خواردنی تێدا وەربگرن. زۆر بەملاولادا گەڕان، هیچ قاپێکیان دەست نەکەوت، خواردنەکە برنج و شلە و نان بوو، تەها پارچە کارتۆنێکی دۆزییەوە و قوتویەکی دۆشاوی تەماتەی بەتاڵی هێنا و قتوەکەی شۆری و برنج و شلەی وەرگرت. شوانەش هەر بەدوای قاپێکدا دەگەڕا تا خواردنی تێدا وەربگرێت.. تەها پێی گوت: تۆش بڕۆ پارچە کارتۆنێک بهێنە و برنجەکە بکەرە سەری، شوانەش گوتی: من ناتوانم بەو شێوەیە بژیم. تەها خواردنەکەی نیشاندا و گوتی: ئەم ژیانە بەلای منەوە خۆشترین ژیانە. خواردنەکە بێبەرامبەر دابەش دەکرا، شوانە خواردنی وەرنەگرت و گوتی: من دەگەڕێمەوە بۆ عێراق.

ساڵی ١٩٩٠ تەها ڕۆیشتبوو بۆ شیراز و جەهروم، بۆ سەردانی سوعادی خوشکی کە لە ئۆردوگای جەهروم بوو. لە گەڕانەوەیدا لە دیواندەرە پاسەکەیان بۆ پشوودان وەستا. دوبارە تەها لەوێ دیسان چاوی بە "شوانە" کەوتەوە. شوانە بە تەهای گوت تۆ کوردیت؟ تەها گوتی: تۆ شوانە نیت؟ شوانە زۆر پێی سەیر بوو گوتی: تۆ چۆن من دەناسیت؟ تەها گوتی: لە ئەڵوەتان پێکەوە بووین. شوانە ئنجا بیری کەوتەوە. ئەو کاتە بڕی سی هەزار دیناری عێراقی پێ بوو، تەهاش بێ پارە بوو، بەڵام هیچ هاوکارییەکی تەها و خەڵکە هەژارەکانی نەکرد. شوانە لە ئاڵوەتانەوە گەڕابووەوە بۆ سلێمانی و دوای دوو ساڵ دوبارە گەڕابووەوە بۆ ئێران، دەیویست بڕوات بۆ ئەوروپا، شوانە گوتی: من لە سلێمانییەوە هاتومەتەوە، بەنیازم بڕۆم بۆ ئەوروپا، بەڵام ئێستا وا

پۆلیس دەمانبات بۆ قەرەنتینەی سنه. ئیتر تەها نەیزانی شوانه چی بەسەرهات و جارێکی دیکه چاوی پێی نەکەوتەوە.

ئەڵوەتان شوێنێکی کوێستانیە، کۆتایی وەرزی بەهار بوو، بەڵام هێشتا ئەڵوەتان زۆر ساردبوو. تەها و زوبێدە هیچ شتێکیان نەبوو، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، خەڵکێکی زۆر بەرەو ئەڵوەتان دەهاتن و ژمارەی پەنابەران لەزیادبووندا بوو. تەها پارەی پێنەبوو تاکو بەتانییەک و کەمێک پێویستی بکڕێت. شەوی پێشوو نەنووستبوون، زۆر خەویان دەهات. تەها لەلای دوکانێکی گوندەکە بەدوای کارتۆندا دەگەڕا، چەند پارچە مقەبایەکی گەورەی دەستکەوت و هێنانی بۆلای زوبێدە. لە پەنایەکدا مقەبایان ڕاخست و مقەبایان بەخۆیاندا دا و لێی نووستن.

تەها دەبوو بەرگە "مۆڵەت"ی هاتوچۆ وەربگرێت، تاکو بتوانێت بەرەو سەردەشت بڕوات. ئەڵوەتان زۆر قەرەباڵغ بوو. بەردەوام خەڵکی زۆرتر لە عێراقەوە دەهاتن. تەها نەیدەتوانی بەرگەی هاتوچۆ وەربگرێت. دوای چەند ڕۆژێک تەها شێخ عوبێدی خەڵکی سەرگەڵووی بینی. شێخ عوبێد کاتێک چاوی بە تەها کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی: ئێمە هەواڵمان بیست کە تۆ بەهۆی کیمیاییەوە شەهید بوویت، ستار و زرار بەردەوام لەگەڕاندان، تاکو هەواڵێکی تۆیان دەستبکەوێت. ئەوان ئێستا لە شاری بانه نیشتەجێن، دوێنێ ستاری برات لێرە بوو وێڵی هەواڵی تۆ بوو. وا باشترە تۆش بەزوویی بەرگەی هاتوچۆ وەربگریت و بڕۆیت بۆ بانه. تەها گوتی: ئێرە زۆر قەرەباڵغە منیش کەس ناناسم، ناتوانم وا بە ئاسانی بەرگە وەربگرم. شێخ عوبێد گوتی: من سبەی دەگەڕێمەوە بۆ بانه هەرچۆنێک بێت ستار دەدۆزمەوە و هەواڵی ئێوەی پێ ڕادەگەیەنم، پێی دەڵێم کە ئێوە ئێستا لە ئەڵوەتانن. دوای چەند ڕۆژێک ستار گەیشتە ئەڵوەتان، بەبینینی براکەی زۆر خۆشحاڵ بوو، دوانیوەڕۆ زراریش گەیشتە ئەڵوەتان، هەر لەوێ پێیانگوت بەرگە بۆ خۆت وەربگرە و وەرە بۆ بانه، با جارێ زوبێدە و ڕەوکان لێرە بمێننەوە. بارەگای پێشمەرگەمان لە شاناخسێ داناوە لە نێو خاکی عێراق. هەر لەوێ یارمەتی پێشمەرگەش وەربگرە، ستار و زرار کەمێک پارەیان دا بە تەها و بەرەو بانه گەڕانەوە. دوای دوو ڕۆژ تەها بەرگەی وەرگرت و بەرەو بانه ڕۆیشت. ڕۆژی دواتر لە بانەوە خۆی گەیاندە گوندی شاناخسێ، شەوێک

لەوێ مایەوە. لەوێ پێشمەرگەی زۆری لێ بوو. هەر لەوێش مووچە دابەش دەکرا. تەها بەشی زۆری پێشمەرگەکانی دەناسی. هەندێک لە پێشمەرگەکان کە تەهایان بەزیندوویی بینی، پێیان سەیربوو. بەبینینی خۆشحاڵ بوون. تەهایان لە باوەش گرت، چەند کەسێکیان لە خۆشحاڵیدا دەگریان، چونکە ئەوان هەواڵیان پێگەیشتبوو کە تەها لە گۆپتەپە شەهید بووە. هەڵبەت لە دوای کیمیابارانی گۆپتەپەوە هەواڵی شەهیدبوونی تەها بە هەموو لایەکدا بڵاو ببووەوە.

هەر لەوێ تەها بڕی ٣٥٠٠ تومەنی وەرگرت و گەڕایەوە بۆ بانە، شەوێک لەلای خوشک و برا و کەسەکانی مایەوە. ئەوان هەموو بەبینینی تەها خۆشحاڵ بوون. بەیانیی ڕۆژی دوایی تەها گەڕایەوە بۆ ئەڵوەتان، بۆلای زوبێدە و ڕەوکان. ڕەوکان تەمەنی چوار ساڵ بوو، زوبێدە دۆشەکەڵەیەکی بچوکی بۆ ڕەوکان دروست کردبوو، تەها کە چاوی بە دۆشەکەڵەکە کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو. لە زوبێدەی پرسی ئەم دۆشەکەڵەیەت چۆن دروست کرد؟ زوبێدە گوتی: چاکەتە کۆنێکی پاسداران لە دەم چەمەکە کەوتبوو منیش هەڵم گرتەوە و پاک شۆریم. چووم لەو ماڵە دەرزی و دەزووم وەرگرت و کردم بەو دۆشەکەڵەیە بۆ ڕەوکان. تەها دەستخۆشی لە زوبێدە کرد و ئەو کەمە پارەیەی کە وەریگرتبوو پیشانی زوبێدەی دا و گوتی: خەمت نەبێت ئیتر برسی نابین، خۆمان دەژیەنین، ئەوا من ٣٥٠٠ تومەنم وەرگرتووە و تۆش دۆشەکەڵەیەکت دروست کردووە. تەها و زوبێدە لەوێ کێشەی زمانیان نەبوو، چونکە ناوچەی سەردەشتیش هەر بە شێوە زاری سۆرانی سلێمانی قسەیان دەکرد، بەڵام تەها و زوبێدە فارسی‌یان نەدەزانی.

دوای گەڕانەوەی تەها لە بانەوە و گەیشتنەوەی بۆ ئاڵوەتان، هەوڵی دا بەرگەی هاتوچۆ بۆ خۆی و زوبێدە وەربگرێت. دوای چەند ڕۆژێک بەرگەی هاتوچۆی وەرگرت و لە ئەڵوەتانەوە ڕۆیشتن بۆ سەردەشت و لەوێشەوە چوون بۆ بانە. شەمسە و زرار و منداڵەکانیان لە بانە بوون. خاڵە عەبدوڵلاش بە ماڵ و منداڵەوە هەر لە بانە بوون. لە بانە شوێنێکی باشیان دەستنەکەوت تاکو لێی بحەوێنەوە. هەموو مزگەوت و خوێندنگە و شوێنە گشتییەکان پڕ ببوون لە کوردانی ئاوارەی عێراق. کوردانی ئێرانیش بەشێک ماڵە کوردی ئاوارەیان بردبووە ماڵەکانی خۆیان و جێگایان بۆ دابین کردبوون. پاشان

هەموو بڕیاریاندا لە بانەوە بڕۆن بۆ ناوچەی سەردەشت. بڕیار درابوو لە پیرشێخ و نێژاوای نزیک نەڵاس ئۆردوگایەک بۆ بەشێک لە ئاوارەکان دروست بکرێت. ئەوانیش خۆیان گەیاندە نەڵاس و لە نێژاوا نیشتەجێ بوون. هەر ماڵە و خێمەیەک و چەند بەتانییەکی کۆنیان پێدان. ئەو هاوینەیان لەوێ بەڕێکرد، زستانی ئەو ناوچەیە زۆر ساردە، ئەوانیش نەیاندەتوانی بە زستان و بێ سووتەمەنی لەوێ بژین. هەرَبۆیەش تەها ڕۆیشت بۆ شارۆچکەی ڕەبەت لە نزیک سەردەشت. ڕەبەت شارۆچکەیەکە کەوتۆتە نێوان سەردەشت و مەهاباد. ڕەبەت لە ڕووی بەرزییەوە شوێنەکەی زۆر لە سەردەشت نزمترە و بەرۆژە. هەر بۆیەش لە زستانان لە سەردەشت گەرمترە. هەر لەو کاتەدا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بڕی دە هەزار تومەنی وەک هاوکاری، بەبێ جیاوازی حیزبایەتی، بەسەر هەموو ماڵێکی ئاوارەدا دابەش کرد. تەهاش ئەو برە پارەیەی وەرگرت. لە ڕەبەت پیرەژنێک بەناوی خاتوومێرێ لە ماڵەکەی خۆیدا، ژوورێکی بەبێ کرێ دا بە تەها، ئەو زستانە زستانێکی زۆر ساردبوو. ئەو پیرەژنە ژنێکی زۆر میهرەبان بوو، جێگای تەها و زوبێدەی کردەوە بەبێ ئەوەی پارەیان لێ وەربگرێت. هەندیک جاریش لەڕوی سووتەمەنییەوە هاوکاری دەکردن.

### تەها لە ڕەبەت

ڕۆژگار تێپەڕی، تەها هەندێک لە پێویستییەکانی ناو ماڵی کڕی، وەک قاپ، کەوچک، مەنجەڵ و چەند پارچەیەک جلوبەرگ بۆ خۆی و زوبێدە و ڕەوکان. حکوومەتی ئێران بۆ کارئاسانی خۆی و دەست ڕاگەیشتنی بەسەر ئاوارەکاندا. داوای کرد کە ئاوارەکانی ڕەبەت خۆیان نوێنەرێک دیاری بکەن بۆ سەرپەرشتی ئاوارەکان. یەکێک لە کارەکانی فەرمانداری سەردەشت دابەشکردنی ئارد بوو، بەسەر ئاوارەکاندا، بە نرخێکی کەم. ئاوارەکانی دانیشتووی ڕەبەت تەهایان هەڵبژارد گوتیان تۆ کەسێکی خوێندەواریت، دەبێت تۆ ئەو کارە بکەیت. تەهاش کارەکەی قبوڵ کرد. فەرمانداری سەردەشت تەهای ڕاسپارد کە ناوی هەموو سەرۆک خێزان و ژمارەی خێزانەکانیان بۆ بنووسێت و لەگەڵ یەکی دوو وێنەی سەرۆک خێزانەکاندا بۆیان بەرێت.

فەرمانداری کارتێکی بچووکی بۆ هەر خێزانێک دروستکرد. فەرمانداری سەردەشت بڕیاری دا مانگانە بە نرخی هەشتا تومەن، فەردەیەک ئارد بداتە هەر خێزانێکی ئاوارە، بەڵام تەها بۆ یەک فەردە ئارد، نەوەد تومەن لە هەر ماڵێک وەربگرێت، حەقی کرێی حەماڵ و کرێی ماشێن. زۆربەی ماڵەکان بە دوو مانگ جارێک یان سێ مانگ جارێک ئاردەکەیان وەردەگرت. تەهاش ئەو ئاردەی کە خەڵکەکە نەیاندەویست هەر لە هەمان شوێن دەیفرۆشتەوە بە خاوەن دوکانی ئاردەکە، هەر فەردەیەک بە قازانجی پێنج تا دە تومەن. هەر بەو هۆیەوە هەندێک مانگ دوو سەد تومەن پارەی دەست دەکەوت. ئەو کات ڕۆژانەی کرێکارێک ٢٥٠ تومەن بوو. تەها زۆر بەباشی کارەکانی خۆی ئەنجامدەدا، هەربۆیە سەرنجی ئێرانییەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، هەر جارێک کە تەها دەچوو بۆ وەرگرتنی ئارد، کارمەندی فەرمانداری یەک فەردە ئاری زیادەی بۆ دەنووسی. لێپرسراوی دابەشکەری ئارد لە فەرمانداری سەردەشت، کوردێک بوو بەناوی ڕەشیدی بایەزیدی، کەسێکی زۆر بەڕێز و سەرڕاست بوو، ئەگەر کەسێکی ساختەکار و فێڵباز بوایە دەیتوانی ڕۆژانە چەندین هەزار تومەنی لە دابەشکردنی ئارددا دەستبکەوێت. بەڵام ڕەشیدی بایەزیدی، لە دابەشکردنی ئارددا زیانیشی دەکرد. تەها بۆی دەرکەوت لەو هەموو قەرەباڵغی و گرفتاریەدا لێپرسراوە ئێرانییەکان کەسانی سەرڕاست و دڵسۆزن، هیچ کەسێک کاری چەوتی نەدەکرد. سەردەمی جەنگ و کەمێک دوای جەنگ بوو، هێشتا بەرژەوەندیخوازی دەیەی ساڵانی ٢٠٠٠-٢٠١٠ نەهاتبوونە پێش. هەمووان هەوڵیان دەدا بەخۆشەویستی و میهرەبانییەوە پێشوازی لە کوردە ئاوارەکان بکەن. لێپرسراوان کاری ئاوارەکانیان بەخێرایی و بەمیهرەبانییەوە ئەنجام دەدا. ئەگەر خواردەمەنی و هەر پێویستیەک بۆ ئاوارەکان بهاتایە، بەزوویی دابەشیان دەکرد. ڕەشیدی بایەزیدی هاوسەری خوشکی ئیسماعیلی قادری بوو.

سوعاد، خوشکێکی دیکەی تەها بوو، ئەویش لەگەڵ هاوسەر و خزم و کەسەکانی دیکەیان ئاوارەی ئێران ببوون، لە ئۆردوگای "خوی" نزیک "ورمێ" نیشتەجێ ببوون. دواتر گواسترانەوە بۆ ئۆردوگای جەهروم لە خوار شیراز. سوعادیش سێ ساڵ لە جەهروم مایەوە، بەڵام فێری زمانی فارسی نەبوو، ئەوان لەوێ کرێکارییان دەکرد،

بەتایبەت لە باخی میوەی لیمۆ و پرتەقال کاری میوە چنینیان دەکرد.

بە درێژایی چل ساڵ، ئێران پێشوازی لە ملیۆنەها ئاوارەی وڵاتان کردووە، بەڵام لەو ماوە دور و درێژەدا بەرنامەیەکی نەبووە تاکو ئاوارەکان فێری زمانی فارسی بکات. دیارە ئاوارە ئەفغانییەکان زیاتر لە هەموو ئاوارەکانیتر لە ئێران ڕۆیشتوونەتە قوتابخانە، بەڵام کوردە عێراقیەکان هیچ کێشەیەکی زمانییان نەبووە، تەنانەت زۆربەی ئەو کەسانەش کە ماوەی سێ ساڵ لە جەهروم بوون فێری زمانی فارسی نەبوون، وڵاتی ئێرانیش بەرنامەی فێربوونی زمانی فارسی بۆ ئەوان نەبوو. هەزاران کوردی عێراقی لە ماوەی چەند مانگێک تاکو دەیان ساڵ لە ئێران ماونەتەوە.

زراریــش هاتبوو بۆ ئـێـران. شەمسە و هـاوســەری زرار و منداڵەکانیان لە شارۆچکەی ڕەبەت نیشتەجێ بوون. تەها و زوبێدە ڕۆژانە سەردانی شەمسە و زرار و منداڵەکانیان دەکرد، شەمسە دەستی باشتر ببوو، بەڵام نەیدەتوانی کاری پێبکات، دەستی ڕاستی هیچ شتێکی پێ هەڵنەدەگیرا. ئەوکاتەی شەمسە لە نەخۆشخانەی شوهەدای تەورێز بوو، ڕووناک و منداڵەکانی شەمسە گواسترابوونەوە بۆ ئۆردوگای خوی. زرار بۆ سەردانی شەمسە ڕۆیشتبوو بۆ تەورێز دوای گەڕانەوەی لە تەورێز ڕۆیشت بۆ ئۆردوگای خوی. شەمسەش دوای سێ مانگ مانەوەی لە نەخۆشخانە، گەڕایەوە بۆلای منداڵەکانی. منداڵەکان بە بینینی دایکیان خۆشحاڵبوون. فەرەیدوون، شۆڕش و ڕۆژگار چوونە لای دایکیانەوە و دایکیان ماچ دەکرد و سەیری دەستیان دەکرد. ئەویش منداڵەکانی ماچ دەکرد و لە باوەشی دەگرتن. شەمسە دەستەکانی هێزیان تێدا نەبوو، بەتایبەت دەستی ڕاستی هیچ شتێکی پێ هەڵنەدەگیرا. تەنانەت نەیدەتوانی بە دەستی ڕاستی شاڵاوی بچکۆلانەش لە باوەش بگرێت. شەمسە زۆر سوپاسی ڕووناکی کرد کە ئەو ماوەیە بە باشی چاودێریی منداڵەکانی کردبوو. ڕووناک خوشکی زرار و کچی خاڵی شەمسە بوو. شەمسە بە بینینی منداڵەکانی هەموو ئێش و ئازار و مەینەتی نەخۆشخانەی لەبیر چووەوە. هەواڵی یەک بەیەکی منداڵەکانی پرسی، شاڵاو گەورە ببوو، تەمەنی ببووە ساڵ و نیوێک، ئیتر پێویستی بە شیر خواردن نەبوو، لە باوەشی دایکیدا ئارامی گرتبوو. شاڵاو دوای سێ مانگ دایکی خۆی بەبۆنکردن ناسیەوە. چەند مانگێک لە نێژاوای لای نەڵاس مانەوە، دواتر چوونە ڕەبەت و لەوێ نیشتەجێ بوون.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، مووچەیان بۆ زراریش بڕیبووەوە، مووچەکەی مانگانە ٣٥٠٠ تومەن بوو، ئەو مووچەیە بۆ کەسێکی وەک زرار کە خاوەنی پێنج منداڵ بوو، زۆر کەم بوو.

تەها هەستی کرد کە ماوەیەکی زۆر لە ئێران دەمێننەوە، ئەو دەبوو بۆ خەرجی ماڵ و منداڵ و گوزەرانی خۆی، کار بکات. حیزبەکەشی لەو ئاوەرەییەدا پارەیەکی وایان نەبوو کە بتوانێت مانگانە مووچەیەک بدات بە پێشمەرگەکان. هەندێک جار بە چەند مانگێک مووچەیەکیان دابەش دەکرد. تەها ڕۆیشت بۆ سەردەشت و مەکینەیەکی کۆنی بەرگدروونی بۆ زوبێدە کڕی بە بڕی ٢٥٠٠ تومەن. زوبێدە دەستی کرد بەکاری بەرگدروون، هەڵبەت کاری بەرگدروون زۆر نەبوو، خەڵکی پارەیان نەبوو تاکو جلوبەرگی تازە بکڕن. وەرگرتنی ئاردی ئاوارەکانیش لە مانگێکدا تەنها چەند ڕۆژێک بوو. تەها جار جارێک دەڕۆیشت بۆ کرێکاری، هەڵبەت لە ڕەبەت کار زۆر کەم بوو. ڕۆژێک یەکێک لە هاوڕێکانی تەها کە ناوی خەلیل سەرمۆردی بوو، گوتی: من لێرە، لە ڕەبەت کارێکم دۆزیوەتەوە، سبەی تۆش وەرە، بەڵکو لەویَ پێکەوە کار بکەین. ڕۆژی دواتر پێکەوە چوون بۆ سەر کار، کارەکە دروستکردنی خانوویەکی گەورەبوو. خانووی ڕەشیدی بایەزیدی بوو، ڕەشید خۆی کارمەندی فەرمانداری سەردەشت بوو، ڕەشید تەهای ناسیەوە، کە چەند جارێک بۆ وەرگرتنی ئارد چووبووە لای. دوو وەستا لە خانووەکەدا کاریان دەکرد، یەکێکیان ناوی ئیسماعیلی قادری بوو، ئەوی دیکەیان ناوی فەتحوڵلای کەرەم پور بوو. تەها لە بەردەستی ئیسماعیلی قادری کاری دەکرد، خشتی دەدایە دەستی. تەها لە سلێمانیش کرێکاری کردبوو، شارەزایی لە کارکردندا هەبوو. ئەوسا لە سلێمانی لە دروستکردنی خانوودا، کەمتر خشت بەکار دەهات. خانوو زیاتر بە بەرد و بلۆک دروست دەکرا. ژمارەی کرێکارەکان زۆر بوون، چەند کرێکارێک ئاگادار کردەوە سبەینێ نەیەنەوە بۆ کار. ئەو سەردەمە دەبوو کرێکار دوازدە کاتژمێر کاری بکردایە، لە کاتژمێر شەشی بەیانی بۆ شەشی ئێوارە. تەها لە سمایلی قادری پرسی، ئایا سبەی من بێمەوە بۆ کارکردن؟ ئەویش گوتی: تۆ زۆر باش کار دەکەیت، سبەی وەرەوە، تۆ بەردەوام خشت بدەرە دەست من. تەها چەند ڕۆژێک لە لای وەستا سمایل کاری کرد. ڕۆژێک لە کاتی کارکردندا،

تەها لەبەرخۆیەوە، بەهێواشی سرووودی شۆڕشگێڕی دەگوتەوە، وەستا سمایل ڕووی کردە تەها و گوتی: تۆ سرووودی جوانت لەبەرە. تەها گوتی: بەڵێ من چەندین سروودم لەبەرە. وەستا سمایل گوتی: تۆ پێشمەرگەیت؟ تەها گوتی: بەڵێ. وەستا گوتی: تۆ پارتیت یان یەکێتیی؟ تەها گوتی: من یەکێتییم. وەستا سمایل گوتی: من مام جەلال تاڵەبانیم زۆر خۆشدەوێت و چەند ساڵێک لەمەوبەر سەردانم کردووە. ئەو سیاسەتمەدارێکی گەورە و پیاوێکی هۆشیار و شۆڕشگێڕە. پاشان بە تەهای گوت، دەبێت تۆ بەردەوام لەگەڵ مندا کار بکەیت. زیاتر لە دوو مانگ پێکەوە کاریان کرد. ڕۆژێکی هەینی، پشوو بوو کاریان نەکرد، تەها بۆ کڕینی هەندێک پێویستی ڕۆیشت بۆ سەردەشت، لە نێو بازاڕی سەردەشت لەگەڵ وەستا سمایل یەکدییان بینی، وەستا سمایل تەهای بۆ نانی نیوەڕۆ لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەوە یەکەم جار بوو تەها بۆ نانخواردن بچێتە ماڵی کوردێکی ئێرانی. کاتی ژەم، سەرەتا "سوپ"یان هێنایە سەر خوان، نانیش لەسەر خوانەکە دانرابوو. تەها نانی بەیانی نەخواردبوو، زۆر برسیی بوو، وایزانی نانخواردنی نیوەڕۆ تەنها ئەو سوپ و نانەیە، بۆیە نانە ڕەقی لە سوپەکە گوشی و دەستی کرد بە خواردنی، بەڵام وەستا سمایل و ئەوان سوپەکەیان بە کەوچک دەخوارد، کەسێکیش بە تەهای نەگوت سوپەکە بەبێ نان و بە کەوچک بخۆ. وەستا سمایل دوو کوڕی بە ناوەکانی شوانە و شێرکۆ، هەبوو، ئەوکات زۆر منداڵ بوون، شێرکۆ لە شوانە بچووکتر بوو. شێرکۆ سەیری تەهای دەکرد و پێدەکەنی. تەها سەیری کرد، کەسی دیکە سوپ ناخودات. ئەویش ناچار چاوی لە ئەوان کرد و دەستی لە سوپ خواردن هەڵگرت. دواتر برنج و شلە و گۆشت هێنرایە سەر خوان. ئینجا تەها تێگەیشت کە لە پێشدا سوپ دەخورێت و دواتر چێشت دێتە سەر خوان.

لەو کاتەوە وەستا سمایل و تەها بوونەتە دوو هاوڕێی گیانیبەگیانی یەکدی. بەردەوام پەیوەندییان بەیەکترەوە هەیە و بەگەرمی هاتوچۆی یەکدی دەکەن.

لە مانگی ١٩٨٩/٩ تەها ماڵەکەی لە ڕەبەتەوە گواستەوە بۆ ئۆردوگای بێزیلێ لە خوار سەردەشت. دووری نێوان ئۆردوگاکە و سەردەشت، تەنها پێنج کیلۆمەتر دەبێت. دوای تەواوبوونی کاری ڕەبەت، تەها ڕۆژانە لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا، بۆ

کارکردن لە بێزیلیێ وە دەچوو بۆ سەردەشت. تەها بەردەوام لەگەڵ وەستا سمایلدا کاری دەکرد.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، خەریکی خۆ ڕێکخستنەوە بوو، دەیویست سەرلەنوێ پێشمەرگەکانی ئامادە بکاتەوە. بارەگاکانی یەکێتیی لەسەر سنووری عێراق - ئێران بوو. ئەو کاتە تەها لە تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماق پێشمەرگە بوو، کە شێخ هاوڕێی کاکەحەمەی مامەڕەزا، فەرماندەی ئەو تیپە بوو. شەهید زراریش جێگری فەرماندەی تیپ بوو. بارەگای تیپەکە لە مەڵبەندی دوو بوو، لە گوندی بلەکێی سەر بە شارۆچکەی بانە کە لەسەر سنووری عێراق - ئێران بوو. پێشمەرگەکان ماوەی دە ڕۆژ لە بارەگاکان دەمانەوە و ماوەی دە ڕۆژیش لەماڵەوە دەبوون.

### ڕێکخستنەوەی تیپەکان و ڕاهێنانی پێشمەرگە

ساڵی ١٩٨٩-١٩٩٠ یەکێتیی نشتمانیی کوردستان، چەند خولێکی بۆ پێشمەرگەکان کردەوە، ئەو کات بارەگای مەڵبەند و تیپەکان لەسەر سنوور بوون، ئەو کاتە مام جەلال لە دەرەوەی وڵات بوو، نەوشیروان مستەفا، جێگری تاڵەبانی بوو، سەرپەرشتی تەواوی مەکتەبی سیاسی و هێزی پێشمەرگەی کوردستانی دەکرد. ئەوسا هێزەکانی یەکێتیی بەسەر سێ مەڵبەنددا دابەش ببوون، تیپی بیست و نۆی کەڵکەسماق یەکێک بوو لە تیپەکانی سەر بە مەڵبەندی دوو. نەوشیروان مستەفا کۆبوونەوەی لەگەڵ هەرسێ مەڵبەندەکەدا کرد، ڕۆژێک سەردانی مەڵبەندی دووی کرد و تەواوی پێشمەرگەکانی ئەو مەڵبەندە لە گوندی "بلەکێ" کۆبوونەوە. نەوشیروان پێی ڕاگەیاندن کە بڕیاریانداوە هێزی پێشمەرگە بکەن بە سێ بەشەوە. هێزێکیان بەناوی پارتیزانەوە دەبێت، ئەم هێزە دەبێت بچنەوە نێو خاکی کوردستان بۆ شەڕی پارتیزانی و ئامادەکاری بکەن بۆ ڕاپەڕینی جەماوەریی لەنێو شارەکاندا. هێزی دووەم بەتالیۆنەکانن، ئەم هێزە دەبێتە هێزێکی ئامادە لەسەر سنوور، لە هەر شوێنێک پێویستی کرد، دەبێت بڕۆن بەرەو ئەو ناوچەیە. هێزی سێیەم بریتی دەبێت لە پێشمەرگە بریندار و پەککەوتەکان، ئەوانە لە ماڵی خۆیان دادەنیشن و هەر کاتێک پێویستمان پێیان بوو ئاگاداریان دەکەین.

هەروەها گوتی: من خۆم ئامادەم لەگەڵ پارتیزانەکاندا بگەڕێمەوە بۆ ناو خاکی کوردستان. هەروەها گوتی: هەر کەسێک ئازادە لە کوێ ناوی خۆی دەنووسێت، لە پارتیزانی بێت یاخود لە بەتالیۆنەکان بێت. تەها بەخۆشحاڵیەوە لە هێزی پارتیزانەکان، ناوی خۆی نووسی. چەند کەسێک لە هاوڕێکانی بە تەهایان گوت تۆ دوو منداڵت هەیە، خۆیشت بەرکەوتەی چەکی کیمیاییت، واباشترە خۆت لە هێزی پارتیزان نە نووسیت، بەڵام تەها پێداگری کرد و وەک پارتیزانێک خۆی ناونووس کرد. "زەرکان" لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٩/١٠ لە "نێژاوا"ی نزیک نەڵاس هاتبووە دونیاوە، تەها و زوبێدە منداڵێکی چوار ساڵ و منداڵێکی چەند مانگانەیان هەبوو، بەڵام تەها پێداگری دەکرد و دەیگوت: من دەڕۆمە خوارەوە و لە نێو خاکی کوردستاندا پێشمەرگایەتی دەکەم. یەکێتیی، هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨ ـەوە چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی وەک پارتیزان ناردبوو بۆ ناوچەکانی گەرمیان، کەرکووک، پیرەمەگروون و هەولێر. لێپرسراوی مەفرەزەی پارتیزانەکانی پیرەمەگروون پێشمەرگەیەکی وریا و چالاک بوو بەناوی غەریب هەڵەدنی. غەریب هەڵەدنی هاوڕێی تەها بوو، هەر بۆیە داوای لە تەها کرد بچێتە مەفرەزەکەی ئەوەوە. تەهاش بە خۆشحاڵییەوە داواکەی قبوڵ کرد، چونکە غەریب هەڵەدنی و تەواوی پێشمەرگەکانی ئەو مەفرەزەیە دۆست و هاوڕێی تەها بوون، غەریب هەڵەدنی لە ڕێکەوتی ١٩٩٣/٧/٢٢ شەهید کرا.



تەها سێکانیانی ڕۆژی ۱۹۹۰/۸/۲۰ ڕەتڵی سورداشی
مەفرەزە پارتیزانەکان لە گڵەزەردەی نزیک گوندی سێکانیان

## فێربوونی زمانی فارسی

کاتێک تەها نوێنەری ئاوارەکانی «ڕەبەت» و لێپرسراوی دابەشکردنی ئەو ئاردە بوو کە لە فەرمانداری «سەردەشت» وەری دەگرت، بڕیاری دا، خۆی فێری زمانی فارسی بکات، ئەو زۆر حەزی لە زمانی فارسی بوو، هەمیشە دەچوو ڕۆژنامەی فارسیی دەکڕی و دەیخوێندنەوە. سەرەتا باش لە فارسی تێنەدەگەیشت، هەر وشەیەکی نەزانیبایە دەچوو لە هاوڕێکانی دەپرسی. تەها هەوڵێکی زۆری دا تاکو فێری فارسی ببێت. لە ماوەی یەک ساڵدا بەباشی فێری زمانی فارسی بوو. دەیتوانی هەندێک کتێبی سادەی فارسی بخوێنێتەوە و لێیان تێبگات. تەها کتێبی قوتابخانەی لە منداڵەکانی وەستا سمایل وەردەگرت و دەیخوێندەوە. کاتێک سواری ماشێن دەبوو تا دەگەیشتە سەرکار، بەردەوام خەریکی خوێندنەوەی کتێبی فارسی بوو. لەگەڵ خەڵکیدا بە فارسی قسەی دەکرد. سمایلی قادری زۆر هاوکاری تەهای دەکرد. بڕیار وابوو تەها بگەڕێتەوە بۆ عێراق، بەرلەوەی بگەڕێتەوە لە شارۆچکەی «میراوا» لەگەڵ وەستا سمایلدا کاری دەکرد. ئەوکات ڕۆژانەی کرێکارێک دوسەد و پەنجا تومەن بوو، بەڵام وەستا سمایل ڕۆژانە سێسەد تومەنی دەدا بە تەها، سێ ژەمەش خواردنی پێدەدا. ماوەی مانگێک لە «میراوا» کاریان کرد، بەبێ ئەوەی تەها هیچ پارەیەک خەرج بکات. لەو ماوەیەدا تەها پارەیەکی باشی کۆکردبووەوە، کاتێک بەرەو کوردستان ڕۆیشت، تەها پارەکانی دایەدەست زوبێدە و ماڵاوایی لە زوبێدە و منداڵەکانی کرد. زوبێدە زۆر نیگەران بوو، ئەو منداڵێکی پێنج ساڵ و منداڵێکی یەک ساڵەی هەبوو، لە غەریبیدا دەژیا، لە خزم و کەسوکاری دابڕا بوو. زراری هاوسەری شەمسەش ڕۆیشتبوو بۆ شەڕ، داهاتووی نادیار بوو. دیارنەبوو دوبارە سەدام چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێتەوە یان نا. تەها بڕیاری دا بوو بۆ بەردەوامبوون لە خەبات بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. زوبێدە نیگەران بوو، بەڵام هاوکات هاوسەرەکەشی هاندەدا بۆ خەبات و تێکۆشان. زوبێدە کراس و شەرواڵێکی بۆ تەها دروو بوو، بۆی خستە نێو کۆڵەپشتەکەیەوە. زوبێدە بە چاوێکی پڕ لە فرمێسک و ئومێدەوە هاوسەرەکەی بەڕێکرد. هاوسەرێک هاوکات خاڵۆزاشی بوو. هاوسەرێک کە زۆری خۆشدەویست. هاوسەرێک کە باوکی دوو

منداڵەکەی بوو. هاوسەرێک کە دەڕۆیشت تا لەگەڵ سوپای سەدامدا لەپێناو ئازادیدا بجەنگێت. زوبێدە، هەرگیز ڕێگری لە خەبات و تێکۆشانی هاوسەرەکەی نەدەکرد. ئەو هەمیشە لە تەنیشت هاوسەرەکەی بوو، هەمیشە پشتوپەنای تەها بوو. ژنانی کورد هەموو بەو جۆرە بوون. بەڵکو تێکڕای شێرەژنانی کورد منداڵەکانیان لە باوەش دەگرت و بەخۆشحاڵییەوە هاوسەرەکانیان بەرەو مەیدانی جەنگ بەڕێدەکرد، ژنانی کورد لە مەیدانی خەبات و تێکۆشاندا، نەبەردانە ڕووبەڕووی دوژمن دەوەستانەوە.

شەمسەش بە دەستی شکاو و شەش منداڵەوە، هانی زراری دەدا بڕوا بۆ جەنگ، جەنگێک لەپێناو ئازادیدا. شەمسە حاڵی لە زوبێدە خراپتر بوو، دەستێکی لەکار کەوتبوو، برینی دەستەکەی دیکەی باش ببوو، بەڵام ئازاری هەبوو، داهاتی هاوسەرەکەی لە داهاتی تەها زیاتر نەبوو. ئەوان هەموویان هاوکاری یەکدییان دەکرد. هەر کەسە و لە بارودۆخێکدا دەژیا، یەکێک شەش منداڵی هەبوو، یەکێک دوو منداڵ. زوبێدە کاری بەرگدروونی دەکرد. شەمسە بە شەش منداڵ و دەستی شکاوەوە نەیدەتوانی هیچ کارێک بکات. بەئومێدی گەیشتن بە ئازادی هاوسەرەکەی بەڕێکرد بۆ جەنگ. بەئومێدی سەرکەوتن لە جەنگدا، کۆڵەپشتەکەی بۆ زرار ئامادەکرد. چاوەکانی شەمسەش هەمیشە نیگەران بوون، زرار پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان بوو، بەڵام سەدامیش دیکتاتۆرێکی نامەرد بوو. بۆمبی کیمیایی بەکار دەهێنا. ژمارەی پەنابەرانی کورد لە ئێران زۆر بوون، زۆربەی پیاوەکان بۆ جەنگ و بەرگریکردن دژی سەدامی زۆردار، بەرەو کوردستان، گەڕانەوە. ژنان لە ئۆردوگاکاندا دەمانەوە، هەریەکەیان چەندین جار هاوسەرەکانیان بەرەو کوردستان بۆ جەنگ بەڕێ کردبوو، هەندێک لە ژنان و کچانی کورد هەموو ئامادەکارییەکیان تێدابوو بۆ جەنگ دژی سەدامی دیکتاتۆر. نرخی ئەم ئازادیە چەندە؟ وا مرۆڤ لەپێناوی بەدەستهێنانی ئازادیدا ژن و منداڵی خۆی جێدەهێڵی و بەخودای دەسپێرێت. ئەوان بۆ بەدەستهێنانی ئازادی، خۆشەویستانی خۆیان، لە وڵاتێکی دراوسێ جێدەهێڵن و خۆیان دەڕۆن بۆ مەیدانی جەنگ. لەبری ژن و منداڵ تفەنگ هەڵدەبژێرن. لەبری ئارامی نێو ماڵ و منداڵ هاوار و ناڵەی جەنگ هەڵدەبژێرن. لەبری خەوتن لە نوێنی گەرم و نەرمدا، دەڕۆن لەسەنگەری بەرگرییدا ئێشک دەگرن. لەبری باوەشی هاوسەر و منداڵەکانیان چەکەکانیان لەئامێز

دەگرن. نەوەی داهاتوو پێویستە نرخی ئەم ئازادییە بزانن و هەمیشە پارێزگاری لێ بکەن، گرنگترین کارێک بۆ پارێزگاریکردن لەم ئازادییە، ئەوەیە کە ئاگاداربن ڕێبەرەکانیان نەبنە دیکتاتور، هەر دیکتاتۆرێک لە شوێنی خۆی سەدامێک و هیتلەرێکە.

### پێشمەرگەکان و بنکەی زەڵێ

بڕیار وا بوو پێشمەرگەکان لە بنکەی زەڵێ ڕاهێنانیان پێبکرێت، ڕاهێنانەکەیان دوو جۆر بوو، ڕاهێنانی یەکەم فریاکەوتنی سەرەتایی پزیشکیی بوو، ڕاهێنانی دووەم بریتی بوو لە چۆنێتی خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی، جۆر و ناسینی مینەکان، هەڵگرتنەوە و دوبارە بەکارهێنانەوەیان. فەرماندەکانی پێشمەرگە بەپێویستیان دەزانی هەموو پێشمەرگە پارتیزانەکان ڕاهێنانیان پێبکرێت و شارەزایی تەواویان لە هەموو پێویستییەکانی جەنگدا هەبێت. نەک تەنها کلاشینکۆفێکیان پێبدەن و بە ناشارەزایی بیاننێرن بۆ بەرەکانی جەنگ. جگە لەوەش، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لەسەر ئەو باوەڕەبوو کە دەبێت خەڵکی شار و ئۆردوگاکان ئامادە بکرێن بۆ ڕاپەڕین، دەبوو پێشمەرگە پارتیزانەکان لە شارو ئۆردوگاکاندا پەیوەندی بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی خۆیانەوە بکەن و هەواڵ و بەرنامەی سەرکردایەتیان پێڕابگەیەنن. تا، ئەوانیش جەماوەر ئامادە بکەن بۆ ڕاپەڕینی سەرتاسەری.

دواجار تەها لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا لە مانگی ئابی ١٩٩٠ دا بەرەو کوردستانی عێراق گەڕایەوە، ئەو ماوەیەکی زۆر بوو، کوردستانی جێهێشتبوو، هەڵبەت ئەوان کە گەڕابوونەوە بۆ کوردستان، بۆ شەڕ و پێکدادان نەگەڕابوونەوە، بەڵکو گەڕانەوەکەیان زیاتر بۆ ئامادەکردنی دانیشتووانی شار و ئۆردوگا زۆرەملێکان بوو بۆ ڕاپەڕینی سەرتاسەری. ئەو کەسانەی لە ڕەتڵی سورداش پێکەوە بوون ژمارەیان بیست کەس بوو، جگە لە هاوڕێیانی ڕەتڵی کەرکوک و مەرگە. ئەوان بارەگایان لە شاخی پیرەمەگروون بوو، ڕۆژانە بە شاخی پیرەمەگروونەوە بوون و شەوانیش بەنێو کەمین و سوپای عێراقیدا و زۆربە نهێنی خۆیان دەگەیاندە نێو ئۆردوگای پیرەمەگروون و تێکەڵاوی جەماوەر دەبوون. لە ئۆردوگای پیرەمەگروون پەیوەندییان بە ڕێکخستنە

یەکێتییەوە دەکرد و بە نامە یەکدییان لە بەرنامە و هەواڵەکان ئاگادار دەکردەوە. هەر لە بناری شاخی پیرەمەگروون، بێتەلێکیان دامەزراندبوو، بەهۆی ئەو بێتەلەوە هەموو هەواڵەکانیان دەگەیاندە سەرکردایەتی یەکێتیی لە قاسمە ڕەشی سەر سنووری عێراق - ئێران. هەروەها بەرنامەی سەرکردایەتیشیان بە بێتەل وەردەگرت و دەیانکردە نامە و دەیانناردەوە بۆ ڕێکخستنەکانی نێو شاری سلێمانی و لەوێشەوە دوبارە بەرنامە پەخش دەکرا بەسەر تەواوی ڕێکخستنەکان لە شار و ئۆردوگاکاندا.



لە ڕاستەوە: تەها سێکانیانی، شەهید عومەر قەرانگۆیی، حەسەن بنگردی، محەمەد دوکانی، مەسعود شارستێنی، زاهیر سیدەری و مەحموودی حاجی ساڵح یاخیانی پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش، تشرینی یەکەمی ١٩٩٠ دوکانیان لە چیای ئاسۆس

پیرەمەگروون، شاخێکی زۆر سەخت و بڵندە، لە دامێنی ڕۆژهەڵاتی چیاکەدا سەرچاوەیەکی ئاو هەیە. هەروەها مەزاری پیرەمەگروون و چەند کەسێتییەک لەوێ هەیە، خەڵکی وەک زیارەتگا سەردانی مەزاری پیرەمەگروون دەکەن، سەرکەوتن بۆ سەر لووتکەی شاخەکە زۆر ئەستەمە. سوپای داگیرکەری سەدام هەرگیز نەیانتوانیوە

بە شاخەکەدا سەربکەون. ئەگەر بیانویستایە هێرش بکەنە سەر شاخەکە بێگومان زیانێکی زۆریان بەردەکەوت، چونکە پێشمەرگەکان لەسەرەوە بەتەواوی بەسەریاندا زاڵ دەبوون. بەڵام بە فڕۆکە و تۆپی دوورهاوێژ بەردەوام ناوچەکەیان بۆردوومان دەکرد، چەندین جاریش ئەو چیایە بۆمباران کراوە. بەڵام لە دوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی ۱۹۹۱ بەهۆی فشاری نێودەوڵەتیی نەیدەتوانی هێرشی کیمیایی ئەنجام بدات. لە ٥ ی نیسانی ۱۹۹۱ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ۹۸۸ یان قبوڵ کرد، بەپێی ئەو بڕیارە فڕینی فڕۆکە لە باکوور و باشووری عێراق قەدەغە کرابوو. لەو ڕێکەوتە بەدواوە سوپای سەدام نەیدەتوانی هێرش بکاتە سەر کوردستان، ئەو بڕیارە بڕیارێکی باش بوو بۆ خەباتگێڕانی کورد.

خەڵکی لە شارەکان و ئۆردوگاکاندا کەلوپەل و پێویستیەکانیان کۆدەکردەوە و دەیاننارد بۆ پێشمەرگە لە شاخی پیرەمەگروون، پێشمەرگەکان هەواڵەکانیان دەگەیاندە مەکتەبی سیاسی و ڕێنماییان لە مەکتەبی سیاسی وەردەگرت.

**دیداری دایک و باوک**

لە دامێنی شاخی پیرەمەگروون‌دا، ئۆردوگایەکی زۆرەملێی گەورە، بۆ ڕاگوێزانی گوندەکانی ناوچەکە دروستکرابوو. شارۆچکەکە شەقام و کۆڵانی تازەی بۆ دروست کرابوو، بە شێوازێک دروست کرابوو کە چاودێریکردنی بۆ چەکدارانی بەعس ئاسانتر بێت، شارۆچکەکەشیان بە ناوی پیرەمەگروونەوە ناونا بوو. دایک و باوکی تەها لە پیرەمەگروون نیشتەجێ ببوون. واتە داروودەستەکەی سەدام بەکۆچی زۆرەملێ ئەوانی ڕاپێچی ئۆردوگای پیرەمەگروون کردبوو. تەها زۆر بیری دایک و باوک و کەسوکاری دەکرد، هیچ هەواڵێکی ئەوانی نەدەزانی، بەڵام دەیزانی کە ژمارەی چەکدارانی بەعس لە نێو ئۆردوگای پیرەمەگروونداا زۆر زۆرە، ئەو دەیزانی ماڵی باوکی لەژێر چاودێری هێزەکانی بەعسدایە.

سەرەتای مانگی ئابی ۱۹۹۰، تەها لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا لە ئێرانەوە وەک پارتیزان هاتنە خوارەوە، لە بناری پیرەمەگروون پەیوەندییان کرد بە مەفرەزە

پارتیزانەکانی سورداشەوە، کە شەهید غەریب هەڵەدنی سەرپەرشتی دەکردن.

تەها، لەگەڵ دوو هاورێی پێشمەرگەیدا بەناوەکانی ئەنوەر تەلانی و عابد تەلانی لە شاخی پیرەمەگروونەوە دابەزین بۆ نێو ئۆردوگای پیرەمەگروون. بەمەبەستی بینینی رێکخستنەکانی یەکێتیی و ئەنجامدانی کار و چالاکییەکانیان و هێنانی برێک خواردەمەنی و پێویستی دیکە. نزیکەی کاتژمێر یازدەی شەو چوونە نێو ئۆردوگای پیرەمەگروون، دوای جێبەجێکردنی کارەکانیان، تەها پێشنیازی بۆ دوو هاورێکەی کرد، بەڵکوماڵی باوکی بدۆزنەوە و سەردانێکیان بکەن. هەڵبەت نە تەها و نە هاورێکانی، ماڵی باوکی تەهایان نەدەزانی. تەنها ئەوەیان دەزانی لە کام گەڕەک نیشتەجێن. هەندێک ناونیشانیان وەرگرتبوو. ئەوان سەرەتا ماڵی ئەبوبەکری حاجی قادریان دۆزییەوە کە ئامۆزای تەها بوو. ئەبوبەکر لە ماڵ نەبوو، هاوسەر و منداڵەکانی لە ماڵ بوون، هاوسەری ئەبوبەکر، پوورزای تەها بوو، بەخێرهاتن و خوڵکی تەهایان کرد، تەها گوتی: لێرە دانانیشین، تۆ وەرە ماڵی باوکمم نیشان بدە! ئەویش گوتی: من وا بە باش دەزانم نەچن بۆ ماڵی باوکت، بەڵکو بچن بۆ ماڵی کاک عەلی- عەلی برای ئەبوبەکر و ئامۆزای تەها بوو- چونکە ماڵی باوکت لەژێر چاودێریدایە. ئەوانیش رۆیشتن بۆ ماڵی کاک عەلی، کاتێک گەیشتنە ئەوێ، ئەوان نووستبوون. تەها ئەوانی لە خەو هەڵساند. کاک عەلی بەخێرهاتنی کردن، بە بینینی تەها زۆر نائاسوودە بوو، چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو. تەها پرسیی: بۆ وا نارەحەت بوویت، چی روویداوە؟ ئەویش گوتی: هیچ شتێک رووی نەداوە، هەر کە چاوم بە تۆ کەوت، لە خۆشحاڵیدا فرمێسک بە چاوامدا دێنە خوارەوە. تەها زانی کاک عەلی راستییەکانی پێناڵێت و نیگەرانە. تەها پێی گوت دەمەوێت چاوم بە دایکم و باوکم بکەوێت، ماوەیەکی زۆرە ئەوانم نەبینوە. کاک عەلی گوتی: ئێوە دانیشن من دەرۆم بانگی دایک و باوکت دەکەم. ئەو رۆیشت و دوای ماوەیەکی کەم دایک و باوکی تەها هاتنە ژوورەوە. هەردووکیان نەیانتوانی قسە بکەن، گەروویان گیرا بوو، فرمێسک بەچاوانیاندا دەهاتە خوارەوە. تەها سەرەتا بە فرمێسکەکانی کاک عەلیدا زانیبووی کارەساتێک روویداوە. دایک و باوکی تەها دەگریان، تەها کەوتبووە دڵەڕاوکێوە، چ کارەساتێکی خراپ روویداوە. تەها چرکە بە چرکە نیگەرانتر دەبوو، دایکی دەگریا و هاواری دەکرد. هاوسەری کاک

عەلی دڵنەوایی دەکردن. ئامینە هاواری دەکرد: خودایە ئەم شەڕە کەی کۆتایی دێت؟ خودایە چۆن هاشمم لەدەست چوو، هاشمی تەمەن چواردە ساڵ. تەها گیان، براکەت کوژراوە.. براکەت پارچە پارچە بووە! تەها، لەو هەواڵە شۆک بوو، نەیدەزانی چی بکات. برا بچووکەکەی، بچووکترین برای کوژرا بوو. ئەو هاشمەی کە تەها دەیکردە کۆڵی و دەیبرد بۆ سەرگەڵوو، کوژرا بوو! هاشمێک کە یاریی لەگەڵدا دەکرد، ئەو کوڕە جوانە کوژرا بوو. پارچە پارچە ببوو. تەها دەستی کردبووە ملی دایک و باوکی و بەکوڵ دەگریا. تەنها دوو ساڵ بوو دایک و باوکی نەبینی بوو، بەڵام ئەوان ئەوەندەی حەوت ساڵ پیر ببوون، سەروریشی باوکی تەواو سپی ببوو. حاجی عەبدوڵڵا نەیدەتوانی قسە بکات و دەگریا، لەگەڵ گریاندا شانەکانی دەلەرزین. هاوسەری کاک عەلی چای گەرمی بۆ تێکردن. کە هێواش بوونەوە، تەها لە باوکی پرسی هاشم بۆچی کوژراوە؟حاجی عەبدوڵڵا گوتی: تۆ هەواڵت ناردبوو کە گەڕاویتەوە بۆ ئەم ناوچەیە، چەند ناسیاوێکی خۆشمان هاوڕێکانی تۆیان بینیبوو، بەڵام تۆیان لەگەڵدا نەبوویت، ئێمە وامان هەست کرد تۆ لە شاخەکانی سێکانیان بیت، شەوێک بە نهێنی و بەدزیی سەربازەکانی سەدامەوە، بەرەو سێکانیان بەڕێکەوتین و بەشاخی سورداشدا سەرکەوتین. ئامینە دەستی کردەوە بە گریان. حاجی عەبدوڵڵا دایەوە پرمەی گریان و قسەکانی پچڕ پچڕ.. و لەگەڵ گریاندا تێکەڵ بوون. کاک عەلی هەڵیدایە و گوتی: لە شاخی سورداش، مینێک لەژێر پێی هاشمدا تەقیوە و.. حاجی عەبدوڵڵاش بە ناڵە و گریانەوە گوتی: هاشمی چواردە ساڵە هەر لەوێ شەهید بوو.. ئامینە خەریکبوو لە هۆش خۆی دەچوو.. حاجی عەبدوڵڵا گوتی: کوڕەکەم، بەبەرچاوی خۆمەوە پارچە پارچە بوو!

داخی لەدەستدانی کوڕێکی تەمەن چواردە ساڵ، کوڕێک کە لەبەر دەمیدا قسەی خۆشی دەکرد و پێدەکەنی، مەگەر کارێکی هێندە ئاسانە، لە پڕێکدا و لە چرکەیەکدا دەنگێک بەرزبووەوە، هاشم هەر وەک پارچە بەردێک بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە، تەنانەت دەرفەتی ئاخ هەڵکێشانیشی نەبوو. مینێک پارچە پارچەی کرد. لەو شاخ و چۆڵەوانییەدا، حاجی عەبدوڵڵا بە تەنها بوو، لەو کاتەدا شاهیدی پارچە پارچە بوونی کوڕەکەی خۆی بوو، ئەو لەو شاخ و کێوە چی دەکرد؟ دەگریا، فرمێسکی

دەڕشت. پارچەکانی کوڕەکەی کۆدەکردەوە! بەمەبەستی بانگکردنی کەسانێک تا بێن بۆ یارمەتیدانی، ڕۆیشت.. مەگەر دەکرێت لاشەی پارچە پارچەی کوڕەکەی لەو کێوە، بەتەنها جێبهێڵێت. دواجار حاجی عەبدوڵڵا، ناچار ڕۆیشت، تاکو داوای یارمەتی لە خەڵکی بکات و بێن بەهانایەوە. لێرەدا شتێک هەیە، ئایا خوێنەر کە ئەم باسە دەخوێنێتەوە هەر وا بە ئاسانی بەسەریدا ڕادەبووری؟ یان دەیخوێنێتەوە و بیردەکاتەوە! یان دەیخوێنێتەوە و دەیەوێت تەواوی مینەکانی جیهان کۆبکاتەوە، یان دەیەوێت هەموو جەنگەکانی جیهان کۆتاییان پێبێت؟ یان دەیەوێت هەموو سەرکردەکان بزانن کە کۆتایی هەموو جەنگێک ڕێکەوتنە، بۆیە وا باشترە هەرچی زووترە، ڕێکەوتن ئەنجام بدەن و خەڵکیش بە کوشتن نەدەن. ئەم ڕێگایە ڕێگای بەهەشت نییە، بەڵکو ئەمە ڕێگای ناخی دۆزەخە. جێگای ئەو تیرۆریستانەی کە خەڵکانی بێتاوان دەکوژن، ناخی دۆزەخە، نەک بەهەشت. کات بەرەو بەیان دەڕۆیشت، خەریکبوو ڕۆژ دەبووەوە، ئامینەش نەیدەتوانی چی دیکە دابنیشێت.

تەها نەیتوانی نان و ئاو بخودات، دایک و باوکی تەواو پیر و پەککەوتە ببوون. دایکی لە خەمی دوو برا و برازاکانیدا بوو کە لەگوندی گۆپتەپە شەهید کرابوون، ئێستا خەمی کوڕە چواردە ساڵەکەشی هاتۆتەسەر. حاجی عەبدوڵڵا لە خەمی سەعیدی ئامۆزای و ماڵ و منداڵەکەیدا بوو، کە بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتبوون و بێسەروشوێن کرابوون. ئەوان لە خەمی تەواوی کەسە شەهید و ئەنفالکراوەکانیاندا بوون. دەیان کەسیان شەهید و ئەنفال و بێسەروشوێن کرابوون. ئەوان بە شەهید و ئەنفالەوە نزیکەی هەشتا کەس، لە کەسە نزیکەکانی گوندەکەیان لەدەست دابوو. خەمی هەموو ئەو کەسانەش لە خەمی هاشم کەمتر نەبوو. حاجی عەبدوڵڵا لەکاتێکدا کە سەری خستبووە سەر شانی تەها، دەگریا و دەیگوت: ئەم جەنگە نەفرەتیە کەی کۆتایی دێت؟ ماوەی نیو کاتژمێر، هەموو بێدەنگ بوون و نەیانتوانی قسەیەک بکەن.

حاجی عەبدوڵڵا و ئامینە هەواڵی زوبێدە، ڕەوکان، شەمسە، زرار و منداڵەکانیان، خاڵە عەبدوڵڵا و تەواوی خزم و کەسەکانیان پرسی، تەها گوتی: ئێستا کچێکیشمان هەیە بەناوی زەرکان. ئەوانیش نزای خێریان بۆ کردن و هیوایان خوداست ئەم منداڵانە لە کەشێکی ئارام و دوور لە شەڕ و کوشتار گەورە بین. ئەو منداڵانەی

لە ئاوارەیی، دەربەدەری، جەنگ و کیمیاباراندا دێنە دونیاوە دەبێت چ ئایندەیەک چاوەڕوانیان بکات.

نزیکی بەرەبەیان بوو، ڕۆژ ببووایەوە، ئەگەری دەستگیرکردنی تەها و هاوڕێکانی هەبوو. تەها دەبوو بەزوویی بگەڕێتەوە بۆ شاخی پیرەمەگروون. هاوڕێکانی دیکەیان چاوەڕوانی ئەوانیان دەکرد. ئەگەر ڕۆژ ببووایەتەوە ئەوانیش گیانیان دەکەوتە مەترسیەوە. تەها دەستی دایک و باوکی ماچ کرد، حاجی عەبدوڵڵا ئیتر بە تەهای نەگوت دانیشە و واز لە پێشمەرگایەتی بهێنە، ئیتر بە تەهای نەگوت واز لەم شەڕە نابەرامبەرە بهێنە، جەنگێک کە لایەنێک خاوەنی تۆپ و فڕۆکەی جەنگی و کیمیاییە و لایەنەکەی دیکەش تەنها کلاشینکۆفی بەدەستەوەیە. ئایا حاجی عەبدوڵڵا توانای قسەکردن و گفتوگۆی نەمابوو، یان کەوتبووە سەر ئەو باوەڕەی کە دەبێت هەرچۆنێک بێت لە بەرامبەر سەدامدا بجەنگن؟ واتە هیچ ڕێگاچارەیەک نییە لە بەرامبەرسەدامدا، تەنها ئەوە نەبێت کە کوردەکان ڕووبەڕووی بووەستنەوە و لەگەڵیدا بکەونە جەنگەوە، واتە سەدامی دیکتاتۆر جگە لە جەنگ هیچ ڕێگاچارەیەکی دیکەی نەهێشتبووەوە. هەموو دیکتاتۆرەکانی جیهان هیچ ڕێگاچارەیەک بۆ خەڵکی ئازادیخوداز ناهێڵنەوە، جگە لە خەبات و تێکۆشان.

تەها بە خەمێکی گەورەوە بەرەو شاخی پیرەمەگروون کەوتەڕێ، خەمی لەدەستدانی براکەی! تەها لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەرەو شاخی پیرەمەگروون گەڕایەوە، زۆر غەمبار و توڕە بوو، لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد. سوێندی دەخوارد کە تۆڵەی براکەی دەکاتەوە، بەدەستەکانی فشاری کلاشینکۆفەکەی شانی دەدا. بەخۆی دەگوت تاکو بەدەستهێنانی ئازادی کۆڵنادەم و دەجەنگم، یاخود دەکوژرێم. ئەو هاوڕێیانەی لەگەڵیدا بوون دڵخۆشییان دەدایەوە، ئەوانیش چەندین خزم و کەسیان لەدەست دابوو. بەگشتی هیچ پێشمەرگەیەک نەبوو کە داخدار نەبووبێت و چەندین کەسوکاری لەدەست نەدابێت. لە سەردەمی سەدامدا هیچ کەس و بنەماڵەیەک نەبوو کە تازێبار نەبووبێت. تەها گەیشتەوە بارەگاکەی خۆیان لە شاخی پیرەمەگروون، کاتێک هاوڕێکانی زانییان کە برا تەمەن چواردەساڵەکەی شەهید بووە. سەرەخۆشییان لێ دەکرد و دڵنەواییان دەکرد و هەوڵیان دەدا ئارامی بکەنەوە. تەها زۆر پەرۆشی هاشمی بوو، زۆر خەمی

لە دایک و باوکی، یاسین و محەمەدی برای، سەعدیەی خوشکی دەخوارد. دایک و باوکی تەواو پەکیان کەوتبوو، بەرگەی خەمی هاشمیان نەدەگرت.

من لە نەورۆزی ساڵی ٢٠١٩ چاوم بە ئامینەی دایکی تەها کەوت، ئەو دەیگوت هەمیشە کاتی کوژرانی هاشمم لەبەرچاوە، ئەو کاتەی کە خوێنی هاشم بەسەر زەویدا ڕژا لەبەرچاومە، بەردەوام جەستەی پارچە پارچە بووی هاشم، لەبەرچاومە. ئامینە خەمێکی زۆری بینیوە، دایکی دوو شەهید و دوو کەمئەندام و خوشکی دوو شەهید و پووری دوانزە شەهیدی دیکەیە. جگە لە چەندین کەس و خزمی دیکەی کە شەهید و ئەنفال کراون. پێویستە دەروونناسان و پزیشکانی دەروونیی لەبارەی ئەم ژنە خۆڕاگرانەوە کتێب بنووسن. دەروونناسان دەبێت لە بارەی دایکی شەهیدانەوە کتێب و وتار بنووسن. ئایا هیچ ڕێگەچارەیەک بۆ ئارامبوونەوەی دایکی شەهید و کوژراو و بێسەروشوێنان هەیە، جگە لە ئارامییەک کە خودا پێیان ببەخشێت.

ئەوان، لە شاخی پیرەمەگروون بنکەیەکی فراوان و نهێنییان دامەزراندن بوو. دوای پێنج مانگ مانەوە، مۆڵەتیان بە تەها و هەشت پێشمەرگەی دیکە دا، بگەڕێنەوە بەرەو ئێران. ئەوان هەموویان ژن و منداڵیان لە ئێران بوون، لە ماوەی ئەو پێنج مانگەدا هیچ هەواڵێکیان لە ژن و منداڵەکانیان نەبوو. پێویستە نرخی مۆبایل و واتساپ و تەلەگرام و فایبەر بزانین. دیارە ئەم تەکنۆلۆژیایە خزمەتێکی زۆری بە وڵاتان و بەتایبەت بە وڵاتە دیکتاتۆرەکان کردووە. ئەوکات ئەگەر ڕژێمی سەدام ئەم تەکنۆلۆژیایەی لەبەردەست بووایە زۆر بە زوویی دەیتوانی ئاگاداری جوڵەی پێشمەرگەکان بێت و هێرشیان بکاتە سەر. تەها گەڕایەوە بۆ سەردەشت، هەڵبەت گەڕانەوەشی کارێکی هەر وا ئاسان نەبوو. سەر سنوور و ڕێگاوبان و ناوچەکە هەمووی لەلایەن سوپای سەدامەوە تەنرابوون. هەموو شوێنێک مینڕێژ کرابوو. زوبێدە شەو و ڕۆژ لە نیگەرانی هاوسەرەکەیدا بوو، چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەو بوو، منداڵەکانی لە ئاوارەیدا گەورە دەبوون، ئەو کاری بەرگدروونی دەکرد، کاری بەرگدرووونیش زۆر کەم بوو. ڕۆژانە خەڵکی زیاتر ئەویان دەناسی و جلوبەرگیان بۆ دەبرد تاکو بۆیان بدوورێت. کرێی دروورنیش زۆر کەم بوو، چونکە ئەو خەڵکە ئاوارە و بێ داهات بوون. ڕەوکان دەگریا و دیاربوو بیری باوکی دەکرد.

تەها گەیشتەماڵەوە، زوبێدە بە گەڕانەوەی هاوسەرەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو، بەخێرهاتنەوەی لێ کرد و بەگەرمی هەواڵی پرسی. بەڵام خۆشحاڵییەکەی زوبێدە زۆری نەکێشا، بە بیستنی هەواڵی شەهیدبوونی هاشم، زۆر نیگەران بوو. دەستیکرد بەگریان، هاشم کوڕی خاڵ و برای هاوسەرەکەشی بوو. شەمسە بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر نیگەران بوو، دەگریا و هاواری دەکرد. شەمسە هاشمی زۆر خۆشدەویست و بەردەوام لە باوەشیدا بوو. شەمسە فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە. بەدەستە شکاوەکەی دەیکێشا بەسەری خۆیدا و شیوەنی دەکرد. خەمەکانی بە فرمێسک دەردەبڕی و دەیگوت خۆزگە منیش لای دایک و باوکم بوومایە. لەتاو براکەی وڕوکاس ببوو. ژنانی گەڕەک لێیان کۆبوونەوە، هەوڵیان دەدا دڵخۆشیی شەمسە و زوبێدە بدەنەوە. منداڵەکانی شەمسەش دەگریان، ئەوان خاڵە هاشمیان زۆر خۆشدەویست. هاشم بچووکترین خاڵی ئەوان بوو. فەرەیدوون و شۆڕش چوار پێنج ساڵ لە هاشم بچووکتر بوون. زۆریان یاریی لەگەڵدا کردبوو. ئەو منداڵانە یادەوەریی زۆری هاشمیان لا مابوو. ڕۆژگار و هێرش زۆر بچووک بوون، تەمەنیان ٦-٧ ساڵ دەبوو ئەو منداڵە بچووک و بێکەس و ئاوارانە لەو دوورە وڵاتە چۆن بەرگەی کۆچی ئەو خاڵە بچووکەیان دەگرت. لە ئۆردوگای بێزیلێ و ئۆردوگاکانی دیکەش هەموو ڕۆژێک هەواڵی کوژرانی کەسێک یان چەند کەسێک، دەبیسترا. دانیشتووانی ئۆردوگاکە بە گشتی هەموویان خەمباربوون. شێرەژنانی ئۆردوگاکە، کاتێک هەواڵی شەهیدبوونی هاوسەرەکانیان دەبیست، دەبێت لە چ ژیانێکدا بووبن، لە ئۆردوگاکە کەسێک نەبوو لانیکەم، خۆشەویستێکی خۆی لەدەست نەدابێت. هەرکاتێک هەواڵی شەهیدبوونی کەسێک دەگەیشت، هەموویان دوبارە برینیان دەکولایەوە.

مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، سەرلەنوێ هێزی پێشمەرگەی ڕێکخستبووەوە، مەکتەبی سیاسی لە خاکی عێراقدا و لە نزیک سنووری ئێران بوو، ئەو بەتالیۆنەی بۆ پارتیزانەکان دروستکرابوو، بەتالیۆنی پازدەی "چەمی ڕەزان" بوو. لێپرسراوی بەتالیۆنەکە شەهید غەریب عەسکەری بوو، جێگری بەتالیۆنیش شەهید غەریب هەڵەدنی بوو ڕابەری سیاسی بەتالیۆنیش، بێستون سابوراوایی بوو. تەها سێکانیانی یش کرا بە لێپرسراوی ئیدارەی بەتالیۆن. بەتالیۆنی پازدەی چەمی

ڕەزان، ناوچەیەکی بەرفراوانی بۆ دیاری کرابوو، هەر لە ڕانیەوە تاکو سلێمانی و نزیکی کەرکووک، لەژێر چاودێری ئەو بەتالیۆنەدا بوو. ژمارەی پێشمەرگەکانی ئەو بەتالیۆنە دەگەیشتە نزیکەی هەزار کەس. واچاوەڕوان دەکرا لە کاتی ڕاپەڕیندا چەندین کەس پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە بکەن. هەر بۆیەش وا بڕیار درابوو هەر پێشمەرگەیەکی کۆن ببێتە لێپرسراوی دەیان پێشمەرگەی نوێ و ژمارەی بە تالیۆنەکان زۆر زیاد بکات.

### سەربازگەی گەناو

لە ڕێکەوتی ١٩٩٠/٨/٢ سوپاکەی سەدام هێرشی کردە سەر وڵاتی کوێت و داگیری کرد، هەموو کەس دەیزانی ئەم کردەوەیەی ئاکامێکی باشی بۆ سەدام نابێت. پێشمەرگەکان پێشتر ڕاهێنانیان پێکرابوو، ئامادە کرابوون بۆ هەڵکوتانە سەر دامودەزگاکانی ڕژێمی بەعس، ڕۆژی ١٩٩١/٣/٥ نزیکەی سەد کەس لە پێشمەرگە و لێپرسراوان لە گوندی "بێتووش"ی سەردەشت کۆبوونەوە، تەهاش لەگەڵیاندا ئامادەبوو. تەها لە سەردەشتەوە هاتبوو، ژن و منداڵی جێهێشتبوو، بەرنامەی شۆڕش وابوو کە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٧ لە تەواوی شار و شارۆچکە و ئۆردوگاکاندا ڕاپەڕین بکرێت و پەلاماری دامودەزگاکانی ڕژێمی بەعس بدرێت. هێشتا بڕیارنامەی ٦٨٨ دەنگی لەسەر نەدرا بوو، لە پیرەمەگروون و شار و شارۆچکەکان شانە چەکدارە نهێنییەکان، پارتیزانەکان و ڕێکخستنەکانی یەکێتیی، هەموو ئامادەکارییەکیان بۆ ڕاپەڕین کردبوو. بڕیاردرابوو لە چەندین شوێنی سەرسنوورەوە، پێشمەرگەکان بپەڕنەوە و خۆیان بگەیەننە قوڵایی خاکی عێراق. پێشمەرگەکانی بەتالیۆنی پازدەی چەمی ڕەزان، کە ئەو کات ژمارەیەکی زۆریان لە شاخی پیرەمەگروون بوون و خەریکی ئامادەکاری ڕاپەڕین بوون. ئەو ژمارەیەش کە لە سەرسنوور بوون، دەیانویست بە زوویی بگەنە پیرەمەگروون، بەڵام لەسەر ڕێگا سەربازگەیەکی سوپای عێراق هەبوو. دەبوو لە پێشدا هێرش بکەنە سەر ئەو سەربازگەیە و سەرکوتیان بکەن، تاکو ڕێگای خۆیان بکەنەوە و بەزوویی بگەنە پیرەمەگروون بۆ پشتیوانی ڕاپەڕین.

تەها ئەو کات تەمەنی سی و یەک ساڵ بوو، لێپرسراوی ئیدارەی بەتالیۆن بوو، پێشمەرگەکان هەموو دۆست و برادەری یەکدی بوون، هەموو هاوڕێکانی تەهایان زۆر خۆشدەویست.

بڕیاری ڕاپەڕین لە شاری ڕانیە دوو ڕۆژ پێش خرا، ڕۆژی ١٩٩١/٣/٥ لە شاری ڕانیە ڕاپەڕین کرا. پێشمەرگەکان شەو لە گوندی بێتووش بوون، سەر سنوور بەگشتی مینڕێژ کرابوو، دەبوو پێشمەرگەکان بە شوێن پێی یەکدیدا بڕۆن، نەوەک مین لەژێر پێیاندا بتەقێتەوە. هاوکات ترسی ئەوەشیان هەبوو، لە سەربازگەکانەوە بە هاوەن و دۆشکە تەقەیان لێ بکرێت.

ڕۆژی ١٩٩١/٣/٦ لە کاتی ڕۆیشتندا ڕیزیان بەستبوو، هەموو قاچیان لە شوێن پێی یەکدی دادەنا، یەک بەدوای یەکدا دەڕۆیشتن. تەها لە ڕیزەکەدا سیازدەهەمین کەس بوو. هەموو بەهێواشی هەنگاویان دەنا. تەها قاچی ڕاستی دانا بوو، قاچی چەپی بەرز کردەوە و بەهێواشی لەسەر زەوی دانا، هەستی بە خزینێکی کەمی قاچی چەپی کرد، لەناکاو دەنگی تەقینەوەیەکی بەهێز ناڵەی کرد، تەها بەرەو ئاسمان بەرزبووەوە و کەوتەوە سەر زەوی.. تەها لەنێو دوکەڵ و بۆنی باروتدا، تلی دەدا. لە پشتێنی بەرەو خوار جلوبەرگی هەمووی سووتا بوون، قاچی چەپی ڕیشاڵ ڕیشاڵ ببوو.. قاچی ڕاستیشی بەخەستی بریندار ببوو. شەهید غەریب هەڵەدنی هاواری کرد: هیچ کەسێک لە جێگەی خۆی نەجوڵێت، نەوەک مینێکی دیکەش بتەقێتەوە! شەهید غەریب بەهێواشی خۆی گەیاندە تەها، باوەشی پێدا کرد و لەنێو مینەکان دووری خستەوە. مەلا بەکر جاسەنەیی و دکتۆر عومەر هەڵەدنی، بەزوویی گەیشتنە سەری و بەو کەمە دەرمان و پێداویستییانەی پێیانبوو، برینەکەیان بۆ تیمار کرد و بەستیان. چەند دەرزییەکیان لێدا، زۆر هەوڵیاندا کە خوێنبەربوونەکەی بووەستێنن، بەڵام پێداویستیەکی ئەوتۆیان لەبەر دەستدا نەبوو. دواتر چەند پێشمەرگەیەک گەیشتنە فریای، بڕیاریاندا تەها بدەن بە کۆڵیاندا و بەزوویی بیگەیەننە گوندی بێتووش، بەڵکو لەوێوە بە ماشێن بەڕێی بکەن بەرەو سەردەشت. چەند پێشمەرگەیەک بە نۆرە تەهایان لە کۆڵ دەکرد، ماوەیەکی زۆر بەکۆڵ بردیان، شوێنەکە هەورازێکی سەخت بوو، هەورازێکی لێژ وخز، هاوکات بارانیش دەباری، بۆیە کۆڵکردنی کارێکی زۆر ئەستەم بوو. زۆر بەسەختی ماوەیەکی زۆر بە کۆڵ بردیان. هەڵبەت تەهاش کێشی زۆر بوو، وەلێ پێشمەرگەکانیش ئازا و

بەهێز بوون. ئەوان لە کاتی شەکەتبوونیاندا، تەهایان دانەدەنایە سەر زەوی، بەڵکو لەسەر پشتی پێشمەرگەیەکەوە دەیانخستە سەرپشتی پێشمەرگەیەکی دیکە. تا لە پایەگای پاسدارەکانەوە دەستەبەرەیان بۆ هێنا و خستیانە سەری. گەیاندیانە لای ماشێنەکان، سواری ماشێنیان کرد و عەبدوڵلای حەمەشوان و مەجید سەرگەڵوویی لەگەڵیدا گەڕانەوە بۆ سەردەشت. تەها خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو. قاچی چەپی بە تەواوی لەدەستدا بوو، قاچی ڕاستیشی بریندار و شکا بوو. تەها بێهۆش و بێ ئاگا بوو.

ئێوارەیەکی درەنگ، کاتێک تەهایان گەیاندە نەخۆشخانەی سەردەشت، بەزوویی بردیان بۆ هۆڵی نەشتەرگەری، پزیشکەکان زۆر بەخێرایی گەیشتنە سەری و دوای بێهۆشکردنی، قاچی چەپیان لە خوار ئەژنۆیەوە بڕییەوە. قاچی ڕاستیشی بەخەستی بریندار ببوو، لە خوار ئەژنۆیەوە ئێسقانی شکابوو، تیماریان کرد و نەیانهێشت زیاتر خوێنی لەبەر بڕوات. دکتۆرەکان بڕیاریاندا بەزوویی بەڕێی بکەن بۆ نەخۆشخانەکانی ورمێ. تەنها یەک شەو لە نەخۆشخانەی سەردەشت هێشتیانەوە. ئەوکات زوبێدە دوو منداڵی هەبوو، "ڕەوکان" تەمەنی حەوت ساڵ و "زەرکان" یش دوو ساڵ بوو. "ڕەوکان" زۆر منداڵ بوو ئەویش نەخۆشیی دەروونیی هەبوو نەیدەتوانی هاوکاری دایکی بکات، بەڵکو ئەو خۆیشی پێویستی بە هاوکاری بوو. ئەو منداڵەش قوربانی جەنگ و نەهامەتییەکان بوو، ئەو ئێستاش گرفتاری نەخۆشیی دەروونیی کیمیاییە.

"زرار" ی هاوسەری شەمسەش پێشمەرگە بوو، ئەویش گەڕابووەوە بۆ عێراق، بۆ جەنگ لە دژی سوپای داگیرکەری بەعس. شەمسە نیگەرانی هاوسەرەکەی بوو، دەستێکی نیوە لەکارکەوتوو بوو، دەبوو بەدەستێک کارەکانی ناو ماڵ و خزمەتکردنی منداڵەکانی ئەنجام بدات، ئەوان و هەموو ئاوارەکانی دیکەش دەستکورت بوون، ژیانێکی کولەمەرگییان بەڕێ دەکرد.

تەها، تا گەیەنرابووە نەخۆشخانە، خوێنی زۆری لێ ڕۆیشتبوو، هەر لە نەخۆشخانە سیازدە بتڵ خوێنیان تێکرد. پاشان گواستیانەوە بۆ نەخۆشخانەی شەهید تاڵەقانی لە شاری ورمێ. دواتر زوبێدە و شەمسە و کەسەکانی، زانییان کە تەها بریندار بووە، بۆیە ئەوانیش بە زوویی خۆیان گەیاندە سەردەشت، بەڵام کاتێک گەیشتن، تەها، تازە بەرەو ورمێ بەڕێکرابوو.



لە ڕاستەوە: مامۆستا سابیر باڵخیی، تەها سێکانیانی و سەعید ڕەشید
ورمێ نەخۆشخانەی شەهید تاڵەقانی – دوای برینەوەی قاچی تەها

زوبێدە بە گریانەوە بەرەو بازاڕی سەردەشت دەڕوات و دەیەوێت بچێت بۆ گەراجی ورمێ، تا خۆی بگەیەنێتە لای تەها. لە ڕێگادا تووشی پیاوێکی پیری ناسیاویان دەبێت، لێی دەپرسێت بۆ چی دەگریت؟ ئەویش دەڵێت: تەها بریندارە و بەڕێکراوە بۆ ورمێ، منیش شارەزا نیم، نازانم چۆن بڕۆم سەردانی بکەم؟ پیاوەکەش دەڵێت: من لەگەڵتدا دێم. ئەو پیاوە ناوی مام ئەحمەد گەناوی بوو. هەر ئەو ڕۆژە دەگەنە ورمێ و سەردانی تەها دەکەن. بەڵام هێشتا تەها وەک پێویست نەهاتبووەوە هۆش خۆی. دوای چەند ڕۆژێک هاوڕێکانی تەها دەچن بۆ سەردانی. شەمسەش کاتێک بەو هەواڵە دەزانێت بەپەلە بەرەو سەردەشت دەڕوات، بەڵام ئەویش فریای بینینی تەها نەکەوتبوو. کاتێک تەها گەیەنرایە نەخۆشخانەی شەهید تاڵەقانی، دکتۆرەکان سەیری قاچی دەکەن، دوبارە بڕیاری بڕینەوەی قاچی دەدەن. دیسان کەمێک لە سەرووترەوە، قاچی دەبڕنەوە.

شەمسە نەیدەزانی چۆن بە پێنج منداڵەوە بگاتە ورمێ و سەردانی براکەی بکات. هەر بۆیە ڕۆژێک منداڵەکانی جێهێشت و خۆی گەیاندە ورمێ بۆ لای براکەی.

لە نەخۆشخانەی شەهید تاڵەقانی ورمێ، دکتۆر و پەرستارەکان بەمیهرەبانییەوە بریندارە عێراقیەکانیان تیمار دەکرد. زۆر خزمەتیان دەکردن. بەتایبەت دوو پەرستار زۆر میهرەبان بوون لەگەڵ تەهادا، "ئەکرەمەی مەلەکی" و "فاتیمەی واعیزی". ئەوان زۆر هاوکاریی تەهایان کرد. ئەو دوو پەرستارە وەک فریشتە بەهانای نەخۆشەکانەوە دەچوون. خانم "مەلەکی" لە ماڵی خۆیانەوە پێویستییەکانی بۆ تەها دەهێنا، لە نەخۆشخانە زۆر دڵخۆشی زوبێدەی دایەوە. شەمسە و زوبێدە کە زانییان تەها مەترسی لەسەر ژیانی نەماوە. ئەو دوو ژنە غەمبارە کەمێک ئارام بوونەوە. زوبێدە، کاتێک هاوسەرەکەی بینی قاچێکی لەدەستداوە، بە چاوێک فرمێسکی دەرشت و بەچاوێکیش خۆشحاڵی دەردەبڕی کە هاوسەرەکەی هێشتا زیندووە. شەمسە نزای بۆ براکەی دەکرد. ئەو دوو شێرەژنە هیچ کارێکیان لەدەست نەدەهات، بە دەستی بەتاڵ و بێپارە دەبوو چییان بکردایە. تەنها دەیانتوانی چاودێری منداڵەکانیان بکەن. ئەوان دواتر هەفتەی جارێک سەردانی تەهایان دەکرد. زۆر لەناکاو هەواڵێکی دڵتەزێنی دیکەیان پێگەیشت.

### شەهید زرار

زراری هاوسەری شەمسە، باوکی شەش منداڵ، لە شەڕدا شەهید بوو، زراری برای زوبێدە شەهید بوو.

١٩٩١/٣/٢٧ ڕۆژێکی شووم بوو، بەگشتی مانگی ئازاری ١٩٩١ بۆ ئەوان مانگێکی شووم بوو، ڕۆژی شەشی هەمان مانگ، تەها قاچی بە مین پەڕی، ڕۆژی ١٩٩١/٣/٢٧ زرار شەهید بوو، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەخت بوو، ڕۆژی شەڕێکی قورس و ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی پێشمەرگە و سوپای سەدام بوو، لە شاری کەرکووک. لەو شەڕەدا، زرار فەرماندەی شەڕەکە بوو، خودی خۆی لە پێشەوەی بەرەی شەڕدا بوو. شەڕەکە زۆر سەخت و دژوار بوو. ژن و منداڵەکانی زرار لە ئۆردوگای بێزیلێ

چاوەڕوانی ئەو بوون. لەناکاو دەنگێکی ترسێنەر ئەو دەشتەی گرتەوە، دەنگێک کە بۆنی سام و ترسی پێوە بوو، زرار فیشەکێکی بەرکەوت. هاوڕێیەکی هاواری کرد فریاکەون! بەخوڕ خوێنی لێ دەڕوات، تکایە فریای بکەون! دوژمن زۆر بە توندی هێرشی دەست پێکردبوو، گوللەی دوژمن وەک تاوە باران بوو، زرار بێهۆش ببوو، خەریکبوو گیانی دەدا، توانای قسەکردنی نەمابوو، هاوڕێیەکی سەری خستبووە سەر ڕانی خۆی، هاوڕێیەکی دیکەی هەوڵی دەدا بەر لە خوێنبەربوونەکەی بگرێت، زرار زۆر بەهێواشی گوتی: هاوڕێیان ئیتر من تەواو بووم. سڵاوم بە شەمسە و منداڵەکانم بگەیەنن، بە منداڵەکانم بڵێن باوکتان بۆ ئازادی مرۆڤایەتی خۆی بەکوشتدا، پێیان بڵێن باوکتان لە پێناو ئازادی کورد و کوردستان سنگی خۆی نا بەگوللەوە. سڵاوم بە هەموو دۆستان و هاوڕێیان بگەیەنن.. پێیان بڵێن لە دوای من، ئەوان لەپێناو تۆڵەسەندنەوەدا نەجەنگن، لەپێناو ئازادیدا بجەنگن. ئەو چەند جارێک ئەم ڕستەیەی دوبارە کردەوە. ئەو قسەی بۆ نەدەکرا و گەرووی گیرابوو، خوێن لەدەمیەوە دەهات، دوبارەی کردەوە تکایە بۆ تۆڵە سەندنەوە مەجەنگن، بۆ ئازادی بجەنگن و یەکگرتووبن! ئەو بۆ ئازادی گیانی خۆی بەخت کرد، نەک بۆ تۆڵە سەندنەوە.

زرار، شەمسە و شەش منداڵی بە تەنها جێهێشت و ڕوحی گەیشتە ئاسمان. بەڵکو زرار لەو دونیای دیکەدا بە ئاشتی و ئازادی بگات. شەهیدێکی دیکە گەیشتە کاروانی دەیان ملیۆن شەهیدی دیکەی ڕێگای ئازادی، لەم جیهانەدا. مرۆڤ لەو ڕۆژەوە کە خۆی ناسیووە لەپێناو ئازادیدا خەباتی کردووە، ئەو ئازادییەش هەندێک جار بانگەشەیەکی فریودەرانە بووە. لەم جیهانە بەرینەدا، ملیۆنەها مرۆڤی ئازا و بەشەرەف لەپێناوی ئازادیدا خەباتیان کردووە، بەڵام دواتر دوچاری پەشیمانی بوونەوە. دواتر زانیویانە کە سەرکردەکانیان بەجۆرێک لە جۆرەکان دیکتاتۆر بوون. لە هەناوی جەنگی ئازادیدا، چەندین جەنگی ناوخۆی دروستبووە، چ دیکتاتۆرێک هەیە باسی ئاشکراکردنی ستەمی کردبێت و دژی ستەم و چەوسانەوە هەنگاوی نابێت. زۆرێک لە سەرکردە ئازادیخوازەکان، دوای گەیشتن بەدەسەڵات خۆیان بوون بە دیکتاتۆر. یەکێک لەوانە ستالین بوو، ئەم جیهانە لە هەناویدا چەندین ستالینی گەورە و بچووکی حەشارداوە.

شەمسە، لە ژیانێکی سەخت و دژواردا بوو، بەزەحمەت بەسەر منداڵەکانیدا ڕادەگەیشت، هەندێک ئاوی گەرم کردبوو منداڵەکانی شۆردبوو. بەدەستە پڕ ئازار و بریندارەکەی جلوبەرگەکانی بۆ شۆرد بوون. فەرەیدوون و شۆڕش و منداڵەکانی دیکە هاوکاری دایکیان دەکرد. کەمێک خواردنیان خواردبوو، مەگەر مووچەی پێشمەرگەیەک چەند بوو؟ بەو مووچە کەمەی زرار، منداڵەکان بە نان و ماستیش تێر نەدەبوون. شەوی پێشتر شەمسە خەونێکی ترسناکی بینی بوو، نیگەران بوو، هەموو لەشی سەر ئارەقە کەوتبوو. لە خەونەکەیدا هەوڵی دەدا خۆی لەدەست ئاژەڵێکی دڕندە ڕزگار بکات، چەند جارێک بە ترس و دڵەڕاوکێوە لە خەو ڕاپەڕی. شەمسە بەردەوام خەونی ترسناکی دەبینی. لە تەمەنی نۆساڵیدا تەهای بە جەستەی خوێناوییەوە بینی بوو، ئەو هیچ کات بە ئاسوودەییەوە نەخەوتبوو، کاتێک منداڵ بوو فڕۆکەکان سێکانیانیان بۆردوومان دەکرد، ئەو هەمیشە لە ترس و دڵەڕاوکێدا بوو. شەوانەش خەونی ترسناکی دەبینی، چ کەسێک دەتوانێت زیاتر لە بیست ساڵ لە شەڕ و دەربەدەریدا بێت و دەروونی ئاسوودە بێت؟ هەندێک کەس بەهۆی ژیانێکی ئابوورییەوە خۆی دەکوژێت، هەندێک کەسیش بە بینینی چەند دڵۆپە خوێنێک لە هۆش خۆی دەچێ.

هەواڵێک بە شەمسە گەیشت، شەمسەیەک کە هێشتا لە خەمی شەهیدبوونی برا چواردە ساڵەکەیدا بوو. شەمسەیەک کە هێشتا داخداری برا بریندارەکەی بوو. شەمسەیەک کە لە خەمی شەهید بوونی خاڵ و خاڵۆزاکانیدا بوو. شەمسەیەک کە بەهۆی ئازاری دەستەکانیەوە نەیدەتوانی کار بکات. شەمسەیەک کە شەش منداڵی بێسەرپەرشتی بەسەردا دەمایەوە. شەمسەیەک کە دوور لە وڵات و کەسوکاری خۆی، لە وڵاتێکی دیکە و لە ئۆردوگای پەنابەراندا دەژیا. دەبوو شەمسە چی بکردایە؟ فەرەیدوونی کوڕە گەورەی دوای چەند مانگێکی دیکە تەمەنی دەبوو بە دوازدە ساڵ، شەمسە نەیدەزانی چی بکات. ئەو زراری خۆشدەویست. زوبێدە ئیتر نەیدەزانی بۆ کێ بگری، بۆ برا ئازاکەی، بۆ برایەک کە شەش منداڵی بچووکی لەدوا جێماوە. زوبێدە سەری خستبووە سەر شانی شەمسە و فرمێسکی دەڕشت. یەکێکیان هاوسەرەکەی مردبوو، هاوسەرێک کە کوڕی خاڵیشی بوو. ئەوی دیکەیان براکەی

مردبوو. خەمەکان نوێ دەبوونەوە، شەمسە هاوسەرەکەی لەدەستدا بوو، براکەشی قاچێکی بڕابووەوە. زبیدە براکەی شەهید کرابوو، هاوسەرە بێ قاچەکەشی هێشتا لە نەخۆشخانە بوو. منداڵەکان خەمبار بوون، جگە لە گریان هیچی دیکەیان لەدەست نەدەهات. ئەگەر تەها لە ئۆردوگا بووایە کاریگەری دەبوو بۆ کەمکردنەوەی خەمی ئەوان. ئەگەر لە گوندەکەی خۆیان بوونایە ڕەنگە کەمێک ئاسوودەتر بوونایە. ئەگەر لەنێو خزم و کەسکاری خۆیاندا بوونایە، لەوانەیە کەمێک خەمەکانیان کەمتر بووایە. ئەگەر بیانتوانیایە لە مزگەوتی گوندەکەی خۆیان پرسە دابنێن ڕەنگە خەمیان سوکتر بووایە. لەوەبوو دڵنەوایی کەسانی تر، کەمێک ئارامی بکردنایەتەوە. خۆ ئەگەر زرار لە بەرچاوی خۆیان کفن بکرایە و لە گۆڕستانێک بە خاک بسپێردرایە، ئەوان کەمێک ئارام دەبوونەوە. زرار دوور لە ژن و منداڵەکانی گیانی سپارد، دوور لە گوند و کەسەکانی شەهید کرا. شەمسە لە خۆی دەپرسی، ئاخۆ دەبێت بەباشی کفن کرابێت و خرابێتە گۆڕەوە، یان لەبەر شەڕ و پێکدادان ئەو هەلەیان نەبووە؟ ئایا لەژێر تۆپباران و گوللەباراندا توانیویانە گۆڕی بۆ هەڵکەنن. شەمسە بەهۆی لەدەستدانی هاوسەرەکەی، منداڵەکان لەتاوی لەدەستدانی باوکیان، هاوکات بەهۆی دووریی و دەربەدەری خەم و دەردیان چەند بەرامبەر بوو. مەینەتیی ئەوان کۆتایی نەبوو، مەینەتیی ئەوان میراتی ئادەم و حەوا بوو، ئادەم و حەوایەک کە دایک و باوکی بکوژ و کوژراو بوون. هابیل و قابیل مەینەتییان وەک میرات بۆ مرۆڤایەتی بەجێهێشت کە هەتا هەتایە ئەو میراتە دەمێنێتەوە.

لە ئۆردوگای بێزیلی، تەواوی ژن و منداڵان لە مەینەتیدا بوون. زۆربەی ئەو پیاوانەی لە ئۆردوگاکەدا مابوونەوە یان پیر بوون، یان کەمئەندامی جەنگ بوون. زۆربەی ژنانی ئۆردوگاکە بێوەژنی جەنگ بوون. زۆربەی منداڵان بێباوککراوی جەنگ بوون. سەدان منداڵ بێباوک بوون، سەدان ژن بێ هاوسەر. ئایا لەو ئۆردوگایەدا ژنان لە پیاوان زیاتر ڕەنجیان نەدەکێشا؟ ئەوان لە پیاوان خۆڕاگرتر نەبوون؟ ئەوانەی لە بەرەکانی جەنگدا دەجەنگان و شەهید دەبوون، لەم جیهانە پڕ لە ستەمکارییە ڕزگاریان دەبوو، بەڵام ژنێک کە دەبێت شەش منداڵی ئەو شەهیدە بە نەبوونی، گەورە بکات. ژنێک کە بەبێ هیچ داهاتێک لەگەڵ ژیاندا ململانێ دەکات، دەبێت چ زووخاوێک بنۆشێت؟

ئێستا شەمسە و زوبێدەش وەک سەدان ژنە کوردی نیشتەجێی ئۆردوگای بێزیلێ، دەبێت لەگەڵ ژیاندا لە ململانێدابن. هەزاران ژنی بێپەنا، هاوسەر شەهید و کەمئەندام، هەزاران منداڵی بێباوک، دەبێت لە مەینەتدا بن. چونکە کەسانێ سەرشێتی وەک سەدام فەرمان دەردەکەن. چونکە دەیان هەزار، بەڵکو سەدان هەزار کەسی نەفام و کاڵفام و شێت، فەرمانەکان جێبەجێ دەکەن. من لەکاتێکدا کە باس لە ژیان و مەینەتیی شەمسە و زوبێدە و سەدان ژنی وەک ئەوان دەکەم؛ دەستەوەستانم، قەڵەمەکەشم سست و لاوازە. من نامەوێ هیچ کەسێک بهێنمە گریان، بەڵکو دەمەوێت لەم جۆرە ژیانە، وانە وەربگرین، تا بەدوای جەنگەوە نەبین.

### ژیان ناوەستێت

دوو هەفتە بەسەر شەهید بوونی زراردا تێپەڕی بوو، چەند ژنێکی دانیشتووی ئۆردوگا، سەردانی شەمسەیان کرد. ئەوان پێشتریش بۆ سەرەخۆشی و دڵنەوایی سەردانی شەمسەیان کردبوو. ئەم جارەش سەردانیان کردبوو، تاکو کەمێک دڵنەوایی بدەنەوە. هاتبوون تاکو مۆڵەتی زەماوەندی کوڕ و کچێکیان لە شەمسە وەربگرن. ژیانکردن لە ئۆردوگای ئاوارەیی هەر خۆی چیرۆکێکە. هەندێک جار لە ئۆردوگاکاندا وا ڕێدەکەوت چەند بەرامبەری خۆیان میوانیان هەبوو، ئۆردوگاکان کێشەی کەمی توالێت و گەرماو و پێداویستییەکانی ژیانیان هەبوو. هەندێک جار ئۆردوگایەک پڕ دەبوو لە خۆڵ و خاشاک، ئاوەڕۆ بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشت و بۆنی پیس بە ئۆردوگاکەدا بڵاو دەبووەوە. واتە بەگشتی هیچ مەرجێکی تەندروستی تێدا نەبوو. بەهۆی نەبوونی کارەباوە هیچ ماڵێک بەفرگری نەبوو، ناچاربوون بۆ ڕووناکیی ماڵەکانیان سوود لە چرای نەوتی وەربگرن. شوێنی چێشتلێنان و پێویستییەکانی ناو ماڵیان نەبوو. کەسانێک کە تاکو دوێنێ لە خانووی جوان و ڕازاوە و خاوێندا دەژیان، یان لە حەشە و ماڵێکی گەورەی چەند ژووریی لادێکاندا دەژیان، لەپڕ ئەو هەموو ماڵ و سامانەیان بەر هێرشی جەنگ کەوت و هیچ شتێکیان نەما. خۆیشیان بەسەڵتە خێزانی ئاوارەی وڵاتێکی دراوسێیان بوون و لەبری ژیانی ناو کۆشک و

خانوو، لە نێو خێمەیەکدا دەژیان. منداڵان کە لە تەواوی تەمەنیاندا لەنێو کۆڵانی کۆنکرێت و سەر جادەی قیر یارییان دەکرد، بەڵام لە ئۆردوگا، دەبوو لەنێو گڵ و زبڵ و پیسیدا یاریی بکەن. کەسانێک کە تا دوێنێ لەسەر سیسەم و قەرەوێڵە بە نوێنی گەرم و خاوێن دەنووستن، ئەمڕۆ چاوەڕوانن؛ ڕێکخراوە خێرخودازەکان یان کەسانی خێرخوداز، بەتانییەکۆنێکیان پێ ببەخشن. ئەو منداڵانەی تا دوێنێ لە باشترین قوتابخانە دەیانخوێند، ئێستا بەرەڵای کۆڵانەکان بوون. کوڕان و کچان کە لە ماڵی خۆیاندا بە ئارامی دەژیان، لەپڕدا کەوتنە نێو دۆخێکی نائارامەوە. خەڵکی شتێک دەڵێن و شتێک دەنووسن؛ بەڵام ژیانکردن و ژیان دروستکردن و پارێزگاری کردن لە ژیان شتێکی دیکەیە.

لەو هەلومەرجەدا دوو ژن یەکێکیان دایکی بووک و ئەویدی دایکی زاوا، هاتبوون تاکو مۆڵەتی زەماوەندی منداڵەکانیان لە هاوسەری شەهیدێک وەربگرن. شەهیدێک کە تەنها پازدە ڕۆژ بوو، بەرەو ئاسمان بەرز ببووەوە، ژیان بەردەوامە. شەمسە فرمێسکەکانی سڕین و گوتی: هیوای بەختەوەرییان بۆ دەخوازم. ئەو کوڕ و کچە لە ئۆردوگا زەماوەندیان کرد. لە ئۆردوگاکەدا چەندین کەسی بریندار هەبوون. چەندین گەنج قاچیان بڕابووەوە و بە دارشەق دەڕۆیشتن. چەندین کەس شەهید کرابوون. مەگەر شەمسەش هاوسەر و برای شەهید نەکرابوو. برایەکی دیکەی کەمئەندام نەکرا بوو؟ مەگەر زوبێدە خوشکی شەهید و هاوسەری کەمئەندام نەبوو. مەگەر شەمسە بۆ خۆی کەمئەندام نەبووە. بەڵام دەبوو ژیان بەردەوام بێت. دەنگی هەلهەلەی زەماوەند لە ئۆردوگاکەدا دەنگیدایەوە، شەمسە و زوبێدە فرمێسکیان بۆ شەهیدە خۆشەویستەکانیان، دەڕشت. نزای خێریان بۆ خۆشبەختی بوک و زاوا دەکرد. شەمسە و زوبێدە لە ماڵەکانی خۆیاندا بوون؛ بەڵام مەگەر نێوانی ماڵ و خێمەکانی ئۆردوگاکە چەند بوو؟

هەواڵی شەهیدبوون، ڕۆژانە بوو. ئەگەر کوڕ و کچە لاوەکان، بۆ ژیانی هاوسەرێتی، بەهۆی شەهیدبوونەوە چاوەڕوانییان بکردایە، دیار نەبوو کە دەبوو هەتا کەی لە چاوەڕوانیدا بن. شەمسە دەیگوت: کاروانی شەهیدان دووروودرێژە. پێویستە کوڕان و کچانی لاو زەماوەند بکەن. لە ئۆردوگایەکدا کە نوقمی شین و ماتەم بوو، هاوکات

لە گۆشەیەکدا دەنگی هەلهەلەی زەماوەند دەبیسترا. باوکی بووکیش پێشتر لە جەنگدا شەهید کرابوو. زاواش براکەی کەمئەندام بوو، هەردوو قاچی بڕابوونەوە. باوکی زاوا لە بەرەکانی جەنگ، چەند ڕۆژێک مۆڵەتی وەرگرتبوو، تاکو زەماوەندی کوڕەکەی ڕێکبخات. زاواش دەبوو دوای چوار ڕۆژی دیکە بگەڕێتەوە بۆ سەنگەرەکان، هەموو نزایان دەکرد کە زاوا بە سەلامەتی بگەڕێتەوە.

تەها، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوو باشتر خۆی فێری زمانی فارسی بکات. ڕۆژانە ڕۆژنامەی دەخوێندەوە. کتێبی جۆراوجۆری فارسیی دەخوێندەوە. لەگەڵ دکتۆر و پەرستار و کارگوزارانی نەخۆشخانەدا، بە فارسی قسەی دەکرد. مەلەکی خانمی پەرستار کتێب و ڕۆژنامەی بۆ دەهێنا. واعیزی خانمی پەرستاریش هەوڵی دەدا لەگەڵ تەهادا، بە فارسی قسە بکات. ئەو دوو خانمە میهرەبانە تورکی ئازەری بوون. چونکە دەیانزانی تەها حەز دەکات فێری زمانی فارسی ببێت، بەردەوام لەگەڵ ئەودا بە فارسی قسەیان دەکرد.

ڕۆژی ١٩٩١/٧/٢٧ منداڵی سێیەمی تەها، لە ئۆردوگای بێزیلێ لەدایک بوو. ناویان لێنا "ڕەوەز". ڕەوەز چوار مانگ دوای شەهیدبوونی زرار هاتە دونیاوە. ڕەوەز، هەرگیز خاڵە شەهیدە کەی خۆی نەبینی بوو. لەو کاتەدا بڕیاری ژمارە ٦٨٨ ی ئەنجومەنی ئاسایش دەرکرا، ١٩٩١/٤/٥ بڕیارەکە فڕینی فڕۆکە جەنگیەکانی عێراق لە باکووری عێراق قەدەغە کرد. ئیتر فڕۆکەکانی سەدام نەیاندەتوانی کوردستان بۆردوومان بکەن، ئەمریکا و ئەوروپییەکان هاتنە سەر هێڵ بۆ هاوکاری کردن. هێڵی سی و حەوت - سی و هەشت پانی جوگرافیایان قەدەغە کرد، فڕۆکە بەسەریدا بفڕێت. ئیتر فڕۆکەکانی جەنگییەکانی عێراق نەیاندەتوانی کوردەکان بۆردوومان بکەن. تێکشکانی سوپاکەی سەدام لە کوێت ورە و دەروونی سەربازان و ئەفسەرانی تێکشکاند بوو، سیاسەتمەداران و ئەفسەرە ژێرەکانی حیزبی بەعس دەیانزانی ئەم سەدامە سەرشێتە، لە کۆتایی نزیک بۆتەوە. لە بەرامبەردا هێزە کوردییەکان و هێزە سیاسییەکانی دیکە لە دژی سەدام چالاکییەکانیان پەرە پێدابوو.

تەها هێشتا لە ورمێ لە نەخۆشخانەی شەهید تاڵەقانی بوو، بەردەوام بیسەری چالاکیی پێشمەرگەکان بوو. ئەوان توانیبوویان بەشێکی زۆری خاکی کوردستانی

عێراق ئازاد بکەن، دوبارە سوپاکەی سەدام هێرشی کردەوە، خەڵکی زۆر ترساند، گوتیان دوبارە ئەنفالمان دەکەنەوە. دوبارە شەپۆلێکی گەورەی پەنابەران ڕوویان کردە ئێران، پێشمەرگەش دوبارە هێرشیان کردەوە و شارەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆکیان ڕزگار کردەوە. هێزەکانی ئەمریکا کوێتیان ئازاد کرد، دوبارە سەدام هێرشی بۆ سەر کوردستان دەستپێکردەوە، بەشێکی دانیشتووانی دهۆک و هەولێر ئاوارەی تورکیا بوون، بەڵام بەشی زۆری کوردەکان لە ڕێگە سنوورییەکانی سەردەشت و بانە و پیرانشار و مەریوانەوە، خۆیان گەیاندە ئێران. ژمارەیەکی زۆر لە خزم و کەسەکانی تەها، هاتنە ئۆردوگای بێزیلێ. فشارەکانی ئەمریکا و ئەوروپا هۆکارێک بوو بۆ بەرگرتن بە هێرشەکانی سوپاکەی سەدام بۆ سەر کوردەکان. ئۆردوگای بێزیلێ و ئۆردوگاکانی دیکە ئێران، زۆر قەرەباڵغ ببوون. ژیان لە ئۆردوگادا زۆر سەخت و دژوار بوو، بە هاتنی ئاوارە تازەکان هێندەی دیکە دژوار بوو.

ژمارەیەک لە خزم و کەسەکانی تەها، دوبارە گەڕانەوە بۆ کوردستانی عێراق. کوردەکان دەبوو بەردەوام لە مەترسی فڕۆکە و کیمیاباران و تۆپباران و مین، خۆیان بپارێزن. هەندێک لە ئاوارەکان چەندین جار لە کوردستانەوە بۆ ئێران کۆچیان کردووە و گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان و دوبارە کۆچیان کردۆتەوە. لەو کاتەدا خزم و کەسەکانی تەها سەردانی نەخۆشخانەیان دەکرد. ئەوان کەسانی دڵسۆز و میهرەبان بوون کە لەسەردەشتەوە دەهاتن بۆ ورمێ تاکو تەها ببینن. زیانی مین کەمتر نەبوو لە زیانەکانی تۆپ و فڕۆکە. کاتێک تەها لە نەخۆشخانە بوو، چەندین جار فەتحوڵڵای کەرەمپور و ئیسماعیلی قادری چوو بوون بۆ سەردانی. تەها، دوای سێ مانگ لە نەخۆشخانە گەڕایەوە بۆ بێزیلێ. ئۆردوگا کەمێک چۆڵ ببوو، زۆرێک لە ئاوارەکان گەڕابوونەوە بۆ کوردستانی عێراق. تەها بە دوو دارشەق دەڕۆیشت، هاوسەرەکەشی کاری بەرگدروونی دەکرد و منداڵەکانی بەخێو دەکرد.

ڕۆژێک ئیسماعیلی قادری و فەتحوڵڵای کەرەمپور، چوونە سەردانی تەها بۆ ئۆردوگای بێزیلێ، هاوکات بڕی ٨٥٠٠ تومەنیان بۆ برد بوو. ئەو بڕە پارەیە بۆ ئەو کاتە پارەیەکی کەم نەبوو، ئیسماعیلی قادری بە تەهای گوت وەرە لەگەڵ من کار بکە. تەها گوتی: من چیدی ناتوانم کار بکەم، من تەنها قاچێکم هەیە ئەو قاچەشم

بریندارە. بە دوو دارشەق بەڕێگادا دەڕۆم. ئیسماعیلی قادری گوتی: ئەوە گرنگ نییە لە سبەینێوە وەرە بۆ سەردەشت و کارم لەگەڵدا بکە.

ڕۆژی دواتر تەها بۆ کارکردن ڕۆیشت بۆ سەردەشت، وەستا سمایل پێی گوت: دانیشە و بە چەکوش ئەو بزمارە خوارانە ڕاست بکەرەوە. وەستا سمایل کاری سادە و ئاسانی بە تەها دەسپارد تاکو ئەنجامی بدات. کارێک کە دەتوانرا بە دانیشتنەوە بکرێت. ئەگەر وەستا سمایل بیویستایە بزماری تازە بکڕێت، زۆر هەرزانتر لەسەری دەکەوت. ڕۆژێک کەسێک لە وەستا سمایلی پرسی، ڕۆژانە چەند دەدەیت بەم کرێکارە بێ قاچە؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی: ڕۆژی پەنجا تومەن، بەڵام لە ڕاستیدا ڕۆژانە بڕی سێ‌سەد و پەنجا تومەنی دەدا بە تەها، ئەگەرچی ئەوکاتە ڕۆژانەی کرێکارێک سێ‌سەد تومەن بوو. وەستا سمایل کەسێکی میهرەبان و شایستە و نموونەیی بوو. هەموو کوردەکانی سەردەشت لەگەڵ کوردە ئاوارەکاندا میهرەبان بوون. ئەگەر میهرەبانی و میواندۆستی ئێرانییەکان (کورد، تورک، فارس و...) نەبووایە، ئەو ئاوارانە ڕووبەڕووی کێشەی زۆرتر دەبوونەوە.

قاچی دەستکرد لە تەورێز دروست دەکرا. تەها دەبوو بۆ دروستکردنی قاچی دەستکرد بڕوات بۆ تەورێز. بەتەهایان گوتبوو نرخی دروستکردنی قاچی دەستکرد هەشت هەزار تومەنە. دەبوو یانزە جاریش لەسەردەشتەوە بچێت بۆ تەورێز. هاوکات دەبوو خەرجی ژن و منداڵەکانیشی بکێشێت. تەها بڕیاری دا سەردانی عێراق بکاتەوە. بەڵام ڕۆیشتن بۆ عێراق بە قاچێکەوە زۆر سەخت و پڕ کێشەبوو. سوپای عێراقی لە کوردستان کشابووەوە، بەڵام هێشتا لە کوردستان هەندێک بنکە و بارەگایان مابوو. نەیدەتوانی بەدارشەقەوە سەدان کیلۆمەتر ببڕێت، بۆیە هەر دەبوو بە ماشێن بڕوات. دواجار بڕیاری دا، ماوەیەک بە دارشەق و دواتر بە ماشێن بەڕێکەوت.

تەها پێش ئەوەی بەمەبەستی دروستکردنی قاچی دەستکرد بڕوات بۆ تەورێز؛ سەردانێکی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی کرد لە شارۆچکەی شەقڵاوەی نزیک هەولێر. داستانی ڕۆیشتن و گەیشتنی تەها بە شەقڵاوە دووروودرێژە، دیارە ئەو کات هێزە چەکدارەکانی عێراق لە کوردستان نە مابوون. تەها، لە مەکتەبی سیاسی چووە لای نەوشیروان مستەفا -جێگری مام جەلال- و ئەویش بڕی ١١٢٥ دیناری عێراقی،

وەک کۆمەک دا بە تەها. تەها گەڕایەوە بۆ بێزیلێ و ڕۆژی دواتر ڕۆیشت بۆ تەورێز. لەوێ پێیان گوت نرخی قاچی دەستکرد، هەشت هەزار و پێنج سەد تومەنە. دروستکردنی ئەو قاچە دەستکردە. نزیکەی ساڵێک کاتی دەویست و دەبوو پانزە جاریش بۆ پەراوەی قاچەکەی سەردانی تەورێز بکات. تەها ماڵی لە بێزیلێ بوو، نەدەکرا تا قاچەکەی تەواو دەبێت ماڵەکەی بباتە تەورێز، چونکە نیشتەجێبوون لە تەورێز خەرجیەکی زۆری دەویست. تەها، لە ماوەی ساڵێکدا سیازدە جار لە بێزیلێ وە سەردانی تەورێزی کرد، هەندێک جاریش ماوەی پێنج ڕۆژ لە تەورێز دەمایەوە.

تەها، هەستی کرد ئەو پارەیە بەشی خەرجی هاتوچۆ و دروستکردنی قاچە دەستدەستکردەکەی ناکات. بۆیە بڕیاری دا جارێکی دیکە بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق. گەڕایەوە بۆ کوردستان و دوبارە سەردانی شەقڵاوەی کردەوە. ئەوکات دکتۆر فوئاد مەعسوم -کە دوواتر بووە سەرۆک کۆماری عێراق- لە مەکتەبی سیاسی دادەنیشت. تەها سەردانی کرد و داوای هاوکاری لێکرد. دکتۆر فوئاد لە نامەیەکدا بڕی حەوتسەد و پەنجا دیناری کۆمەک بۆ نووسیی. ئەوسا هەزار دیناری عێراقی -سویسری- بەرامبەر بوو بە سیازدە هەزار تومەنی ئێرانی بوو. ئەو بڕە پارەیە زۆر کەم بوو بۆ تەها، هەر بۆیە تەها نامەیەکی بۆ دکتۆر کەمال فوئاد، ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نووسی و باسی خەرجی قاچە دەستکردەکەی خۆی تێدا نووسی. کاتیک دکتۆر کەمال نامەکەی خوێندەوە ئەویش گوتی: منیش دەزانم حەوتسەت و پەنجا دینار کەمە و بەشی ئەو هەموو خەرجیەی تەورێز ناکات. گوتی: نامەیەکی دیکە بنووسە و داوای سێهەزار دینار بکە. دکتۆر کەمال نامەکەی تەهای برد بۆلای دکتۆر فوئاد مەعسوم و پێی گوت ئەو بڕە پارەیەی بۆ تەهات نووسیوە، زۆر کەمە. من دەزانم بەشی ناکات، ئەو ماڵی لە سەردەشتە و ناچارە هاتوچۆ بکات بۆ تەورێز. بەڵکو پارەکەی بۆ بکرێت بە سێهەزار دینار دکتۆر فوئاد ٢٢٥٠ دیناری دیکەی بۆ نووسی. واتە بڕی پارەکەی بۆ کرد بە سێهەزار دینار. تەها پارەکەی وەرگرت و شەقڵاوەی بەجێهێشت.

لە شەقڵاوەوە ڕۆیشت بۆ سلێمانی، لە نزیک "کتێبخانەی سلێمانی" مامۆستا جەمال عەبدولی بینی. هەمان ئەو مامۆستا جەمال عەبدولەی کە لە ئەمنی سلێمانی

پێکەوە زیندانی بوون. هەمان مامۆستا جەمال کە کراس و شیرینی بۆ تەها کڕی بوو، مامۆستا کاتێک تەهای بە یەک قاچەوە بینی زۆر غەمبار بوو، فرمێسک بە چاوانیدا هاتە خوارەوە. تەهای لە باوەش گرت و هەواڵی ماڵ و منداڵی لێ پرسی، زۆر خولکی تەهای کرد کە لەگەڵیدا بچێتەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام تەها داوای لێبوردنی کرد و گوتی: بەڵێنم بە هاوڕێیەکم -ساڵح بێچار- داوە کە میوانی ئەو بم. مامۆستا بە تەهای گوت سبەی نامەیەکت بۆ دەنووسم وەرە هەر لێرە، لە کتێبخانەی سلێمانی وەری بگرە. دوای ماوەیەک گفتوگۆ ماڵاواییان لە یەکدی کرد. ڕۆژی دواتر تەها چوو بۆ کتێبخانەی سلێمانی، مامۆستا زەرفێکی بچووکی لای کاک عومەر عەبدولڕەحمان بۆ دانابوو، تەها زەرفەکەی وەرگرت، کاتیک کردیەوە سەیری کرد بڕێک پارەی تێدایە.

ئەو کاتە بەشێکی زۆری کوردستان لەژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەدا بوو، تەها بەسەلامەتی گەڕایەوە بۆ بێزیلێ، زوبێدە و شەمسە و منداڵەکان بە گەڕانەوەی تەها خۆشحاڵ بوون.

تەها چەندین جار بۆ قاچی دەستکرد سەردانی تەورێزی کرد، بڕیاری دا هەرکاتێک قاچە دەستکردەکەی تەواو بوو، بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. ئەو ماوەیەی کە تەها چاوەڕێی قاچە دەستکردەکەی دەکرد، لە سەردەشت لەلای وەستا سمایل کاری دەکرد. مووچەی پێشمەرگایەتی وەردەگرت و زوبێدەش کاری بەرگدروونی دەکرد. لەو ماوەیەدا توانیان کەمێک پارە کۆبکەنەوە. تەها هەر جارێک کە دەچوو بۆ تەورێز بە خەڵکی زیاتر ئاشنا دەبوو. تەها لەوە تێگەیشت کە خەڵکی تەورێز چەند میهرەبان و بەڕێزن. تەها بەردەوام کتێبی فارسی دەخوێندەوە و بە فارسی قسەی دەکرد. لە کۆتاییدا، ڕۆژی ٥-٦-١٩٩٢، تەها قاچی دەستکردی وەرگرت.

تەها بەرلەوەی قاچەکەی وەربگرێت، ڕۆژانە بۆ کارکردن دەچوو بۆ سەردەشت. زوبێدەش ئاگاداری منداڵەکانی دەکرد و ئیشوکاری ناو ماڵی تەواو دەکرد، دوای ئەوەی منداڵەکانی دەخەواند کاری بەرگدروونی دەکرد. ئەو هەندێک جار شەوانە تاکو بەیانی کاری بەرگدروونی دەکرد. تەها بۆ باشتر فێربوونی زمانی فارسی، گۆڤاری کەیهانی منداڵانی دەخوێندەوە، فارسییەکەی زۆر باش ببوو. دواتر کتێبی شازادە و گەدا ی بە زمانی فارسی خوێندەوە. کتێبەکانی عەزیز نەسین و ڕۆمانی

"هەڵۆی کوێستان" ی خوێندەوە. ئەو فەرهەنگێکی "کورد - فارسی" کڕی بوو، بە هاوکاری فەرهەنگەکە کتێبی دەخوێندەوە. لە کاتی خوێندنەوەدا لە هەر شوێنێک لە ڕستەیەک تێنەگەیشتایە ڕۆژی دواتر پرسیاری لە وەستا سمایل و خەڵکانی دیکە دەکرد. دیارە یەکەم کتێب کە هەوڵی دابوو بیخوێنێتەوە، چوارینەکانی خەیام بوو، چونکە کاتێک بە منداڵی لە سێکانیان بوو، مامە محەمەدی شەوانە چوارینەکانی خەیامی بە کوردی دەخوێندەوە، تەهاش لە سەردەشت هەوڵی دەدا چوارینەکانی خەیام بە فارسی بخوێنێتەوە.

تەها، ڕۆژی ١٩٨٩/٤/٤، چوارینەکانی خەیامی بە زمانی فارسی کڕی بوو، بەڵام خوێندنەوەی چوارینەکان بۆ ئەو گران بوو. ساڵی ١٩٩٢ کاتێک ویستی ماڵەکەی لە ئێرانەوە بباتەوە بۆ سلێمانی، دوبارە "چوارینەکانی خەیام" ی خوێندەوە؛ ئەمجارە زۆرباش لە هۆنراوەکان تێدەگەیشت. پێشتر چەندین جار "چوارینەکانی خەیام" ی بە زمانی کوردی خوێندبووەوە. تەها بەردەوام کتێبەکانی "عەزیز نەسین" ی بە فارسی دەخوێندەوە، وەکوو کتێبی "نرخەکان ڕۆژ بە ڕۆژ بەرز دەبنەوە" کە "ڕەزا هەمرا" وەریگێڕابووە سەر زمانی فارسی. کتێبەکانی عەزیز نەسین کاریگەریی زۆریان لەسەر تەها هەبوو بۆ فێربوونی زمانی فارسی. هەڵبەت تەها بە منداڵی و پێش ئەوەی بچێتە قوتابخانە، زۆر گوێی لەو کتێبانە گرتبوو کە مامی دەیخوێندنەوە. وەک کتێبی "ئەمیر ئەرسەلان"، یەکەم کتێب کە خۆی بە منداڵی خوێندبوویەوە، کتێبی "میعراج نامە" بوو، دواتریش کتێبەکانی "قەڵای خەیبەر" و "چل تووتی" خوێندبووەوە، کتێبی چل تووتی لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی خوێندبووەوە. لە هەمان ساڵدا کتێبی "دز و قازی" و هۆنراوەکانی قانعی شاعیری خوێندبووەوە. مامۆستاکانی پێیان گوتبوو، تەنها کتێبی قوتابخانە بخوێنەرەوە کتێبی دیکە مەخوێنەرەوە، بەڵام تەها زۆر حەزی بەکتێب خوێندنەوە بوو. باوکی خوێندەواری نەبوو، بەڵام بەردەوام کتێبی بۆ دەکڕی. هەرکاتێک دەچوو بۆ سلێمانی یان کەرکووک، کتێبی بۆ تەها دەکڕی، لە سێکانیان و سەرگەڵوو کتێب و کتێبخانە نەبوو.

کوردستانی عێراق ئازاد کرابوو، سوپای عێراق، کوردستانی چۆڵ کردبوو. بڕیاربوو تەها بەماڵەوە بگەڕێتەوە کوردستان. شەمسە ویستی لەگەڵ منداڵەکانیدا بگەڕێتەوە

بۆ کوردستان، تەها گوتی: ماڵەکەمان دەبەینەوە شارۆچکەی پیرەمەگروون، شوێنێک کە دایک و باوک و خزمەکانی لێ نیشتەجێ بوون. ئەوان نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە گوندەکەی خۆیان، چونکە لە سێکانیان زەوی کوشتوکاڵی کەم بوو، ڕێگای ماشێنی نەبوو، تەواوی گوندەکەش ڕوخێنرابوو. کارەبا و قوتابخانەی نەبوو، هەر بۆیەش تەها بڕیاری دا لە پیرەمەگروون نیشتەجێ بێت.

ئەوکاتە لە عێراق گرانیی بوو، ئارد و پێداویستیەکانی دیکە کەم بوو. تەها دوازدە فەردە ئارد و دوو فەردە گەنمی کڕی. هەروەها لە تەورێز مەکینەیەکی بەرگدروونی بە ٤٥٠٠ تومەن بۆ زوبێدە کڕی. مانگایەک و چەند سەربزن و هەندێک مریشک و قەلی هێنایەوە بۆ کوردستان. ماڵەکەی بردە پیرەمەگروون و لەوێ خانوویەکی بەکرێ گرت مانگی بە چل دینار. شەمسە و منداڵەکانیشی هەر لە پیرەمەگروون نیشەجێ بوون.

تەها چەندین کتێبی فارسیشی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ پیرەمەگروون. یەکێتیی نیشتمانیی و پارتی دیموکرات بە هاوبەشی سوپایەکی یەکگرتوویان دروست کرد. تەها دوبارە گەڕایەوە سەر کاری پێشمەرگایەتی و کرا بە لێپرسراوی ئیدارەی فەوج. هەر فەوجیک بریتی بوو لە ٢٥١ کەس، چوار فەوجیش لیوایەک بوو، غەریب هەڵەدنی لێپرسراوی لیواکەیان بوو.

### شەڕی ناوخۆ

پیلانی سەدام و دوژمنانی کورد بە ئاکام گەیشت. دۆستایەتی و یەکێتیی نێوان دوو حیزبی دەسەڵاتداری کوردستان نەما. ئەوەی کە نەدەبوو ڕوویدا. چیتر سەدام کوردەکانی نەدەکوشت، بەڵکو کوردەکان خۆیان خۆیانیان دەکوشت. دیارە سەدام و پیلانگێڕانی دیکە لەم کارەدا دەستیان هەبوو، پیلانگێڕانی نێودەوڵەتیش دەستیان تێیدا هەبوو، ئەم شەڕە چەند ساڵێک درێژەی کێشا و بووە هۆی زیانی گیانی و ماڵیی زۆر بۆ کورد. بەو شەڕە زۆر دڵ شکان، داخی تازە هاتە سەر داخی کۆن. ئاخر بۆچی و لە پای چی؟

بەداخەوە شەڕی ناوخۆ دروست بوو، دۆستایەتی و یەکڕیزی لە نێوان پارتی دیموکرات و یەکێتیی نیشتمانیی و بزووتنەوەی ئیسلامیدا نەما. یەکێتیی نیشتمانیی بەسەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی لەلایەک و پارتی دیموکرات بەسەرۆکایەتی مەسعود بارزانی و بزووتنەوەی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی مەلا عوسمان، لەلایەکی دیکە کەوتنە شەڕەوە. شەڕی ناوخۆ و کاولکارییەکان،، یەکڕیزی نێوان حیزبەکانی نەهێشت. یەکڕیزییەک کە دەیتوانی کوردستان بەرەو ئاوەدانی و ئارامی بەرێت. پیلانگێڕی دوژمنانی کورد کاریگەری زۆری هەبوو، کوردەکان لەبری ئەوەی هەوڵبدەن بۆ گەیشتن بە ئازادی و سەربەخۆیی، دەستیانکرد بە شەڕی یەکدی کوشتن. شەڕی ناوخۆ، لە کارەساتە دڵتەزێنەکانی سەدام بە ئازارتر بوو. کوردەکان دەبێت لە شەڕی بێهوودە وانە وەربگرن، جارێکی دیکە ئەو هەڵە مێژووییە دوبارە نەکەنەوە. تەنانەت ئەگەر سەرۆکەکانیشیان لەگەڵ یەکدا کێشەیان هەبێت، هەرگیز نابێت پێشمەرگەکان لەگەڵ یەکدیدا شەڕ بکەن. لەکاتی ڕوودانی شەڕ و ئاڵۆزیی ناوخۆدا، نابێت پێشمەرگەکان گوێڕایەڵی بەرپرسەکانیان بن. دەبێت کارێک بکەن کە هیچ سەرکردەیەک لە بیری شەڕی ناوخۆدا نەبێت. هێزە کوردییەکان دەبێت بە جۆرێک یاسا دابڕێژن کە هیچ سەرکردەیەک نەتوانێت شەڕی ناوخۆ بەرپا بکات. ئەگەر هێزێکی ئیسلامیی توندڕەوی وەک داعش بیەوێت شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسێنێت، ئەوکات چی بکرێت؟ دەبێت کارێک بکرێت ئەو جۆرە هێزە هەرگیز دەسەڵات نەگرنە دەست، باشترین کار پەروەردەکردن و هۆشیارکردنەوەیە.

**ستاری برای تەها**

ستار منداڵی چوارەمی حاجی عەبدوڵڵا و ئامینە بوو. لەدایکبووی ١٩٦٤ بوو، نۆ ساڵ لە شەمسە و چوار ساڵ لە تەها و دوو ساڵ لە یاسین بچووکتر بوو. ستاریش پێشمەرگە بوو، پێشمەرگەیەکی ئازا و قارەمان بوو.

هەمووان دژی شەڕی ناوخۆ بوون، بەڵام چی بکەن، جەنگ دروست ببوو، سەرکردەکان بە لای یەکەوە دانەدەنیشتن، پێکەوە گفتوگۆیان نەدەکرد. ئەوەی سەدام و

دوژمنانی کورد دەیانویست ڕوویدا. ستار پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. حاجی عەبدوڵلا چەند جار لەگەڵ کوڕەکەی دەکەوتە گفتوگۆ، پێیدەگوت ئەم شەڕە شەڕێکی ناڕەوایە، ئەم شەڕە شەڕی برا کوژییە. ئەم شەڕە شەڕی سەدام و دوژمن نییە، ئەمە شەڕی براکانە، ئەم شەڕە شەڕی کورد و کوردە. حاجی عەبدوڵلا دەیگوت تۆ لەگەڵ سوپای سەدامدا شەڕت کردووە، بەڵام لەگەڵ کورددا شەڕ مەکە. بەڵام ستار لایەنگری بەرپرسەکانی بوو، ستار کەمتر دەچوو بۆ ماڵی باوکی، تاکو باوکی نیگەران نەکات.

شەوێک حاجی عەبدوڵلا بە ناڵە و هاواری ئامینە لە خەو ڕاپەڕی، گوتی: ئەو هاوار کردنە چییە؟ ئامینە گوتی: خەونێکی ناخۆشم بینی، لە خەونمدا ستارم بینی، ستار گرفتار و ناڕەحەت بوو. حاجی عەبدوڵلا خۆیشی نیگەرانی ستار بوو، بەڵام دڵخۆشی ئامینەی دەدایەوە گوتی: نیگەران مەبە، ستار ساغ و سەلامەتە. ئامینە تا بەرەبەیان چەند جارێک خەونی ناخۆشی بینی. حاجی عەبدوڵلاش خەونی بە ستاریەوە بینی. لە خەونەکەیدا بە دوای ستاردا دەگەڕا.

ستار هاوسەری هەبوو، کچێکی جوانی بەناوی "هاوژین" هەبوو، هەر کاتێک ستار دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە هاوژینی لە باوەش دەکرد و یاریی لەگەڵدا دەکرد، لەگەڵ خۆیدا بەنێو ژوور و حەوشەکەدا دەیگێڕا. ستار کچەکەی و هاوسەرەکەی زۆر خۆشدەویست. کاتێک ستار هاتە دونیاوە، شەمسە زۆری خۆشدەویست، بەردەوام دەیلاواندەوە و لە باوەشی دەگرت. هەمان شەو کە حاجی عەبدوڵلا و ئامینە خەونی ناخۆشیان پێوە دەبینی، شەمسەش خەونی ناخۆشی بینی بوو. ئەویش ئەو شەوە بە نیگەرانییەوە، خەو نەچوو بووە چاوی.

تەها، تا مانگی ١٩٩٤/٥ لێپرسراوی ئیدارەی فەوج بوو، دوای ئەوە بوو بە لێپرسراوی فەرمانگەی ئاوی دوکان.

ڕۆژی ١٩٩٤/٦/٦ لە قەڵادزێ شەڕێکی گەورە لە نێوان پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی و بزووتنەوەی ئیسلامیدا ڕوویدا، شەڕی براکوژیی وماڵوێرانکەر. لەو ڕۆژەدا خزمێکی نزیکی تەها بەناوی کاوە ڕەشید ئەحمەد، شەهید کرا. کاوە خەڵکی سێکانیان بوو، بە شەهیدبوونی کاوە، تەها زۆر نیگەران بوو. تەها ئەو شەڕەی بە

شەڕێکی بێمانا دەزانی. زۆر دژی شەڕی برا کوژی بوو. بەهیچ جۆرێک باوەڕی بەو جۆرە شەڕە نەبوو. ئاخر ئەم شەڕە لەپێناوی چی؟ بۆچی ئێمە یەکدی بکوژین؟

تەها ئەندامی کۆمیتەی ڕێکخستن بوو، لێپرسراوی فەرمانگەی ئاوی دوکان بوو، ئیتر ئەو کاری سەربازی و پێشمەرگایەتی نەدەکرد، بەڵام کاری ڕێکخستنی دەکرد. ڕۆژانە هەواڵی شەهیدبوونی هاوڕێیەکی پێدەگەیشت. شەڕی ناوخۆ لە شەڕی ڕژێم ناخۆشتر بوو، شەڕێکی بێ ماناو پڕ زیان. ئایا هۆی جەنگ پیلانی سەدام و وڵاتانی دەرەکی بوو؟ هەڵگیرسانی شەڕ لە کەم ئەزموونی سەرکردەکان بوو لە گفتوگۆدا. هیچ کەسێک باوەڕی بەو جەنگە نەبوو، جەنگێکی بێ هۆ. چەند ڕۆژێک بوو تەها نیگەران بوو، دڵی پڕ غەم بوو، هەر هەواڵێک دەهات هەواڵی ناخۆش و دڵتەزێن بوو. ئەگەرچی ئەو ماوەی بیست ساڵ بوو، هەواڵی ناخۆش و دڵتەزێنی دەبیست. چەند ڕۆژێک بوو، دڵی گیرابوو، لەوە دەترسا هەواڵی ناخۆشی پێ بگات. شەڕ لەگەڵ سوپای سەدامدا نەمابوو، بەڵام جەنگی ناوخۆ بەردەوام بوو.

ڕۆژی ١٩٩٤/٨/٢٤ بوو. تەها لە کۆمیتە خەریکی کارەکانی خۆی بوو، هەواڵێکی پێگەیشت کە تووشی شۆکی کرد، پێش چاوی تاریک بوو، گێژ بوو، دەست و قاچی کەوتنە لەرزین. هەستیکرد پشتی شکاوە، ئاخێکی هەڵکیشا و خەریک بوو بکەوێتە سەر بەزەوی، خۆی بە کورسییەکەوە گرتەوە. هاوڕیکانی وایانزانی بووراوەتەوە، کارمەندی سەر بێتەلەکە بروسکەیەکی هێنا بوو، لەسەر مێزەکە دانابوو، نووسرابوو: ستار لە سەیدساق لە شەڕی ئیسلامییەکاندا شەهید کراوە. فرمێسکەکانی تەها کەوتبوونە سەر پەڕە کاغەزەکەی بەردەمی. هاوڕێکانی خەریکی خوێندنەوەی بروسکەکە بوون کە هەواڵەکەی تێدا نووسرابوو. ئەوانیش ئاهێکیان هەڵکیشا و تەواو غەمبار بوون. ستار تەمەنی بیست و حەت ساڵ بوو، تەها برایەکی دیکەشی شەهیدکرا بوو. ستار تەنها یەک منداڵی بچووکی هەبوو. تەها دووەم برای شەهید کرا بوو، خۆی و خوشکەکەشی کەمئەندام بوون. زراری هاوسەری خوشکەکەشی شەهید کرابوو. خاڵێکی بەتەواوی ئەندامانی خیزانەکەیەوە شەهید کرابوو. خاڵێکی دیکەشی بەناوی سەلامی حەمەشوان شەهید کرابوو. دوو خاڵۆزای دیکەشی بەناوەکانی سەرهەنگ و موحسین شەهید کرابوون. تەها وای هەستکرد پشتی شکاوە. نەیدەتوانی لەسەر قاچە دەستکردەکەی بووەستێت.

"شەوبۆ"ی هاوسەری ستار، بێوەژن بوو. "هاوژین"ی بچکۆلەش بێباوک ببوو، حاجی عەبدوڵڵا و ئامینە لە چ دۆخێکی ناهەمواردا بوون؟ شەمسە چۆن بەرگەی ئەو هەموو ئازارەی دەگرت؟ ستاری تەمەن بیست و حەوت ساڵ، چووە ڕیزی کاروانی شەهیدانی ڕێگای ئازادی. بکوژانی ستار لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە بۆ ئازادی دەجەنگن.

تەها برینداری جەنگ بوو، لە هەموو شتێک بێزار ببوو، لە ڕوانگەی تەهاوە جەنگ لەگەڵ سەدامدا شەڕێکی ڕەوا بووە و دژی زوڵم و ستەم بووە، بەڵام شەڕی پارتی و ئیسلامییەکان، شەڕێکی نادروست بووە. دەکرا ئەو شەڕە، بەهۆی گفتوگۆوە بە زوویی کۆتایی پێ بهاتایە.

هەواڵی شەهیدبوونی ستار هەر وەک کوتەکێک لەسەری حاجی عەبدوڵڵا و ئامینەی دا، هەواڵەکە وەک گورزێکی گران لە سەری شەمسەی دا. تەها حەزی دەکرد بکەوێت و هەڵنەستێتەوە. بەڕاستی ڕۆژی ١٩٩٤/٨/٢٤ڕۆژێکی ڕەش بوو. هاوسەری ستار ئەژنۆی خستبووە سەر زەوی و دەگریا، ئەو ژنە جوانە کچەکەی لە باوەش گرتبوو دەیگوشی بەخۆیەوە. ئامینە پشتی چەمابووەوە. ئامینەیەک کە دەیان غەمی لە دڵدا بوو نەیدەزانی بۆ کامیان بگری. ئامینە، هاوژینی لە باوەش دەگرت و بۆنی پێوە دەکرد. حاجی عەبدوڵڵا پشتی کووڕ ببوو، ڕاست نەدەبووەوە و دڵنەوایی بووکەکەی دەدایەوە، حاجی عەبدوڵڵا وەک گەورەی بنەماڵەکە سەبر و تاقەتی لێ برابوو، ئەو دەبوو بە باشی ئاگاداری خۆی بێت، دەبوو خۆی وەک کەسێکی بەهێز نیشان بدات، هەتا نەوەکانی هەست بە ئارامی بکەن.

سەرجەم خزم و کەسوکار لە پیرەمەگروون کۆببوونەوە. هەموو لە شەڕی ناوخۆ بێزار بوون، دەیانگوت ئەم جەنگە جەنگێکی ناڕاستە. کاتی ئەنفالەکان زۆربەی زۆری خەڵکی سێکانیان هاتبوونە ئۆردوگای پیرەمەگروون. هەر لە پیرەمەگروون پرسەیان دانا و خزم و کەسەکانی دیکەش لە شوێنە دوورەکانی ترەوە هاتن بۆ پیرەمەگروون و بەشداری پرسەکەیان کرد. تەها خەم دایگرتبوو، فشاری خستبووە سەر قاچە دەستکردەکەی، لەم گۆشەی ژوورەکەوە دەڕۆیشت بۆ ئەو گۆشەی ژوورەکە و نەفرەتی لە جەنگی ناوخۆ دەکرد.

تەنها تەها بەو جۆرە بیری نەدەکردەوە، لەوانەیە جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی‌یش هەر هەمان بیرکردنەوەیان هەبووبێت. ئایا مەلا عوسمانیش هەر وا بیری دەکردەوە؟ ئەی بۆچی ئەم سەرکردانە پێکەوە کۆنەدەبوونەوە و گفتوگۆیان نەدەکرد. ئەوان ماوەی چوار ساڵ دژبەیەک شەڕیان کرد، دوای چوار ساڵ پێکەوە کەوتنە گفتوگۆ، مەگەر نەیاندەزانی کۆتایی هەر جەنگێک ڕێککەوتنە؟ جەنگێک بە کردەوە لە خزمەتی سەدام و دوژمنانی کورددا بوو. دیارە هەندێک کەس هەن هەرگیز نایانەوێت جەنگ کۆتایی بێت. چونکە ئەوان سوود لە جەنگ وەردەگرن. خۆزگە هەموو سەربازانی جیهان دەچوونە سەر پەیڕەوی دزموند داس"، هەمان دزموند داسی سەربازی ئەمریکی کە ئامادە نەبوو چەک هەڵگرێت، بەڵام ئەو مەدالیای ئازایەتی جەنگی وەرگرت.

بەهۆی شەڕی ناوخۆوە، لیوا و فەوجە هاوبەشەکان، هەڵوەشانەوە. پێش شەڕی ناوخۆ سەربازانی لیوای فەوجەکان نیوەیان سەر بە یەکێتیی بوون و نیوەکەی دیکەشیان سەر بە پارتی بوون. ئەوە یەککگرتنێکی زۆر جوان بوو، هاوکارییەکی باش بوو. بەڵام شەڕی ناوخۆ هەموو شتێکی هەڵوەشاندەوە. هاوڕێ و هاوسەنگەرەکان دژبە بەیەکتر چوونە سەنگەرەوە. یەکێتیی لیوای تازەی دروست کرد. هەموو ئەفسەر و سەربازەکانی لایەنگری یەکێتیی بوون. پارتی دیموکراتیش یەکەکانی خۆی بەهەمان شێوە ڕێکخست. تەها داوای کرد لە لیوا تازەکەی یەکێتیی کار بکات، بەڵام فەرماندەکان گوتیان تەها قاچێکی نییە و نابێت بێتە نێو لیواکەوە. تەها تەمەنی سی و چوار ساڵ بوو. هەڵبەت فەرماندەکان دەیانزانی تەها دژی شەڕی ناوخۆیە. تەها زۆر دڵسۆزی یەکێتیی بوو، بەڵام لە هەمانکاتدا دژی شەڕی ناوخۆ بوو. پێشنیازیان بۆ تەها کرد ببێتە لێپرسراوی ئاوی دوکان، پیرەمەگروون، خەلەکان و بنگرد. تەهاش ئەو ئەرکەی قبوڵ کرد. ئەو لە ساڵی ١٩٩٤ هەتا ساڵی ٢٠٠٠ لێپرسراوی ئاوی شارۆچکەی دوکان بوو. تەها ماڵەکەشی بردە دوکان. زوبێدە و منداڵەکانیشی لە دوکان نیشتەجێ کرد. تەها ماوەی شەش ساڵ لێپرسراوی ئاوی دوکان بوو، ئەو کارە بۆ تەها کارێکی شیاو بوو، ئەو لە شارۆچکەی دوکان کەسوکار و هاوڕێی زۆر بوون، لەوێش هاوڕێی زۆر باشی ناسی.

لە شەڕی ناوخۆدا چەند جارێک شارەکانی هەولێر و سلێمانی دەستاودەست کران. لەم شەڕەدا لەسەر داوای پارتی دیموکرات چەند جارێک فڕۆکەکانی تورکیا بۆردوومانی کوردستانی عێراق و پێشمەرگەکانی یەکێتی‌یان کرد. هەڵبەت لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا سوپای عێراق بەهیچ جۆرێک بۆردوومانی نەدەکرد، بەڵام لە هێرشێکدا سوپای عێراق بەشداری کرد، هاوکاری پارتی دیموکراتی کوردستانی کرد و -٣١ ی ئاب- هێرشی بۆ سەر شاری هەولێر دەستپێکرد. توانیان دەست بەسەر هەولێردا بگرن و دواتر ڕادەستی هێزەکانی پارتی دیموکراتیان کرد و خۆیان گەڕانەوە بۆ کەرکووک و موسڵ. هەر بەهۆی ئەو هێرشەوە لایەنگرانی یەکێتیی ناچار بوون بەرەو سەر سنوور و وڵاتی ئێران کۆچ بکەن. ئەم جارە تەها ڕۆیشت بۆ گوندی ئەشکانی سەر سنوور لە نزیک قەڵادزێ. ئێرانییەکان لەو گوندەدا ئۆردوگایەکیان بۆ هاوکاری ئاوارەکان دروستکرد. تەها لەوێ بوو بە لێپرسراوی ئۆردوگاکە. هاوکات لێپرسراوی ئاوی دوکانیش بوو، نزیکەی دوو مانگ لە ئۆردوگاکە مانەوە پاشان گەڕانەوە بۆ شارەکانی خۆیان. یەکێتیی دەستی بەسەر شاری سلێمانی‌دا گرتەوە، بەڵام هەولێر لەژێر دەستی پارتی‌دا مایەوە، کۆسرەت ڕەسوڵ سەرۆکی حکوومەتی سلێمانی بوو، خۆیشی لە کاتی شەڕدا لە پێشەوەی بەرەکانی شەڕ بوو، هەر لەو شەڕەدا بە خەستی بریندار بوو، ئەو تا ساڵی ٢٠١٩ باری تەندروستی باش نەبوو. لە کاتی شەڕی ناوخۆدا شەڕێکی زۆر سەخت لە دوکان ڕوویدا، لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر کوژراو هەبوون، یەکێک لەو کوژراوانە تەحسین شاوەیس بوو، تەحسین شاوەیس پێشتر یەکێک بوو لە سەرۆک جاشەکانی سەردەمی سەدام حوسێن. لە سەردەمی شۆڕش‌دا چەندین پێشمەرگە و فەرماندە و لێپرسراوی شەهید کردبوو، بەڵام لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ پەیوەندیی کردبوو بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە. یەکێک لەو سەرکردانەی یەکێتیی کە ئەو شەهیدی کرد "شاسوار جەلال - شەهید ئارام" بوو. کە لە ساڵی ١٩٧٨ لە گوندی تەنگیسەری ناوچەی قەرەداخ شەهیدی کرد. هەر ئەو سەرۆک جاشە، سەرەتای ساڵی ١٩٨٥ "مامەڕیشە"ی شەهید کرد، کە یەکێک بوو لە پێشمەرگە هەرە قارەمانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. مامەڕیشە ناوی ڕاستەقینەی نەجمەدین شکور ڕەئوف بوو، بەڵام بە مامەڕیشە ناسرابوو، سەربازان

و لایەنگرانی ڕژێمی بەعس زۆر لە مامەڕیشە دەترسان، بەڵام تەحسین شاوەیس بەفێڵ و تەڵەکە توانی شەهیدی بکات.

ئەو کات ئازادی سەرگرمە سەرتیپی پەنجا و حەوتی سەرگرمە بوو. وەک ئازاد باسی دەکات تەحسین شاوەیس نامەی بۆ مامەڕیشە ناردووە و داوای کردوە یەکدی ببینن. مامەڕیشە نامەکە پیشانی ئازادی سەرگرمە دەدات و دەڵێت تەحسین شاوەیس داوای لێ کردووە پێکەوە دابنیشن، بەڵام ئازادی سەرگرمە بە مامەڕیشە دەڵێت کاری وا نەکەیت، تەحسین بێ شەرەفە و جێگەی باوەڕ نییە، بەڵام مامەڕیشە بە قسەی ئازاد ناکات و دەچێت بۆ شوێنی دیاری کراو، هەتا لەگەڵ تەحسین یەکدی ببینن. بەڵام لەبری یەکتربینین تەحسین کەمین بۆ مامەڕیشە دادەنێت هەر لەو شوێنە شەهیدی دەکات.

بەکوژرانی تەحسین شاوەیس لە دوکان هەموو لایەک خۆشحاڵ بوون، دەیانگوت کەسێکی خۆفرۆش و خائین لەنێو چوو.



سەرۆک مام جەلال خەڵاتی پارتیزانی دەبەخشێتە تەها سێکانیانی ١٩٩٧ قەڵاچوالان

تەها، دوای دوو مانگ مانەوەی لە ئۆردوگای ئەشکان، دوبارە گەڕایەوە بۆ دوکان. هیچ کەسێک پۆستەکەی ئەوی وەرنەگرتبوو. تەها تاکو دوو ساڵ دوای کۆتایی هاتنی شەڕ لێپرسراوی فەرمانگەی ئاوی دوکان بوو، لەو ماوەی ە دا شەڕی پارتی و یەکێتیی کۆتاییهات. واتە شەڕی ناوخۆ ساڵی ١٩٩٨ کۆتاییهات. تەها لە ساڵی ٢٠٠٠ تەمەنی بوو بە چل ساڵ. ئەگەرچی بۆ ساڵیادی لەدایکبوونی هیچ مەراسیمێکی ڕێک نەخست. زوبێدە هێشتا کاری بەرگدروونی دەکرد. ئەو تەواو شەکەت ببوو، مەگەر مرۆڤ توانای چەندە؟ ئێستا دەردەکەوێت کە منداڵان لە سەردەمی جەنگدا بۆ خۆیان و بۆ دایک و باوکیان چەند گرفتیان هەیە. منداڵانی ژێر هێرشی کیمیایی، منداڵانی پەروەردەی ژێر بوردوومانی تۆپ و فڕۆکە لە تەواوی تەمەنیاندا کێشەیان هەیە. تەها دەیویست کەمێک پشوو بدات، قاچی ئازاری دەدا، بەڵام هەمیشە کەسێکی بەورە بووە. تەها ساڵی ٢٠٠٠ خۆی خانەنشین کرد و تەنها مووچەی کەمئەندامی وەردەگرت. واتە مووچەی فەرمانگەی ئاوی ڕەتکردەوە. لەدوای ساڵی ٢٠٠٠ وە تەها زۆربەی کات خەریکی خوێندنەوە و فێربوونی زمانی فارسی بوو.

تەها لە کاری کڕین و فرۆشتندا کەسێکی هۆشیار بوو، ئەو لە دوکانەوە ماڵەکەی گواستەوە بۆ سلێمانی. هەر لە سلێمانی توانی خانوویەک بۆ خۆی بنیاد بنێت و لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی پێکەوە لەو خانووەدا دەژیان. بەڵام پەیوەندییەکانی بە یەکێتیی نیشتمانییەوە هەربەردەوام بوو هەر کاتێک یەکێتیی پێویستی پێی هەبووایە، تەها ئامادەبوو بۆ هەرکارێک پێی بسپێردرێت. ساڵی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٣ کە کاتی کەوتنی ڕژێمی سەدام بوو، چەندین جار لە نێوان کوردەکان و ڕژێمی سەدامدا شەڕ دروست بووە. ساڵی ٢٠٠٣ ڕژێمی سەدام ڕووخا، کوردستان کەوتە قۆناغێکی تازەوە. کوردەکان زیاتر هەستیان بە ئازادی کرد. خزمەتگوزاری زیادی کرد، هەوڵێکی زۆر درا بۆ بنیادنانەوە، کێشە و ئاڵۆزی دروست دەبوو، بەڵام بەزوویی چارەسەر دەکرا. لەماوەی چەند ساڵێکدا کوردستان گۆڕانکاری گەورەی بە خۆیەوە بینی. لەو ماوەیەدا قوتابخانە و نەخۆشخانە و ڕێگاوبانێکی زۆر دروست کرا. باری ئابووریی خەڵک بەرەوپێش دەچوو. زۆرێک لە گوندەکانی کوردستان ئاوەدان کرانەوە و کارەبایان بۆ ڕاکێشرا. پرۆژەی ئاو و ئاوەڕۆ لە تەواوی شار و شارۆچکەکاندا جێبەجێ کرا.

چەندین زانکۆ لەسەر ئاستی کوردستان دامەزرا.

دوای نەمانی ڕژێمی سەدام گۆڕانکارییەکی گەورە لە لە کوردستانی عێراق بەدیهات، ئەم گۆڕانکارییانە ئەوە دەردەخات کە هیچ گەشەکردنێک بەبێ ئازادی بەدینایەت. ئازادی مەرجی بنەڕەتی هەموو پەرەسەندنێکە. لە هەمان کاتدا ئەم گەشەسەندن و ئاوەدانییە ئەوە دەردەخات کە کوردەکانی عێراق شایستەی ئازادی و خزمەتگوزاری زیاترن. ئازادیەک وابەستە بە یەکڕیزی و هاوژیانی هەموو لایەنەکان. پێویستە لاوانی کورد بزانن ئەم هەموو گەشە و ئازادییە بە چ نرخێک بەدەستهاتووە. پێویستە یەکێتیی ناوخۆیان بپارێزن، ئاگاداری توندڕەوی هەر لایەن و توێژێک بن، بەردەوام وتووێژ و دانوستان بکەن.

ساڵی ٢٠١١ کۆنفڕانسی پێشمەرگە کەمئەندامەکان بەسترا. تەها بەشداری ئەو کۆنفڕانسەی کرد، لەیەکێک لە لقەکانی کۆمەڵەی کەمئەندامان‌دا دەستبەکار بوو. ئێستا ساڵی ٢٠٢٠ تەها لە لقی "دوکان – شارباژێڕ" ی کۆمەڵەی کەمئەندامانی سەنگەر کاردەکات، ڕۆژانی یەکشەممە و دوشەممە لە دوانیوەڕۆ تا ئێوارەیەکی درەنگ لەو کۆمەڵەیە کار دەکات، جگە لەوەش زۆربەی ڕۆژ دەڕوات بۆ بارەگاکەیان.

تەها خاوەنی پێنج منداڵە، بچووکەکەیان "بژوێن" ڕۆژی ١٩٩٨/١/٨ لە سلێمانی هاتۆتە دونیاوە. تەها لە سلێمانی خاوەنی خانووی دوو نهۆمی خۆیەتی. خەریکی ژیانی تایبەتی خۆیەتی. هەموو کوردەکان لە هەوڵی بەدەستهێنانی ژیانی شایستەی خۆیان و خزمەتکردنی کوردستاندان، ئازادی و ئارامی و یەکڕیزی کلیلی پێشکەوتنە.

**داعش**

ساڵی ٢٠١٤ داعش هێرشی کرد و دەستی بەسەر بەشێکی زۆری خاکی عێراقدا گرت، داعش زۆر دڕندانەکاری دەکرد. هێرشی کردە سەر کوردستانیش. داستانی داعش و کوردە ئێزدییەکان داستانێکی ناسراوە. کوشتوبڕ، زیندانی و ئەشکەنجەدان و دەستدرێژیی زۆر لە سەردەمی سەدام خراپتر، دەستی پێکرد. داعش بۆمبی کیمیایی نەبوو، دەنا کەس نازانێ چییان دەکرد. کوردەکان لە بەرامبەر داعشدا بەرگرییەکی

بێوێنەیان کرد. داعشی و ڕێباز و بیری داعشی کارەساتی ئەم سەدەیەیە. کارەساتی سەدەی بیست و یەک. ئومێدەوارم تا کۆتایی سەدە، ئەم کارەساتە دوبارە نەبێتەوە. تاوانی مرۆڤکوژی بەناوی خوداوە، هەزار جار خراپترە لە مرۆڤکوژی بە ناوی ئایدیۆلۆژییای مادییەوە.

تەها تەمەنی پەنجا و چوار ساڵ بوو. قاچێکی نەبوو. قاچەکەی دیکەشی شوێن برینی زۆری پێوەبوو. نەدەکرا لە ماڵەوە دابنیشێت و سەیری پێشڕەوییەکانی داعش بکات. ڕۆژانە سەردانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانی دەکرد. ئەرکەکانی پێشمەرگایەتی ئەنجام دەدا. بەڵام دەیویست وەک هاوڕێکانی بڕواتە پێشەوەی بەرەکانی جەنگ و پێش بە هێرشەکانی داعش بگرێت. تەها بە کاری کەمئەندامان و کارگێڕیی ڕازی نەبوو. بەڵکو پێداگریی دەکرد بڕوات بۆ جەنگ. گوتیان تۆ تەمەنت هەیە و کەمئەندامیت، دەبێت لە مانگێکدا تەنها دە ڕۆژ لە بەرەی جەنگ بمێنیتەوە. ماوەیەک بڕۆیتەوە ماڵەوە بۆ پشوودان. ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێ کەمئەندامەکانی تەها ویستیان بڕۆن بۆ بەرەی جەنگ و لەگەڵ داعشدا بجەنگن. ئەوانیش هەموو پێشمەرگەی دێرین و کەمئەندام بوون، ئەزموونی زۆری شەڕکردنیان هەبوو عاشقی ئازادی بوون.

تەها لەگەڵ چەند پێشمەرگەی کەمئەندامی دیکە ڕۆیشتن بۆ "قەرەتەپە"ی نزیک "جەلەولا"ی سەربە پارێزگای دیالە. تەها سەرلەنوێ چەکی هەڵگرت و لە بەرەی پێشەوەی جەنگ، بەرەوڕووی داعش وەستا. لەو کاتەدا ئەو بەرەیەی جەنگ کەمێک ئارام بوو. هەندێک تەقە و تۆپباران هەبوو، بەڵام هێرش نەدەکرا. تەها ماوەی دە ڕۆژ لە قەرەتەپە بوو. بەڵام لەو ماوەیەدا هیچ هێرشێک ڕووینەدا. دوای ئەو دە ڕۆژە تەها و هاوڕێکانی بۆ پشوودان گەڕانەوە بۆ ماڵەوە. دوای ماوەیەک تەها لە بەرواری ٢٠١٤/١٠/٨ گەڕایەوە بۆ بەرەکانی جەنگی دژی داعش. ئەم جارە بارەگاکەیان لەنێو شارۆچکەی قەرەتەپەدا بوو، لەو ناوچەیەش شەڕ گەرم بوو. هەردولا هێرشیان دەکردە سەر یەکدی. تەها و هاوڕێکانی شەو و ڕۆژ چاودێری هێرشی داعشیان دەکرد. سەنگەرەکانی داعش زۆر لێیان نزیک بوو، ترسی هێرشی داعشیان هەبوو. پێشمەرگە کەمئەندامەکان بۆ پشوو هاتنەوە بارەگا، بارەگاکەیان لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا بوو. مزگەوتێک بەرامبەریان بوو، مزگەوتەکە دوو دەرگای هەبوو، دەرگایەکیان بەرامبەر

بارەگای پێشمەرگەکان بوو، دەرگاکەی دیکەش بە پێچەوانەوە، ڕووی لە ماڵەکانی کۆڵانەکە بوو.

تەها و شوانە موغاغی هاوڕێی، پێکەوە لە ژوورێکدا دانیشتبوون، گفتوگۆیان دەکرد. پێشمەرگەکانی دیکەش نزیکەی پەنجا کەس دەبوون، هەموو لە هۆڵێکی گەورەدا بوون. سەرجەم پێشمەرگەی کەمئەندام و جەنگاوەری بەئەزموون بوون. پێشتر خەڵک و مەلای مزگەوتەکەیان ئاگادار کردبوو کە لە دەرگای پشتەوە هاتوچۆی مزگەوت بکەن، کەس لە دەرگای بەرامبەر بارەگاکە هاتوچۆ نەکات. نەکا داعشێکی خۆکوژ بێت و خۆی بتەقێنێتەوە. لە هەردوو سەری کۆڵانەکەش بەربەستی "گڵ"یان بەرز کردبووەوە، تاکو هیچ ماشێنێک نەتوانێت بە کۆڵانەکەدا تێپەڕێت. تەواوی پێشمەرگەکان شەکەت و ماندوو بوون. شەو نەنووستبوون. بەیانی زوو هاتبوونەوە بۆ پشوودان. نانی بەیانیان خواردبوو خەریکی ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆ بوون. تەها و شوانە موغاغی لە ژوورەکەیاندا سەرگەرمی گفتوگۆ بوون. لەناکاو دەنگی تەقینەوەیەکی گەورە هات. تەواوی شووشەی پەنجەرەکان شکان. هەموو بە پەشۆکاوییەوە لە جێگای خۆیان هەڵسان، دوبارە دەنگی تەقینەوەیەکی دیکەی بەهێز هات. تەقینەوەی دووەم، زۆر لێیانەوە نزیک بوو. دەنگێکی بەهێزی هەبوو، چەندین پارچە بەردی بچووک لە پەنجەرەکەوە هاتنە ژوورەوە. پاشان تەقینەوەی سێیەمیش ڕوویدا. ئەو تەقینەوەیە زۆر بەهێز بوو. تەها لە شوێنی خۆی بەرز بووەوە و درایەوە بە زەویدا. هۆڵ و ژوورەکە و هەموو خانووەکە بەتەواوی ڕووخا و لەگەڵ زەویدا تەخت بوون. پێشمەرگەکان هەموو کەوتنە ژێر داروپەردووی خانووەکەوە. تەها لەژێر کۆنکرێتی سەقفی خانووەکەدا جوڵەی پێنەدەکرا، هەناسەی سوار ببوو. پشت و دەست و قاچەکانی ئازارێکی زۆری هەبوو. بلۆکێک کەوتبووە لای سەریەوە ئەو بلۆکە تارادەیەک پارێزگاری لە سەری کردبوو. لەبەر ئازار نەیدەتوانی بجوڵێت. وای هەست دەکرد هەموو جەستەی شکاوە. فشاری سەقفی خانووەکە زۆر بوو لەسەری. لەژێر سەقفەکەدا ماوەیەک بێهۆش بوو. دواتر هۆش خۆی هاتەوە، بەڵام نەیدەزانی ماوەی چەند بێهۆش بووە. لە دەرەوە گوێی لەتەقە و دەنگە دەنگ بوو. تەها وایدەزانی ئەوە هێرشی داعشەکانە و پێشمەرگەکان بەرگری دەکەن.

شوان موغاغیی‌یش وەک تەها لەژێر خانووە ڕووخاوەکەدا بوو. بانگی تەهای کرد: تەها ماویت یان مردوویت؟! تەها وەڵامی دایەوە: ماوم! بەڵام، ناتوانم بجوڵێم. ژێر سەقفەکە تاریک بوو، هیچ شتێک نەدەبینرا. کونێکی بچووک هەبوو ڕووناکی لەو کونەوە دەهاتە ژێر سەقفە ڕووخاوەکەوە. تەها چاوی لێبوو شوانە بە سکەخشکێ بەرەو لای کونەکە ڕۆیشت. لەوێووە ڕایانکێشایە دەرەوە، تەها لەژێر سەقفەکەدا مابووەوە، تەنگە نەفەس ببوو، فشارێکی زۆر لەسەر پشتی بوو. نەیدەتوانی بەباشی هەناسە بدات. زۆری لە خۆی کرد، تاکو کەمێک بجوڵێت. دواجار هەستی بەخۆی کرد کە کەمێک جوڵاوە، چونکە هەناسەی باشتر بۆ دەدرا. ئەویش وەک شوانە، هەوڵی دا بەسکەخشکێ خۆی گەیاندە لای کونەکە. کاتێک هاوڕێکانی بینییان، بەزوویی دەستیان گرت و ڕایانکیشایە دەرەوە. هەموو لەشی کوترابوو. ئازارێکی زۆری هەبوو، نەیدەتوانی دابنیشێت یان بە پێوە بووەستێت. لەسەرپشت کەوتبوو. تێکڕا هاوڕێکانی، شەهید یان بریندار ببوون. تەنها چەند کەسێک سەلامەت مابوونەوە. ئەوانیش لەکاتی تەقینەوەکەدا لە مزگەوت بوون. تەها دیسان بێ قاچ بووەوە. قاچە دەستکردەکەی کەوتە ژێر سەقفەکەوە. لەو تەقینەوەیەدا چواردە پێشمەرگە شەهید بوون و سی‌وپێنج پێشمەرگەش بریندار بوون. خۆ ئەگەر ئەو بلۆکە نەکەوتایەتە لای سەری تەهاوە، ئەوا ئەویش ئێستا شەهید بوو. منیش نەمدەتوانی هیچ لەبارەیەوە بنووسم. تەهاش یەکێکە لە هەزاران قوربانی دەستی تیرۆری کوێرانەی داعش.

پێشمەرگە شارەزای شەڕی نێو شاخ و پارتیزانی بوون. بەپێچەوانەوە لە شەڕی نێو شارەکاندا شارەزایی تەواویان نەبوو. ئەو بەربەستە گڵەی لە کۆڵانەکەدا دروستیان کردبوو، دەبوو بەرزتر بووایە. بەربەستەکە نەدەبوو لە سێ مەتر کەمتر بووایە. ماشێنە بۆمبڕێژەکە بەخێراییەکی زۆر هاتبوو بەسەر بەربەستەکەدا سەرکەوتبوو. هاتبووە کۆڵانەکەوە و لە پێش بارەگاکەدا خۆی تەقاندبووەوە. هەر هەمان ڕۆژ و لەهەمان کاتدا دوو تەقینەوەی دیکەی گەورە لە قەرەتەپە ڕوویاندا. یەکێکیان لە نێو بارەگای کۆمیتەی یەکێتیی‌دا بوو، ئەوی دیکەشیان لە بارەگای ئاسایشی قەرەتەپە بوو. ئەو ڕۆژە، بە کۆی گشتی بەهۆی تەقینەوەکانەوە نزیکەی حەفتا شەهید و بریندار هەبوو.

تەها، بەبێهۆشی گەیەنرایە نەخۆشخانەی کفری، نەخۆشخانەکە برینداری زۆری لێ بوو. هەر دوای تەقینەوەکە هەواڵەکە لە تەلەفزیۆن بڵاو کرایەوە. هەموو لایەک هەواڵی تەقینەوەکەیان بیست. زوبێدەش بەهۆی تەلەفزیۆنەوە هەواڵەکەی زانی بوو. بەڵام هەواڵی تەهای نەدەزانی. نەیدەزانی بریندارە یان شەهیدە. هەر بە زوویی بە مۆبایل تەلەفۆن بۆ تەها دەکات، تەهاش مۆبایلەکەی لەژێر بینا ڕووخاوەکەدا جێما بوو. زەنگ دەڕۆیشت بۆ مۆبایلەکەی، بەڵام کەسێک نەبوو وەڵام بداتەوە. زوبێدە دەزانێت تەها تووشی کارەساتێک بووە. هەر بۆیە تەلەفۆن بۆ حامیدی حاجی ڕەسوڵی پوورزای دەکات، دەڵێ فریای تەها بکەوە، بارەگاکەیان تەقیوەتەوە و مۆبایلەکەشی هەڵناگرێت. ئەویش دەڵێت من لە کەلارم، لێی نزیکم ئێستا دەڕۆم بۆلای.

تەها لە نەخۆشخانەی کفری هۆش خۆی هاتەوە. کەسێک پێی گوت ژمارەی کەسێکمان بدەرێ با تەلەفۆن بۆ خزم و کەسەکانت بکەین و هەواڵی تۆیان پێ ڕابگەیەنین. تەهاش ژمارەی ساڵح بێچار و حاجی عومەری ئامۆزای پێدان و هەواڵی بریندار بوونی تەهایان بە ئەوان ڕاگەیاند. بریندارەکان یەکجار زۆر بوون، ئامبولانس فریایی ئەو هەموو بریندارانە نەدەکەوتن. تەهایان خستە دوای پیکابێکەوە و بەڕێیان کرد بۆ نەخۆشخانەی کەلار. لە نەخۆشخانەکە دایانگرت تا بەزوویی بە ئامبولانس بەڕێی بکەن بۆ نەخۆشخانەی شۆڕش لە سلێمانی. بەڵام لەوێش ئامبولانس نەبوو. تەها، کاتێک چاوی کردەوە، بینی حامیدی پوورزای بەسەر سەریەوە وەستاوە. ئەویش زانی ئامبولانس دەستناکەوێت بەزوویی تەهای کردە ماشێنەکەی خۆیەوە و بەرەو سلێمانی بەڕێکەوت و گەیاندیە نەخۆشخانەی شۆڕش.

زوبێدە و شەمسە و تەواوی خزم و کەسوکار و هاوڕێیانی تەها بەزوویی خۆیان گەیاندە نەخۆشخانەی شۆڕش. تەها بێهۆش لە نەخۆشخانە کەوتبوو. بە نەمان و لەناوچوونی سەدام ژنانی کورد ئاهێکی ئاسوودەییان هەڵکێشا، وایاندەزانی ئیتر شەڕ و کوشتار وماڵوێرانی کۆتایی هاتووە. ئەوان چەند ساڵێک بە ئارامی دەژیان. لەپڕ داعش وەک بەڵایەک لەسەر زەوی پەیدابوو. داعشەکان زۆر لە سەدام خراپتر بوون. سەدام تاوانەکانی بەناوی حیزبی بەعس و پێشکەوتنەوە ئەنجام دەدا، بەڵام داعشەکان تەواوی تاوانەکانیان بەناوی خوداوە ئەنجام دەدا. ئەو بەرنامەیە خراپترین بەرنامەی

سەرڕووی زەوییە. دیکتاتۆر و پیاوکوژەکانی وەک کۆمۆنیستەکان و فاشیستەکان و نازییەکان، بەناوی یەک ئایدیۆلۆژیاوە تاوانکارییان دەکرد. بەڵام داعشەکان بەناوی خوداوە، تاوانیان ئەنجام دەدا. هەر تاوانێکیشیان بە یاسای خودا ناودەبەن. بۆ هەر تاوانێکیش کە ئەنجامی دەدەن داوای بەهەشت لە خودا دەکەن. ئەوان لەو باوەڕەدان بە سەربڕینی خەڵک دەچنە بەهەشت. بە هێرشی خۆکوژیی لەنێو بازاڕ و شوێنە گشتییەکان و بە کوشتنی منداڵی شیرەخۆرە و ژنانی دوگیان و پیاوی پیر، دەچنە بەهەشت. ئەوان کوشتنی خەڵکی بێتاوان بە ڕێگای گەشتن بە بەهەشت دەزانن. داعش و بیرکردنەوەی داعش، ترسناکترین بیرکردنەوەیە لەسەر ڕووی زەویدا. تاوانکردن بەناوی خوداوە، واتە پاککردنەوەی تاوانەکانیان.

برینداربێکی زۆر گەیەنرابوونە نەخۆشخانە. تەها لە نەخۆشخانە کەوتبوو، زوبێدەی خەمبار و ئازا بەردەوام بەدیار هاوسەرەکەیەوە بوو. منداڵەکان زۆر لە خەمی باوکیاندا بوون. شەمسە زۆر خەمی براکەی بوو، ئەو شێرەژنە بەو هەموو خەم و نیگەرانییەوە هاتبوو بۆ سەردانی براکەی. شەمسە تەمەنی شەست ساڵ بوو، خەمی دەیان کەسی لە کەسە نزیکەکانی لە دڵدا بوو. ئامینەی غەمبار ڕۆژانە سەردانی نەخۆشخانەی دەکرد، ئەو بەکوڵی خەمەوە سەردانی کوڕەکەی دەکرد، کوڕێک کە لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوو ببووەوە. حاجی عەبدوڵڵای باوکی تەها لە ساڵی ٢٠١٠ کۆچی دوایی کرد بوو، باوکی نەمابوو تا شاهیدی ئەو بەڵا گەورەیەش بێت.



تەها سێکانیانی بە برینداری دوای تەقینەوەی بارەگاکەیان لە قەرەتەپە ڕۆژی ٢٠١٤/١٠/١٢
نەخۆشخانەی شۆڕش لە سلێمانی – فۆتۆ ساڵح بێچار

ئەوە دوایین جار بوو کە تەها بڕوا بۆ بەرەی جەنگ. واتە لە دوای داعش ئیتر شەڕ نەما و کۆتاییهات. چی لەوەباشتر کە هەرگیز شەڕنەبێت. تەها لە نەورۆزی ساڵی ٢٠١٩ بە منی گوت: ئیتر تەمەنم وا بۆ شەست ساڵ دەچێت، سوپاس بۆ خودا کە ئیتر شەڕ نییە و وڵات هێمن و ئارامە. وەلێ تەها و هەزاران کوردی ئازا و دلێری دیکە نیگەرانن، نیگەرانن لە توندڕەوانی چەپ و ڕاست. بەڵام گەورەترین نیگەرانی ئەوان نیگەرانییە لە توندڕەوە ئیسلامییەکانی نزیک لە داعش و قاعیدە. لە کوردستانی عێراق، لەگەڵ هەر کەسێکدا قسەم کردووە، دەیگوت نیگەرانی ئێمە لە ئیسلامییە توندڕەوەکانی وەک داعشە. لە شەقامەکانیشدا دەتوانرێت پاشماوەی توندڕەوەکان ببینێت. لەنێو بازاڕ و شەقامەکانی سلێمانی‌دا هەندێک گەنج و لاو دەبینرێت کە لە ڕوخسارياندا دیارە لەسەر چی بیروباوەڕێکن. گرنگترین کار کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت ئەنجامی بدات، پەروەردە و ڕووناکبیرییە.

ڕووناکبیریی و تەنها ڕووناکبیریی هۆکارە بۆ برەودان بە کەلتووری مرۆڤایەتی و مرۆڤدۆستی. برەودان بە ئاشتی و ڕێکەوتن و دۆستایەتی، هاوژینی و پێکەوە ژیان، گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە. تەنانەت ڕووناکبیرکردن لە دروستکردنی ڕێگاوبان و قوتابخانە و نەخۆشخانە گرنگترە. چونکە ئەگەر توندڕەوەکان دەسەڵات بگرنە دەست، هەرچییەک کە بنیادنراوە ئەوان تێکیدەدەن یان بەهۆی جەنگەوە تێکدەچێت. مەگەر سەدام بۆخۆی چی کرد؟ هەرچییەک کە بنیادی نابوو، بەهۆی ئەو جەنگەوە کە بەرپایکرد، لەناوچوون. هەموو کەسێک و بەتایبەت لاوان دەبێت بزانن کە ئەم ئازادی و ئاسایشەی ئەمڕۆ، لە کوردستانی عێراق هەیە، بە چ نرخێک بەدەستهاتووە. پێویستە بەچاوێکی کراوەوە ئاگاداری کاری توندڕەوەکان بن، چونکە ئەوان وەک خۆرکە و مۆرانە دەچنە نێو کۆمەڵگەوە. ئەوان لە قوتابخانە و شوێنە گشتی و تایبەتییەکان و دامەزراوەکاندا کاری مێشک شۆرینی منداڵان دەکەن. وتەی جوانیان بۆ باس دەکەن، باسی خودا و بەهەشتیان بۆ دەکەن، بەڵام کردەوەکانیان شەیتانی و دۆزەخییە.

ئەگەر گەشە و خزمەتگوزارییەکان ئاوێتەی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی نەبن، ئەگەر گەشەسەندن تێکەڵ بە ناکۆکییە چینایەتییەکان کرا، ئەوکات کەشێکی لەبار بۆ توندڕەوی دەخوڵقێت. من لە نەورۆزی ٢٠١٩ دا سەردانی دوورترین گوندەکانی کوردستانی عێراقم کرد، لەو گوندە دوورانەدا دەیان ماشێنی مۆدێل بەرزم بینی. خەڵکی کوردستان خەریکە دەوڵەمەند دەبن، پێویستە ئاگاداربن لەسەر ئەم سامانەی هەیانە، هەژاریی بەرهەم نەهێنن. هەژاری و ناکۆکی چینایەتی، باشترین پێگەی گەشەی بیری توندڕەوییە. زۆرێک لە وڵاتان لەپاڵ گەشە و پێشکەوتندا هەژارییان بەرهەمهێناوە. پێشکەوتن سەرەتایەکە بۆ جەنگ و شۆڕش، ئەگەر دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بەدی نەهاتبێت.



ساڵح بێچار و تەها سێکانیانی نەخۆشخانەی شۆڕش لە سلێمانی - ٢٠١٤/١٠/١٣

### چەکی دانا و قەڵەمی هەڵگرت

ساڵی ٢٠٢٠ تەها تەمەنی بوو بە شەست ساڵ، ئێستا ئاشتی بەرقەرارە، تەها چەکی داناوە و قەڵەمی هەڵگرتووە. ئەو فارسییەکی باش دەزانێت و کتێبی زۆری خوێندووەتەوە. کتێبەکانی "شازادەی حەمام" ی وەرگێڕاوەتە سەرزمانی کوردی سۆرانی. هەروەها کتێبەکانی "شا عەباس و پینەچی" و "مەزهەبی عیشق" یشی وەرگێڕاوە. ساڵح بێچار هاوڕێی دێرینی، هاوکاری ئەو دەکات لە وەرگێڕاندا؛ بەڵام تەها وەک پێشمەرگەیەکی دێرینی بە ئەزموون هیچ کات چەکەکەی لە خۆی جیا ناکاتەوە. بەردەوام دەمانچە و کلاشینکۆفی لایە. پێشمەرگەی دێرین و بە ئەزموون بەدووری نازانن لەهەر کاتێکدا، داعشی تازە دەربکەون. دەیان هەزار قارەمانی کورد چەکدارن، بۆ بەرگریکردن لە ئاشتی و ئازادی. تەها دەیگوت لە کوردستاندا چەک زۆرە. نەدەبوو چەک هێندە زۆر بێت. ئەو لایەنگری داماڵینی چەکە. دەیگوت دەبێت بەردەوام ئامادەبین، بەڵام دەبوو چەکەکان لە جبەخانە بوونایە نەک لە ماڵی خەڵکیدا. تا ئەو ڕۆژەی چەکداماڵینی گشتیی، دەچەسپێت، تەها پارێزگاری لە چەکەکەی خۆی

دەکات. بەڵام بە قەڵەم کاردەکات. ئەو دەڵێت پێویستە من کاری فەرهەنگی بکەم، پێویستە ئەو کتێبانە بە چاپ بگەیەنم کە دژی شەڕن، کتێبی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە. کتێبێک کە کاریگەری هەبێت بۆ بەرزڕاگرتنی ناسنامەی کورد و کوردستان.

## دووهاوسەری نموونەیی

هەندێک ژن و مێرد، بەهۆی کێشەیەکی بچووکەوە ڕوودەکەنە دادگا و لەیەکدی جیادەبنەوە. ژیانی زوبێدە و تەها، نموونەیەکە بۆ نەوەی نوێ. تەواوی ئەو نەهامەتیانەی لەم جیهانەدا هەن، بەسەر ئەم دوو هاوسەرەدا هاتووە. هەژاری و بێپارەیی، دەربەدەریی، زیندان، ئەشکەنجە، شەهیدبوونی کەسوکار، کەمئەندامی، برینداربوون، نەخۆشی، ئاوارەیی وڵاتان، پیادەڕۆیی بەنێو بەفر و سەهۆڵبەنداندا، هیچ یەکێک لەم کێشە و دەردیسەریانە، ئەم دوو هاوسەرەی پەلکێشی دادگا نەکرد. هەرگیز زوبێدە ڕەخنەی لە تەها نەدەگرت، کە بۆچی ئەم کارەت کرد و ئەو کارەت نەکرد. زوبێدە لە ئاوەرەییدا شەوانە تاکو بەربەیان، کاری بەرگدروونی دەکرد، تا کۆمەکی خەرجی خێزانەکەی بکات. کاتێک کە هاوسەری لە بەرەکانی جەنگ بوو سەرپەرشتی منداڵەکانی دەکرد. ئاگاداریی هاوسەرە یەک قاچەکەی دەکرد. تەهاش زوبێدەی خۆشدەویست، ئەو هەمیشە ئاگاداریی زوبێدەی دەکرد. تەها بەردەوام ڕێز لە هاوسەری خۆشەویستی دەگرێت، ڕێز لە کچی خاڵی دەگرێت، ڕێز لە خوشکی شەهید زرار و شەهید زوهێر دەگرێت.

ئەو هاوسەرانەی بە خاتری ماشێنێک یان ژەمەخواردنێک، پێکەوە شەڕ دەکەن، بڕوانن و بزانن زوبێدە و تەها، چۆن پێکەوە ژیاون. ئەو هاوسەرانەی کە بەهۆی کڕین و فرۆشتنێکی سادە یا بەهۆی کەمێک پارەوە، دەچنە دادگا، ببینن ئەوان کە عاشقی یەکدین، چۆن پێکەوە دەژین. چۆن ژیانی خۆیان بنیادناوە. چۆن لە بنیادنانی وڵاتی خۆیان و خزمەتی هاووڵاتیان و بنیادنانی مێژووی کۆمەڵگەی خۆیاندا بەشدارییان کردووە. تکایە بە خوێندنەوەی بەسەر هاتەکانی تەها و زوبێدە شەڕەکانتان ڕابگرن. کاتێک تەها کرێکاری دەکرد و بێپارە بوو، بە هێنانی بڵاوکراوە نهێنی و قەدەغەکان

گیانی خۆی دەخستە مەترسییەوە؛ زوبێدە دەیتوانی داوای جیابوونەوە بکات. کاتێک تەها بە پارەی کرێکاری کتێبی دەکڕی و بەبێ نان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، زوبێدە دەیتوانی لەگەڵیدا بەشەڕ بێت. کاتێک تەها لە زیندان بیست ساڵ حوکمی بەسەردا درا، بە ئاماژەیەکی زوبێدە، دادگای سەدام بڕیاری جیابوونەوەی بۆ دەردەکردن. زوبێدە، عاشقی تەها بووە و هەیە. هیچ شتێک ڕێگری ژیانی هاوبەشی ئەوان نەبوو. سەربووردەی کەسانی وەک تەها و زوبێدە لە سەربووردەی لەیل و مەجنون، شیرین و خەسرەو، شیرین و فەرهاد و وامق و عەزرا کاریگەرتر و جوانتر و پڕ دەردیسەریترە. پێویستە فیلم لەسەر ژیانی ئەوان بەرهەم بێت، سینەماکاران باشتر دەتوانن هەستی مرۆڤەکان نمایش بکەن.

# بەشی دووەم
# شرۆڤەیەک بۆ گەشتەکەم

مانگی «ئوردیبەهەشتی ١٣٩٦ - مایسی ٢٠١٧» لە نووسینگەی کارەکەم دانیشتبووم. زەنگی تەلەفۆن لێیدا، کەسێک بوو گوتی: من ناوم تەها سێکانیانییە و لە سلێمانییەوە هاتووم بۆ مەشهەد. ئەگەر کاتت هەبێت حەزدەکەم سەردانت بکەم. منیش پێیدەڵێم بەخێر بێیت. ناونیشانی دەدەمێ و دوای یەک کاتژمێر دوو پیاو کە تەمەنیان لە دەوروبەری پەنجا و پێنج ساڵیدا بوون گەیشتنە نووسینگەکەم. یەکێکیان خۆی پێناساندم، گوتی من ناوم «تەها عەبدوڵلا فەرەج»ە، ناسراوم بە تەها سێکانیانی. کوردم و خەڵکی گوندێکم بە ناوی سێکانیان لە کوردستانی عێراق، ئەم پیاوەش خاڵمە و ناوی عەبدوڵلای حەمەشوانە و فارسی نازانێت.

تەها، چاکەت و پانتۆڵی لەبەردا بوو، خاڵیشی جلوبەرگی کوردی. کاتژمێرێک پێکەوە گفتوگۆمان کرد. تەها زۆر باش بە فارسی قسەی دەکرد. ئەو گوتی پێشمەرگەی کەمئەندامە و ئێستا بە پلەی سەرهەنگ خانەنشینە. کەسێکی وریا و چالاکە، بەقاچێکی دەستکردەوە بە چل و دوو پلیکانەدا سەرکەوتبوو تا من ببینێت.

تەها، کتێبی "شـازادەی حەمام" ی خوێندووتەوە، دەڵێت هاورێیەکی بەناوی "فەرەیدوونی حەکیمزادە" کتێبی "شازادەی حەمام" ی پێداوە و پێی گوتووە ئەم کتێبە بخوێنەرەوە. فەرەیدوونی حەکیمزادە خەڵکی سەردەشتە و لە مهاباد دادەنیشێت. تەها کتێبەکەی خوێندووەتەوە، ئێستاش داوای مۆڵەت لە من دەکات تاکو کتێبەکە وەربگێرێتە سەر زمانی کوردی سۆرانی. تا ئێستا چەندین کەس هەوڵیان داوە کتێبەکە وەربگێرنە

سەر زمانی ئینگلیزی، بەڵام دوای ئەوەی "دە -پازدە" لاپەڕەیان لێ وەرگێراوە، دواتر گوتویانە کارێکی سەختە و وازیان لێهێناوە. منیش لەبەرخۆمەوە گوتم بەخودا ئەمیش هەر وەک ئەوانی دیکە دەبێت و دوای ماوەیەکی کەم وازی لێدەهێنێت. کێ تاقەتی ئەوەی هەیە ١٨٠٠ لاپەڕە لە چوار بەرگی کتێبێکی قەبارەگەورە وەربگێڕێت؟ ئەوە جگە لە خەرجی چاپ. گوتم: هیچ کێشە نییە، من مۆڵەتت پێدەدەم و تۆش کتێبەکە وەربگێڕە. لەکاتی قسەکردندا لەوە تێگەیشتم، تەها کەسێکی خوێندەوارە و هاوڕێیەکی باشی کتێبە. ئەو بڕوانامەی زانکۆی نییە؛ بەڵام کتێبی زۆر خوێندووەتەوە.

تەها زۆری خولک کردم کە بەماڵ و منداڵەوە بڕۆم بۆ سلێمانی و میوانی ئەو بم. منیش زۆرم خولک کردن کە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ میوانی من بن. بەڵام قبوڵیان نەکرد، ماڵاواییان کرد و ڕۆیشتن.

دوای چەند مانگێک، تەها زەنگی بۆ لێدام و گوتی: بەرگی یەکەم و دووەمی "شازادەی حەمام" وەرگێڕدراوە و چاپیشکراوە. کتێبەکەشی بۆ ناردم. دوای دە مانگ تەها زەنگی بۆ لێدام و گوتی: لە ئێرانە و دەیەوێت سەردانی هەموو ئەو شوێنانە بکات کە لە بەرگی سێیەمی "شازادەی حەمام" دا ناویان هاتووە. بەرنامەی گەشتەکەی بۆ شاری یەزد بە جۆرێک بوو کە هەمان ڕۆژ، من لە یەزد بووم و لەوێ یەکدیمان بینی. ئەو لە هۆتێلێک بوو، منیش کاتی نانی بەیانی گەیشتمە لای. کتێبەکەی وەرگێڕا بوو سالح بێچاری هاوڕێی، پێداچوونەوە و دارشتنەوەی بۆ کردبوو. هەر لەوێ تەها هەشت سەد دۆلاری لە هەقی نووسینی کتێبەکە پێدام. هەرچەند گوتم نامەوێت، بەڵام ئەو بە زۆر پارەکەی پێدام. ئەوە یەکەمین هەقی نووسین و خەرجی چاپکردنی کتێب بوو کە من وەرمگرتبێت. کێبەکەم لە "دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی پاپۆلی" چاپکرا بوو، دەزگاکە هی خۆمە، بەڵام هەقی نووسینی بە من نەدا. من ئەوەندە کتێب پێشکەش بە خەڵکی دەکەم کە بە هیچ جۆرێک پارەی خەرجی کتێبەکانم دەستناکەوێتەوە. هاوڕێکانم پێمدەڵێن کتێبەکانت زۆر باشن، کتێبێکمان بۆ بنێرە. ئەوان نازانن کە باشترین هاندانی نووسەرێک کڕینی کتێبەکانیەتی. هەڵبەتە هاوڕێیان، کتێبەکان بە ئەوانی دیکە دەناسێنن. ئێستا کە من ئەمە دەنووسم بەرگی یەکەم و دووەمی "شازادەی حەمام" سی و حەوت جار چاپ کراوەتەوە.

هەمان ڕۆژ، چوارشەممە "٢٣ آبان ١٣٩٧ – ١٤-١١-٢٠١٨" کە تەها لە یەزد بوو، ئەو ڕۆژە هەفتەی کتێب بوو. خاتوو "رقیه دوست فاتمی‌ها" بەڕێوەبەری گشتی کتێبخانەکان، بەبۆنەی ڕۆژی کتێبەوە منی بۆ پێشکەشکردنی وتارێک بانگهێشت کردبوو. منیش تەهام لەگەڵ خۆمدا برد بۆ ئەو سیمینارە. هەر لەوێ تەها لەلایەن جێگری پارێزگاری ئەوکاتە و پارێزگاری ئێستا بەڕێزد دکتۆر محەمەد عەلی تالبی و بەڕێوەبەرانەوە ڕێزێکی زۆری لێگیرا و خەڵاتی ڕێزلێنانی پێشکەش کرا. ئەو ڕۆژە لە یەزد ماڵئاواییم لە تەها کرد. ئەو ڕۆیشت بۆ مەشهەد. لە مەشهەدەوە ڕۆیشت بۆ قوچان، شێروان، بوجنورد و قورەمەیدان. دوای چەند مانگێک تەها بەرگی سێیەمی شازادەی حەمامی بە زمانی کوردی و بە دیزاینێکی جوان و کاغەزێکی باشەوە بۆ ناردم. بەڕاستی تەهاش وەک هەموو کوردەکان کەسێکی ڕاستگۆ و سەرڕاستە، کەسێکە دەتوانرێت پشتی پێببەسترێت.

## گەشت بۆ سلێمانی

تەها، زەنگی لێدا و منی بە ماڵ و منداڵەوە بانگهێشت کرد بۆ شاری سلێمانی. بڕیارماندا بۆ پشووی نەورۆزی ساڵی ٢٠١٩ بڕۆین بۆ سلێمانی. تەها گوتی: خانوویەکی سێ نهۆمی هەیە، نهۆمی سێیەمی بۆ ئێمە تەرخانکردووە. ماشێنی تۆیۆتای دوو کابینەیی هەیە. گوتی کە دێتە مەرزی "باشماخ - مەریوان" بەشوێنماندا. گوتی کاتێک ئێمە لە سنوور دەپەڕینەوە، ئەو چاوەڕێمانە.

بڕیارماندا من و دکتۆر فاتیمەی وسۆقی هاوسەرم و فەربورد پاپولی یەزدی کوڕم، بڕۆین بۆ سلێمانی. تەها پێی گوتبووین لەسەر مەرز، ڤیزا دەدرێت. ئەو لەسەر مەرز ڤیزای بۆ وەرگرتین. ئێمە وا بەنیازبووین، بە ڕۆیشتن و هاتنەوە تەنها هەفتەیەکمان پێبچێت. جۆرێک گەشتەکەمان ڕێکخست بوو کە دووەم ڕۆژی نەورۆز بگەڕێینەوە بۆ ئێران. وا بڕیار بوو لە مەشهەدەوە بە فڕۆکە بڕۆین بۆ سنە و لەوێوە بڕۆین بۆ مەریوان؛ بەڵام لە مەشهەد بۆ سنە، فڕۆکە نەبوو. دەبوو لە مەشهەدەوە بچین بۆ کرماشان و لەوێشەوە بە ماشێن بڕۆین بۆ سنە و مەریوان. دواتر بڕیارماندا

لە مەشهەدەوە تاکو مەریوان بە ماشێنی خۆمان برۆین. ڕێگا دوورە، بەڵام دەڕۆین. بەرنامەی ڕۆیشتنمان دانا. بڕیار بوو شەوی یەکەم لە سمنان بمێنینەوە. شەوی دووەمیش لە سنە. ئامادەکردنی پێداویستییەکانی گەشتەکەمان خستە ئەستۆی فەربورد. فەربورد خوێندکاری زانکۆیە. خوێندکاری ئەندازیاری ئاوە لە زانکۆی فیردەوسی مەشهەد. کاتی ڕۆیشتنمان قۆناغی یەکەمی زانکۆ بوو. نووسراوی فەرمی لە زانکۆ وەرگرت و بردی بۆ فەرمانگەی پاسپۆرت. دەبوو بارمتەیەک دابنێت، تاکو بتوانێت بچێتە دەرەوەی وڵات. فەربود بە زوویی کارەکانی ئەنجامدا. هەموو شتێک ئامادە بوو. ڕۆژی ٢٠١٩/٣/١٤ کاتژمێر ٨ ی بەیانی لە مەشهەد بەڕێکەوتین. کەشوهەوا خۆش بوو. بڕیارمان دابوو کە شەو گەیشتینە شاری سمنان، لەوێ میوانی هاوڕێی بەڕێز و خۆشەویستم عەلی ڕەزای شاحوسێنی بین. یادەوەریی سمنان و سەردانی شوێنی دابەشکردنی ئاوی ڕووبار و خواردنی ساردەمەنی لە شەهمیرزاد و ڕێز و میوانداریی دکتۆر عەلی ڕەزای شاحوسێنی و هاوسەری بەڕێزییان لە شوێنێکی دیکە دەنووسم.

ڕۆژی دواتر گەیشتینە سنە. تێپەڕین لە شەقامە بازنەییە نوێکەی باشووری تارانەوە زۆر ئاسانکاری بوو. ڕێگا تازە و فراوانەکەی نێوان تاران و هەمەدان گەشتەکەی بۆ ئاسانترکردین. ئەگەرچی دووری ڕێگاکە شەکەتی کرد بووین، بەڵام بینینی شاری ساوە و شارەکانی دیکەی سەرڕێگا ماندوێتی لەبیر بردینەوە.

مامۆستا شەریفی تەهمورس نەژاد لە شاری سنە، کەسێکی بەڕێز و خۆشەویستە. کەسێکی زانا و شارەزایە. نموونەی کوردێکی تەواوە، حەز بە دۆستایەتی و میوانداریی و پێکەوە ژیان دەکات. سینەی پڕە لە مێژووی کورد و کوردستان و مرۆڤدۆستی. ئەویش کتێبی "شازادەی حەمام"ی خوێندووەتەوە.

ساڵی ٢٠١٠ زەنگی بۆ لێدام و هانیدام بۆ نووسینی زیاتر. بانگهێشتی شاری سنەی کردم و فەرموویان بەخێزانەوە وەرن بۆ شاری سنە. زۆر جار زەنگ بۆ یەکدی لێدەدەین و بە یەکەوە گفتوگۆ دەکەین. باسی بەسەرهاتەکان و نوکتەکانی کتێبی "شـازادەی حەمام" دەکەین. ئەو لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٥ ـە، مامۆستای ئامادەیی بووە. ئێستا خانەنشینە. بەکالۆریۆسی یاسای لە زانکۆی تاران وەرگرتووە.

شارەزاییەکی زۆری هەیە لە هۆنراوە و ئەدەبیاتی فارسیدا. ساڵی ٢٠١٦ کۆنگرەی ئەنجومەنی جیۆپۆلەتیکی ئێران لە شاری سنە بەڕێوەچوو. لەگەڵ هاوڕێی بەڕێز و خۆشەویستم دکتۆر یەدوڵڵای کەریمی پور، ڕۆیشتین بۆ سەردانی مامۆستا شەریفی تەهمورست نەژاد. هاوسەری بەڕێزیان خانم شەهێنی سوری بە میهرەبانییەکی زۆرەوە پێشوازی لێکردین. کاتەکەمان کەم بوو، بەڵام لەو کاتە کەمەدا سوودێکی زۆرم لە وتەکانی ئەو پیاوە وەرگرت. چوار ساڵ دوای ئەو گەشتە بڕیارماندا شەو میوانی ئەوان بین.

دەوروبەری کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆی ڕۆژی ٣/١٦ /٢٠١٩ لەگەڵ مامۆستا شەریف، "مەیدانی ئیقبال - ئازادی" سنەمان دیاری کرد کە یەکدی ببینین. لە کات و شوێنی دیاریکراودا مامۆستا لەسەر گۆڕەپانەکە وەستابوو، چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد، ئەو ئێمەی برد بۆماڵی خوشکەکەی و لە ماڵی ئەوان میوانداریی لێکردین.

دیار بوو کە هاوسەرەکەی زۆر نەخۆشە، لە نەخۆشخانە خەوێنراوە و لە باری بێهۆشیدایە. نەخۆشی جگەری هەبوو. مامۆستا شەریف زۆر لە خەمی هاوسەرەکەیدا بوو، هەر بۆیەش ئێمەی برد بۆ ماڵی خوشکەکەی. من لە میوانداریی ئەو ماڵە بەڕێزە شەرمەندە بووم. کوڕەکانی مامۆستاش، کامەران و کەیوان نیگەرانی دایکیان بوون. ویستم پێیان بڵێم مۆڵەتم بدەن و نەبم بە بارگرانی بەسەر ئەوانەوە؛ بەڵام چەسارەتم نەکرد. کەسێک کە دەچێتە ماڵە کوردێک ناکرێت بڵێت دەڕۆم. کوردەکان میواندۆستترین خەڵکی سەر ڕووی زەوییین. خوشکەکانی مامۆستا شەریف زۆر میهرەبان و میواندۆست بوون. هەستم کرد بە دانیشتنی زۆر لە ماڵەوە، دەبمە ئەرکێکی زیاتر بۆ ئەوان، هەر بۆیە بە بیانووی چوونە بازاڕ ڕۆیشتمە دەرەوە، تاکو ئەوانیش کارەکانی ناو ماڵیان باشتر ئەنجام بدەن.

مۆڵەتم وەرگرت و سەردانێکی ناو شارم کرد. شاری سنەی جوان، زۆر گەورە بووە. شارێکی هەڵکەوتوو لە دامێنی چیا و گردی ڕەنگیندا. سنە شارێکە نموونەی جوانییە. دانیشتووانەکەی زۆر میهرەبان و خۆشەویستن. شەقامەکانی زۆر خاوێنە. لەسەر شەقامێک دەوەستم و لەگەڵ ڕێبوارانداا دەکەومە گفتوگۆ. هەموویان بە میهرەبانییەوە وەڵامم دەدەنەوە بە گشتی لەگەڵ هەشت کەسدا گفتوگۆم کرد. هەر

هەشت کەسەکە هاوسەریان لەگەڵدابوو. دەوەستن و وەڵامم دەدەنەوە. هەموو خوڵکم دەکەن تا لەگەڵیاندا بڕۆمەوە بۆماڵەوە. خوڵکەکەیان لە دڵەوە بوو. ئەگەر لەگەڵیاندا بڕۆشتمایەوە، زۆر خۆشحاڵ دەبوون. خوڵکەکەیان بەڕاستی و میهرەبانانە بوو. ئێستاش زۆرێک لە دانیشتووانی شارەکە جلوبەرگی جوانی کوردی دەپۆشن. ئەو جلوبەرگە هەم جوانە و هەم ناسنامە و کەلتووری کورد و ناوچەکەیە. سنە، دڵی کوردستانە. ئەم شارە، ڕۆڵێکی گرنگی لە بڵاوکردنەوەی کەلتووری کورد لە هەموو ئێران و ناوچەکەدا هەیە. زانکۆی سنەش ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە پەیوەندی بە تەواوی زانکۆ کوردییەکانی دیکەوە، لە نێویاندا زانکۆی سلێمانی. خەڵکی سنە ڕۆڵی گرنگی خۆیان لە بڵاوکردنەوەی کەلتووری ڕەسەن و ناسنامەی کوردیی، تێدەگەن.

ئێمە هەموو نیگەرانی تەندروستی هاوسەری مامۆستا شەریف بووین. ئەو لە یەکەی چاودێریی چڕ (ICU) خەوێنرابوو. سەردانی قەدەغە بوو. گەڕامەوە بۆ ماڵی خوشکی مامۆستا شەریف. بۆ نانی ئێوارە، مامۆستا شەریف و کوڕ و بووک و نەوەکانیشی هاتن. ئێمە داوای لێبوردنمان لێ کردن. گوتمان ئێوە نەخۆشتان هەیە و ئێمەش بووین بە ئەرک بۆتان. بە میهرەبانییەوە گوتیان: نەخۆشەکەمان لە یەکەی چاودێریی چڕ خەوێنراوە. ناتوانین هیچی بۆ بکەین. ئەوەندە بەسە بۆ میهرەبانی کوردەکان، پیاوی میهرەبان هاوسەرەکەی لە نەخۆشخانەیە. کوڕە میهرەبانەکانی قەدری دایکیان باش دەزانن. یەکێکیان لە نەخۆشخانە بوو. ئەوانی دیکەشیان میوانداریيان دەکردین.

بەیانی زوو، بەرچایی ئامادە کرابوو، خوان ڕازابووەوە. شلیک لەسەر خوان دانرا بوو. لە کاتی گفتوگۆدا لە مامۆستا شەریفم پرسی دەزانیت کێ شلیکی هێناوەتە سنە؟ (زیاتر لە٧٥% ی شلیکی ئێران لە پارێزگای سنە بەرهەمدێت) لە وەڵامدا گوتی: ساڵی ١٩٥٨ سەردەمی کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم، شێخ عوسمانی نەقشبەندی لە عێراقەوە هات بۆ سنە. شێخ عوسمان ساڵی ١٨٩٦ لە گوندی سەفی ئاوای ناوچەی جوانڕۆی پارێزگای کرماشان هاتۆتە دونیاوە. شێخ عوسمان لە عێراق دەژیا، دوای کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم، هاتەوە ئێران و لە گوندی دوڕووی سەروئاوا لە پارێزگای سنە، نیشتەجێ بوو. هەر لەو گوندە برەویدا بە چاندنی شلیک. ئەم بەرهەمە، کەم کەم بە هەموو دێهاتەکانی سنەدا بڵاوبووەوە بەتایبەتی ناوچەی هەورامان. شێخ

عوسمان بووە هۆی ئەو خێر و بەرەکەتە. شێخ عوسمان دواتر چووە ئیستەمبوڵ. لە ئیستەمبوڵ خانەقایەکی دروست کرد و مورێدێکی زۆر لە دەوری کۆبوونەوە. ئەو دەستپێشخەری چەندین کاری خێرخوازی بوو. لە مانگی (بهمن ۱۳۷۵ - شوباتی ۱۹۹٦) و لە تەمەنی سەد و یەک ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و لە خانەقاکەی خۆیدا بەخاک بسپێردرا. شێخ عوسمان لە نێو کوردەکان و تورکمانەکاندا، مورێدێکی زۆری هەیە. هەندێک لە مورێدەکانی پێیان باش بوو تەرمەکەی بهێنرێتەوە بۆ ئێران.

دوای نانی بەیانی، ماڵاواییمان لە ماڵی مامۆستا شەریف کرد و بەرەو مەریوان بەڕێکەوتین. جادەی مەشهەد بۆ سنە، زۆر باش بوو. هەمووی دوو ساید یان پان و فراوان بوو. بەڵام جادەی سنە بۆ مەریوان زۆر خراپ بوو. جادەیەکی تەسک و باریک و قەرەباڵغ بە ماشێنی بارهەڵگری گەورە. جادەکە ترانزێتی بوو. لەسەر مەرز، لە کارمەندێکی گومرگم پرسی: ڕۆژانە چەند بارهەڵگر لەم مەرزەوە تێپەڕ دەبێت؟ گوتی زیاتر لە پێنج سەد بارهەڵگر لە بەندەرەکانی باشووری ئێرانەوە دێن و بەرەو کوردستانی عێراق دەڕۆن، کاڵا دەبەن و کاڵای دیکە دەهێننەوە. بەڕاستی جادەی سنە - مەریوان، جادەیەکی خراپ و مەترسیدارە. جادەیەکی پێچاوپێچ و ناخۆشە. نێوانی سنە و مەریوان نزیکەی سەد و سی و پێنج کیلۆمەترە؛ بەڵام هیچ کەسێکی ژیر ناتوانێت ئەو ماوەیە بە کەمتر لە سێ کاتژمێر ببڕێت. هەوراز و نەدیوە پێچاوپێچەکان، هۆکاری هێواشبوونەوەی ماشێنن. جادەکە مەترسیدارە؛ بەڵام سروشت و دیمەنی جوانی ناوچەکە و گوندەکانی سەرڕێگا، کە زۆربەیان بەشێوەی پلیکانەیی دروستکراون، سەرنجڕاکێشن. هەر ئەم سەرنجڕاکێشانە زۆر جار دەبێتە هۆکاری گیانلەدەستدانی شۆفێرەکان. پێویستە ئەو ڕێگایە بکرێتە دوو ساید. ئەگەرچی لە ئێستادا لە نزیک سنەوە کار لەسەر دوو ساید و فراوانکردنی جادەکە دەکرێت.

لە نێوان ڕێگادا، دەگەینە شارۆچکەی "نگل". شارۆچکەیەکی بچووکی جوان و ئاوەدان. دەبوو، لەو جادە پڕ پێچ و بارهەڵگرەدا، کەمێک پشوو بدەین. لە بەردەم چایخانەیەکدا وەستاین. کورسی و مێز و پیاڵە و قۆری چایخانەکە زۆر خاوێن بوون. لەم شارۆچکەیەدا مزگەوتێکی بەناوبانگ هەیە بەناوی مزگەوتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، یان مزگەوتی نگل. لەنێو مزگەوتەکەدا قورئانێکی دەستنووس هەیە

که مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بە سەردەمی خەلیفەی سێیەمی موسڵمانان. سەردانی مزگەوت و قورئانی پیرۆزم کرد. مەلای مزگەوت لەوێ بوو، هەندێک باسی ئەو قورئانەی بۆ کردین. مزگەوتەکە زۆر پاک و خاوێن بوو. فەرشی جوان و بەنرخی تێدا ڕاخرابوو. خەڵکی نگل، زۆر باش پارێزگاری لەو قورئانە پیرۆزە دەکەن.

لە چایخانەکە، چا دەخۆینەوە و بەڕێدەکەوینەوە. تا ئەو شوێنە، داربەڕووەکان کەم و تە نک بوون. بەڵام لەوێوە بەرەو مەریوان دارستانەکان چڕترە. جادەکەش بەرەو بەرزی و بەرەو کوێستان دەڕوات. ناوە، ناوە جادەی دیکە لە جادە سەرەکییەکە جیادەبێتەوە و بەرەو گوندەکان دەڕوات.

کێوەکانی سەر سنوور، بەفر داپۆشی بوون. ڕۆژی ١٦ ی ئازار بوو؛ بەڵام کەشوهەوا خۆش بوو. لە دامێنی جادەکەوە ڕووبارێک سەرەوخوار دەڕۆیشت. بەفر ئاوەڕۆچکەی کردبوو، هێواش هێواش دەتوایەوە. سەوزەگیا تازە سەری دەردەهێنا. ئەگەر کاتمان هەبووایە جار جارێک لە ڕێگادا دەوەستاین. هەر چەند کیلۆمەترێک و چایخانەیەک هەبوو. لای هەموو چایخانەکان نووسرابوو ماسیی برژاو ئامادەیە. ماشێنی بارهەڵگر زۆر بوون. قەمەرەش هەر زۆر بوون. ماشێنێکی پەیکان لە جادەکە لایدا هێندەی نەمابوو وەربگەڕێت. ئایا، ئەم هەموو ماشێنی پەیکانە، بەهۆی هەژاریی ناوچەکەوەیە؛ یاخود هۆکاری دیکەی هەیە؟ لە بەردەمی چایخانەیەکدا نووسرابوو: ماسی قزل ئالا -سەلەمۆن- ی چەم هەیە". هەرچەندە کاتەکە درەنگ بوو، لەو شوێنە وەستاین. خاوەنی چایخانەکە ژن و مێردێک بوون. کاتژمێر نزیکی ١٠:٣٠ پێشنیوەڕۆ بوو. پێمانگوتن ئێمە خواردن ناخۆین. ئەوان زانییان لە مەشهەدەوە هاتووین و دەڕۆین بۆ مەریوان. گوتیان: بۆ چاخواردنەوە میوانی ئێمە بن. مەبەستیان ئەوە بوو پارەی چامان لێ وەرنەگرن. زۆر کەم چایخانە هەیە، بێبەرامبەر چا بدەن بە ڕێبواران. ڕەنگە تەنها لە کوردستان ئەو چایچییانە هەبن. چەند ساڵ پێشتر لە مهابادەوە دەچووم بۆ سەردەشت. لە گەردەنەی زمزیران چایچییەک پارەی چای لێ وەرنەگرتم. کاتێک کە زانی لە مەشهەدەوە هاتووم و دەڕۆم بۆ سەردەشت، گوتی تۆ میوانیت و پارەت لێ وەرناگرم.

قسەم لەگەڵ ناسیاوێکی مەریوانیدا کردبوو. بڕیاڕ بوو ماشێنەکەمان لە ماڵی ئەوان جێبهێڵین. ناونیشانی ماڵەکەیانم نەدەزانی. وەڵامی تەلەفۆنیشی نەدایەوە. بۆ دۆزینەوەی، کاتژمێرێک بەنێو شاری مەریواندا گەڕاین. زۆر نیگەران بووم، کە بۆچی ئەم ناسیاوە بەڵێنەکەی خۆی فەرامۆش کردووە؟ بەڵام چارەیەک نەبوو دەبوو بڕۆین. تەها لەسەر سنوور چاوەڕێمان بوو. لە مەریوان بەدوای گەراجێکدا گەڕایین، تاکو ماشێنەکەمانی لێ ڕابگرین. پرسیارمان لە چەند کەسێک کرد، ئەوان پێشنیازی گەراجێکیان بۆ کردین لە بازاڕی خورشید. دواجار بازاڕی خورشیدمان دۆزییەوە، ماشێنەکەمان بردە گەراج و هەر لەوێ تەکسیەکمان بەکرێگرت. زۆر دەمێک بوو ئارەزووی ئەوەم هەبوو دەریاچەی زرێبار ببینم، دەریاچەی زێبار کەوتۆتە نێوان شاری مەریوان و مەرزی باشماخەوە. من یەکەمجار لە ساڵی ١٩٨٦ ناوی دەریاچەی زرێبارم لە لایەن دکتۆر عەیوزی، مامۆستای جوگرافیایی زانکۆی تارانەوە بیست؛ بەڵام دەبوو بەزوویی بە کەناری دەریاچەکەدا تێبپەڕین. لە کاتی تێپەڕین بە کەناری زرێباردا، مامۆستایەکی ئەزیز و خانەنشینی زانکۆی تاران، دکتۆر فەرەجوڵڵای مەحموودی کەوتەوە یادم. پیاوێکی خەڵکی سنە، کە جێگەی شانازی جوگرافیای ئێران و زانکۆی تارانە. یادی هەموو ئەو کوردانەشم کردەوە کە بەدرێژایی ژیانم ناسیومن.

مەرزی باشماخ، مەرزێکی فەرمی نێوان عێراق و ئێرانە، لە کوردستان. بەهۆی دواکەوتنمانەوە لە مەریوان؛ دەبوو بە زوویی بگەینە سەرسنوور. تەها لە سەرسنوور چاوەڕوانمان بوو. نێوان مەریوان و باشماخ، نزیکەی بیست کیلۆمەترە. لە دوورەوە دیاربوو کە سنوور زۆر جەنجاڵە. ژمارەیەکی زۆر بارهەڵگر لەوێ بوو. شۆفێری تەکسیەکە زۆر شارەزا بوو. بەتەنیشت ڕیزی بارهەڵگرەکاندا تێپەڕی. گەیشتینە گومرگ و لە تەکسیەکە دابەزین. نزیکەی بیست و پێنج کەسی دیکە لە پێش ئێمەوە سەرەیان گرتبوو. سەرەی ئێمەش هات و پاسپۆرتەکانمان دایەدەست ئەفسەر. هەموو خەڵکەکەیان بەڕێکرد و ئێمەیان هێشتەوە. کیشە چییە؟ زەنگم بۆ تەها لێدا و پێم گوت: وا ئێمە گەیشتووینەتە سەر سنوور و پاسپۆرتەکانمان مۆر دەکەین. ئەفسەرێک ئێمەی برد بۆ لای لێپرسراوەکەیان، ئەفسەری فەرماندە گوتی: ئێوە پارەی

چوونەدەر لە وڵاتتان بە تەواوی نەداوە. ئێوە گوتوتانە دەڕۆین بۆ عێراق، کارمەندی بانک وایزانیوە ئێوە بۆ زیارەت دەڕۆن. بەڵام ئەم سنوورە سنووری گەشتیارییە. ئێوە دەبێت لێرە پارەی دیکە بدەن. سوپاس بۆ خودا کێشەکەمان تەنها پارە بوو. ڕۆیشتین پارەکەی ترمان دا و لە سنوور تێپەڕ بووین.

بە تێپەڕبوونمان لە سنووری ئێران، ئاڵای عێراق و ئاڵای هەرێمی کوردستان کە وێنەی خۆرێکی تێدابوو، کەوتە بەرچاوم. پێکەوە دەشەکانەوە. بە بینینی ئەو ئاڵایەی وێنەی خۆرێکی تێدا بوو، فرمێسک بە چاوانمدا هاتە خوارەوە. خۆزگە دەستم دەگەیشتە ئەو ئاڵایە و ماچم دەکرد. "با" ئاڵای هەرێمی دەشەکاندەوە. کەمێک لە هاوسەرم و فەربورد دواکەوتم. لە ڕاستییدا هەستم لای ئاڵاکە بوو. لە خۆم دەپرسی ئەم ئاڵایە بە چ نرخێک لێرە هەڵکراوە؟ لە هەمان کاتدا زۆر شت بە بیرمدا هات. پێناسەی حاڵی خۆم بە هۆنراوەیەکی شاملۆ دەردەبڕم:

**شەو کە جۆگەی زیوینی مانگەشەو**

**دەشت دەکاتە دەریاچەی بێهایان**

**من چارۆکەی کەشتی خەیاڵم**

**دەکەمەوە بۆ ئاراستەی با**

"با" یەک کە لەو ئاڵا پیرۆزەی دەدا، هاوکات لە هزر و بیری منیشی دەدا. لە یەک کاتدا، دەیان پرسیار، دەیان کتێب و فیلم دەهاتنە بەرچاوم.

هەر کە گەیشتینە بەشی کوردستانی عێراق، لە دوورەوە تەهام بینی. لەگەڵ "ڕووناک"ی ژنخوشکیدا چاوەڕوانی ئێمە بوون. تەها منی لە باوەش گرت. ژنخوشکەکەی پێناساندین. ڕووناک ژنێکی تەمەن مامناوەند و گۆشتن بوو. میهرەبانی لە ڕوخساری دەباری. هیچ فارسی نەدەزانی. من، هاوسەرم و فەربوردیش کوردیمان نەدەزانی. ڕووناک و تەها نزیکەی سێ کاتژمێر بوو، چاوەڕوانی ئێمە بوون. تەها ئێمەی برد بۆ بەشی کارگێڕیی سنوور. پاسپۆرتەکانی لێ وەرگرتین و دایەدەست کارمەندێک. چاوەڕێی وەرگرتنی ڤیزا بووین. لەسەر کورسی دانیشتبووین. تەها پارەی تێچووی ڤیزاکانی دا. هەرچەندە پێداگریمان کرد خۆمان پارەکە بدەین، بەڵام تەها قبوڵی نەکرد. بەهەموو مانایەک ئێمە میوان بووین. لە بەشی کوردستان ڕێگەیان

ئەدەدا ماشێنی تایبەتی بێتە ناوەوە. هەر گەشتیارێک کە ڤیزای وەردەگرت، دەبوو تەکسی بگرێت تاکو بچێتە دەرەوە؛ بەڵام تەها چون پێشمەرگە بوو، ماشێنەکەی خۆی هێنابووە ناوەوە. سواری تۆیۆتا دووکابینەکەی تەها بووین. من لە پێشەوە لەلای تەها دانیشتم. ڕووناک، فەربورد و هاوسەریشم لە دواوە دانیشتن. تەها، لە بەردەم دەروازەی سەرەکی باشماخ وەستا. دابەزی و چووە نێو ئۆفیسێک. لەو ئۆفیسە، دەمانچەکەی خۆی وەرگرتەوە. من دەمزانی کە تەها پێشمەرگەی خانەنشینە. بەڵام نەمدەزانی کە چەک هەڵدەگرێت. لەو کاتەدا بیرم بۆ ئەوە چوو، کە ڕەنگە هێشتا لە کوردستان ئاسایش بەرقەرار نەبێت. دەنا، بۆچی ئەم پیاوە چەک هەڵدەگرێت؟ وەک ئەوەی تەها نیگەرانی و پرسیار لە ڕوخساری مندا بەدی بکات. ڕوونکردنەوەی دا، کە ئاسایش بەتەواوی بەرقەرارە. بەڵام ئەو چەکدارە و مۆڵەتی هەڵگرتنی چەکی هەیە.

چەند کیلۆمەتری سەرەتا، جادەکە زۆر خراپە. جادەکە چاڵی گەورەی تێدایە. بارهەڵگرە قورسەکان، جادەکەیان خراپ کردووە. جادەی نوێ لە دروستکردندایە. تەها، بەدرێژایی ڕێگاکە ناوی شاخ و ناوچەکانی پێ دەگوتین. باسی سەردەمی جەنگی عێراق - ئێرانی لە ناوچەکەدا بۆ دەکردین. یەک بە یەک باسی مێژووی ڕووداوەکانی ئەو ناوچەیەی بۆ دەکردین. بۆ نموونە لەو شوێنە لە چ ڕۆژ و مانگ و ساڵێکدا چ ڕووداوێک ڕووی داوە. تەها زەینێکی زۆر بەهێزی هەیە. دیارە ئەو زیاتر لە بیست جار بە پیادە سنوورەکانی ئێران - عێراقی بڕیوە. تەواوی شاخ و دۆڵ و کوێرە ڕێگاکان شارەزایە. کێشەی ئێمە لەگەڵ ڕووناکدا ئەوە بوو نەمان دەتوانی پێکەوە قسە بکەین. ڕووناک خاڵۆزای تەهایە. چەند ساڵێک لە کوردستانی ئێران پەناهەندە بووە، بەڵام فارسی نازانێت.

تەها گوتی: نانی نیوەڕۆ لە پێنجوێن دەخۆین. هاوڕێکانی تەها لە پێنجوێن چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد. وشەی پێنجوێن، بەلای منەوە وشەیەکی بیرەوەریی وروژێنە. ناوی پێنجوێن لە جەنگی عێراق — ئێراندا سەرسووڕهێنەرە. سەدان جار ناوی ئەم شارەم لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ئێراندا بەرگوێ کەوتووە. کاتژمێر ٢:٣٠ ی دوانیوەڕۆ گەیشتینە پێنجوێن. هاوڕێکانی تەها لە بەردەم ڕێستۆرانتێک چاوەڕێی ئێمەن. لە تەها دەپرسن، بۆچی وا درەنگ هاتن؟ چووینە نێو ڕێستۆرانتەکە. ڕێستۆرانتێکی

ئاسایی بوو. هەر لەوێ کەبابیان بۆ دروست کردین. کەباب بە گۆشتی تازە. تا کەبابەکە برژا، چایان بۆ هێناین. هاورێکانی تەها هەموو خوێنگەرم، میهرەبان و بەهێز بوون. هەموویان پێشمەرگەی دێرین بوون. بەنزیکی هاوتەمەنی تەها بوون. کەمێک فارسییان دەزانی. هاوکات تەها قسەکانی ئێمەی بۆ وەردەگێڕان. تا ئامادەکردنی کەباب، چامان خواردەوە. کەبابێکی خۆش و بەلەزەتمان خوارد. هەموو هاورێکانی تەها جلوبەرگی کوردییان پۆشی بوو. خاوەنی رێستۆرانتەکەش تەهای باش دەناسی. تەها ویستی پارەی خواردنەکە بدات، بەڵام هاورێکانی نەیانهێشت. کەمێک بە ناو شاردا سووڕاینەوە. دیارە پێنجوێن نۆژەن کراوەتەوە.

بەرەو سلێمانی بەرێکەوتین. تەها گوتی: بۆ گەیشتن بەسلێمانی دوو رێگا هەیە. رێگایەکیان پان و فراوان و باشە. ئەوی دیکەیان رێگای نێو شاخان و پێچاوپێچە. رێگایەکە بەنێو جەنگەڵی داربەڕوودا تێدەپەڕێت. دیارە کە رێگا پڕ پێچاوپێچەکەمان هەڵبژارد. جادەکە تەنگ و باریکە. ماشێن ئەوەندە پێچاوپێچ دەکات کە مرۆڤ سەری گێژدەخوات. نیگەرانی فەربورد بووم، چونکە ئەو لەم جۆرە رێوبانە هەستیارە. بە تەهام گوت: لەوانەیە فەربورد تووشی دڵتێکهەڵاتن ببێت. چەند جارێک لە لێواری جادەکە وەستاین. جادەکە زۆر چۆڵ بوو. چەند جارێک لای کانی و سەرچاوەکان وەستاین. کانی و ئاوی زۆر لەسەر رێگامان بوو. چەند لە بەرزییەوە دادەبەزینە خوارەوە، زەوی سەوزتر دەردەکەوت. هەندێک جێ، شوێنەواری سەنگەر و پەناگە بوو. تەها گوتی ئەم سەنگەر و پەناگانە شوێنەواری سوپای پاسدارانی ئێرانە. لە کاتی جەنگدا سوپا لەم ناوچەیەدا پێشڕەوییەکی زۆری کردبوو. تەها بەردەوام روونکردنەوەی دەدا. باسی ئەو شەڕ و پێکدادانانەی دەکرد کە لەو ناوچانەدا روویان دابوو. من چاوەکانم داخست. دەنگی هاواری سەربازان و ئەفسەرانی لاو دەهاتە گوێم. دەنگی شەهیدان، کوژراو و بریندارانی جەنگم دەبیست. لەپڕ وا هەستم کرد کە ئاوی جۆگەلەکە، سوورە. وا بیرم کردەوە لە سەرچاوەوە خوێن هەڵدەقوڵێت. هەموو سەوزەگیاکەم بە گوڵاڵەسوورە دەبینی. گوڵاڵەکان هەموو پیاڵەن. پیاڵەی پڕ لە خوێنی لاوانی وڵات. پیاڵەی پڕ لە خوێنی سەربازانی ژێر فەرمانی سەدامی دیکتاتۆر. پیاڵەی پڕ لە خوێنی شەهیدانی کورد. لە خودا دەپاڕامەوە جارێکی دیکە لەم سەرزەمینە

بەهەشت ئاسایەدا، جەنگ ڕوونەداتەوە. خۆزگە لە هیچ شوێنێکی جیهاندا، جەنگ ڕوونەداتەوە.

دوا جار، گەیشتینە دەشتی سلێمانی. دەشتێکی سەرسەوز و فراوانی بە گەنم و جۆ داچێنراو. گەنم و جۆ سی تا چل سانتیمەتر لە زەوی بەرز ببوونەوە. زەوی هەر وەک فەرشێکی زمڕووت بوو. بیرم کردەوە بەهەشت هەمان ئەم شوێنەیە. بیرم دەکردەوە بۆچی بەدرێژایی ڕێگاکە هیچ گوندێکی گەورە نەبوو. گوند زۆر کەم بوو. هۆکارەکەیم لە تەها پرسی؟ ئەویش گوتی چیرۆکەکەی درێژە، پاشان باسی دەکەم. پەیوەندی بە سەردەمی سەدامەوە هەیە. سەدام نزیکەی ٤٢٠٠ گوندی کوردستانی چۆڵ و وێران کرد و خەڵکەکەشی گواستنەوە بۆ ئۆردوگای زۆرەملێ. ئێستا هەندێک لەو ئۆردوگایانە بوون بە شار. لەسەر ڕێگا، تەها دوان لەو ئۆردوگایانەی پیشان داین کە ئیستا بوون بە شار و خەڵکێکی زۆر لێیان نیشتەجێ بووە.

دواتر گەیشتینە شاری سلێمانی. شارێکی جوان کە بەشێکی زۆری شار، تازە دروستکرا بوون. تەلار و باڵاخانەی زۆر جوانیان دروست کردبوو. شەقام و بلوارەکانی فراوان بوون. یەکەمین شت کە سەرنجی منی ڕاکیشا نەخشەی کوردستانی گەورە بوو لەسەر چیای گۆیژە دروستکرابوو، نەخشەیەک کە هەموو کوردستانی گەورەی بەیەک پارچە نیشان دەدا، هەر لە "دەریاچەی وان"ی تورکیاوە تاکو ئیلام، بەسەر لووتکەی ئەو چیا بڵندەوە کێشرابوو. لە نێو شاردا چەند گردۆڵکەیەک هەیە. کۆشک و باڵەخانەی جوان و بڵندی زۆر تێدایە. پارکێکی زۆر گەورە و جوان لە دەروازەی شارەدا دروست کراوە. تەها باسی چۆنێتی دروستکردنی پارکەکەی بۆ کردین. بە چەندین شیو و دۆڵدا سەرکەوتین و دابەزینەوە. گەیشتینە لای ماڵی تەها. کاتژمێر نزیکەی پێنجی دوانیوەڕۆیە. هەموو بنەماڵەی تەها چاوەڕوانی ئێمەن. هاوکارییان کردین تاکو جانتا و کەلوپەکانمان بردە نهۆمی دووەم. زوبێدە هاوسەری تەها، قاچی شکاوە. لەسەر جێگایە. شەمسەش لەوێیە. هاتووە بۆ هاوکاری و خزمەتکردنی براژنەکەی کە هاوکات خوشکی هاوسەرەکەشیەتی و خاڵۆزاشیەتی. بە میهرەبانییەکی زۆرەوە بەخێرهاتنیان لێ کردین. چا دەخۆینەوە و خزمەتمان دەکەن. پێنج منداڵ و دوو بووکی تەها لەوێن. ڕووناک نیو کاتژمێر دانیشت و ماڵاوایی دەکات و دەڕوات.

تەها پێنج ژنخوشکی هەیە زەینەب، ڕووناک، سوهام، ڕۆشن و دولبەر. تەها ئێستا تەنها یەک نەوەی هەیە بەناوی "بارین" کچێکی تەمەن سێ ساڵە.

باران و تەرزەیەکی زۆر دەبارێت. لە ماوەی چەند خولەکێکدا بالکۆنی خانووەکە پڕ دەبێت لە تـەرزە. لە کۆڵان لافاو تا ناوەڕاستی تایەی ماشێنەکەی تەها بەرز دەبێتەوە. بە تەها دەڵێم ئەگەر بەم شێوەیە باران بەردەوام بێت، دوای یەک پازدە خولەکی دیکە لافاو هەڵدەستێت. وەڵامم دەداتەوە ئەم بارانە، هیچ مەترسییەکی بۆ شار نییە. شارەوانی ڕەچاوی ئەو بارودۆخەی کردووە. زێرابی سندوقی گەورە و فراوانیان دروست کردووە. باراناو هەر چەند زۆر بێت ناچێتە ماڵانەوە و بە ئاسانی بە زێرابەکاندا دەڕوات. هەر لەنێو شاردا چەندین بەرزە پرد دروست کراون. دیار بوو لە سلێمانی خزمەتگوزاریی باش لەبەرچاو گیرا بوو. کە بەداخەوە تاکو ئێستا لە زۆربەی شارەکانی ئێران گرنگی بە دروستکردنی زێرابی گەورە نەدراوە. ئەو کەمە ئاوەڕۆیەی کە هەیە بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە ئاوێکی زۆر پێیدا بڕوات. ئەگەر باران زۆر ببارێت خودا دەیزانێت چ کارەساتێک ڕوودەدات.

دوای بارانبارین، خۆر ئاوابوون لە سلێمانی زۆر جوان و سەرنج ڕاکێشە. بڕیارماندا بڕۆینە دەرەوە، بۆ بینینی شار. شارەکە جوانە. خەڵکەکەی شاد و دڵخۆشن. لاوەکان چالاک و جوانپۆشن. ژنان بە جلوبەرگی جوان و ڕەنگاوڕەنگەوە سیمای شاریان وەک بەهەشت لێکردووە. لە چەند بلوارێکی درێژەوە تێدەپەڕین و لە نێوەندی شار نزیک دەبینەوە. بە تەها دەڵێم دەمەوێت بڕێک دۆلار بگۆڕمەوە بە پارەی عێراقی. تەها دەڵێت پێویست ناکات. چەندت پارە دەوێت من دەتدەمێ. شارەکە زۆر خاوێنە. خەڵکەکەشی زۆر پاکوخاوێنن. ئەو شارە سواڵکەری تێدا نییە، یاخود من نەمبینیوە. یەکێک لەو تایبەتمەندییانەی کە من لە سلێمانی بینیم پاکوخاوێنییە. هەموو ئەو ماڵانەی من سەردانم کردن هەم لەنێو شار و هەم لە دێهاتەکاندا، زۆر پاکوخاوێن بوون. بەتایبەت توالێتەکانیان زۆر خاوێن بوون. ئەوەش یەکێکە لە نیشانەکانی ڕووناکبیری ئەو شارە. خاوێنی توالێتی ماڵەکان نیشانەی کەسێتی ئەو ماڵە نیشاندەدات. هەروەها خاوێنی توالێتی شارەکانیش بەهەمان شێوەیە.

لە شاری سلێمانی، زۆر بەنزینخانە هەبوون. پێدەچوو لە نێو خۆیاندا کێبڕکێی نرخیان هەبێت. لە هەر بەنزینخانەیەک نرخی بەنزین کەمێک جیاوازی هەبوو. هەر یەکەیان هەوڵیاندەدا خزمەتگوزاریی باشتر پێشکەش بکات. تەها هەوڵی دەدا ئێمە ببات بۆ جادەیەکی گەورەی تازە دروست کراو، کە هەموو شار لەو جادەیەوە دەردەکەوت. بورجێکی گەورە لە ناوەڕاستی شاردایە شارەکەی ڕووناککردۆتەوە. ڕووناکییەک کە نیشانەی ئازادییە. گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. شەو هەموومان بەدەوزی یەکدا دانیشتبووین و گفتوگۆمان دەکرد، تەها وەرگێڕ بوو. کەسی دیکە فارسی نەدەزانی. شەمسە و زوبێدە چەند وشەیەک تێدەگەیشتن. هەندێک لە خزمەکانی تەهاش هاتن بۆ ماڵیان. بۆ سەردانی ئەوان و بینینی ئێمە هاتبوون. شۆڕش، کوڕی شەمسە لەگەڵ هاوسەر و چوار منداڵیدا هاتبوون. بۆ ئێوارە شەمسە خواردنێکی باشی دروستکردووە. چەند جۆر خواردن، دۆڵمەشی دروستکرد بوو. دۆڵمەیەک بە گەڵایەکی پان و گەورە دروست کرا بوو. وەک گەڵای تووتن وابوو. دۆڵمەیەکی زۆر خۆش و بەلەزەت بوو. بیست و چوار کەس بەدەوری خوانەکەدا دانیشتبووین. خواردنەکان هەمەجۆرن. بەڵام من زیاتر دۆڵمە دەخۆم. نزیکی نیوەشەو دەڕۆین بۆ نهۆمی خۆمان. هەوا کەمێک ساردە. ژوورەکە گەورەیە بەڵام بە سۆپایەکی نەوتی گەرم ببوو. بەیانی زۆر زوو، شەمسە بەرچایی ئامادەکرد بوو. هەنگوین، چەند جۆرێک پەنیر، ڕۆنەکەرە، ماست کە هەمووی لە سیکانیانەوە هێنرابوون.

### سەردانی ئەمنەسوورەکە

دوای نانی بەیانی لەگەڵ تەها ڕۆیشتین بۆ مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکە. ڕووی دەرەوەی باڵەخانەی ئەمنەسوورەکە ڕەنگی سوورە. ئەمنەسوورەکە لە سەردەمی سەدامدا یەکێک بووە لە زیندانە ترسناکەکان. لەبەر ئەوە ئێستا ناویانناوە "مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکە". بەبۆچوونی من مۆزەخانەی پەند وەرگرتنە، ساڵح بێچار دۆست و هاوڕێی و هاوکاری تەهایە لە وەرگێرانی کتێبی "شازادەی حەمام" لە بەردەم مۆزەخانەکە چاوەڕوانی ئێمەیە. ساڵح بێچار نووسەر و شاعیرە. کەسێکی زۆر بەڕێز،

جوانپۆش و میهرەبانە.

گۆڕینی ئەو کۆشکە بە مۆزەخانە لەسەر ئەستۆی هێرۆ خان "هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد" بووە. ئەو ژنە چالاک و سیاسەتمەدار و تێکۆشەرە لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٨ـە. هاوسەری خوداڵێخۆشبوو مام جەلال تاڵەبانی و کچی مافناس و سیاسەتمەدار ئیبراهیم ئەحمەدە، کە یەکێکە لە کەسێتییە ناسراوەکانی کوردستان و عێراق و جیهانی سێیەم. ئیبراهیم ئەحمەد لەکاتی خەبات و شۆڕشدا، لە شاخ لەگەڵ مام جەلالدا بووە. هێرۆ خان، دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام و سەرکەوتنی کوردەکان و دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، پێگەیەکی گرنگی هەبووە. ئەندامی ئەنجومەنی کوردستان بووە، هەروەها دامەزرێنەری تەلەفزیۆنی کوردساتە. ژنێکی بەتوانا و هونەردۆستە. هەوڵ و تێکۆشانەکانی ئەو بۆ پەرەپێدانی زانکۆ و دامەزراوە زانستی، فێرکاری و هونەرییەکان جێگای پێزانینی کوردەکانە.

لە سەردەمی سەدامدا، "مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکە" یەکێک بووە لە ترسناکترین شوێنی ئەشکەنجەدانی کوردەکان. بیناکە زۆر تۆکمە و مەحکەمە. شوێنەواری هەزاران گوللە بە دیوارەکانییەوەیەتی. ڕۆژانی ٧ و ١٩٩١/٣/٨ سەدان کەس لە پێشمەرگە و جەماوەر هێرشیان کردە سەر ئەمنەسوورەکە. توانییان قارەمانانە و بە قوربانیدان، دەستی بەسەردا بگرن. هەڵبەت جەللادەکانیش لەترسی گیانی خۆیان بەرگرییەکی زۆریان کرد. کاتێک شۆڕش و ڕاپەڕین دەکرێت، تاوانباران لەترسی گیانی خۆیان بەرگری دەکەن. لەدوا ساتەکانیاندا بیر لە پاراستنی گیانی ئاغا و دیکتاتۆرەکانیان ناکەنەوە. ئەوان زیاتر بەرگری لە گیانی خۆیان دەکەن. خۆیان دەزانن پێشتر چ کارێکی دڕندانەیان ئەنجام داوە. دەزانن ئەگەر دەستگیر بکرێن خەڵکی چ بەڵایەکیان بەسەردا دەهێنێن. ئەگەر ڕەوانەی دادگا بکرێن بەپێی تاوانەکانیان سزای خۆیان وەردەگرن. هەر فیشەکێک کە لەلایەن ئەو تاوانبارانەوە بەرەوڕووی خەڵکی ڕاپەڕیو تەقێندراوە، لەترسی گیانی خۆیان بووە. جەماوەری کوردانی ئازادیخوازیش ئەو کۆشکە گەورەیەیان داوەتە بەر ڕێژنەی گوللە، تاکو تاوانباران و جەللادەکان خۆیان بدەن بەدەستەوە. چاوەکانم دادەخەم. ڕۆژی هێرشکردنە سەر ئەو کۆشکە دەبینم. ڕۆژێک کە تەنها چەند کاتژمێرێکی ماوە بۆ ئازادی. ڕۆژێک کە هێشتا ڕابردوویەکی

زۆر کۆن نییە. کاتێک ئێمە چووین بۆ سەردانی ئەو مۆزەخانەیە، تەنها بیست و هەشت ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی بوو.

شوێنی گوللە بە دیوارەکانەوە، گەواهی خەبات و تێکۆشانی کوردەکانە. لە حەوشەی مۆزەخانەکەدا، ژمارەیەک تانک و زرێپۆش و تۆپ و دۆشکەی سەردەمی سەدام نمایش کرابوون. چەندین ماشێنی سەربازیی ڕاگیرابوون و ژەنگ لێی دابوون.

ژووورە تاریکەکانی زیندانەکە هەر وەک سەردەمی سەدام، بەبێ دەستکاریکردن هێڵرابوونەوە. ژوورەکانی ئەشکەنجە و لێدان دڵەڕاوکێ و ترسییان لە دڵی سەردانیکەراندا بەجێدەهێشت. تەها خودی خۆی نزیکەی پێنج مانگ لە زیندانێکی هاوشێوەی ئێرە -واتا بینای پێشووی دائیرەی ئەمنی سلێمانی، شوێنی ئێستای بینای یەکێتی نووسەرانی کورد و دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان- زیندانی کرابوو. جۆرەها ئەشکەنجەی بینی بوو. لە ژوورێکدا هەموو هۆکارەکانی ئەشکەنجەدان هەن. هێشتا دەزگایەکی هەڵواسینی زیندانییان لەوێ بوو، بەجۆرێک بوو کە ئێستاش پشتی مرۆڤی دەلەرزاند. ژوورێکی ئاسایی کە جێگای ٣٠ کەسی تێدا دەبێتەوە، وەلێ بە وتەی هەندێک کەس، هەر یەک لەو ژوورانە زیاتر لە سەد کەسی تێدا ئاخنراوە. بەبینینی هەناوم دەلەرزی خۆ ئەگەر من لەو شوێنەدا زیندانی بکرامایە هەرگیز بەرگەی ئەو توندوتیژییەم نەدەگرت و هەرچیم بزانیایە دەمدرکاند.

پەیکەرێک لەوێ هەیە. دەستەکانی لە پشتەوە بەستراون و بە بەبنمیچی ژوورەکەدا هەڵواسراوە. شانەکانی لە جێی خۆیان دەرچووبوون. ئێش و ئازار لە ڕوخساریدا دەبینرا. هونەرمەندی پەیکەرتاش هەموو هونەری خۆی بەکارهێناوە تاکو ئێش و ژانی ئەشکەنجەدان، پیشان بدات. ئێستا کە من ئەم بابەتە دەنووسم کاتژمێر ٥:٣٠ ی بەرەبەیانی ٢٠٢١/٢/٢٧ـە، واتە نزیکەی ساڵێک بەسەر سەردانەکەمان بۆ مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکە تێپەڕیوە. ئێستاش هەست بەئازار و ئەشکەنجەی ئەو زیندانیانە دەکەم.

وەک ئەوەی کە دیوارەکانی زیندان قسە بکەن. ژوورە تاریکەکان هەستی زیندانییە ئەشکەنجەدراوەکان دەگێڕنەوە. لە بەردەم ژوورێکدا دەوەستم. ژوورەکە، گیانی من دەگەیەنێتە قوڵایی دەروونی مرۆڤەکان. دووکەس ڕووبەڕووی یەکدی وەستاون

یەکێکیان جەللاد و ئەوی دیکەیان ئازادیخواز. کەسی جەللاد خۆی وەک نۆکەر و بەردەستی شەیتان نیشان دەدات. جەللاد هەر خودی شەیتانە. من نووسینەکەم سڕییەوە. کەسێتی شەیتان، زۆر بەرزترە لە کەسێتی ئەو جەللادانە. جەللاد ڕۆحی خۆی بە دیکتاتۆری شەیتان ڕەفتار فرۆشتووە. بەڵێ کەسی جەللاد نەخۆشیی دەروونیی هەیە. ئەو وەک تاوانکارێک، مێشکی شۆرداوەتەوە. ئەو هەر جارێک قامچی لە کەسێکی ئازادیخواز دەدا، چێژ وەردەگرێت. لە لێدانێکی پیاوانی ئازادیخواز و شێرەژنان، پاداشتی ئاخ و داخ وەردەگرێ. ئەو نەخۆشیی سادیزمی هەیە، چێژ لە ئەشکەنجەدان وەردەگرێت. ئەشکەنجەدەر و ئەشکەنجەدراو دوو دیوی مرۆڤن. دیوێکیان ئاژەڵێتی و دڕندەیی ڕۆحی مرۆڤ پیشان دەدات. دیوی دووەمیش بریتییە لە یەکلاکردنەوەی مرۆڤ و سووربوون لەسەر ڕێزگرتن لە بەها بەرز و باڵاکانی مرۆڤایەتی، ئازادی تەنها شتێکە کە ئەشکەنجە و کوشتن لەپێناویدا نرخی هەیە.

ڕاستە زۆر کەس دەبرێنە ژێر ئەشکەنجە؛ بەڵام هەندێکیان لەژێر ئەشکەنجەدا دەمرن. هەندێکیشیان خۆیان دەبنە جەللاد و کەسانی دیکە ئەشکەنجەدەدەن. هەندێکیشیان دەگەنە پلەی سەروەری و مرۆڤایەتی. پێدەچێت بڵێن جەللاد لەپێناو دەستکەوتی خۆی کاردەکات. ئەگەر جەللاد نرخێکی هەبووایە دەیتوانی بە گفتوگۆ بە دەستی بهێنێت. بە گشتی زۆربەی زۆری جەللادەکان، لە بەرامبەر کارە شەیتانییەکانی خۆیاندا پارەیان دەستدەکەوێت. ئەوان بە ئەشکەنجەدانی خەڵک دەروونی نەخۆشیان ئاسوودە دەکەن. ئای ئەمەش بووە بە پیشە؟ ئاخۆ جەللاد بە ژن و منداڵەکانی بڵێ چ کارەیە؟ ئایا ئەگەر ڕۆژێک نەوەکانی لێی بپرسن و بڵێن بابەگەورە بۆچی لەبەر خاتری سەدامی دیکتاتۆر خەڵکیت ئازاردەدا، چیان وەڵام دەداتەوە؟

مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکەی سلێمانی مۆزەخانەی پەندوەرگرتنە. دیکتاتۆرێکی خوێنمژ کە هەرگیز بیری لە شکستی خۆی نەدەکردەوە، ئێستا ڕۆژانە، هەزاران نەفرەتی بۆ دەچێت. لە مۆزەخانەکەدا تەنها یەک شت کەمە، وێنە و تایبەتمەندییەکانی جەللادەکان. نزیکەی سێ چارەکە سەعاتە لە بەشی ئەشکەنجەدانی مۆزەخانەکەین. تەها و ساڵح بێچار ڕوونکردنەوە دەدەن؛ بەڵام ئەو سێ چارەکە سەعاتە لەلای من بە سێ سەدە تێپەڕی.

بە ژوورەکاندا دەخولێمەوە. دەمەوێت ڕۆحی جەللاد و قوربانی لێک بکەمەوە. نازاندرێت، کەسێک چەند مانگێک ئەشکەنجە بدرێت و گەواهی لێدانی کەسانی دیکە بێت، چ هەستێکی هەبووە؟ لەبەرامبەر کەسێک کە چەندین ساڵ کەسانی شەرەفمەندی ئەشکەنجە دابێت، چ هەستێکی هەبووە؟ من دەتوانم کەمێک لە هەردوو لایان بهێنمە بەرچاوی خۆم؛ بەڵام ناتوانم ئەو هەستە بە قەڵەم بنووسم.

ئەگەر وێنەکێش بوومایە، لەوانەیە بمتوانیایە قامچی لێدانی پشتی مرۆڤەکان پیشان بدەم. لێدانی قامچییەک کە گۆشت و ئێسقان لێک جیا دەکاتەوە. ئایا دەبێت زللە لێدانێکی توند کە مرۆڤێک بەدرێژایی تەمەنی کەڕ بکات، وێنە بکێشم؟ ئایا وێنەکێش دەتوانێت ئێش و ئازاری ئەو کەسە پیشان بدات کە دەستەکانی لە پشتەوە بەستراون و بە بنمیچی ژوورێکدا هەڵدەواسراوە؟ بیر لەوە دەکەمەوە کاتێک شوێنی ئەشکەنجەدان دەڕوخێت و خاپوور دەکرێت. چی لە جەللاد دەکرێت؟ کاتێک دیکتاتۆرێکی زاڵم دەڕوخێت، ئەو دیکتاتورە چی لێدەکرێت؟ ئەوانیش ئەشکەنجە دەدرێن. خودا بکات وا نەبێت، چونکە دیسان بۆ ئەشکەنجەدانی دیکتاتۆریش جەللاد پێویستە. واتە دووبارەکردنەوەی ئەشکەنجە. جەللادێک دێت تا جەللادی پێشوو ئەشکەنجە بدات. گورگێک دێت تا گورگێکی دیکە هەڵبدڕێت. مرۆڤ ئەگەر بیەوێت بە سەروەریی بگات و ئەشکەنجە بنبڕ بکرێت، دەبێت هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەک بۆ هەموو کەس قەدەغە بکرێت.

کەسێک بۆی گێڕامەوە: شەوێک جەللادێک منی بردە ژوورەکەی خۆی. کەوتە پرسیارکردن لێم، پرسیاری بێسەرەوبەرە. لەناکاو بەهەموو هێزی خۆی بۆکسێکی لە نێوچاوانم سرەواند. موستیلەیەکی گەورە لە پەنجەیدا بوو. نقێمێکی گەورە بە موستیلەکەیەوە بوو. ئەو شارەزاییەکی باشی هەبوو لە بۆکس لێدان. بەجۆرێک بۆکسەکەی لێدام کە ژان چووە دڵم. بە نقێمی موستیلەکە لە ئێسقانی سەرمی دا. بروسکەیەک بە بەرچاومدا هات. دونیا لە بەرچاوم تاریک بوو. ئەو لێدانەی ئەوشەوە لێیدام و ئەو ئازارەی پێی گەیاندم؛ منی هۆشیار کردەوە تا لە ئاغاکەی دوور بکەومەوە، جەللاد پێی گوتم: ئەگەر تۆ لە من ناترسیت و لەگەڵ من نەبیت، دڵنیابە کە بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ لەم ژوورە تاریکەدا دەمێنیتەوە. کەچی ساڵێکی پێنەچوو

ئەو جەللادە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا لافاو بردی و مرد. بەڵام من هێشتا زیندووم. نرخی ئازادی، زۆر لەوە زیاترە. من هەر لە هەمان ژوور، ئەوم بەخشی. زۆر بێکەڵک بوو، شایەنی تۆڵە سەندنەوە نەبوو. تۆڵەسەندنەوە سەرەتای ئەشکەنجەیە.

سەردانی بەشی زیندانی ژنانمان کرد. ئەو بەشە لە بەشی پیاوان ترسناکتر دەهاتە بەرچاو. کەمێک لەسەر زەوی هەڵتروشکام. باری دەروونیم تێکچوو. هەردوو دەستم خستە سەر گوێکانم. گوێم لە هاواری ژنە تێکۆشەرەکانی کورد بوو. گریانی کچانی گەنج کە لەبری ژووری بووکێنی، شوێنیان کونجی زیندان بوو. لەبری نازپێدانی پیاوی عاشق، قامچی جەللاد لەشی ئازار دەدان. وەک ئەوەی هەر لێدانی قامچییەک ڕەشەبا بێت و ئاڵای هەرێمی کوردستان بشەکێنێتەوە. ئەو ئاڵایانەی کە لە گۆڕەپان و شوێنە بڵندەکانی شارەکاندا هەڵواسراون و دەشەکێنەوە چییە؟. ئەوە سیمبولی چەندین سەدە خەبات و تێکۆشانی نەتەوەکانە. سیمبولی ڕەنج و کوێرەوەریی ئەو ژن و پیاوانەیە کە لە ژێر ئەشکەنجەدا هاواری ئازادی و سەربەخۆییان دەکرد. لە مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکە لە واتای ڕێزگرتن لە ئاڵا گەیشتم. دەبێت هەزاران، یاخود ملیۆنان کەس. زەحمەت بکێشن و شەهید و زیندەبەچاڵ بکرێن، تاکو ئاڵایەک بشەکێتەوە. ئاڵایەک ڕادەستی فەرماندە و سەربازەکان بکرێت. خۆری سەر ئاڵاکەی هەرێمی کوردستان، ڕووناکییەکەی بەسەر دڵمدا دەدرەوشێتەوە. دەبێت چەندین ساڵ کار بکەم بۆ ئەوەی لەو ڕووناکییە تێبگەم. دڵنیام لاوان و نەوەی داهاتووی هەرێمی کوردستان، نرخی ئەو ئاڵا خۆرداره دەزانن. هەموو جۆرە توندڕەویی و جیاوازییەک، پایەکانی ئەو ئاڵایە بێهێز دەکات.

لە ژووری زیندانییان و ئەشکەنجە دێمە دەرەوە. بەرەو هۆڵێک ڕێنوێنیم دەکەن. هۆڵێک کە تەواوی دیوارەکانی ئاوێنەبەندن و بەهۆی گڵۆپەوە زۆر ڕووناکە. ئەم هۆڵە ئەوەندە جوان و ڕازاوەیە، هەر لە ژووری زیارەتگە دەچێت. دوای ژوورە تاریک و خەمناکەکان، ئەم هۆڵە ڕووناکە چییە؟ ئەم هەموو تیشکەی کە لە ئاوێنەکانی دەدا، نیگەرانی کردم. پرسیم لەم مۆزەخانەیەدا ئەم هەموو ئاوێنە و ڕووناکییە چییە؟ ئێرە کوێیە؟ وەڵامی تەها و ساڵح بێچار سەرسوڕهێنەر بوو. ئەم تیشکدانەوانە، نیشانەی ڕووناکی نییە. نیشانەی تاریکییە. تا ئێستا لە ژیانمدا نەمبیستووە تیشک و ڕووناکی

نیشانەی تاریکیی بێت. ڕووناکییەک کە ئاماژەی تاریکی دەروونی مرۆڤە. ڕووناکییەک کە ئاماژەیە بۆ ترس و ئازاردان. ئاماژەی ئەشکەنجە و ئازار و گریانە. ئاوێنەیەک کە دەروونی مرۆڤ پێچەوانە دەکاتەوە. ئەو هۆڵە، نیشانەی گەشەسەندنی بەتاڵە لەسەر بنەمای نەوت و تەکنۆلۆژیا. ڕووناکی و ئاوێنەیەک، کە گوزارشت لە تاریکی دەروونی ئەو سیاسەتمەدارانە دەکات کە بەرگرییان لە سەدام کردووە. ئاوێنەکان، ڕەنگدانەوەی حکوومەتێکن لەسەر بنەمای دەریایەک لە خوێن و فرمێسک. ئەم هۆڵە ئاوێنەبەند و ڕووناکە سەد هێندەی ژوورە تاریکەکان، تاریکترە. ئەم ڕووناکی و ئاوێنانە دەرخەری ستەمی بێ کۆتایی زۆردارانـە. ئەگەر لە ژوورەکانی زینداندا جەللادەکان یەک یاخود دوو کەس بوون، لەم هۆڵەدا جەللادەکان سەدان و هەزاران کەسن. لە ژوورە تەنگ و تاریکەکاندا لە ژووری داخراودا، جەللادەکان کەسەکان ئەشکەنجە دەدەن. ئەم هۆڵە درەوشاوەیە پیشاندەری ستەمی ئاشکرایە. ستەمێک لە شوێنی گشتیدا، ستەمێک بە بەرچاوی هەموو جیهانەوە. دەکرا ستەم کردن لەو ژوورە تاریکانەدا بەنهێنی بهێڵدرێتەوە. دەتواندرا بە درۆ پەردە پۆش بکرێت. بەڵام درەوشانەوەی ئەم ڕووناکییە. پیشاندەری ستەمە بە بەرچاوی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤەوە.

لە هۆڵێک دا ١٨٢ هەزار پارچە ئاوێنەی بچووک هەیە. هەر ئاوێنەیەک شووشەی تەمەنی کەسێکە کە بە ئازار و ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونیـەوە کوژراوە، گوللەباران کراوە، یان لە ژێر ئەشکەنجەدا مردووە. زیندەبەچاڵ کراوە یان لە برسا و لە تینوویێتیدا مردووە. لە بێکەسی و خەم و خەفەتدا مردووە. بە چەکی کیمیایی مردووە. بە نەخۆشیی مردووە. کاتێک مردووە کە لەڕاستیدا نەدەبوو بمرێت. لە جێیەک مردووە کە نەدەبوو بمرێت. لە شوێنێک خراوەتە چاڵەوە بە بێ هیچ ڕێوڕەسمێک. بە بێ کفن و بە بێ گۆڕ. ئەو کوژراوە. ١٨٢ هەزار ئاوێنە، ئاماژەی ١٨٢ هەزار کوردە کە بەدەستی سەدام ئەنفالکراون یان بەدەستی داورودەستەکەی کوژراون. ١٨٢ هەزار کەسی ئەنفالکراو. ٤٢٠٠ گڵۆپ، ئاوێنەکان تیشکباران دەکەن ئەم گڵۆپانە چین؟

هەر گڵۆپێک هێمایە بۆ گوندێک. گوندێک کە وێرانکراوە. گوندێک کە لەگەڵ زەویدا تەختکراوە. گوندێک تەنها شوێنەواری مـاوە. گوندێک کە بە بۆمبی کیمیایی، بە

گوللـەی تانک و تۆپ، بە بۆمبی هێشوویی، بەفڕۆکەی میراجی فەرەنسایی و سۆخۆی ڕووسیی و هەلیکۆپتەری کوبرای ئەمریکایی وێران کراوە. گوندێک کە لەسەر ڕووی زەوی سڕدراوەتەوە. دانیشتووانەکەشی یان کوژراون یان ئەنفال و بێسەروشوێن کراون. هەندێکیشیان کە بەزیندوویی ماونەتەوە، لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا نیشتەجێ کراون. بەناوی گوندی هاوچەرخ و گەشەسەندوو. کۆچی زۆرەملێ و دوورخستنەوە لە زێدی خۆیان. ٤٢٠٠ گوند کە هەر یەکەیان میراتێکی فەرهەنگییان هەبوو. هەر یەکەیان شوێنی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ و باخداری بوون. هەریەکەیان کانی و ئاو و جۆگە و ڕووباریان هەبوو. چیتر ناتوانم بەرگەی ئەم هۆڵە ئاوێنەبەند و پڕ ڕووناکییە بگرم. سەرم گێژ بووە. بەرچاوم تاریک بووە. دەبێت لە ڕاڕەوەکەوە بڕۆمە دەرەوە. لەم ڕووناکییە پڕ تاریکییە ڕابکەم.

دەڵێن دیزاینی هۆڵی ڕووناکیی و تاریکیی لەلایەن هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەدەوە پێشنیازکراوە. ئەو هۆڵە، لووتکەی هونەرە. هونەری دەرخستنی دەروونی تاریکی جەللاد بە ڕوخسارێکی گەشەوە. ئەم هۆڵە پیشانمان دەدات کە ئاڵای هەرێمی کوردستان، بە خوێنی لاوانی ئازا و ئازادیخوازی کورد، بەرز ڕاگیراوە. ئاڵای هەرێمی کوردستان چارۆکەی کەشتییەکە کە لەسەر دەریای خوێن لەنگەری گرتووە. ستوونی ئەو ئاڵا پیرۆزە، ستوونی ئەو کەشتیەیە. ڕێبەرانی هەرێمی کوردستان لەسەر ئەو کەشتیە دانیشتوون کە بەنێو ئۆقیانووسی خوێنی شەهیداندا، گوزەر دەکات. هەرێمی کوردستان کەشتیەکە. ئەم کەشتییە، نە هی پارتی دیموکرات و نە هی یەکێتیی نیشتمانییە. ئەم کەشتیە، ئەم فراکسیۆنە یان ئەو فراکسیۆنەی نییە. ناکۆکی نێوانیان دەتوانێت کەشتییەکە کون بکات. ئەگەر کەشتیەکە کون ببێت، ئەوکاتە خوێنی شەهیدانی کورد فوارە دەکات. هەر ڕێبەرێکی کورد، دەبێت ئەوە بزانێت کە نابێت ئەو کەشتیە کون ببێت. ئەو کەشتیە بە ناکۆکی و دووبەرەکی و خۆبەزلزانی و خۆپەرستی کون دەبێت. لە جیهاندا زۆر کەس ئارەزوو دەکەن ئەم کەشتیە کون ببێت. لاوانی کورد پێویستە هۆشیاربن. پێویستە هەر ڕێبەرێکی کورد بزانێت کە ئەو ئاڵایە، گەواهی یەکڕیزییە. گەواهی ئاڕاستەکردنی کەشتییەکەیە. پێویستە هەر ڕێبەرێکی کورد بەیانیان کە لە خەو ڕابوو، هۆڵی ئاوێنەبەندی مۆزە خانەی ئەمنەسوورەکەی سلێمانیی لەبیربێت.

دیزاینی مۆزەخانەکە دەیەوێت دەروونی سەردانکەران هێمن بکاتەوە. ئەو نایەوێت سەردانکەران بەدەروونێکی ماندووەوە لە مۆزەخانەکە برۆنە دەرەوە. دیزاینەری مۆزەخانەکە دەیەوێت بڵێت ژیان بەردەوامە. لەم تەلارەدا هۆڵێکی دیکەی گەورە هەیە. هۆڵێک کە شوێنەواری مێژوویی و کاری دەستیی ژنان و پیاوان پیشان دەدات. هۆڵێک پیشانی دەدات کە گەلی کورد، هێمن و ئاشتیخواز و داهێنەرن؛ بەڵام لەگەڵ ئەو ئاشتیخوازییەشدا لەکاتی جەنگدا وەکوو شێر دەجەنگن. هۆڵێک وێنە و تابلۆی پیاوانێکە کە پڕ چەکن؛ بەڵام لە کاتی بەزم و شادیدان. ئەم وێنانە، کوردەکان تەواو ساز و ئامادە پیشان دەدەن. بەرهەمە هونەرییەکانی ئەو هۆڵەی سەرەوەی مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکە، شتێکی زیاتر لە هونەر و کاری دەستی بە مرۆڤ دەبەخشێت. دەبێت سەرنجی بدەیت. شاعیرانی کورد دەبێت شیعری زیاتر لەسەر ئەم مۆزەخانە و ڕۆحیەتی بنووسن. ساڵح بێچار لەگەڵماندایە.

ساڵح بێچار شیعری جوانی هەیە، ئەو لە شیعرێکدا دەڵێ:

**"هەموو ڕقمان لە زنجیرە،**
**چونکە ئەڵقەکانی ئەو**
**لە ئێمە یەکگرتووترن!"**
**یاخود دەڵێ:**
**"هەر کەسە و**
**بەدەردێک موعتادە،**
**منیش بە عیشقی تۆ"**
**یان دەڵێ:**
**"تۆ دەگوت چاوت،**
**من دەمگوت بۆنی هەناسەت**
**لە نێرگز دەچێت!"**
**یاخود دەڵێ:**
**"من و تۆ**
**هەرگیز پێکناگەین**
**تا ئەو (واو)ە**
**لە نێوانماندا بێت!"**

بە دڵنیاییەوە ساڵح بێچار باشتر دەتوانێت بە شیعرەکانی پێناسەی ئەم مۆزەخانەیە بکات. ئەو ڕۆڵەی ئەم مۆزەخانەیەیە، منیش سەردانکەر. ئەو خاوەن میراتی مۆزەخانەکەیە و منیش میراتگر. ئەو نیشتەجێی مۆزەخانەکەیە و منیش ڕێبوار. ئەو خاوەن ماڵە و منیش میوان.

زیاتر لە سێ کاتژمێرە لە نێو مۆزەخانەکەدایین. تەها ئێمە دەبات بۆ کافتریایەک کە لە نێو مۆزەخانەکەدایە. تاکوو لەوێ شتێک بخۆینەوە. چەند لاوێکی کورد، لەوێ خزمەت دەکەن. ئەو شوێنە هەم ڕێستۆرانتە و هەم کافتریا. من داوای چا دەکەم. دەڵێم با "چا"کەم لە پیاڵەی شووشەدا بێت. هەست دەکەم "چا"کە ڕەنگی خوێنی هەیە. پیاڵەکە دەبەم بۆ لێوم. ناتوانم قومێک لەو چایە بخۆمەوە. گەرووم بەستراوە. فرمێسک لە چاوانمدا قەتیس ماوە. تەها دەڵێت "چا"کەت سارد بووەوە. دەڵێم چا ناخۆمەوە. ئاو دەخۆمەوە. ئاوێک بەڵکو کەمێک دەروونم هێور بکاتەوە.

لە مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکە، دێمە دەرەوە. من زۆر مۆزەخانەی وڵاتانی جیاوازم بینیوە؛ بەڵام مۆزەخانەی پەندئامێزی وەکوو مۆزەخانەی ئەمنەسوورەکەی سلێمانیم نەبینیووە. لەوانەیە جارێکی دیکە بچمەوە بۆ سەردانی ئەو مۆزەخانەیە.

### بازاڕی سلێمانی

بڕیار بوو ئەمڕۆ بڕۆینە نێوەندی شاری سلێمانی. سەرێک لە بازاڕ بدەین. نێوەندی شار زۆر جەنجاڵە. خەڵکێکی زۆر لە هاتوچۆ و کڕین و فرۆشتندا بوون. ترافیک زۆرە. جێگەی وەستانی ماشێن دەستناکەوێت. چەند جادە و کۆڵان گەڕاین. هەر ئەمەش هۆکار بوو بۆئەوەی باشتر شەقامەکانی نێوەندی شار ببینم. لەکۆتاییدا گەراجێک لە چەند نهۆمی ژێر زەویدا بۆ وەستانی ماشێنەکەمان دەدۆزینەوە. گەراجێک لە ژێرزەمینی یەکێک لە باڵەخانەکانی بازاڕ. هەموو بازاڕەکانی ئەمڕۆ پێیان دەوترێت "مۆڵ". لە نزیک گەراجەکە چەند دوکانێکی ساردەمەنی فرۆش هەیە، زۆر پاکوخاوێنن. تەها دەڵێت با ساردەمەنی بخۆین. دەچێنە ناو یەکێک لە دوکانەکان. کورسی و مێزەکان جوان و خاوێنن. چەند کەسێک لەوێ دانیشتوون و ساردەمەنی

دەخۆن. گەنجە ساردەمەنی فرۆشەکە دەزانێت ئێمە ئێرانیین. بە فارسی قسەمان لەگەڵ دەکات. چەند ساڵێک لە ئێران بووە. لە تاران و سنە کاروکاسپی کردووە. بەخێرهاتنمان دەکات ساردەمەنیەکی خۆشمان پێشکەش دەکات. بە زەحمەت پارەمان لێ وەردەگرێت. من دەمەوێت پارەکەی بدەم. پارە لە من وەرناگرێت. تەها پارەکە دەدات. گەنجەکە خاترمان دەگرێت. لە دوکانەکە دەچینە دەرەوە. دەمەوێت دۆلار بە دیناری عێراقی بگۆڕمەوە. چەند کەسێک لە قەراخ شەقامەکەدا دۆلار دەکڕن. تەها ڕێگەم پێنادات. دەڵێت هەر چەندە پارەت دەوێت من دەتدەمێ. دواتر خۆی سەد و بیست هەزار دیناری عێراقیم دەداتێ. گوتی ئەمە بەرامبە بە سەد دۆلارە. دواتر دوور لە چاوی تەها سەد دۆلارم گۆڕییەوە، سەد و نۆزدە هەزار دیناری عێراقیم وەرگرت. ویستم پارەکەی تەها بدەمەوە پێی ناخۆش بوو. پارەکەی وەرنەگرت. بازاری گشتی شار زۆر جەنجاڵ بوو. بازارێکی بە شەوق و زەوق. زۆرێک لە گوزەرەکان تایبەتن، گوزەری پێڵاوفرۆشەکان "ناتوانم بنووسم گوزەری پێڵاودرووەکان، چونکە ئەوەی کە بینیم کەسێک پێڵاوی نەدەدووری و دروستی نەدەکرد، تەنها پێڵاویان دەفرۆشت". بەڵام دوکانەکانیان جوان و ڕێکوپێک بوون. فرۆشیارەکان هەموو ڕووخۆشن. پێڵاو لە چین و تورکیاوە دەهێنن. ئەی باشە ئەو هەموو پێستەی مانگا و مەڕەی کوردستان بۆ کوێ دەبەن؟ کوردستان دەتوانێت ببێتە باشترین نێوەندی ناوچەکە بۆ بەرهەمهێنانی چەرم و دروستکراوە چەرمییەکان. پێستە و چەرم دەتوانێت ببێتە سەرچاوەی داهات و پەیداکردنی کار و پیشەیەک بۆ کوردستان. گوزەرەکانی بازاڕ بۆ من سەرنجڕاکێش بوون. لە ناوەوە چەند دوکانێک گیادەرمانی جوراوجۆریان هەبوو. زۆربەی جۆری گیاکان لە کوێستانەکانی کوردستانەوە هێنرابوون. یەکێکیان گوتی: کوێستانەکانی کوردستان سەرچاوەی گیادەرمانییەکانن. هەڵبەت هەندێک لە پێداویستی و ڕۆنەڕووەکییەکان هیندی بوون. چەند کاڵایەکی مالیزی و چینی دەبینران. هێشتا بەرهەمی لەکیس نراو زۆر کەم بوو. کوردستان دەتوانێت بە لەکیسنانی گیادەرمانییە جۆراوجۆرەکان، قازانجێکی زۆر پەیدا بکات. گیادەرمانییەکانی کوردستان، دەتوانن لە بازاڕی نێودەوڵەتییدا پێگەی خۆیان هەبێت.

کیسە خەنەی یەزد لەنێو دوکانی عەتارییەکان و بازاڕ زۆر بوون. زەعفران کەم بوو. تازە بازاڕی زەعفران لە گەشەکردندا بوو. براندێکی دیکەم نەبینی. دۆشاوی تەماتەی ئێرانی زۆر بوو. قوماشی کارخانەی موتەهری زۆر بوو. فەرشی کارخانە و کاغەزی دیواری ئێرانی بەهەمان جۆر. هەڵبەت بە گشتی کاڵای ئێرانی لە بازار کەم بوو. هەرچەندە شیرەمەنییەکانی "کالە" لە سلێمانی و هەموو شار و شارۆچکەکانی دەوروبەری زۆر بوو. یەکێک لە گلەیی کوردەکان ئەوەبوو کە براندی کالە، بەربەستی لە بەردەم بەرەوپێشچوونی گەشەسەندنی پیشەسازی بەرهەمە شیرەمەنییەکانی کوردستاندا، دروستکردووە.

بازاڕی سلێمانی دەتوانێت شوێنێکی باش بێت بۆ کاڵای ئێرانی و جێگەی کاڵای چینی بگرێتەوە. بە مەرجێک کوالێتی بەرهەمەکانمان باشتر بکەین و بە ویژدانەوە بەرهەمەکان هەناردە بکەین.

ئێران پێویستە بەشێکی سەرمایەگوزارییەکەی لە کوردستان ئەنجام بدات. پیشەسازیی چەرم، شیرەمەنی، گژوگیای دەرمانی و ڕێگاوبان، بەتایبەت ڕێگای ئاسن کە سەرمایەگوزارییەکی گرنگ و لەبەرچاوە.

ئارەزوو دەکەم ڕۆژێک بتوانین بە شەمەندەفەر لە کابولەوە بۆ مەشهەد، تاران، سنە، سلێمانی و هەولێر تا کەناری دەریای ناوەڕاست گەشت بکەین. ئایا من تا ئەو ڕۆژە دەمێنم؟

بازاڕی گۆشتفرۆشەکان زۆر جەنجاڵ و بە ژاوەژاو و پڕ کڕیارە. بازاڕێکە کە تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە. بازاڕی سلێمانی وەک بازاڕی تەورێزە و بگرە زۆر بە ڕەونەقتریشە. دوکانێک تەنها کلکی گوێرەکەی دەفرۆشت. کلکەکانیان جوان ڕازاندبووەوە. دوکانێک تەنها چەوریی ئاژەڵی دەفرۆشت. ئەوەندە کڕیاری هەبوو کە گۆشتی نەدەفرۆشت. چەوریی نێو ورگی دەفرۆشت.

ئەم جۆرە دوکانەم لە بازاڕی تەورێز بینی بوو. بەڵام لە بازاڕی شارێکی سێ ملیۆنی وەک مەشهەد نەمدی بوو. دوکانێک تەنها چەوریی ورگ بفرۆشێت. هەتا لە بازاڕەکانی تارانیش نەمدی بوو، کڕیاری زۆری هەبێت. کە کڕیارێکی وا تایبەت بە خۆی پەیدا بکات.

بازاڕ و گوزەرەکانی سلێمانی جوان و سەرنجڕاکێشن. هەم لە ڕووی ئەندازەی بیناسازییەوە جێی سەرنجن. میچی هەندێک لە گوزەرەکان زۆر سەرنجڕاکێش و جوانن. بەڵام لەوە سەرنجڕاکێشتر خودی خەڵکی بازاڕن. بازاڕەکە پڕ لە جموجۆڵ و شەوق و زەوقە. خەڵکە ڕووخۆش و میواندۆستەکەی بە جلوبەرگی ئاڵوواڵاوە وەک باخچەی گوڵ دەنوێنن. لە دوکانێکی زەڕنگەر کۆمەڵێک سەرقاڵی کڕینی زێڕ بوون. دیاربوو ئاڵتوونیان بۆ بووک هەڵدەگرت. ژنانی کورد جلوبەرگی کەشخە و جوانیان پۆشی بوو. پیاوەکان جلوبەرگی کوردییان لەبەردا بوو. ئەو جلوبەرگانە دروونیان ئاسان نییە و خەرجییەکەی زۆرە. ئەو جلوبەرگە بەشێکە لە ناسنامەی کوردەکان. کە وردە وردە جلوبەرگی ڕۆژاوایی جێگەی پێ لێژدەکات. ئارەزوومەندم کوردەکان جلوبەرگی ڕەسەنی خۆیان بپارێزن. لە سەرتاسەری دونیا کوردەکان بە ئازایەتی، بەجەرگی، ڕاستگۆیی و جلوبەرگە تایبەتەکەیان دەناسرێنەوە.

لەگەڵ تەها بەرەو بازاڕی کتێبفرۆشەکان دەڕۆین. چەند کتێبفرۆشێکی بەناوبانگ لەوێ هەبوون. تەها دەڵێت: ئەمڕۆ بۆ نیوەڕۆ میوانمان هەیە باشترە بچینەوە بۆ ماڵەوە. پاشنیوەڕۆ دێینەوە بۆ کتێبخانەکان. لە بازاڕ بووکەشوشەیەک بۆ "بارین"ی تەمەن سێ ساڵی نەوەی تەها دەکڕم. دۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووریی و ئەندازەی بیناسازیی بازاڕ بۆ دکتور وسوقی سەرنجڕاکێشە و چەند ڕوونکردنەوە و سەرنجێک بۆ من باس دەکات. فەربوردیش لەو هەموو جموجۆڵەی بازاڕ سەرسامە. تەها دەیەوێت پێداویستی بۆماڵەوە بکڕێت. نیو کاتژمێرێک ڕوخسەتمان لێ وەردەگرێت. لە بەردەم مزگەوتی گەورەی سلێمانیدا‌ین. دەچین سەردانێکی مزگەوت دەکەین. مزگەوتێکی گەورە و جوان کە تازە نۆژەن کراوەتەوە.

گۆڕی هەندێک لە ناوداران و گەورە پیاوانی تێدایە. کێلی قەبرەکان جوان و سەرنجڕاکێشن. گۆڕی هەندێک لە پیاوچاک و شێخەکانیش هەر لە نێو مزگەوتەکەدان، سەردانکەرێکی زۆری هەیە. لە حەوشەی مزگەوتەکە کەمێک وچان دەگرین. پیاوە بەتەمەنەکان لە نێو حەوشەی مزگەوت لەبەر هەتاو خۆیان هەڵخستووە. یەکێک لەو پیاوە بەتەمەنانە فارسی دەزانێت و لەگەڵیا دەکەومە گفتوگۆ. زۆربەی زۆری کوردەکان کارەساتبارن. پیرەمێردەکە گوتی پەنجا و هەشت کەس لە کەسە نزیکەکانی

لەدەستداوە. سێ منداڵ، هەشت نەوە، سێ برا و دوو خوشکی، لەو بێسەروشوێنانەن. ژمارەیەک لە برازا و خوشکەزای دیکەی شەهید بوون. کاتێک کە ناوی دەهێنان، چاوەکانی پڕ دەبوو لە فرمێسک، پرسیی: بۆچی هەتا ئێستا زیندووە؟ پێم گوت: خودا تەمەنتان درێژ بکات، تۆ ئێستا دەتوانی هەست بە ئازادی بکەیت. گوتی: دەترسم! پرسیم: بۆچی دەترسی؟ گوتی: لەبەر خۆم ناترسم، لەبەر گەنجەکان دەترسم. پرسیم: بۆچی؟ گوتی: لە کاری داعش! لێرە کەسانێک هەن پێی سەرسامن. ژمارەیەک توندڕەو دەیانەوێت مرۆڤایەتی و ئایین لەناوبەرن. عێراق وێران بکەن و کوردەکان بە کوشت بدەن.

چەند گەنجێک بە قیافەی داعشی لە گۆڕەپانی مزگەوتەکە بوون. گوتی: ئەمانە دەبینی؟ کوردەکان ئەم سەروسیمایەیان نییە. ئەمانە وەک داعش بیردەکەنەوە. ئەمانە هەموو ڕۆژێک بۆ بانگەشەی فیکرەی توندڕەوی دێنە مزگەوت. پرسیم: بانگەشە بۆ داعش دەکەن؟ گوتی: بەڵێ بەڵام بە ئاشکرا نا. دەیانەوێت هەموو دونیا بەکوشتبدەن. گوتی: ئەگەر لە شەقامەکاندا چاوبگێڕی ئەوانە دەبینی سەروسیمای خۆیان و هاوسەرەکانیان داعشانەیە و لە دوورەوە هاوار دەکەن. پیرەمێردەکە گوتی: من هەموو ڕۆژێک دێم بۆ مزگەوت، لە خودا دەپاڕێمەوە کە ئەو بیروباوەڕە لە زەینی گەنجەکانمان بە دووربێت. ئەو بیروباوەڕە هۆکاری هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆییە. هزری داعشی، هزری عەرەبییە نەک هزری کوردی.

ئێمەی کورد سەرەتا بیر لە مرۆڤبوون دەکەینەوە پاشان لە ئازادی، سەربەخۆیی و گەشەسەندنی کوردستان. دواتر لە دین. ئەو گوتی: من سەرەتا کوردم پاشان موسڵمان. من ئەم قسەیەم لە سەرەتای شۆڕشی ئێران لە زاری شێخ عێزەدینی حوسێنی مهابادی لە تەلەفزیۆنەوە بیستبوو.

پیرەپیاوەکە گوتی: داعشەکان کەسانی دەمارگیر و توڕەن و خاوەنی نیشتمانێک نین. سەرەتا بیر لە چوونە بەهەشت و پاشان لە ئیسلام و دین دەکەنەوە. لەلای ئەوان مرۆڤ و مرۆڤایەتی هیچ بەهایەکی نییە. ئەم جۆرە بیرکردنەوانە لای کوردەکان ڕەواجی نییە. بەڵام ئەگەر زۆر بانگەشەی بۆ بکەن، پێدەچێت کار لە مێشکی گەنجەکانمان بکات. ئەگەر پارەشیان هەبێت پێدەچێت ئایدیۆلۆژی خۆیان

پەرە پێبدەن. پیرەپیاو ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی: گەورەترین مەترسی بۆ مرۆڤایەتی، کوردستان و هەموو دونیاش تەنها بیری توندڕەوە بێ نیشتمانەکانە. چ داعش بن یان بۆکۆحەرام یان هەر گرووپێکی تر. لە پیرەمێردەم پرسی: ئێستا سەرقاڵی چیت؟ گوتی: من ئاژەڵدارم چەند سەر مەڕێکم هەیە. لەگەڵ نزیکەی سەد و بیست سەرێک مانگاش. موڵک و ماڵم هەیە و باخێکی دیکەشم هەیە. دوو کوڕیشم هەیە، کاسبن. من تەمەنم نەوەد و یەک ساڵە و دەتوانم کار بکەم. هەموو مانگێک چوار مەڕ سەردەبڕم، خواردن دروست دەکەم. خێر دەکەم. خواردن دەدەم بە خەڵکی. بۆ یادی ئەو پەنجا و هەشت کەسە شەهیدەی بنەماڵەکەم و بەیادی هەموو شەهیدانی کورد، خێری لێ دەکەم و خەڵکی بانگهێشت دەکەم. پێشتریش پێداویستی و کەلوپەلی زۆرم داوە بە پێشمەرگەکان. بەیادی هەموو جەنگاوەرانی دونیا خۆراک دەبەخشم. لەسەر مەنجەڵە خواردنەکان، نزا دەکەم، کە خودا ئەقڵ بدات بە توندڕەوەکان. نزادەکەم، هەمیشە یەکێتی و برایەتی کوردەکان پتەوتر بێت. گوتی: جەنگی ناوخۆ لە هەر جەنگێکی دیکە خراپترە. لە جەنگی کیمیاییش خراپترە، لە جەنگی ناوخۆیدا برا برا دەکوژێت.

ئەو پیرە تێگەیشتووە زانی ئێرانیم. پرسیی: خەڵکی کوێی ئێرانی؟ گوتم: خەڵکی (یەزد)م، بەڵام لە مەشهەد نیشتەجێم. پرسی: مەشهەد کە قەبری ئیمام ڕەزای لێیە؟ گوتم بەڵێ. گوتی: من ئەوانم خۆشدەوێ. پرسیم: تۆ دەروێشیت؟ گوتی: بەڵێ، من نەقشبەندییم. پرسیم: تا چەندت خوێندووە؟ گوتی: من مامۆستا بووم. بەردەوام ئاژەڵداری و کشتوکاڵیشم کردووە. ماوەی چل و پێنج ساڵ وانەم گوتووەتەوە. زانیم ئەم پیرەمێردە یەکێکە لە شێخەکانی نەقشبەندی و ناوی عەبدولڕەحمان ئەبوبەکر حەمە بوو. پیاوێکی ژیر و بە ویقار بوو. پرسیی: تۆ کارت چییە؟ گوتم: مامۆستای خانەنشینی زانکۆم و نووسەرم. پێم گوت بیرەوەرییەکانم بە زمانی کوردی سۆرانی وەرگێڕدراوە. ناوی کتێبەکەی پرسی و گوتی: بە دڵنیاییەوە دەیکڕم و دەیخوێنمەوە. ناونیشانی خۆی پێدام و خوڵکی کردم بۆ ماڵی خۆی. پێم گوت: ئێستا میوانم، ئینشائەڵلا بۆ جارێکی تر. گوتی: جارێکی دیکە کەیە؟ گوتم: لەوانەیە دوو ساڵی دیکە. پێکەنی و گوتی: بە ئومێدی خودا؛ من تەمەنم نەوەد و یەک ساڵە. خودا دەزانێ، تا چەند ساڵی دیکە دەمێنم کە دەڵێی دوو ساڵی دیکە؟ ئێستا بڕیاربدە و سبەینێ وەرە

بۆ لای ئێمە. پۆزشم بۆ هێنایەوە کە ناتوانم. بە حەسرەتێکی زۆرەوە ماڵاوایيم لەو پیرەمێردە دانایە کرد. ئاخۆ بتوانم جارێکی دیکە بە خزمەتی بگەمەوە.

تەها گەڕایەوە و گوتی: با بڕۆین، میوانەکان هاتوون. بۆ ئەوەی بگەینەوە ماشێنەکە دەبێت بە بازاڕی سەوزە و میوەفرۆشەکاندا تێپەڕین. میوەفرۆشێک هەناری زۆر گەورەی دەفرۆشت. توێکڵی هەنارەکان تەنک و جوان بوون. حەزم لە هەنار کرد. هەناری نەورۆزانە. دەمەویت هەنار بکڕم؛ بەڵام گرانە. تەهاش لەگەڵماندایە. بیرم کردەوە ئەگەر هەنار بکڕم تەها پارەکەی دەدات. بڕیار بوو هاوسەرەکەم و فەربود، تەها سەرقاڵ بکەن، تا من چەند هەنارێک بکڕم. ئێستا ئیتر پارەم پێیە.

نزیکەی دە هەنارێکم هەڵبژارد. تەها کە زانی خەریکی هەنار کڕینم، وەک هەڵۆ خۆی گەیاندە لامان و پارەی هەنارەکانی دا و گوتی: تۆ میوانی ئێمەی. چۆن دەبێت پارە بدەیت. کەوتینە ڕێ بەرەو ماڵ. ماڵی تەها لە گەڕەکێکی تازە دروستکراوی دوور لە نێوەندی شارە. شەقامەکانی شار پڕن لە جوانی. باڵەخانەکانی تازە و تۆکمەن. چەندین باڵەخانەی دیکەش لە دروستکردندان. شار لە فراوانبووندایە. گەشەسەندنی شار بە هۆی گەشەسەندنی ئابوورییەوەیە.

چەند کەسێک لە خزمەکانی تەها هاتوون بۆ لای ئێمە. لە نێوان ئەوانەدا پێنج کەسیان کتێبی "شازادەی حەمام"یان خوێندووەتەوە. هەڵبەت "شازادەی حەمام" بە زمانی کوردی. نادری مەلا سەفیش هاتووە. نادر برای قادر و عەبدولواحیدە. ناوی تەواوی خۆی نادر مەحموود حەمەیە. هاوسەری نادر، کچی خاڵی تەهایە. کوڕەکەشیان، کارزان و کۆچەری هاوسەریشی هاتوون. "گەڵا" کچی کارزان، قوتابی پۆلی یەکی سەرەتاییە، کچێکی زمانشیرین و جوان و میهرەبانە. هۆنراوەیەکی بە زمانی ئینگلیزی بۆ ئێمە خوێندەوە. نەوەی ئێستا لە هەموو شوێنێک خەریکی فێربوونی زمانی ئینگلیزیین. نادر، کتێبی "شازادەی حەمام"ی خوێندووەتەوە و چەند بەشێک لە کتێبەکەمان بۆ باس دەکات. نادر و براکانی قادر و عەبدولواحید جوتیارن. خاوەنی کێڵگەیەکی چەند سەد دۆنمین لە دەوروبەری شارۆچکەی ڕانیە. خولکمان دەکەن کە بچین بۆ کێڵگەکەیان. کارزان گەنجێکی زۆر میهرەبانە. دیارە کە کوڕی کار و کاسپییە. ئەویش خولکمان دەکات بۆ ماڵی خۆی. کۆچەر دوگیانە. خاتوونێکی

هوشیار و میهرەبانە. ئەویش خوڵکی هاوسەرەکەم دەکات کە بچین بۆ کێڵگەکەیان. دەڵێت: ئەگەر بێن بۆ ڕانیە، کەشێکی خۆش بەسەردەبەین. "گەلا"ش دەڵێت :دەبێ هەر بێن. من زۆر دڵخۆشبووم بە بانگهێشت و سەردانی کێڵگەکەیان. دڵخۆشم کە "شازادەی حەمام" لەنێو کوردەکانی سلێمانی‌یش خوێنەری هەیە. خوێنەری دڵسۆز کە دێن بۆ دیداری من و بانگهێشتم دەکەن. هەموو مرۆڤێک بە خوڵککردن خۆشحاڵ دەبێت. بەتایبەت ئەگەر ئەو خوڵکە، لە دڵەوە بێت و لە ئاکامی خوێندنەوەی پەرتووکی نووسەرەوە بێت.

تەها بۆ نانی نیوەڕۆ میوانی هەبوو، سی و چوار نەفەر لە سەر خوانەکە بوون. "شەمسە" نیوەڕۆخوانێکی ڕازاوەی ئامادە کردبوو. "پەیام"ی بووکی تەهاش زۆر هاوکاری دەکرد. پەیام کچی یاسینی برای تەهایە. بووک و زاوا، ئامۆزای یەکترن. بارین کچی پەیامە. لەسەر خوانەکە کەس فارسی نازانێت. تەها قسەکانمان بۆ وەردەگێڕێت. ئەوانەی دەوری خوانەکە هەموو کەسوکاری یەکترن.

پاش وچانێکی کورت، بەرەو بازاڕی کتێبفرۆشان دەڕۆین. سلێمانی شارێکی کەلتوورییە. شاری ڕووناکبیرییە. هەر لە کۆنەوە شاری ڕووناکبیریی بووە. لە نێو کوردەکاندا بابەتی زانستی، فەلسەفی، ئایدیۆلۆژی، ئەدەبی و هونەری، هەمیشە ڕەواجی هەیە. سلێمانی پێگەی تایبەتی هەیە لە فراوانکردن و بەرەوپێشبردنی زانست، ئەدەب و کەلتووری هەرێمی کوردستان. ڕێکخراوە هونەریی و ئەدەبییەکان لە سلێمانی زۆرن. لە نێوان ڕووناکبیرانی کوردستان و بەتایبەت سلێمانی، دیالۆگی سیاسی جێگەیەکی تایبەتی هەیە. ئەم دیالۆگە بە درێژایی ڕۆژگار، بەرەوپێش چووە. سەردەمێکی درێژ، دیالۆگی ناسیۆنالیستی گەشەی کرد. ئێستاش دیالۆگی ناسیۆنالیستی لایەنگرێکی زۆری هەیە. دیالۆگی چۆنێتی گەیشتن بە ئازادی، یەکسانی، دادپەروەریی، خۆبەڕێوەبەری و سەربەخۆیی، زۆر فراوان بووە و هەیە. لە سلێمانی و کوردستان دیالۆگی کۆمەلایەتی و چینایەتی و جێندەری شوێنی تایبەتیان هەیە. لەم هەرێمە هەمیشە سەبارەت بە ڕۆڵی ژنان لە کۆمەڵگە، گفتوگۆ کراوە. هەر ئەو گفتوگۆ تیۆریی و هزییانەیە کە پێگەیەکی کەلتووری تایبەتی داوەتە سلێمانی. بەهەمان شێوە، ئامادەیی ژنان لە مەیدانەکانی خەباتی سیاسی، یاسایی، سەربازی و ئابووریی‌دا

جێگەی بایەخ و گرنگی پێدانە. ڕەنگە لە تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە هیچ شوێنێک بە ئەندازەی کوردستان ژنان ڕۆڵیان نەبێت. ئامادەیی ژنانی پێشمەرگە، خۆی لەخۆیدا دەرەنجامی دیالۆگی ڕووناکبیرییە. لە تەواوی عێراق و ناوچەکەدا. ژنانی جەنگاوەر ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە بەرزکردنەوەی پێگەی ژنان. بێگومان نەوەی نوێی کورد کە زمانەکانی (ئینگلیزی، عەرەبی، فەرەنسی، ئیسپانی، ئەڵمانی، سویدی، نەرویژی و هوڵەندی و..) بە باشی دەزانن. پێگەی کوردستان لە دیبەیتە ڕۆشنگەریی و ڕووناکبیرییەکانی دونیادا بەرز ڕادەگرن.

کتێبگەلێکی زۆر لە هەموو زمانەکانەوە، کراون بە کوردی. ژنانی کورد وەک ئازادترین و شەڕکەرترین ژنانی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەتوانن ڕۆڵێکی گرنگتر ببینن لە پێشکەشکردنی مۆدێلی ئازادیی ژنان لە جیهاندا.

زانکۆی سلێمانی یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی زانست و ڕووناکبیری و خەباتی ئازادیخوازیی لە کوردستان و عێراقدا. ئەم زانکۆیە، پێگە و ناوبانگێکی جیهانی هەیە. هەم بەهۆی پێگەی زانستی و هەم بەهۆی پێگەی لە خەباتی ئازادیخوازیدا.

لەگەڵ تەها و دکتۆر وسوقی و فەربود پاپولی دەچینە نێوەندی شار. سەردانی چەند کتێبخانەیەک دەکەین. پاشان تەها دەمانبات بۆ بازاڕی کتێبفرۆشان. لەڕاستییدا چاوەڕێم نەدەکرد ئەم هەموو کتێبخانەیە لە سلێمانی هەبێت. کتێبخانەکان فراوان و پڕ کڕیارن. خەڵک بەتایبەت گەنجان لە نێو کتێبخانەکاندا زۆر بوون. لە هەندێکیاندا مێز و کورسی تێدا بوو. ژمارەیەک دانیشتبوون و کتێبیان دەخوێندەوە. ژمارەیەکیش وتووێژیان دەکرد.

دەچینە "کتێبخانەی غەزەلنووس". کتێبخانەیەکی گەورەیە. ڕووبەرەکەی سەد و پەنجا مەتر چوارگۆشەیە. مێز و کورسییان بۆ کڕیارەکانیان دانابوو. خاوەنی کتێبخانەکە ناوی محەمەد ساڵحە. لە سلێمانی هاتۆتە دونیاوە. لە مناڵییەوە هۆگری کتێب بووە. فارسیش باش دەزانێت. لە ساڵی ١٩٨٧ تا ٢٠٠٥ لە سەردەشت ژیاوە. هاوژینەکەی خەڵکی سەردەشتە. زۆرێک لە کوردانی عێراق هاوسەرەکانیان کوردی ئێرانە و بە پێچەوانەشەوە. تەها من بە محەمەد ساڵح دەناسێنێت. ئەو من لە ئامێز دەگرێت. کتێبی "شازادەی حەمام"ی خوێندبووەوە. کتێبەکەشی دەفرۆشت. فەرمووی

لێکردین دابنیشین. "دکتۆر وسوقی" دەڵێ: سەرەتا ڕوخسەتمان بدە کتێبەکانتان ببینین.

سەیری ڕەفەکانی کتێبخانەکە دەکەین. کتێبەکان زۆر بەڕێکوپێکی ڕیزبەندی کراون. کتێبی مێژوویی، ئایدیۆلۆژی، ئەدەبی، هۆنراوە، ڕۆمان، کۆمەڵناسی، مرۆڤناسی و هی دیکەش. کتێبی وەرگێڕدراو لە زمانە ئەورووپییەکان و ڕووسییەوە بۆ کوردی زۆرن. زۆربەی کتێبەکان بە کاغەزی زۆر باش چاپکراون و بەرگی کتێبەکان سەرنجڕاکێشن. محەمەد ساڵح، چەند ڕوونکردنەوەیەکمان دەداتێ. مێژووی وەرگێڕانی کتێبەکان دەزانێت. خولکمان دەکات دابنیشین. سەبارەت بە کتێب و کتێب خوێندنەوە لە سلێمانی بۆمان دەدوێت. دەڵێت: خۆشبەختانە لە سلێمانی خوێنەرێکی زۆر هەیە. بەتایبەت گەنجان کە زۆر بە گەرمی پێشوازی لە کتێب دەکەن. ئەم کتێبخانەیە بەشێکی دیکەشی لە "سینەما سالم" لە "شەقامی سالم" هەیە. محەمەد ساڵح، بەهۆی جەنگ و نائارامی سەردەمی سەدامەوە دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە. ئەو بە لاوی بووەتە پێشمەرگە. لە کوردستانی عێراق کەسانی هاوتەمەنی تەها و محەمەد ساڵح زۆرن، کە بە هۆکاری جەنگ وماڵوێرانی سەردەمی سەدام، وازیان لە خوێندن هێناوە. یاخود هەرگیز نەچوونەتە بەر خوێندن. محەمەد نەیتوانی بوو ئامادەیی تەواو بکات. بەناچاری وازی لە قوتابخانە و خوێندن هێنابوو، ببووە پێشمەرگە؛ بەڵام هەمیشە کتێبی خوێندووەتەوە. لە ئێران لەگەڵ خوشکەزاکەی کاری کەلتووریی کردووە. لە سەردەشت، بانە و بۆکان لە بواری کتێبدا چالاک بووە. ئەنجومەنێکی ئەدەبی چالاک و کتێبفرۆشی هەبووە. کاتێک سەدام لە ١٩٨٧/٦/٢٨ سەردەشتی کیمیاباران کرد، محەمەد ساڵح یش بەرکەوتەی چەکی کیمیایی بووە. نزیکەی دوو هەفتە بەتەواوی نابینا بووە. دواتر چاوەکانی چاک بوونەوە. محەمەد ساڵح چالاکوانێکی بواری ڕووناکبیری کەرتی تایبەتە لە شاری سلێمانی.

دکتۆر وسوقی لێی پرسی: بۆچی لە کتێبخانەکەتاندا کتێبی ئایدیۆلۆژی زۆرە؟ ئایا هێشتا ئەم کتێبانە کڕیاریان هەیە؟ محەمەد ساڵح دەڵێت: لە کوردستان، تا پێش خرۆشۆڤ، پارتە چەپەکانی لایەنگری ڕووسیای شورەوی زۆر بوون. زۆر کتێبی بنچینەی ئایدیۆلۆژیا و ڕۆمانی ڕووسی، وەرگێڕدران بۆ کوردی. زۆرێک لە

ڕووناکبیران و خەباتگێڕانی کورد، ساڵانێک لە ڕووسیا بوون. مەلا مستەفا بارزانی ماوەی یازدە ساڵ لە ڕووسیا بوو. لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا، قازی محەمەد بەپشتیوانی ڕووسیا لە مەهاباد حکومەتێکی سەربەخۆی کوردی ڕاگەیاند. مەلا مستەفا بە فەرمانی قازی محەمەد بوو بە ژەنەڕاڵ. لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا پەیوەندی ڕووناکبیرانی چەپی کورد لەگەڵ ڕووسیا فراوان بوو. واتا زەمینەی وەرگێڕانی کتێبی ئایدۆلۆژیی، زۆرتر بوو. کتێبە ئایدیۆلۆژییەکان زۆر بە هەرزان دەگەیشتنە دەستی خەڵک. ئەو دەڵێت: لە ئێرانیش بارودۆخ هەر بەو شێوەیە بوو. حیزبی تودە، چەندین ڕۆژنامەی هەبوو. تودەییەکان کتێبی زۆریان چاپ دەکرد. ساڵی ١٩٣٠-١٩٦٠ چەپەکانی لایەنگری شۆڕەوی لە کوردستان، بەهێز بوون. بە دەرهاویشتەکانی خروشۆڤ پارتە چەپەکانی کوردستان پاشەکشەیان کرد. لەگەڵ ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت، ئیتر کەس لێرە هەواداری کۆمۆنیزم نییە؛ بەڵام کتێب و توێژینەوەی زۆر لە بواری ڕەخنەی مارکسیزم و سۆسیالیزم چاپ دەکرێ. کەسانێک ئەم کتێبانە دەکڕن. بازاڕی ڕەخنەی زانستی مارکسیزم، گەرمە. کتێبی کۆمەڵناسی و ڕۆمان کڕیاری باشیان هەیە. ئەو کتێبانەش کە دەربارەی مێژووی کوردستانن، بە هەمان شێوەن. هەروەها کتێبێکی زۆر هەیە دەربارەی ناسیۆنالیزمی کوردی.

محەمەد ساڵح درێژەی پێدەدات و دەڵێت: لە سەردەمی سەدامدا خەبات لە پێناو ناسیۆنالیزمی کورددا نەبوو. خەبات لە پێناو ئازادیدا بوو. لەو کاتەدا، خەبات لەسەر بنەمای عەقڵگەرایی و "یزم" ـەکان نەبوو. خەباتێکی ناچاری بوو. دیکتاتۆرەکان خەڵک ناچار دەکەن خەبات بکەن. ئەو دەڵێت کێشەی ئێمە، ڕکابەری هێزە گەورەکان و هێزە ناوچەییەکانە، کە ئەم ڕکابەرییە بووەتە هۆی ناکۆکی ناوخۆیی. لە بارەی فەلسەفە و مێژووەوە، قسەمان بۆ دەکات. دەڵێ ئێمە لە سێ هەزار ساڵ پێش ئێستاوە هەر بەرەو داڕووخان دەچین. یۆنان کە نێوەندی فەلسەفە بوو ڕووخا. میسریش کە نێوەندی حوکمداری، هێز و دەوڵەتداری فیرعەونەکان بوو، لەنێوچوو. کوردستان کە شوێنی داهێنان و دۆزینەوە و بەکارهێنانی ئاسن و ناسینی گژوگیا وماڵیکردنی ئاژەڵ بوو دواکەوت. ئێمە هەرەسمان هێناوە، بەڵام خۆمان نازانین. ئەو درێژەی پێدەدات و دەڵێ هەڵکەوتەی جوگرافیای کوردستان زۆر زیانی پێگەیاندووین و پێمان

دەگەیەنێت. دەڵێ ئێمەی کورد زلهێزەکانمان خۆشناوێت. ئەوان لەپێناو ڕکابەری و بەرژەوەندی خۆیان لە کوردستانن. بەڵام ئێمەش سوود لە بوونی ئەوان وەردەگرین. دەڵێ سوودوەرگرتن لە بوونی زلهێزەکان، هونەری دیپلۆماسییە. زۆربەی خەڵکی کوردستان لە ڕۆیشتنی زلهێزەکان نیگەرانن. محەمەد ساڵح دەڵێ بەشی هەرە گرنگی ئازادی کوردەکان لە ژێر دەستی سەدام، بەهۆی دەستتێوەردانی هێزەکانی ئەمریکاوە بوو.

لێی دەپرسم: ترسی سەرەکی ئێوە چییە؟ دەڵێ ئاشکرایە. ئیسلامییە توندڕەوەکان. لایەنگرانی داعش و ئەلقاعیدە. مەترسی لە جەنگی ناوخۆیی، کە هەمیشە بەرۆکی کوردستانی گرتووە. ئێمە چەندین جار ئەزموونی جەنگی ناوخۆییمان هەیە. هیوادارم ئەم ئەزموونانە ڕێگربن لە دووبارەبوونەوەی جەنگەکانی ئایندە؛ وەلێ لە ئێستادا مەترسی ئیسلامییە توندڕەوەکان، لە پێش هەموویانەوەیە. ئەو ڕوونکردنەوەی زیاتر دەربارەی هەوڵەکانی داعش تا کاریگەریان لەسەر گەنجەکان هەبێت، دەدات.

لە دەوری مێزەکە دانیشتووین و گفتوگۆ دەکەین. محەمەد ساڵح، پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ ئێران هەیە. هەموو ساڵێک بەشداری لە پیشانگەی کتێبی تاراندا دەکات. کتێبێکی زۆر دەکڕێت و دەیهێنێتە بۆ هەرێمی کوردستان. ئەو خوڵکم دەکات و دەڵێت: هەر کتێبێک دەتەوێت، پێم بڵێ تا پێشکەشتان بکەم. زۆر سوپاسی دەکەم. دەڵێم کتێبە فارسییەکان، لە ئێرانیش هەن. کتێبە کوردییەکانیش من ناتوانم بیانخوێنمەوە. ئێمە نزیکەی سێ کاتژمێر لەو کتێبخانەیە بووین. لە نزیک کاتژمێر ٦:٣٠ ی ئێوارە، کتێبخانەی غەزەلنووس بەجێدەهێڵین. ڕووناکبیرانی کوردستان قسەی زۆریان هەیە بۆ وتن و زۆر ئارەزووشیان هەیە بۆ نووسین. بەهیوای دیدار، ماڵاوایی لەو پیاوە ژیرە بەئەزموونە دەکەین.

تەها لە شار دەمانباتە دەرەوە. جادەیەکی قیری پێچاوپێچ دەگرینەبەر، دونیا تاریک بووە. هەتا بەرەو بەرزایی سەرکەوین هەوا ساردتر دەبێت. لە هەندێک شوێن جادەکە فراوان کراوە. دیمەنی جوانی شار لەو بەرزییەوە زیاتر دەردەکەوێت. لە کەناری ڕێگاکەوە، کۆشک و دوکانی بچووک بچووک دروست کراون. ئەم ڕێگایە بووەتە ناوچەیەکی گەشتیاری بۆ شاری سلێمانی. خەڵکی بە خواردن و خواردنەوە

و سەیرکردنی دیمەنی شارەوە سەرقاڵن. لەگەڵ ئەوەی هەواش ساردە، ژمارەیەک ماشێن و خەڵکێکی زۆر بۆ خۆشیی هاتوونەتە دەرەوەی شار. تەها دەمانبات بۆ بەرزترین شوێنی گۆیژە. ئەو کێوەی سلێمانی لە ئامێز گرتووە. هەمان ئەو کێوەی لە قەدپاڵەکەیدا نەخشەی کوردستان بە ڕەنگەکانی ئاڵای کوردستان نەخشێنراوە. ئەگەر بەودیوی کێوەکەدا شۆڕبینەوە دیمەنی سلێمانیمان لە بەرچاو ون دەبێت. لە بەرزایی کێوەکە شوێنێکی فراوان و لەبار هەیە بۆ ڕاگرتنی ماشێن. تەها دەیەوێت ساردەمەنیمان بۆ بکڕێت، هەموومان ناڕازین. ئەم پیاوە، چەند بەسۆز و میواندۆستە.

ئاشکرایە دۆخی ئابووریی خەڵک زۆر باشە. زۆربەی ماشێنەکان مۆدێل بەرزن. خەڵک پۆشاکی گرانبەهایان پۆشیوە. خودا بکات ئەم خۆشی و شادییە هەژاری بە دواوە نەبێت. لە بەرزایی کێوەکە، هەوا ساردە. بەڵام تا ڕادەیەک قەرەباڵغە. شەوە، گڵۆپەکانی شار داگیرساون. سلێمانی شارێکی جوان و سەرنجڕاکێشە. بۆ جارێکیش بێت پێویستە سەردانی بکەن. بیردەکەمەوە ئەگەر بمەوێت بە هەندێک لایەنەکانی ئەم شارە ئاشنابم، دەبێت دوو ساڵ لە سلێمانی بژیم. خۆ ئەگەر بمەوێت بە ڕوحی شار ئاشنابم، دەبێت تا کۆتایی تەمەنم لەوێ نیشتەجێی بم.

**زانکۆی سلێمانی**

ویستمان سەردانی زانکۆی سلێمانی بکەین. زانکۆکان لە ڕۆژانی نەورۆزدا، پێنج ڕۆژ پشوویانە. بەرنامەی سەردانەکەمان خرایە ڕۆژی ٢٠١٩/٣/٢٥ واتە یەکەم ڕۆژی دەوامی دوای پشووی نەورۆز. تەها و ساڵح بێچار هەماهەنگی پێویستیان ئەنجام دابوو. دکتۆر ئەرکان عەبدوڵڵا مەحموود، سەرۆکی بەشی زمان و ئەدەبیاتی فارسییش، کارئاسانی نێو زانکۆی بۆ فەراهەم کردین. دکتۆر ئەرکان لە زانکۆی تاران خوێندویەتی. کتێبی "شازادەی حەمام" ی خوێندبووەوە. منی وەک نووسەرێک دەناسی. زانکۆی سلێمانی لە هەرێمی کوردستان، بە زانکۆی دایک دەناسرێت. لە ساڵی ٢٠٢٠ دا نزیکەی ٢٥ هەزار خوێندکار و دوو هەزار مامۆستای ئەکادیمی هەبوو. کۆلێژی پزیشکییش سەر بەزانکۆی سلێمانییە. لە ئێرانیش تا ساڵانی (١٩٨٥-١٩٨٦ز)

بە هەمان شێوە بوو. هەر لەو ساڵەدا زانکۆی زانستی پزیشکی خۆی لە (وەزارەتی زانست و توێژینەوە و تەکنەلۆژیا) جیاکردەوە. بڕیار بوو سەرەتا سەردانی سەرۆکی زانکۆی سلێمانی بکەین و پاشان بە ناو زانکۆدا بگەڕێین.

کاتژمێر دەی بەیانی چووینە نێو کەمپی زانکۆوە. زانکۆیەکی گەورە و تەواو نوێ. زانکۆیەک کە پێشینەی خەباتی مامۆستایان و خوێندکارانی، هەر خۆی چیرۆکێکی دووروودرێژە. زانکۆی سلێمانی چەق و پشتیوانی باسوخواسە هزری و ڕووناکبیرییەکانی کوردستانی عێراق بووە و هەیە و دەبێت.. زانکۆی سلێمانی لەسەر زەوییەکی تەخت بونیاد نەنراوە. (بەرزییەکەی لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە ٨٥٠ مەترە) تەلاری سەرۆکایەتی زانکۆش تازە دروست کراوە. ژووری سەرۆکی زانکۆ لە نهۆمی دووەمە. ڕاڕەوەکانی فراوان و پلیکانەکانی پان و ڕێک و جوان، دروست کراون. کۆمەڵێک تابلۆی دانسقە لە ڕێڕەو و پێپلیکانەکاندا، هەڵواسراون. ئەو تابلۆیانەی کە هەر یەکەیان، کۆمەڵێک چەمکی لەبارەی ناسنامەی ڕابردوو و ئێستای هەرێمی کوردستانەوە لەخۆگرتووە. بوونی ئەم تابلۆیانە، سەلیقە و خولیای بەرپرسانی زانکۆ دەگەیەنێ. هاوکات بەها و بایەخێکە کە بەرپرسانی زانکۆ بە هونەری دەدەن. چووینە نێو نووسینگەی سەرۆکی زانکۆ. نووسینگەیەکی زۆر جوان و خاوێن، کارمەندانی ڕووخۆش و جوانپۆش، لە چاوەڕوانی ئێمەدا بوون. لەکاتی دیاریکراودا گەیشتین. بەبێ هیچ ڕاگرتنێک چووینە ژووری سەرۆکی زانکۆ. پرۆفیسۆر دکتۆر ڕەزا حەسەن حسێن، سەرۆکی زانکۆ، پیاوێکی میهرەبان و بەڕێزە. پسپۆڕی بایۆلۆژییە. یەکێکە لە دیارترین توێژەران و زانایانی بایۆلۆژی لە وڵاتی عێراق و ناوچەکەدا. بەڕێزیان وەک کەسێکی ڕووناکبیر و لیبراڵ هاتە پێش چاوم. درکم کرد زانایەکی خاوەن دیدێکی فراوان سەرۆکی زانکۆی سلێمانییە. پرۆفیسۆر دکتۆر ڕەزا حەسەن حسێن توانیویەتی زۆرترین ئاسانکاریی بۆ زانکۆکەی فەراهەم کات. پەیوەندی فراوان لەگەڵ نێوەندە زانستییەکانی جیهاندا ببەستێت و زانکۆی سلێمانی لەسەر ئاستی ناوخۆ و نێودەوڵەتی زیاتر بباتە پێش. دەسەڵات و ئازادی زانستیی، تەکتیک و بەڕێوەبردنی باشی سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی نەک هەر بووەتە هۆی پێشکەوتنی زانستیی زانکۆ، بەڵکو بووەتە مایەی پێشکەوتنی زانستیی هەرێمی کوردستان و عێراقیش.

ئازادی بە بەڕێوەبردن و دەستپێشخەریی زانستییەوە پەرە بە پێشکەوتنی زانستیی و کەلتووریی زانکۆ دەدات. زانکۆیەکی پێشکەوتوو دەتوانێت ببێتە پاسەوانی ئازادی و بنکەی ئازادیخوازانی کوردستان و عێراق. ئارەزووم دەکرد کەسانی وەک پرۆفیسۆر دکتۆر "ڕەزا حەسەن حسێن" لە سەرۆکایەتی زانکۆکانی جیهاندابن.

سەرۆکی زانکۆ، تەمەنی پەنجا ساڵ دەبێت. دکتۆر ئەرکان، من، دکتۆر وسوقی، فەربود، تەها و ساڵح بێچاری پێدەناسێنێت. سەرۆکی زانکۆ زۆر بە میهرەبانییەوە گوێ بۆ قسەکانی دکتور ئەرکان، سەبارەت بە من و کتێبی "شازادەی حەمام" ڕادەگرێت. دکتۆر ئەرکان، تیشک دەخاتە سەر بایەخی ئەو بەشانەی کتێبەکە کە سەبارەت بە کورد نووسراون. سەرۆکی زانکۆ دوای باسکردنی مێژووی زانکۆی سلێمانی و چالاکییەکانی ئێستای، زەمینەی هاوکاری لەگەڵ زانکۆکانی ئێراندا بۆ باس کردین. زانکۆی سلێمانی کۆمەڵێک لێکتێگەیشتنی لەگەڵ (وەزارەتی زانست، توێژینەوە و تەکنەلۆژیا) و زانکۆ جۆراوجۆرەکانی دیکەی ئێراندا هەیە. زانکۆی سلێمانی لەگەڵ زانکۆکانی دیکەی عێراق، ئەوروپا و ئەمریکاشدا لە پەیوەندیدایە. پەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ زانکۆی زانستە پزیشکییەکانی تاراندا هەیە. هەروەکچۆن لەگەڵ زانکۆکانی مەشهەد، هەمەدان، سەنعەتی هەمەدان، گەیلان، کرماشان و کوردستان -سنە- شدا، پەیوەندی باشی هەیە. بەرنامەی سەردانە کارگێڕیی و زانستییەکانی نێوان زانکۆی سلێمانی و زانکۆکانی ئێران بە بەردەوامی بەڕێوەدەچێت. ٢٠١٨/١٢/٢٩ تیمێکی ئوستادانی زانکۆی سلێمانی سەردانی زانکۆکانی تهران، وەک زانکۆی ئازادی کەرەجیان کرد. ئەم تیمە پێکهاتبوو لە (د. عەبدولقادر حەمەدەمین سەرۆکی کۆلیژی زمان، د. شەمال عەبدول محەمەد سەرۆکی کۆلیژی زانستە ئیسلامییەکان، د.سەلام عەبدولکەریم سەرۆکی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، د. محەمەد نەجیب سەباح بەرزنجی) کە لە ئوستادە ناسراوەکانی زانکۆی سلێمانی بوو.

لەکارنامەی پرۆفیسۆر دکتۆر ڕەزا حەسەن حسێن، سەردانێکی زانکۆی گەیلان بۆ مایسی ٢٠١٩ ڕێکخرا بوو. دکتۆر ئەحمەد حەمەئەمین، ڕاگری کۆلێژی کشتوکاڵ کە لە سەردانی سەرۆکی زانکۆدا هاوڕێمان بوو. بەڕێزیان کتێبی "شازادەی حەمام"ی خوێندبووەوە، لەبەرئەمەش ڕێزی نواند و لەگەڵماندا هات بۆ ژووری سەرۆکی زانکۆ.

بەڕێزیان بەرچاوڕوونییەکی لەبارەی کتێبی شازادەی حەمام بۆ سەرۆکی زانکۆ خستەڕوو. پرۆفیسۆر ئەحمەد محەمەدەمین، یەکێکە لە ناسراوترین ئوستادەکانی کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی سلێمانی. تەها بەرگی یەکەم و دووەمی "شازادەی حەمام"ی چاپی کوردی، پێشکەشی سەرۆکی زانکۆ کرد. من ئومێدم خواست پەیوەندی نێوان زانکۆی سلێمانی و زانکۆکانی ئێران زیاتر بێت. باس لە گرنگی زانکۆی سلێمانی لە پشتیوانیکردنی دەستکەوتەکانی ئازادی خەڵکی کوردستان، دەکەم. ئەوەم خستەڕوو کە زانکۆی سلێمانی لەپێناو بەدیهێنانی ئازادی ڕێگایەکی سەختی بڕیوە. هیوادارم زانکۆ هاوکات لەگەڵ بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی زانستی سەردەمدا، بە هەمان شێوە ڕۆڵی هەبێت لە پاراستنی کەلتووری کوردستان، بەتایبەتی پاراستنی میراتی کەلتووری و خەباتی هەرێمی کوردستان و زیندوو ڕاگرتنی یادەوەرییەکانی لەبەرچاوی گەنجان، لە هەموو کاتێک سەرکەوتووتر بن. تەها بە سەرۆکی زانکۆ دەڵێت: دکتۆر پاپولی دەیەوێت کتێبێک دەربارەی هەرێمی کوردستان بنووسێت. دکتۆر ڕەزا سەرۆکی زانکۆ، لوتف دەکات و دەفەرموێت هەر کات کتێبەکە ئامادەبوو، زانکۆی سلێمانی ئەرکی لە چاپدانی دەگرێتە ئەستۆ. بەڕێزیان بە بەڕێوەبەری نووسینگەکەی دەڵێت کە ئێمە بۆ نانی نیوەڕۆ میوانی فەرمی زانکۆی سلێمانین و خۆیشی داوای لێبوردنی کرد کە لەبەر سەرقاڵی بە کاری کارگێڕیی ناتوانێت لەگەڵمان ئامادەی نیوەڕۆخوانەکە بێت. نزیکی کاتژمێر یازدە بەدەم وێنە گرتن و هیواخواستنی پێشکەوتنی بەردەوام بۆ زانکۆی سلێمانی، ژوورەکەی دکتۆر ڕەزا حەسەن حسێن جێدەهێڵین.

ئارەزووەدەکەم سەردانی کتێبخانە و بەشەکانی دیکەی زانکۆی سلێمانی بکەم. یەکەم ڕۆژی دەوامی دوای پشووی نەورۆزە. لەنێو زانکۆدا ژمارەیەکی زۆر خوێندکار دەبینران. لاوانی خوێندکار جلوبەرگی جوان و ڕەنگاوڕەنگیان پۆشیوە. پۆشینی ئەو جلانە نیشانەی ئازادییانە. هەر کەس ئەو جلوبەرگەی پۆشیوە کە خۆی ئارەزووی دەکات. ژمارەی کچانی باڵاپۆش زۆرە. خوێندکارە کوڕەکان کە جلی کوردییان پۆشیوە کەمن. کەشخەیی خوێندکارە گەنجەکان نەشئە و شادی بە من دەبەخشێت. سەردانی تەلارە جیاوازەکانی زانکۆ دەکەین. هەموویان بەرز و تاڕادەیەک هاوشێوەی یەکترن. هێشتا لەنێو زانکۆدا خەریکی دروستکردنی تەلاری دیکەن. ڕووکاری تەلارەکان بە

خشتی ڕەنگاوڕەنگ دروست کراون. تەلار و حەوشەی زانکۆ، بۆخۆی جۆرێک شادی بە مرۆڤ دەبەخشێت. ڕۆژی یەکەمی دوای پشووی نەورۆزە؛ بەڵام خوێندکاران هاتوونەتە نێو پۆلەکانیان. مامۆستایان سەرقاڵی وانەوتنەوەن. من و دکتۆر و سوقی لەگەڵ چەند خوێندکارێک گفتگۆ دەکەین. دکتۆر ئەرکان، تەها و ساڵح بێچار بابەتەکان وەردەگێڕن. ئەو خوێندکارانە کە قسەمان لەگەڵدا دەکردن زۆر گەشبین و پڕ لە هیوابوون. ئەوان کاتێک یەکیان دەبینی لەگەڵ تەوقەیان دەکرد، یەکدییان لە ئامێز دەگرت و دەمبەخەندە بوون. هیچ خوێندکارێکی بێ هیوا و ڕەشبینم نەبینی. دڵخۆشی، گەشبینی و هیواداریی نەوەی نوێ، یەکێکە لە پایە بنچینەییەکانی پێشکەوتن. وڵاتێک کە لاوەکانی هیوادار و دڵخۆش نەبن، نابێت چاوەڕێی گەشەسەندنی بەردەوام، بەرهەمهێنان، ڕاستگۆیی و ڕاستی بکرێت. لە وڵاتێکدا ئەگەر لاوەکانی دڵخۆش نەبن، کۆچکردنی خاوەن بڕوانامە و دەوڵەمەندەکان زۆرترە. بەو گفتوگۆیەی کە لەگەڵ خوێندکارەکاندا کردمان، سەرنجی ئەوەمان دا زۆربەیان ئەهلی خوێندنەوەن. جگە لە وانەکانی خۆیان زانیارییان لەسەر جیهان، ناوچەکە، عێراق و کوردستان هەبوو. زۆربەیان ئاگاداری مێژووی پڕ لە بەرەنگاری زانکۆکەیان بوون. دەیانزانی کە لە چ زانکۆیەک و بە چ باکگراوندێک دەخوێنن. لەوەش سەرنجڕاکێشتر، زۆرێک لە خوێندکارەکان بە ئینگلیزی قسەیان دەکرد.

دەچین بۆ کۆلێژی زمان. بڕیارە لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولقادر حەمەئەمین محەمە، ڕاگری کۆلێژی زمان یەکتر ببینین. ژووری ڕاگر زۆر شیک و پاک و خاوێنە. سکرتێرەکەشی زۆر بەڕێزە. پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولقادر پسپۆڕی زمانی کوردییە. ئەو لەم بەشەدا وەک کەسێکی بەئەزموون ناسراوە. دکتۆر ئەرکان ئێمە بە ئەوان دەناسێنێت. دەربارەی بابەتە هاوبەشەکان گفتوگۆ دەکەین. بەڕێزیان لەبارەی کۆلێژ و بەشە جۆراوجۆرەکانەوە بەکورتی دەدوێت. ئەو گەرمی و لوتفەی لە ژووری سەرۆکی زانکۆ هەبوو، لێرە نییە. ماڵاوایی لە دکتۆر عبدولقادر دەکەین و بەرەو بەشی زمان و ئەدەبی فارسی دەڕۆین. کاتژمێر لە دوازدە لایداوە. خوێندکارەکان بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ ڕۆشتوون. هەموو مامۆستایان لە بەش ئامادەن، کە بریتی بوون لە:

.١دکتۆر ئەرکان عەبدوڵلا مەحموود - سەرۆک بەش ٢. دکتۆر عومەر محەمەد سەعید - بڕیاردەری بەش ٣. دکتۆر شنۆ محەمەد مەحموود ٤. دکتۆر عەدنان عبدولڕەحمان تەها ٥. دکتۆر سەبوور عەبدولکەریم حەمە کریم ٦.دکتۆر ئەمین حەمە ڕەزا حەمە ئەمین.

مامۆستایانی بەشی فارسی زۆر باش منیان دەناسی. زۆربەیان لە ئێران ژیابوون. کەسانی بەتوانا و بەئومێد بوون. مامۆستایانی ماندوو نەناس هەوڵ دەدەن زمان و ئەدەبی فارسی و فەرهەنگی ئێران لە کوردستان بڵاو بکەنەوە. کەڵکیان لە سەرچاوەی جیاوازی فارسی وەردەگرت. بۆ فێربوونی زمانی فارسی سوودیان لە کتێبە پێنج بەرگییەکەی دکتۆر ئیحسان قەبول دەبینی. دەڵێن ئەدەبیاتی فارسی زۆر دەوڵەمەندە. لەوێ ئەدەبیاتی کلاسیک و ئەدەبیاتی نوێش دەخوێنن. خوێندکاران زۆر گرنگی بە شانامە دەدەن. ئەندامانی بەش پێیانوایە پەرەپێدانی زمانی فارسی لە هەرێمی کوردستان دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی کەلتوور و فەرهەنگی ئێران و کوردستان. ئاڵوگۆڕی چەمکەکانی ئەدەبی، کۆمەلایەتی، ئابووریی و ڕامیاریی فارسی و کوردی دەبێتە هۆی فراوانبوونی هاوکاری لە هەموو بوارەکاندا.

ئەوان باوەڕیان وایە فێربوونی زمانی فارسی هۆکاری بەرەوپێشچوونی پەیوەندی ئابووریی نێوان ئێران و کوردستانە. دەڵێن: لە ئێستادا دەیان کۆمپانیای ناودار سەرقاڵی بازرگانین لەگەڵ ئێراندا. زمانی فارسی سەرەڕای پەرەپێدانی پەیوەندی زانستی و کەلتووریی هۆکاریشە بۆ گەشەسەندنی بواری بازرگانی. ژمارەیەک لە خوێندکارەکان، کارمەندی ئەم کۆمپانیایانەن. کۆمپانیاکانی گواستنەوە و گەیاندن پێویستیان بە کەسانێکە کە شارەزای زمانی فارسی و کوردی بن. هەندێک لەم کۆمپانیایانە دەرچووەکانی بەشی زمان و ئەدەبی فارسییان دامەزراندووە.

زۆرینەی خوێندکارەکانی بەشی زمان و ئەدەبی فارسی لە سەرەتای وەرگرتنیان شارەزای زمانی فارسی نین. واتا ناتوانن بە فارسی قسە بکەن، بخوێنن و بنووسن. بەلام لە کۆتایی چوار ساڵی خوێندنی بەکالۆریۆسدا بە باشی فێری فارسی دەبن. بەرنامەڕێژی بۆ گەشتی زانستی بە مەبەستی سەردانکردن و بینینی نێوەندە ئەکادیمی و شوێنە گەشتیارییەکانی ئێران کراوە. ئەوان پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ

"زانکۆی کوردستان - سنە" دا هەیە. بەپێی یاداشتنامەیەکی لێکتێگەیشتنی نێوانیان، خوێندنی دکتۆرای هاوبەشی بواری زمان و ئەدەبی فارسییان هەیە. مامۆستاکانی بەش هیوادارن کە هاوکاری خوێندکارەکانیان بکرێت، تا سەردانی شارەکانی تاران، ئەسفەهان، یەزد، مەشهەد و ناوچەکانی دیکەی ئێران بکەن. من و دکتۆر وسوقی خۆشحاڵ دەبین کە لە زانکۆی سلێمانی ژمارەیەکی زۆر ئارەزوومەندی ئەدەبی فارسی دەبینین. کە هەوڵی پەرەپێدانی پەیوەندی زانستی و ڕووناکبیری لەگەڵ ئێراندا دەدەن. کەسانێک کە زۆربەیان دەرچووی زانکۆکانی ئێرانن. زۆربەی مامۆستایانی بەشی زمان و ئەدەبی فارسی زمانی ئینگلیزی دەزانن. حەز و خولیا و گەشبینی ئەم مامۆستایانە لە ناخەوە دەمهەژێنن. ،ئەم شەوق و زەوقە زۆرەی مامۆستایان گەشتۆتە خوێندکارانیش. نزیکەی کاتژمێر و نیوێک پێکەوە گفتوگۆدەکەین. هیچ کەسێکیان باسی مووچە و دۆخی ژیانی خۆیان ناکەن. ئاشکرایە کە لەم بارەیەوە کێشەیەکیان نییە. وێرای ئەو هەموو جەنگ و ململانێ و هێرشی داعش و... هێشتا دراوی عێراقی بەراورد بە دراوی دراوسێ ڕۆژهەڵاتییەکانی، بەنرخترە.

بۆ ژەمی نیوەڕۆ، لە هۆتێلێکی پێنج ئەستێرەی دەرەوەی زانکۆ، میوانداریمان دەکەن. هەڵبەت میواندارییەکی فەرمییە. بەمەش سەرۆکی زانکۆ ڕێزێکی زۆری لە من و هاوڕێکانم گرتووە. ڕێستۆرانتی هۆتێلەکە، زۆر جوانْ و پاک و خاوێنە. هەموو ستانداردێکی پێنج ئەستێرەی تێدایە. کارمەندانی ڕێستۆرانت، مێزێکیان بۆ ئامادەکردین. مێزێکی خڕ و میواندارییەکی تایبەت. ئاشکرایە کە ستافی ڕێستورانتەکە ڕاهێنانیان پێکراوە.. چەند جارێک، بە مەبەست داوای چەند شتێکم کرد. هەموو جارێک گارسۆنەکان بەوپەڕی میهرەبانی و ڕوخۆشییەوە داواکەیان جێبەجێ دەکرد.



**لە ڕاستەوە: فەربود پاپولی، د. ئەرکان عەبدوڵڵا، د. پاپولی یەزدی و د. وسوقی لە ڕێستۆرانتی داوا – سلێمانی.**

**زانكۆی سلێمانی؛ زانكۆیەكی جیاواز لە زانكۆكانی جیهان**

لە پاریس، خوێندكاری زانكۆی سۆربۆن بووم كە بیستم ڕژێمی بەعس، زانكۆی سلێمانی بۆمباران كردووە و ژمارەیەك مامۆستا و خوێندكاری كوشتووە. لەو كاتەوە حەزم دەكرد ئەم زانكۆیە ببینم. لەبارەی ڕابردووی و چۆنێتی گەشەسەندنی هەندێك زانیاریم هەبوو. لە دەیەی ١٩٥٠ ڕووناكبیرانی كورد دەیانزانی كە دەبێت لە كوردستانی عێراق زانكۆیەك هەبێت. ئەوان هەوڵێكی بێوچانیان دا، تا لە كوردستان زانكۆیەك بنیادبنێن. لە سەردەمی حوكمی عوسمانییەكانەوە بیرۆكەی دروستكردنی زانكۆ لە كوردستان، لە ئارادا بوو. كەسانێكی وەك پرۆفیسۆر «محەمەد حەمەد ساڵح» مامۆستای مێژوو لە زانكۆی لەندەن و لێكۆڵەری دیاری كورد «توفیق وەهبی» ١٨٩١-١٩٨٤ ئەفسەری سەردەمی عوسمانیی و وەزیری سەردەمی پاشایەتی عێراق. پێش كوودەتاكە پشتگیریان لەو بیرۆكەیە دەكرد. دوابەدوای بەدواداچوونی كۆمەڵێك سیاسەتمەدار و ڕووناكبیری كورد لە ساڵی ١٩٥٧، بیرۆكەی دامەزراندنی زانكۆی سلێمانی لەلایەن پرۆفیسۆر «محەمەد حەمەد ساڵح» پرۆفیسۆری مێژوو لە زانكۆی لەندەن خرایە ڕوو. پاش یازدە ساڵ، حكوومەتی بەغدا ساڵی ١٩٦٨ دامەزراندنی زانكۆی سلێمانی پەسەند كرد. ئەم زانكۆیە لە هەمان ئەو ساڵەدا دروستكرا كە حیزبی بەعس بە ڕابەرایەتی ئەحمەد حەسەن بەكر و سەدام حسێن كودەتایان بە سەر حكوومەتی عێراقدا كرد و دەسەڵات كەوتە دەستی بەعسییەكان. زانكۆ لە ڕێكەوتی ١٩٦٨/٧/٢٣ بنیادنرا، واتا سێ مانگ دوای كودەتای حیزبی بەعس،بەڵام پێش ئەم ڕێكەوتە فەرمانی كردنەوەی زانكۆ درابوو.

هەر زوو، ناكۆكییەكانی ئەم زانكۆیە و حكوومەتی بەغدا دەستی پێكرد. بیرمەندان، مامۆستایان و خوێندكارانی زانكۆی سلێمانی هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ بیروبۆچوونی حیزبی بەعس و سەرانی ئەو حیزبەدا ناكۆك بوون. بۆیە زانكۆ هەر لە سەرەتاوە كێشەی لەگەڵ دەسەڵاتی حیزبی بەعسی عێراقیدا هەبوو. حیزبی بەعسیش هەرگیز لەگەڵ كردنەوەی زانكۆدا نەبوو. واتە حیزبی بەعس دژی هەر پێكهاتەیەكی ڕێكخراوەیی بوو كە ببوایەتە هۆی هۆشیاریی. بیركردنەوەی حیزبی بەعس، لەسەر بنەمای ناسیۆنالیزمی عەرەبی و سۆیالیزم بوو. هەربۆیە گرووپە ناعەرەبەكان بە

هاووڵاتی پلە دوو هەژمار دەکران. ئەم تێڕوانین و سیاسەتەی حیزبی بەعسی عێراقی، بەتایبەت لە بەرامبەر کوردەکاندا کە گەورەترین نەتەوەی ناعەرەب بوون لە عێراقدا، تاکوو ڕووخاندنی ئەو حیزبە لە ساڵی ٢٠٠٣ دا، درێژەی هەبوو. ڕەگوڕیشەی ناکۆکی و شەڕەکانی ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حسێن لەگەڵ کورددا لەسەر بنەمای ئەو بیرۆکەی پانعەرەبیزم و ناسیۆنالیزمی عەرەبییە بوو. حکوومەتی بەعس دەیزانی کە کوردەکان دژایەتی ئایدیۆلۆژیای بەعسدا دەکەن. مۆڵەتی دروستکردنی زانکۆش بە هۆی فشار و هەوڵی بەردەوامی ڕووناکبیرانی کورد، پێش کودەتای ساڵی ١٩٦٨ بڕیاری لەسەر درابوو. ئەحمەد حەسەن بەکر تازەگی ببووە سەرۆک کۆمار و نەیدەتوانی ئەم زانکۆیە بە کۆرپەیی لەباربەرێت. حکوومەتی بەغدا هەر لەو سەرەتایەوە دەیویست ئەم زانکۆیە لەژێر فەرمان و چاودێرییەکی توندا بێت. ڕووناکبیرانی کورد، زانکۆی سلێمانی‌یان کردبووە نێوەندێکی هزریی، زانستیی، سیاسیی و بەرخودان. ئەگەر ئەم زانکۆیە تەنها لێکۆڵینەوەی زانستی بکردایە، حیزبی بەعس و حکوومەتی بەغدا گرفتێکی ئەوتۆیان لەگەڵیدا نەدەبوو؛ بەڵام زانکۆی سلێمانی مەکۆی وتووێژی هزری و بیری سیاسی بوو. حکوومەتی بەغدا تا دەهات فشارەکانی لەسەر ئەم زانکۆیە توندتر دەکرد. زۆرێک لە مامۆستایان و خوێندکاران و کارمەندانی زانکۆ ڕووبەڕووی ئازار و ئەشکەنجە بوونەوە. ژمارەیەکیان زیندانی کران. ژمارەیەک لە زانکۆ دەرکران. حیزبی بەعس و حکوومەتی بەغدا لەگەڵ کوردەکاندا کەوتنە جەنگەوە. حکوومەت ناوچە جیاوازەکانی کوردستانی بۆردوومان دەکرد. مەلا موستەفا بارزانی، سەرکردایەتی شۆڕشگێرانی کوردی دەکرد دژی بەغدا. مەترسی بۆردوومانی زانکۆی سلێمانی لەلایەن حکوومەتی بەعسەوە هەبوو، سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، بڕیاری گواستنەوەی زانکۆی سلێمانی دا، بۆ ناوچە ئازادکراوەکانی قەڵادزێ. پێشبینی بەرپرسانی زانکۆ ڕاست بوو.

## تاوانێکی دەگمەن

فڕۆکە جەنگییەکانی حکوومەتی عێراق، کاتژمێر ٩:٤٥ خولەکی بەیانی، ڕۆژی چوارشەممە ١٩٧٤/٤/٢٤، هێرشیان کردە سەر ناوچەی پشدەر و شوێنە گشتییەکانی نێو شاری قەڵادزێ. هەڵبەت زۆربەی مامۆستا، فەرمانبەران و خوێندکارانی ئەوکاتەی زانکۆی سلێمانی کە پێشتر چووبوونە نێو شۆڕش، ڕوویان کردبووە قەڵادزێ. چونکە بڕیاربوو دوای هەفتەیەکی دی، واتا ڕۆژی (٥/١) دەوامی فەرمی زانکۆ لە قەڵادزێ دەست پێبکاتەوە. ئەو شوێنانەی بە "ناپاڵم" بۆمباران کران، بەگشتی شوێنی مەدەنی بوون، بەتایبەت نەخۆشخانەی قەڵادزێ، بینای (إنحصاری تووتن) کە ئامادە کرابوو بۆ زانکۆی سلێمانی، فەرمانگەی شارەوانی، قائیمقامیەت، خوێندنگەکان. هەڵبەت ڕۆژی پێشتر، خەڵک لە ئەگەر و مەترسی بۆردوومان و حاڵەتی نەخوازراو ئاگادار کرابوونەوە، هەربۆیە ئەو ڕۆژە بەشێکی زۆری دانیشتووانی قەڵادزێ، چووبوونە گوندەکانی دەوروبەری شار. دەنا ژمارەی شەهید و بریندار زۆر زیاتر دەبوون. وێڕای ئەوەش بۆردوومانەکە بووە هۆی شەهیدبوونی زیاتر لە سەد و سی کەس و برینداربوونی نزیکەی چوارسەد کەسی دیکە، هاوکات وێرانکردنی سەدان خانوو و دوکان. بەشێک لە شەهیدەکان خوێندکاری زانکۆی سلێمانی و خەڵکی شار و شارۆچکەکانی سلێمانی، هەولێر، خانەقین، دوکان، بادینان، کۆیە و پشدەر بوون. کە بریتی بوون لە: ١- هیوا عەبدولغەفور. ٢- بورهان عەبدوڵڵا شاسوار. ٣- سەروەر عەلی قادر. ٤-ئازاد حسێن ئەحمەد. ٥- سۆران محەمەد سەڵتە. و ژمارەیەکی دیکەش.

زۆربەی شەهید و بریندارەکان سڤیل و ژن و منداڵ بوون، هیچ پێشمەرگەیەک لەو بۆردوومانەدا شەهید نەبوو.. هێرشی ئاسمانی بۆ سەر زانکۆی سلێمانی هەرگیز بە ڕێکەوت نەبوو. بەپێی گێڕانەوەی زۆرێک لە خەڵکی ناوچەکە، ڕۆژی پێش هێرشەکە و شەوی پێش بۆردوومانەکەش، چەند فڕۆکەی باجەڕ بە ئاسمانی ناوچەکەدا سووڕاونەتەوە وێنەی شارەکە و شوێنی زانکۆکەیان گرتووە. ڕۆژی دواتر، فڕۆکەی سۆخۆی ڕووسی، بە بۆمبی قەدەغەکراوی "ناپاڵم"ی هیندی، نێو شاری قەڵادزێ و کەمپی زانکۆیان بۆردوومان کرد. ئەم بۆردوومانە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا تاوانێک بوو کە پێشینەی نەبوو. دواتر لەنێو میدیای ناوچەکە و دونیاشدا، دەنگدانەوەی

زۆری هەبوو، تەنانەت ڕۆژنامەکانی گاردیان و فایناننشال تایمزی بریتانی و لۆمۆندی فەرەنسی ڕاپۆرتیان لە بارەوە بڵاوکردەوە.

بە درێژایی هەردوو جەنگی جیهانیی، جەنگی ڤێتنام و جەنگەکانی دیکە، ئەگەر بەشێکی کەمی زانکۆیەک، بکاوتایەتە بەرهێرشی ئاسمانیی دوژمن، ئەوا هێزەکانی دوژمن ئەگەر بە ڕووکەشیش بێت پۆزشیان بۆ تاوانەکەیان دەهێناوەتەوە. کە گوایە بۆردوومانی زانکۆ بە هەڵە ئەنجامدراوە. لە سەرتاسەری دونیادا زانکۆکان ڕێزێکی تایبەتیان هەیە. لە زۆربەی وڵاتاندا هێزی چەکدار مافی چوونە نێو زانکۆ و حەرەمی نێوەندە فێرکارییەکانیان نییە. بەڵام زانکۆیەک لە لایەن هێزی ئاسمانی وڵاتەکەی خۆیەوە بۆردوومان بکرێت؛ تاوانێکی چاوەڕوان نەکراوە. بۆمبارانکردنی زانکۆ کارێکە هەر لە حکوومەتی بەعسی عێراق و بیرکردنەوەی هاوشێوەکانی ئەحمەد حەسەن بەکر و بەتایبەتی سەدام حسێنەوە دەوەشێتەوە. زانکۆی سلێمانی لە عێراق، یەکێکە لەو زانکۆ دەگمەنانەی، ڕەنگە تەنها زانکۆی جیهانیش بێت کە لەلایەن وڵاتەکەی خۆیەوە بۆمباران کرابێت. بۆمبارانێک کە پێشتر پلانی بۆ دانرابێت. ئاخۆ بیروبۆچوونی ڕووناکبیریی و سیاسیی ئەکادیمیانی زانکۆی سلێمانی، بۆ ڕژێمی بەعس تا چەند جێی مەترسی بووبێت، تاوەکوو ئابڕووچوونی بۆمبارانکردنی ئەو زانکۆیە قبوڵ بکات. دوای بۆمبارانەکەش زانکۆ و خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆی سلێمانی دەستیان لە تێکۆشان هەڵنەگرت. هەر بۆیە ڕژێمی بەعس، ساڵی ١٩٨١ ئەم زانکۆیەی داخست. خەڵکی قەڵادزێ وەک هەموو کورد دژی سەدام حسێن درێژەیان بە خەبات دا. لە ١٩٨٢/٤/٢٤دا خەڵکی قەڵادزێ مەراسیمێکیان بۆ یادی هەشت ساڵەی بۆردوومانەکەی ساڵی ١٩٧٤ ڕێکخست. جارێکی دیکە قەڵادزێ بە فەرمانی سەدام حوسین بۆمباران کرایەوە. ئەمجارەش خەڵکی ئەو شارە، درانە بەر ڕێژنەی گوللە، لە ئاکامدا دوو ژنی قارەمان، دایکە ئامینە و خوشکە سنەوبەر شەهید بوون و ژمارەیەکیش بریندار بوون. لە ساڵی ١٩٨١ حکوومەتی بەعس زانکۆی سلێمانیی گواستەوە بۆ هەولێر و ناوەکەشی گۆڕی بۆ زانکۆی سەلاحەدین. سلێمانی ماوەی یانزدە ساڵ، لە زانکۆ بێبەش کرا. ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ لاوازبوونی ڕژێمی بەعس، هەوڵەکان بۆ سەرلەنوێ بنیادنانەوەی زانکۆی سلێمانی کەوتنەوە گەڕ، تا لە ڕۆژی

١٩٩٢/١٢/١٤ دا زانکۆی سلێمانی سەرلەنوێ دامەزرایەوە. زانکۆ، ئەمڕۆ چەندین کۆلێژی لە شارۆچکەکانی دەوروبەری سلێمانیدا هەیە.

زانکۆی سلێمانی لەسەر خوێنی شەهیدان بنیادنراوە. ئەم زانکۆیە بە خەباتی هەزاران مامۆستا، خوێندکار، کارمەند و زانای لێهاتووی کورد، بەردەوام بووە و گەشەی سەندووە. زانکۆیەک لە پەنجا و چوار ساڵەی تەمەنیدا -کە پانزدە ساڵ داخرا بوو- ئێستا و لە ساڵی ٢٠٢٠ دا خاوەنی دوو هەزار مامۆستای ئەکادیمی و نزیکەی بیست و پێنج هەزار خوێندکارە. ئەو گەنجانەی بۆ زانست ڕوودەکەنە ئەم زانکۆیە دەزانن کە میراتگری خوێنی شەهیدانن. ئەوان میراتگری خوێنی سەدان هەزار تێکۆشەری کورد و پێشمەرگەن. ئاڵای زانکۆی سلێمانی، وەکوو ئاڵای هەرێمی کوردستان بە خوێن، بەرز ڕاگیراوە. ڕێز و حورمەتی ئەم زانکۆیە لەسەر تەواوی ئەهلی زانست، لە سەرانسەری جیهان و هەموو زانکۆکانی دونیا، پێویستە. هەر بەو شێوەیە لەسەر هەموو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی وەک نەتەوە یەکگرتووەکان، یونسکۆ و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی جیهانی پێویستە و دەبێت لە پێشکەشکردنی هاوکاریی دارایی و زانستی ئەم زانکۆیە دریغی نەکەن. دەبێت زانکۆ بەناوبانگەکانی دونیاش کۆمەکی ماڵیی، مەعنەوی و زانستی خۆیان بۆ ئەم زانکۆیە زیاتر و زیاتر بکەن. بەو هیوایەی ئەو مەشخەڵەی کە شۆڕشگێرانی کورد لەم زانکۆیە دایانگیرساند، ڕووناکییەکەی بگاتە هەموو کوردستان، عێراق و ناوچەکە. هەر کەس لەسەر کورسی سەرۆکایەتی ئەم زانکۆیە و کۆلێژەکانی دادەنیشێت، دەبێت بزانێت بەرپرسیارێتییەکەی سەدان جار لە بەرپرسیارییەتی هاوپیشەکانی لە زانکۆکانی دیکە زیاترە. ئەم سەکۆ ئازادە بە پشتیوانی و بەشداری هەموو چین و توێژەکان دروست بووە. ئەم زانکۆیە دەبێت بەهاوبەشی هەموو چین و توێژەکانی کورد و ئازادیخوازانی جیهان، بەردەوام بمێنێتەوە. بەپێی ئەو پێشینەیەی کە لەسەر ئەم زانکۆیە هەمبوو، یەکێک لە ئامانجەکانی سەردانی سلێمانی، بینینی ئەم زانکۆیە بوو.

## چەمی ڕەزان

کوردەکان هەمیشە بۆ ئازادی خەباتیانکردووە. بە درێژایی حکومڕانی عوسمانی و سەفەوییەکان بۆ ئازادی تێکۆشاون. لەوانەیە لە سەرتاسەری دونیادا، مێژووی هیچ نەتەوەیەک وەک مێژووی نەتەوەی کورد لەگەڵ خەبات تەریب نەبێت. خەباتی نوێی کوردەکانی عێراق بۆ ئازادی، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەستیپێکرد؛ بەڵام ئەم خەباتە لە ساڵی ١٩٦١ لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا چڕتر بووەوە. کوردەکان لەم مێژووەوە بۆ درێژەپێدان بە خەبات کۆمەڵە و دەستەی سیاسیان پێکهێنا. مێژووی ئەم بەرخودانە زۆر بەوردی نووسراوە. بەڵام من لێرەدا دەمەوێت بەو شێوەیەی کە بینیومە و بیستوومە تیشکی بخەمە سەر و باسێکی بکەم. ئەوەی کە دەینووسم یادەوەرییە نەک لێکۆڵینەوە. هەر کەموکورتییەک پەیوەستە بە منەوە. بە بۆچوونی من دەوڵەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق، هەر لە دوای کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم تا ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام حسین، هەڵسوکەوتێکی دروستیان لەگەڵ کورددا نەبووە. هەموو ئەم دەوڵەتانە بانگەشەی مۆدێرنیتەیان دەکرد، بەڵام فاشیستانە ڕەفتاریان دەکرد. فەرمانڕەواکانی بەعس کوردیان بە مەترسییەکی شاراوە و ڕاستەقینە بۆ سەر خۆیان دەزانی.

بڕیاربوو، تەها بمانبات بۆ «چەمی ڕەزان». خەباتی کوردەکان لە ناوچەی سلێمانی دژ بە بەغدا لە چەمی ڕەزانەوە دەستیپێکرد. دوای مەلا مستەفا ئەم ناوچەیە گرنگییەکی زیاتری هەبوو. مەلا مستەفا زیاتر لە سەرگەڵوو بوو. پارتی دیموکراتی کوردستان ساڵی ١٩٤٦دامەزرا، مەلا مستەفا سەرۆکی حیزبەکە بوو هەمزە عەبدوڵلاش سکرتێری حیزب بوو. ساڵی ١٩٦١ کە خەباتی چەکداری دەستیپێکرد لەو سەردەمەدا ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری حیزب بوو. چەند گرووپێکی چەکداری پێکهێنران پێیاندەگوترا هێز. «هێزی ڕزگاری» سەرەتا لە چەمی ڕەزان بوو، دواتر گواسترایەوە بۆ سەرگەڵوو. ئەو کاتە جەلال تاڵەبانی بەرپرسی هێزی ڕزگاری بوو. مەلا مستەفا نەچووە چەمی ڕەزان. ئەو خۆی لە گەڵاڵە و حاجی ئۆمەران بوو.

پێدەچێت چەم بە واتای دۆڵێکی پڕ لە ئاو بێت، ڕەزانیش بە واتای ڕەز و باخی ترێ بێت. لە خۆراسانیش چەندین گوند و ناوچە هەیە کە ناویان «ڕەزان» ە، ناوی

هەندێک لەوانە بە تێپەڕبوونی کات گۆڕدراوە بە «رضوان». تا پێش ڕووخانی سەدام حوسێن ڕێگای سلێمانی بۆ چەمی ڕەزان زۆر خراپ و ناهەموار بوو. حکوومەتی بەغدا ڕێگەی بۆ ناوچەکە دروست نەدەکرد. کوردەکانیش نەیاندەویست ڕێگەی بۆ دروستبکرێت، چون بە هۆی ڕێگاوبانەوە سوپاکەی سەدام دەیتوانی خێراتر هێرش بکاتە سەر ناوچەکە.

لە نەورۆزی ساڵی ۲۰۱۹ ڕێگەیەکی قیری باش تا بەردەمی ئەشکەوتی چەمی ڕەزان هەبوو. تەها بەخێرایی ماشێنەکەی لێدەخوڕی. ئاسمان هەور بوو. شەوی پێشتر باران باریبوو. زەوی تەڕبوو. دەشتودەر، درەخت و کێو، سەوزیان پۆشیبوو. دونیا دەدرەوشایەوە. دەمویست پڕ بە سییەکانم هەوا هەڵمژم. هەناسەی قوڵ هەڵدەکێشم. بیرم کردەوە، ئەگەر باڵم هەبوایە دەمتوانی چەند جوان بفڕم. ئەگەر فڕۆکەیەکی بێفڕۆکەوان دەبوو، ئاخۆ چ وێنەگەلێکی جوانی دەگرت. ڕەنگە ڕۆژێک گەشتیاران بە هێلیکۆپتەر و فڕۆکە، لەم ناوچە بەهەشت ئاسایەدا، گەشت بکەن.

من لەنێو دونیای خەیاڵدا بووم. تەها بۆی باسکردین کە دوای ڕووخانی سەدام، ئەم ڕێگایانەیان بۆ ئەشکەوتەکانی چەمی ڕەزان دروستکردووە، ئەو گوتی ناوچەکە ئێستا بووەتە شوێنێکی گەشتیاری. گەشتینە ئەشکەوتی قزقاپان. گۆڕێک بە قەدپاڵی شاخەکەوە دەبینرا، هاوشێوەی گۆڕ و ئارامگەی زەردەشتیەکانی ئێرانی کۆن. بۆئەوەی ئەو گۆڕە ببینی سەرەتا، دەبێ بە جادەیەکی هەورازی کەمێک سەختدا سەرکەویت. پلیکانەی ئاسنیان بۆ دروستکردووە. بەبێ ئەو پلیکانەیە گەیشتنە لای گۆڕەکە ئەستەمە. تەها ماشێنەکەی ڕادەگرێت. کەشوهەوا، پاک و دڵنشینە. هەڵبەت سەرەتای وەرزی بەهارە. نازانم کەشوهەوای ناوچەکە لە هاویندا چۆنە. دەبێت بە پلیکانەکاندا سەربکەوین. بە ئەندازەی ئەپارتمانێکی چوار تا پێنج نهۆمی دەڕۆینە سەرەوە. هەر چەند بە پلیکانە ئاسنەکاندا سەردەکەوین دیمەنی جوانتر دەبینین. من تەنها لە کێوەکانی دەوروبەری شاری "دوربان" ی ئەفریقای باشوور، دیمەنێکی وا جوانم بینیوە. من سەردانی زۆر ناوچەی ئەوروپام کردووە. ناوچەی زۆر جوانم لە سەرتاسەری دونیادا بینیوە. دۆڵی چەمی ڕەزان لە کوردستان، یەکێکە لە دیمەنە جوانەکانی جیهان. ئەم دۆڵە، دوو شتی کەمە، یەکەم ڕێکلام و دووەم پێداویستییەکانی

گەشتیاری. "قزقاپان" بە قەدپاڵی کێوەکەوە هەڵکەندراوە. سێ ژووری تێدایە. بە ئەگەری زۆر، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ماددەکان. بەبێ بوونی پلیکانە گەیشتن پێی زۆر سەختە. پێش دروستکردنی ئەم پلیکانەیە، دەبو بۆ سەرکەتن، داربەستیان بەکاربهێنایە. تەنها شاخەوانە لێهاتووەکان دەیانتوانی بە بەکارهێنانی پێداویستییە شاخەوانییەکان پێیدا سەربکەون. ئەم ژوورانە، پەناگەیەکی زۆرباشە بۆ پارتیزانەکان.

مرۆڤ حەزدەکات چەندین کاتژمێر لەو بەرهەیوانە بچووکەی پێش قەبرەکە بمێنێتەوە. ئەگەر مێز و کورسی لەو شوێنە هەبوایە خواردنەوەی قاوەیەک زۆر چێژبەخش دەبوو، قاوەیەک کە بەدڵنیاییەوە دەبوو لە قاوەی کافێکانی شانزێلیزێ پاریس گرانتر بێت. بەڵام چارەیەکمان نییە و دەبێ بڕۆین. لە پلیکانەکان دێینە خوارەوە. ژن و مێردێکی گەنج دەبینین کە بۆ بینینی قزقاپان هاتوون. لە بەردەم پلیکانەکان وەستاون و هێشتا سەرنەکەوتوون. ئەوان وەک دوو کۆتری ئاشتی وان کە جەنگەکانی سەدامیان نەبینیووە. ئەوان لە سەردەمی ئاشتیدا هاتوونەتە دونیاوە و گەورە بوون. بێگومان گرژی و ئاڵۆزییەکانی سەردەمی داعشیان بینیوە. سڵاویان لێدەکەم. داوا لە تەها دەکەم وەرگێڕمان بێت. ژن و مێردێکی گەنج، هاتوون بۆ گەشت. دڵخۆش و جوان و هیوادار بە ئایندە. بوونی ئەم دوو دڵدارە، هێندەی دیکە دیمەنەکەیان جوانتر کرد. وەڵامی پرسیارەکانیان دەدایەوە نزای خێرمان بۆ کردن و لێیان جیا بووینەوە. ڕەنگە ئیتر تا کۆتایی تەمەنم نەیانبینمەوە. وەلێ یادەوەریی ئەو دوو گەنجە پڕ هیوا و ئارەزووەم هەرگیز لەیاد ناچێت. بەرەو ئەشکەوتەکانی چەمی ڕەزان بەڕێدەکەوین. کەشوهەوا شادی بەخشە. هۆنراوەیەکی "مەلیکی شوعەرای بەهار"م بیرکەوتەوە: بە بۆنی دڵرفێنی تۆ مەستم.

دەشتێکی سەوز. گوڵاڵە سوورە زەوی داپۆشیوە. تەها بۆمان باس دەکات. ئەم شوێنە مەڵبەندی خەباتی کوردەکانە دژ بە حیزبی بەعس. جادەیەکی نوێ دروست کراوە. دەربەندەکە کەم کەم باریک دەبێتەوە. لە دوورەوە، شاخە بەرزەکان دەردەکەون. ئاڵای کوردستان بە قەدپاڵی شاخەکانەوە دەبینرێت. چەند ئەشکەوتێک بە قەدپاڵی شاخەکەوە دەبینرێت. دەمی یەکێک لە ئەشکەوتەکان زۆر گەورە و فراوانە. ئەشکەوتەکە زیاتر لە سەد مەترێک لە ئاستی دەربەندەکە بەرزترە. گەیشتن بەو

شوێنە تەنها کاری پێشمەرگە گیان لە سەردەستەکانە.

ئەم شوێنە زیارەتگەیە. زیارەتگەی ئازادیخوازانی سەرانسەری دونیا. یەکەمین بەرخوانی کورد دژی حکوومەتی کودەتاچی بەغدا، لەم شوێنەوە سەری هەڵدا. لە ساڵی ١٩٦١ تا ڕووخانی سەدام، واتا ٢٠٠٣ چەمی ڕەزان مەیدانی بەرخودان و بەرەنگاربوونەوە بوو. لە خوارووی ئەشکەوتەکەوە، گۆڕەپانێکی زۆر جوان هەیە. کە ڕازاندویانەتەوە بۆ پێشوازیی گەشتیاران. چەند چایخانە و ڕێستورانێکیان دروستکردووە. ماشێنەکان لێی دەوەستن. لەسەر ڕێگای چونەژوورەوە بۆ ناوچە گەشتیاریەکە، بازگەیەک هەیە. بەخێرایی پشکنین بۆ سەردانیکەران دەکەن. تەها ناسنامەکەی پیشانی ئەوان دەدات. ڕێزی لێ دەگرن. تەها دەپرسێت: شێخ بەکری عەوالانی لێرەیە؟ دەڵێن: لە نزیکی سەیرانگەکەیە، تەها دەڵێت: ئاگاداری بکەنەوە کە تەها سێکانیانی هاتووە. تەها دەڵێت: تا شێخ بەکر عەوالانی دێت با پیاسەیەک بکەین. ئێمەش بە ماشێنەکە تا کۆتایی جادە قیرەکە دەڕۆین. چەند سەد مەترێکیش لەسەر جادە خۆڵەکە دەڕۆین. جادەکە کۆتایی پێدێت. دادەبەزین و بەپێ دەچینە نێو دەربەندەکەوە. دار و دەوەنەکان زیاتر چڕدەبنەوە. کێوەکان بەشکۆ و نزیک بە ستوونی هەڵکشاون. تەها دەروازەی ئەشکەوتەکانمان پیشان دەدات. دەروازەی ئەشکەوتە سەرەکییەکە زۆر گەورەیە. ئەگەر کەسێک بە چەکەوە لەو بەرزاییە جێگیربێت، هیچ دوژمنێک ناتوانێت ڕووبەڕووی ببێتەوە. تەنانەت بۆمبی کیمیاییش ناتوانێت کاریگەری زۆری هەبێت. چون فڕۆکە و هەلیکۆپتەریش ناتوانن بۆمبەکانیان بهاوێژنە نێو ئەشکەوتەکەوە. مەگەر بە موشەکی کروزی مۆدێرن بتوانرێت دەروازەی ئەشکەوتەکە خاپوور بکرێت. بە هێلیکۆپتەر دەتوانرێت دەروازەی ئەشکەوتەکە بۆردوومان بکرێت. بەڵام بێ سوودە و ئەگەری زۆرە هەلیکۆپتەرەکە لەلایەن جەنگاوەرەکانی ئەشکەوتەکەوە بخرێتە خوارەوە. هەڵبژاردنی ئەم ئەشکەوتانە لەلایەن شۆڕشگێڕانی کوردەوە، کارێکی زۆر ژیرانە بووە. من سەرسامم بە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت. تۆ تەنیا دەبێت بێیت و ئەم سروشتە جوان و سامناکە و ترسێنەرە ببینی. ئەم سروشتە، چیا و ئەشکەوتەکان وەسف ناکرێت. مەگەر ئەوەی شاعیرێکی بەتوانا وەسفی بکات یان هونەرمەندێکی فلیمساز، بتوانێت دیمەنێک لەم جوانییە پیشان

بدات. ئەم شوێنە پێویستە هەوارگەی گەشتیاران بێت. کەسێک هەواڵمان پێدەدات کە شێخ بەکر عەوالآنی هاتووە. شێخ، پیاوێکە هاوتەمەنی تەهایە، ڕەنگە چەند ساڵێک بچووکتریش بێت. پیاوێکی گورجوگۆڵ، جلوبەرگێکی کوردی پۆشتەی لەبەردایە. ڕیشێکی قەڵەمیی هەیە. بە ڕووخۆشییەوە تەها لە ئامێز دەگرێت. هەردوو یەکدی ماچ دەکەن. تەها من، هاوسەر و کوڕەکەمی پێدەناسێنێت. شێخ خوڵکمان.دەکات بۆ چاخواردنەوە. دەڵێت دەبێ بۆ نانی نیوەڕۆ لێرە بمێننەوە. شێخ بەکر فارسی نەدەزانی، تەها وەرگێڕمان بوو. تەها دەڵێت دەبێت بڕۆین. چامان بۆ دەهێنن. چەند پرسیارێک لە شێخ بەکری عەوالآن، دەکەم. ئەو پێشمەرگەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێکە کارگێڕی کۆمەڵەی پێشمەرگە کەمئەندامەکانی سەنگەرە، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٤ ە واتا چوار ساڵ لە تەها بچووکترە. شێخ دەڵێت من هێشتا لەدایک نەبووم کە جەلال تاڵەبانی و چەند کەسێک لە هاوڕێیانی هاتوونەتە ئێرە و خەباتیان دەستپێکردووە. لە سەرەتادا تەنها چوار کەس بوون ١- جەلال تاڵەبانی ٢- ئیبراهیم ئەحمەد ٣- مەلا ناسیح ٤- عومەر دەبابە. هێشتا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دروست نەببوو. ئەم پیاوانە بە چەند تفەنگێکی ڕاوەوە لەم کەژ و کێوە خەباتیان دژی حکوومەتی بەغدا دەستپێکرد. وردە وردە کەسانی دیکە پەیوەندی پێوە کردن. جەلال تاڵەبانی تەمەنی نزیکەی بیست و هەشت ساڵ بوو کە لەم وشوێنە دەستی بە خەبات کرد. باوکی شێخ بەکر عەوالآنی هاوکاری ئەم گرووپەی دەکرد.

باوکی شێخ بەکر، ئەرکی دابینکردنی خۆراک بوو بۆ ئەم چەند کەسە. ئامادەکردنی خۆراک و هێنانی بۆ ئەم ئەشکەوتانە، کارێکی زۆر سەخت و ترسناکە. دەبێت کەسێکی جێگەی متمانە بێت تا شۆڕشگێرەکان فریو نەدات و شوێنەکانیان بۆ هێزەکانی سوپای دوژمن ئاشکرا نەکات. یان خۆراکەکانیان ژەهراوی نەکات. شێخ بەکر تەمەنی سێ ساڵ بووە کە باوکی لەگەڵ جەلال تەڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد کاری دەکرد و هاوکاریان بوو. هێدی هێدی ژمارەیان زیادی دەکرد. عیشق و باوەڕ بە ئازادی هەبوو. هیچ پارە و پولێک لە گۆڕێدا نەبوو. تەنها ترسی کوشتن هەبوو. لە ساڵی ١٩٦٣-١٩٦٥ ژمارەی پێشمەرگەکان زیادی کرد. وردە وردە ژنانیش دەستیان بە چالاکی کرد. سەرانی شۆڕش بڕوایان وابوو کە دەبێت ژنانیش ببنە پێشمەرگە. شێخ

بەکر عەوالآنی کاتێک چاوی بە دونیا هەڵهێنا کوردستان لە جەنگ و شۆڕشدا بوو، باوکی جێی باوەڕی مام جەلال و ئیبراهیم ئەحمەد بوو.

لە شێخ بەکر دەپرسم، یەکەم جار کە بەشداری شەڕت کرد، کەی بوو؟ دەڵێت ساڵی ١٩٨٣ بوو ١٩ ساڵ بووم. ڕووبەڕووی یەکەیەکی زرێپۆش بووینەوە: دوازدە کەس بووین. بۆسەمان نابووەوە. سێ زرێپۆش و دوو ماشێنی سەربازیمان سووتاند. لێی دەپرسم: ئەی دوا جار کە بەشداری شەڕت کرد، کەی بوو؟ دەڵێت دواین شەڕی داعش بوو. لە قەرەتەپە ساڵی ٢٠١٤. دەڵێت لەگەڵ تەها بووم. شێخ بەکر چەندین جار بریندار بووە. ئەو دوو ژن و نۆ منداڵی هەیە. پێنج کوڕ و چوار کچ.

شێخ بەکر، سەیرانگەی چەمی ڕەزان بەڕێوە دەبات. لێی دەپرسم بە بۆچوونی تۆ ئێستا داعش کۆتایی هاتووە؟ ئاشتی بەرقەرارە؟ ئایا هەست بە مەترسی دەکەیت؟ دەڵێت ئەگەر بڵێم مەترسی نەماوە ڕاست نییە. مەترسی هەیە. گەورەترین مەتری خودی عێراقە. هەمیشە دووبەرەکیی فیکری لەنێوان کورد و باقی عێراقدا هەیە. مەترسی دیکەش بوونی جیاوازی نێوان پارتە کوردییەکانە. دەڵێت هیواخوازم سەرکردەکانی یەکێتیی و پارتی هەمیشە کۆک و یەکگرتووبن.

شێخ بەکر دەڵێ هیواداره ئەو دوو حیزبە یەکڕیز و یەکگرتووبن؛ بەڵام ئەویش وەک هەموو ئەو کەسانەی کە قسەم لەگەڵ کردون، ئیسلامییە توندڕەوەکان بە مەترسی دەزانێت. ئەو کەسانە بە مەترسی دەزانێت کە دەکەونە نێو تەڵەی داعش و ئەلقاعیدەوە. دەڵێت ئیسلامییە توندڕوەکان بانگەشە و ڕیکلامی زۆر دەکەن. بە بۆچوونی ئەو خێزان، پەروەردە و فێرکردن، زانکۆکان، ڕووناکبیران و حکوومەت، دەبێت هۆشیاربن لە گەشەکردنی هزری داعشی.

لە بەردەم ئەو شوێنەی کە وەستابووین و چامان دەخواردەوە، ئاگر کرابووەوە. بۆ ئامادەکردنی ژەمی نیوەڕۆ. گەشتیاران زۆربەیان بۆ ژەمی نیوەڕۆ دێنە ئێرە. لەلای سەروومانەوە تاڤگەیەکی زۆر جوان هەیە. شێخ بەکر دەڵێت سەیری ئەو تاڤگەیە بکە، لێم دەپرسێت: جوانە؟ من دەڵێم بەڵێ جوانە. دەڵێت ئێمە بە تاڤگە دەڵێین "باڤڵ". لە ساڵی ١٩٨٤ دا، جەلال تاڵەبانی و ملازم عومەر هاتن بۆ ئێرە. دەڵێت من لەگەڵیاندا بووم. کاتێک مام جەلال لەگەڵ ملازم عومەردا قسەی دەکرد، پێی گوت

من ئەم بافڵەم ئەوەندە خۆشدەوێ، کوڕەکەم ناوناوە بافڵ. مام جەلال گوتی من لە کەناری ئەم تاڤگەیە بیرەوەریی زۆرم هەیە. بۆئەوەی کە ئەو بیرەوەرییە خۆش و ناخۆشانە، سەرکەوتن و شەهیدەکان فەرامۆش نەکەم، کوڕەکەم ناوناوە بافڵ.

شێخ بەکر دەڵێت خراپترین بیرەوەریی من لە ساڵی ١٩٨٨دا یە. کاتێک فڕۆکەکانی سەدام، ئەم شوێنەیان کیمیاباران کرد، زۆر کەس مردن. ئەم شوێنەی لێی ڕاوەستاوین چەندین ژن و منداڵی لێ شەهید بوون. ئەوەندە بۆمبی کیمیاییان لێرە دا، کە تەنانەت ماسییەکانی نێو ئاوی ڕووبارەکەش مردن. لە چوار لاوە بە هەلیکۆپتەر، بۆردومانی کیمیایی بوو. ئەو کەسەی توانی بگاتە بەرزایی چیا و ئەشکەوتەکان ڕزگاری بوو. هەر کەسێکیش لە نێو دۆڵەکەدا بوو بە گازی دەمار "اعصاب" کوژرا یان بریندار بوو. شێخ بەکر دەڵێت ئێمە پیاوی شەڕین، شەڕی پیاوانە. دەڵێت سێ ڕۆژ دوای هاوسەرگیریی چووە بۆ شەڕ. شەڕێک کە سەد و حەوت ڕۆژی خایاند. دوای سەد و حەوت ڕۆژ گەڕایەوە ماڵەوە. یەکێک لە ژنەکانیشی بە ناو نەزیرە کەریم، پێشمەرگە بووە.

شێخ بەکریش وەک تەها، دەستبەرداری خوێندن بووە و بووە بە پێشمەرگە. تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندووە. ناچاربووە بچێتە ڕیزی پێشمەرگەوە. ئەو لە ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندی کردووە بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە. بەڵام ساڵی ١٩٨٣ پاش لە سێدارەدانی شەهید سیروانی هاوڕێی چەکی هەڵگرت. شەهید سیروان گوللەباران کرا. ئەو بەڵێنی بە خۆی دا کە درێژە بە ڕێبازی شەهید سیروان و باوکی خۆی بدات. گفتوگۆکەمان درێژەی کێشا. ئەگەر زیاتر درێژەی بدەمێ، دەبێ بۆ ژەمی نیوەڕۆ بمێنینەوە. ئێمە دەمانەوێت ماڵاوایی بکەین. دەڵێم دواین پرسیار بکەم؟ ئەو دەڵێت بپرسە. من دەڵێم تایبەتە. ئەو دەڵێت بپرسە. پرسیارەکەم ئەوەیە: تۆ ڕیشت هەیە. ئایا تۆ هەمیشە ڕیشت هەبووە؟ فرمێسک لە چاوەکانی دێت. گریان گەرووی ئەو پیاوە ئازایە دەگرێت و دەڵێت: ئێمە پرسەدارین. من دەڵێم خودا نەکا. ئایا کەسێک لە خزمانت مردووە؟ وەڵام دەداتەوە: مام جەلال. لەو ڕۆژەوە مام جەلال مردووە من ڕیشم هەیە. من دەڵێم مام جەلال نزیکەی دوو ساڵە مردووە. ئەو دەڵێت تا کۆتایی ژیانم ڕیشم دەهێڵمەوە. مەبەستم ئەوەیە تا کۆتایی ژیانم لە ماتەمینی مام جەلالدا دەبم. ئێمە ماڵئاوایی دەکەین بە هیوای دوبارە بینینەوە.

لەگەڵ تەها بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتین. تەها گوتی ئەمڕۆ نانی نیوەڕۆ لە دەرەوەی شار دەخۆین. نزیک سلێمانی چەندین چێشتخانە هەبوو. لە بەردەم یەکێکیاندا وەستاین. کاتژمێر نزیکەی سێی دوای نیوەڕۆ بوو. چێشتخانەکە زۆر جەنجاڵ بوو. لە بەردەم دەرگای چێشتخانەکە کۆتەرەدارێک لە شێوەی ستوون دانراوە. باڵندەیەک بە زنجیر بە دارەکەوە بەسترابووەوە. ئەو باڵندە زیندانییە لە سەر پەلێکی دارەکە هەڵنیشتبوو. ئەو بازە چنگ تیژە، کە لە ئاسمان ڕاوی دەکرد ئێستا بۆ سەرنجڕاکێشان و سەرگەرمی خەڵک زنجیر کراوە، ئەو بێ زمانە، بێدەنگ و بێ جووڵە بە چاوە نیوە داخراوەکانی تەماشای میوانەکانی دەکرد. ئێمەی مرۆڤ لە پێناو خۆشی و حەزەکانماندا، ئەو مافە بە خۆمان ڕەوا دەبینین کە هەموو گیانلەبەرەکانی جیهان بکوژین، یان دیل و زنجیریان بکەین؛ بەڵام زنجیرکردنی پاشای ئاسمانەکان ئەوە نەک هەر سوکایەتیکردنە بە گیانداران، بەڵکو سوکایەتیکردنە بە خودی مرۆڤیش. لە یەک ساتدا بیرم کردەوە ئێمە خودی خۆمانین کە زنجیر و پێ بەندکراوین.

چێشتخانەکە کەشێکی هاوینەی هەبوو. هۆڵێکی گەورەی کراوەی هەبوو. باخچەیەکیش لە تەنیشتییەوە. ژمارەیەک خەڵک لە هۆڵەکە و ژمارەیەکیش لە باخچەکەدا دانیشتبوون. تەها گوتی بفەرموون چی دەخۆن؟ گوتم خواردنێکی کەلتووری. ئەو قەرەخەرمان و مریشکی بۆ داواکردم. قەرەخەرمان گەنمە. گەنمێک کە بە سەوزی بە ئاگر هەڵدەپرووکێنرێت، وەک برنج لێدەنرێت. هەرگیز نەمخواردبوو، خواردنێکی بەتام بوو، بە مریشکی خۆماڵییەوە خواردم. بەڕاستی بەتام و چێژ بوو. سوپ و زەڵاتە و زەیتوون لە سەر سفرەکە بوون. ویستم من پارەی خواردنەکە بدەم، تەها ڕێگەی نەدا و لێشم دڵگران بوو.

**سەردانی سێکانیان:**

دووەم ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ٢٠١٩ بڕیار بوو بڕۆین بۆ سێکانیان، گوندەکەی تەها، زۆر حەزم دەکرد ئەم گوندە شاخاوییە ببینم. گوندێک سەردەمانێک دانیشتووانی سی خێزان، واتا نزیکەی سەد و بیست کەس بوون. ئەم گوندە بە نزیکەی سی ساڵ،

زیاتر لە حەفتا شەهیدی پێشکەش بە ڕێگەی ئازادی کوردستان کردووە. دەیان کەمئەندام و زیندانی بۆ ئازادی پەروەردە کردووە.

کەشوهەوا خۆشە. لە سلێمانی بەڕێدەکەوین. خەڵکی بۆ گەشت و سەیران لە شار هاتوونەتە دەر. لە ڕۆخی ڕێگاکان گۆشتفرۆشی زۆری لێیە. لە پێش دوکانەکانیان لاکی مەڕ و بزنیان هەڵواسیوە. خەڵکی گۆشت دەکڕن و لەو کەشە بەهاری و ئازادەدا دەیبرژێنن. ڕێگا زۆر جەنجاڵە. خەڵکێکی زۆر لە دەشت و دامێنی چیاکان دانیشتوون. ئاگریان کردوەتەوە، چا لێدەنێن و خواردن ئامادە دەکەن. تەها دەپرسێت: حەزدەکەن گۆشت بکڕین و بیبرژێنین؟ دەڵێم: نا. شەمسە نان و پەنیرێکی زۆری پێداوین. هەر ئەوەمان پێدەخورێت. تەها دەڵێت: جا ئەو تۆزە خواردنە کە هیچ نییە. تەنها نان و پەنیرە. پێی دەڵێم خودا گەورەیە بۆ نانی نیوەڕۆ، تەها دەڵێت: کەواتە با بەخێرایی بڕۆین بۆ گوند. یاسینی برام چاوەڕێمانە.

وردە وردە ڕێگاکە دەچێتە نێو شاخەکان. جادەکە قیرتاوە. ئەم ڕێگایە دوای ڕووخانی سەدام دروستکراوە. تەها باس لە سەختی ڕێگاکە دەکات پێش دروستکردنی. دەڵێت: لێرەوە بە سەرگەڵو و بەرگەڵودا بەپێ دەڕۆیشتین بۆ سێکانیان. لە نزیک کانی و ئاوێک دەوەستین. هەندێک خەڵکی دیکەشی لێیە، چاک و چۆنییەکی سەرپێی دەکەین. کاتی نیوەڕۆیە کاتژمێر لە دوازدە لای داوە. دوبارە دەکەوینەوە ڕێ، پاش کەمێک لە ڕۆشتن، تەها سەیارەکەی ڕادەگرێت. دەڵێت: ئەمانەی لە ڕۆخی جادەکە دانیشتوون خزم و کەسوکاری منن، با سڵاو و ئەحواڵ پرسییەکیان لێ بکەین. خێزانێکی دە دوانزە کەسین، لە دەوری یەک کۆبوونەتەوە. هەموویان بە بینینی تەها خۆشحاڵ دەبن. زۆرمان لێدەکەن تا لە ماشێنەکە دابەزین. ئێمەش دادەبەزین. تەها ئێمەیان پێ دەناسێنێت. ژن و مێردێک دەڵێن ئێمە کتێبی «شازادەی حەمام»مان خوێندووەتەوە. کەژاڵ عەبدوڵڵا سەعید، پیشەی مامۆستایە و هاوسەرەکەشی مەسعود ئەحمەد عەبدولڕەحمان، یاریدەدەری بەڕێوەبەری قوتابخانەیە. کەژاڵ بەشی ئەدەبی کوردی خوێندووە. بۆ من سەرنجڕاکێشە. چامان پێشکەش دەکەن. یەکترناسینێکی ڕاستگۆیانەیە. چا بە ئاوی کانیاو، ئاگری دار، پیاڵە و ژێر پیاڵەی پاک و خاوێن لەنێو سروشتێکی جواندا کێ هەیە نەیخوات؟ چا،کەم بەوپەڕی چێژەوە خواردەوە. بەڕاستی

سروشت جوانە. ئەم شوێنەش کە ئەم کۆمەڵە هەڵیان بژاردووە دڵڕفێنە. ڕێگاکان بە ناوەڕاستی دارستان و لەوەڕگە و باخ و کانیاوەکاندا دەڕوات. ئەوبەری ڕێگاکە دارستانێکە چەند کانیاوێکی لێ هەڵدەقوڵێت. جۆگەکان لە کانیاوەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە. لە هەر گۆشەیەکی ئەم زەمینەدا کانیاوێک هەڵدەقوڵێت. لە دەوروبەری کانیاوەکان گوڵ و گیا سەریان دەرهێناوە. درەختەکان گەڵایان گوێمشکە بووە. فەربود دەڕوات تا لە کانیاوەکە ئاو بخواتەوە. مێرگ و سەوزایی دەوروبەری کانییەکە پێ و پێڵاوەکانی تەڕ کردووە، قاقا، پێدەکەنێت. ماڵی حاجی حەمەئەمین حاجی سەعید، لەمبەری جادەکەوە دانیشتوون. جێگەیەکی وشکیان لەنێو مێرگەکەدا پەیداکردووە. فەرشێکیان ڕاخستووە. کەلوپەلەکانیان لەسەر بڵاوکردووەتەوە. ئاگریان کردووەتەوە بە تەنیشت ئەواندا جۆگە ئاوێک هاژەی دێت. ئاوی جۆگەکە وەک فرمێسکی چاو ڕوونە. دەنگی بەریەککەوتنی شەپۆلەکانی ئاوەکە لەگەڵ بەردەکانی ناو جۆگەکە مۆسیقایەکی دڵنەوازی دروستکردووە. ڕووبارەکە لە لووتکەی چیاکەوە دێتەخوار. بەفر لووتکەکانی داپۆشیوە. دوای چاکوچۆنی و هەواڵ پرسینیان. قسەیان لەگەڵ دەکەین. دەزانین کە هەموویان یەک خێزانن. بابەگەورە لە ناوەڕاستی هەموویاندا دانیشتووە. هەموویان خەڵکی گوندی «سرد»ن گوندێکی بچووک. ئەو گوندەش وەکو زۆربەی گوندەکانی دیکە ژمارەیەک شەهید، ئەنفال، کەمئەندام، گیراو و زیندانی هەیە. بەڵام ئێستا ڕۆژە خۆشەکانی ئازادییە.

حاجی حەمەئەمین حاجی سەعید، لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٧ـە. لە ساڵی ١٩٥٨ چووە بۆ سەربازی. ئەو کاتە عێراق سیستەمی پاشایەتی بووە. ئەو سەرباز بووە کاتێک عەبدولکەریم قاسم کودەتای کرد. ماوەی سەربازییەکەی لە هەولێر بووە. دواتر ناردویانە بۆ سوریا. بەڵام هەموو فەرماندەکانی ئەو کورد بوون. ئەو دەڵێت لەو سەردەمەدا زۆربەی فەرماندەی یەکەکانی سوپای عێراق کورد بوون. لێم پرسی کاتێک کە گەنج بووی گوندنشینان باج و خەرجییان دەدا بە دەوڵەت؟ حاجی حەمەئەمین دەڵێت هەرگیز ئێمە هیچ کات باج و خەراجمان نەداوە بە حکوومەت. لە گوندەکەی ئەوانیش خەڵوزیان دروست دەکرد. داهاتی زۆربەی خەڵک لەسەر خەڵوز و ترێ و مەڕداری بوو. لە سەردەمی گەنجێتی حاجی حمەئەمین‌دا، لە گوندەکاندا فەرمانگەی

حکوومی نەبوون. فرمانبەری دەوڵەتیش هەر نەبوون. نە مامۆستا هەبوو، نە دکتۆر و نە پۆلیس، ئەو دەڵێت لەو سەردەمەدا گوندەکان تەنیا سەربازیان بە دەوڵەت دەدا. کوێخای گوند دەیگوت دەبێت چەند کەسێک بڕۆن بۆ سەربازی. دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر گوندەکاندا تەنها بەسەرباز کردن بوو. دەڵێت لە سەردەمی مەلیک فەیسەڵدا گوندەکان کوێخایان هەبوو، بەڵام هیچ شتێکیان پێ نەدەدان، خەڵک خۆیان کوێخاکانیان هەڵدەبژارد.

خانە خوێکەمان خەریکی گۆشت برژاندنن. حاجی حەمەئەمین بە منداڵەکانی دەڵێت میوانمان هەیە گۆشتی زیاتر لە شیش بدەن. گۆشتێکی زۆری لێیە. دەڵێم ئەگەر مۆڵەت بفەرموون ئێمە دەمانەوێت بڕۆین. وەک ئەوەی کوفرێکم کردبێت. حاجی حەمەئەمین دەڵێت هەر میوانێک لە کاتی نانخواردندا و لەسەر بەرەی کوردێک دانیشتبێت ناڵێ دەڕۆم. ڕۆشتنی ئێوە لەم کاتەدا کە کاتی نانی نیوەڕۆیە، بۆ ئێمە وەک سووکایەتی وایە. داوای لێبووردنمان کرد و دانیشتینەوە. نانی نیوەڕۆ وا ئامادە دەبێت. خودا ناردی.

کەژاڵ، پرسیار و سەرنجی سەبارەت بە کتێبی "شازادەی حەمام" هەیە. ئەو دەپرسێت و تەهاش وەریدەگێڕێت. من داوا لە حاجی حەمەئەمین دەکەم ناوی پشتاوپشتی خۆیم پێبڵێ تا بینووسم.

حاجی حەمەئەمین ئاهێکی هەڵکێشا. گوتی هەژدە کەس لە خۆشەویستانم شەهید و ئەنفالکراون. چوار لە برا و خوشکەکانم شەهید بوون. چواردە کەس لە کەسوکارە نزیکەکانم، کوڕی مام و پوورەکانم شەهید بوون. حاجی حەمەئەمین دەڵێت باوکم و دایکم کۆچی دواییان کردووە. ئەوان بە داخەوە سەریانناوەتەوە. هەموو ڕۆژێک بۆمەرگی ئازیزانیان دەگریان. دایکم هەر ڕۆژە و دەبوو لە زیندان و گۆڕستانەکاندا بەدوای یەکێک لە ئازیزەکانیاندا بگەڕایە. هەمیشە ترسمان هەبوو، هەر کاتێک بەدوای کەسێکماندا دەگەڕاین، دەمانزانی لەوانەیە خۆشمان سەرمان دابنێین. سەردەمی سەدام، سەردەمی دۆزەخ بوو. کوردستان دۆزەخێک بوو لەسەر زەوی.

لە بەرامبەر من پیاوێک دانیشتووە کە هەژدە کەس لە خوشکەزا و برازاکانی شەهید بوون. چوار کەسی دیکەش لە کەسە نزیکەکانی لە دەستداوە. زمانم نایەتە گۆ لەگەڵ

ئەم پیاوەدا دەبێ چی بڵێم؟ بە بێدەنگی دەمێنمەوە. بەدوای وشەیەکدا دەگەڕێم. ئەگەر ئێوە بوونایە چیتان پێدەگوت؟ چیتان لێ دەپرسی؟ مەسعود و کەژاڵ فریام کەوتن. دەربارەی کتێبی "شازادەی حەمام" پرسیارم لێدەکەن. سوپاس بۆ خودا نەوەی ئێستا، نەوەکانی کەژاڵ و مەسعود، نە شەهیدیان تێدایە نە ئەنفالێک. بەدڵنیاییەوە نەوەی نوێ، بەهای ئەو ئازادی و فیداکارییەی نەوەی پێش خۆیان دەزانن. نیوەڕۆ تێر گۆشتی برژاومان خوارد. هەڵبەت لەگەڵ سۆز و میهرەبانی خاوەنخوان. ئەگەر زمانمان یەک نییە، بەڵام دڵمان یەکە. هاودڵی لە هاوزمانی خۆشترە.

قاقای ڕاسان و ڕەوان، دوو مناڵەکەی کەژاڵ و مەسعود، ئەوە پیشان دەدەن کە ژیان بەردەوامە. چی لەوە باشتر کە ژیان ئاوا بە زوڵاڵی و بەرەو باشی بێت. لە کوردستانی عێراق، تەنیا ڕێگەوبانەکان نین کە چاک بوون. بەڵکو دڵەکانیش چاکبوونەتەوە. ئازار و مەینەتەکانیش نەماون. هەڵدەستین و ماڵاواییان لێدەکەین بەرەو سێکانیان دەکەوینەڕێ. بۆ دوایین جار پرسیار لە حاجی حەمەئەمین دەکەم، ئایا پێتوایە هێشتا مەترسی لەسەر کوردستان هەیە؟ تەها وەریدەگێڕێت. حاجی حەمەئەمین و مەسعود و کەژاڵ هەموو بەیەکەوە دەڵێن: ئیسلامییە توندڕەوەکان و داعشەکان مەترسییەکی زۆر گەورەن. مەسعود دەڵێت ئیسلامییە توندڕەوەکان کار لە لەسەر مێشکی منداڵان دەکەن. توندڕەوەکان چەندین گرووپن تێکڕاش لەگەڵ یەکدی ناکۆکن، لەگەڵ مرۆڤایەتیش ناکۆکن. حاجی حەمەئەمین و مەسعود ماچ دەکەم. دووبارە پیرۆزبایی نەورۆزیان لێدەکەم و ئارەزووی ساڵێکی خۆشیان بۆدەخوازم. ماڵاواییان لێدەکەم.

ڕێگا بەردەوامە، کاتژمێر نزیکی ٢:٣٠ ی پاش نیوەڕۆ، دەچینە سەر ڕێگا گشتییەکە. ڕێگاکە وردە وردە بەرەو ناو شاخەکان هەڵدەکشێت. دەگەینە هەڵدێری چیایەکی بڵند. چیایەک کە دەشتی سلێمانی لە دوڵی سەرگەڵوو جیادەکاتەوە. ڕێگاکە بە دۆڵێکی قوڵدا ئێمە بەرەو گەردەنەکە دەبات. ئەم ڕێگایە لە ساڵی ٢٠١٧ جارێکی دیکە فراوان کراوە. ماشێنە تۆیۆتاکە بە خێرایی دەڕوات. دەگەینە سەرگەردەنەکە و دادەبەزین. هەموو دەشتی سلێمانی لەبەردەممانە. تەها بۆمان باس دەکات و لە دوورەوە، ئاوەدانیەکانمان پیشان دەدات، ناویان دەڵێت. لەم ڕێگا و گەردەنەیەدا ڕۆژگارێک

لە بن هەربەردێکدا پێشمەرگەیەک هەبوو، کە ئامادەبوون بۆ پارێزگارکردن لێی گیانیان ببەخشن. گەردەنەیەک کە بە درێژایی چل ساڵ سەدان شەهیدی بەخۆیەوە بینیوە. لەوانەیە لە هەموو ناوچەکەدا کەمتر گەردەنەیەکی وا هەبێت کە هێندەی ئەم گەردەنەیە بەرخودان و پارێزگاری و گیانبەخشینی بینیبێت. لەوبەری گەردەنەکەوە دۆڵ و گوندی سەرگەڵوو دەبینرێت. دۆڵ و ئەشکەوتەکانی گوندەکە بنکەی هێزەکانی مەلا مستەفا بوون. دوای مەلا مستەفاش یەکێک لە بنکە سەرەکییەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی بوو. چاپخانەی شۆڕشیش لەوێ بوو. بیربکەرەوە و بهێنە پێش چاوی خۆت. کە سەدام تەنانەت بەرگەی یەک وشە یاخود یەک دێڕ کە پێچەوانەی خۆی بووایە، نەدەگرت. سزای یەک وشەی پێچەوانەی دیکتاتۆریەت لەسێدارەدان بوو. ئەو سەردەمە لە پشت ئەو گەردەنەوە لە گوندی سەرگەڵوو کوردەکان چاپخانەیان دروستکرد. ڕۆژنامە، گۆڤار و کتێبیان دژی ئایدیۆلۆژیای دیکتاتۆریەت چاپ دەکرد. سەدام و هێزەکانی چ هەوڵێکیاندا تا ئەم کێو و دۆڵانە بخەنە ژێر دەستی خۆیان؟ پێشمەرگەکان دەبێ چ ئازایەتییەکیان نواندبێ تا پارێزگاری لەم دۆڵ و گەردەنەیە بکەن؟ ئاخۆ دەبێ چەند خوێن لێرەدا ڕژابێت؟

تەها دەڵێت دوو سبەی دەتانبەم بۆ سەرگەڵوو. لە گەردەنەکەوە ڕێگاکە پێچاوپێچ بەرەو خوار دادەگەڕێت. ئەمبەراوبەری ڕێگاکە داربەڕووە. دەگەینە تەختایی دۆڵەکە. دۆڵێکە پڕ لە ئاو و دار و درەخت. بۆئەوەی بگەینە سێکانیان دەبێت لەم دۆڵەوە تێپەڕین. لە تەنیشت گوندی سەرگەڵووەوە تێپەڕین. گوندێک کە پێگەیەکی تایبەتی لە مێژووی بەرەنگاری کوردستاندا هەیە. بەشێکی زۆری خانووەکان تازە دروستکراون. دەبێت دوبارە بەسەر گەردەنەیەکی دیدا سەرکەوین، تا بگەینە دۆڵێکی دیکە. لەسەر گەردەنەی دووەم، وچانێک دەگرین. باڵەخانەیەک هاوشێوەی گۆڕەپانێک بە شێوازی شانۆی ڕۆمانی لە قۆناغی درووستکردندایە. لەوێوە هەموو گوندەکە دەبینرێت. گوندێکی زۆر جوانە. سەرگەڵوو، ئەو گوندەی کە تەها بە پیادە لە سێکانیانەوە دەهات بۆ ئێرە تا بچێتە قوتابخانە. لە ڕێگایەکی هەڵدێرەوە تێدەپەڕین. ڕێگاکە بە قەدپاڵی شاخەکەدا تێدەپەڕێت. دۆڵێکی قوڵ لە خوارمانەوەیە. لە تەختی دۆڵەکەدا ڕووبارێکی بچووک هاژەی دێ. ڕووبارێک کە بەرەو بەنداوی دوکان دەڕوات. ماشێنەکە بەرەو

تەختی دۆڵەکە دەجوڵێت. مرۆڤ تووشی سەرسووڕمان دەبێت. دەگەینە تەختایی دۆڵەکە، دەبێت بۆ جاری سێیەم بە گەردەنەیەکی دیکەدا سەرکەوین. سێکانیان لە بەرزیی ١٣٢٥ مەتردایە و بەرزترین گوندی دۆڵەکەیە. دەگەینە سەر گەردەنەکە. چەند جوانە، سێکانیان بەتەواوی لە بەرامبەرمانە. لەوبەری دۆڵەکەوە. تیشکدانەوەی خۆر لە گوێسەبانە تازە دروستکراوەکانەوە شادی دەخستە دڵەوە. دەوەستین و چەند وێنەیەک دەگرین؛ بەڵام کامێرای مۆبایل بەکەڵکی ئەو کارە نایەت. بەداخەوە کە کامێرای باشترمان پێنەبوو. بە حەسرەتی نەبوونی کامێرای باشەوە سواری ماشێنەکە دەبین. هاوسەرەکەم دەڵێت خۆزگە کامێرایەکی باشمان پێبوایە.

ئەو ڕێگەیەی کە تەها بە پیادە لەگەڵ جەمالی هاوڕێیدا لە سێکانیانەوە پێیدا دەهات بۆ سەرگەڵوو، وا ئێمە لە نزیکەوە دەیبینین. بەڕاستی وێناکردنیشی سەختە، دوو مناڵی حەوت و هەشت ساڵ بە پیادە لەم کێو و دۆڵەدا بێن و بچن.

دووبـارە دەگەینە تەختی دۆڵـەکە. بۆ جـاری چـوارەم دەبـێ بە هەورازێکدا سەرکەوینەوە. لە ڕێگایەکی پێچاوپێچدا دەچینە نێو دۆڵەکە لە بـەردەم باخەکەی تەهادا دەوەستین. دەیەوێ پێش ئەوەی بچین بۆ ماڵی یاسینی برای، سەرێک لە باخەکەی بدەین. تەلی دڕکاوی و دەرگایەک باخەکە لە ڕێگاکە جیا دەکاتەوە. ئەم تەلبەندە بۆ ئەوەیە کە ئاژەڵ نەچێتە نێو باخەکەوە. باخەکەی زۆربەی دارمێوە. داری دیکەشی تێدایە. لە کۆتایی باخەکەدا خانوویەکی نوێ دروستکراوە. بەڵام پۆشتە نییە. خانوویەکی گوندییە بۆ حەوانەوە. درەختێک لە بەردەمی خانووەکەدایە. درەختێکی بەهێز. لەنێو پەلی درەختەکەدا سێ مەتر بەرزتر لە زەوی، جێگە خەوێکی لە دار دروستکراو هەیە. تەها بۆ پشوودانی خۆی دروستی کردووە. دەڵێ لە هاویندا مێشوولە زۆرە، ئاژەڵ و زیندەوەری زیانبەخش هەیە. پەردەکوللەی بەدەوری جێگەخەوەکەیدا کێشاوە. بەڕاستی لە هاویندا خەوتن لەسەر درەخت چێژبەخشە. لە پشت خانووەکەوە کانیاوێکی بچووک هەیە،کە بۆ ئاودانی درەختەکان بەکاردێت. تەها دەڵێت زۆربەی کات خۆم بە تەنیا دێم بۆ ئێرە.

سواری ماشێنەکە دەبین و دەڕۆین بەرەو ماڵی یاسینی برای تەها. ئەم خانووانە زیاتر وەک هاوینەهەوار و دوورکەوتنەوە لە گەرمای هاوینی سلێمانی دروستکراون.

لە بەردەمی هەر خانوویەکدا ماشێنێکی مۆدیل بەرز ڕاوەستاوە، ئەمەش نیشانەی باشبوونی دۆخی داراییە. تەها ماشێنەکەی لە بەردەمی ماڵی یاسین ڕادەگرێت، چاوەڕێمانن. دوو براکە یەکدی ماچ دەکەن. ئێستا هەردوکیان باپیرەی بارینی بچکۆلەن. یاسین لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٢ـە. بەخێرهاتنمان دەکەن. یاسین و کەلسومی هاوسەری، چاوەڕێمانن. کەلسوم مەحموود حەسەن کچی مامی باوکی یاسینە. ئەوان حەوت منداڵیان هەیە. کوڕە گەورەکەی، واتا ئاری پەیمانگەی وەرزشی تەواو کردووە. بەڵام لە گوندەکەدا هاوکاری باوکی دەکات. دووەمیان دیاری خوێندکارە، لە سەرگەڵوو دەخوێنێت. شانازیش هەمیشەیی لای دایک و باوکیەتی. شاگوڵیش لە گوندەکەیە. شاراش دیپلۆمی باڵای وەرزشی هەیە. ئەم دوو خوشکە شوویان کردووە، بەڵام بەهۆی پشووی نەورۆزەوە هاتونەتەوە لای دایک و باوکیان. پەیامیش بووکی تەهایە دایکی بارین ی بچکۆلەیە. پەیام لە سلێمانییە.

پەیمانیش بووکی خاڵە عەبدوڵلایە، خاڵی تەها و یاسین، لە پیرەمەگروون دەژی. ئەم زانیارییانەیان لە سلێمانی بە من دا. کاتێک گەیشتمە بەردەمی ماڵی یاسین، هەموویانم دەناسی. خانوویەکی نوێیە، خانووە کۆنەکەی تێکداوە و خانوویەکی نوێی دروستکردووە. بە ئاوی کانیاوەکە، حەوش و بانی ماڵەکەیان شوشتووە. شتومەکەکانی ئێمە بۆ ژوورێکی گەورەی پاک و خاوێن دەبەن کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا زۆپایەکی دار هەیە. کوێستانە و هەواش ساردە. بەدڵنیاییەوە، شەو بە ساردتریش دەبێت.

دوانیوەڕۆیە. هەموومان لە ژووری میوان چا دەخۆینەوە. جگە لە تەها هیچ کەس فارسی نازانێت. یاسین پێشمەرگایەتی نەکردووە. ئەو هەمیشە سەرقاڵی جوتیاری و ئاژەڵداری بووە. ڕەز و مەڕ و مانگای هەیە؛ بەڵام بەردەوام هاوکاری پێشمەرگەی کردووە. نۆ ساڵ سەربازی کردووە. ماوەیەک دەڕۆیشت بۆ سەربازی و دواتر هەڵدەهات. ساڵی ١٩٨٤ هاوسەرگیری لەگەڵ کەلسومدا دەکات. ئەوکاتە، ١٩٨٤-١٩٨٦ سەربازی هەڵاتوو بوو. سەربازییەکەی تا ساڵی ١٩٩١ درێژەی کێشا. کەسێکی میهرەبان و خەمخۆری خێزان و میواندۆست بوو. دوای چا خواردنەوە لەگەڵ تەها دەچینە نێو گوند. گوندێکی بچووکی سی ماڵی. خانووەکان زۆربەی بنەی هاوینەن،

واتا خاوەنەکانیان لە سلێمانی و شوێنانی دیکە نیشتەجێن. تەنها لە پشووەکاندا دێنەوە بۆ گوند. گوندەکە جگە لە مزگەوتێک هیچی دیکەی نییە. ئاو و کارەباشی هەیە. کەمێک بەدەوری گوندەکەدا دەگەڕێین. شەو دێینەوە بۆ ماڵەوە نانی ئێوارە ئامادەیە. خوانێکی شاهانە و پڕ لە خواردنی جۆراوجۆر ڕازێنراوەتەوە. تەها دەڵێت: لە ڕابردوودا میوان زۆر بوو خواردن کەم بوو، لە ئێستادا میوان کەم و خواردن زۆرە.

دەوروبەری سەعات حەوتی شەوە، لەسەر خوانەکە دانیشتووین. لەڕاستیدا من هێشتا برسیم نییە؛ بەڵام بۆنی چێشتەکە زۆر خۆش بوو. سێ کەس لەوانەی سەر خوانەکە دانیشتوون "شازادەی حەمام"یان خوێندووەتەوە. ئاری دەڵێت من دوو جار "شازادەی حەمام"م خوێندووەتەوە. یەکێک لە کچەکانی یاسین‌یش کتێبەکەی خوێندووەتەوە. هاوسەری فەرەیدون کوڕی شەمسە ئەویش لەوێ بوو، بەکالۆریۆسی لە مێژوودا هەیە، کتێبی "شازادەی حەمام"ی خوێندووەتەوە.

تەها قسەکانی ئێمە وەردەگێڕێت. زمانی یەکتر نازانین، بەڵام پەیوەندییەکی ڕۆحی لە نێوانماندا دروست بووە. دەڵێن ئێمە میوانی "شازادەی حەمام" و هاوسەر و کوڕەکەی ین. بۆنوبەرامەی خواردنەکان زۆر خۆشە. سێکانیان ڕووبەهەنارێکی خۆشی هەیە. مریشکی کوردییان بە ڕووبەهەنارەوە لێناوە زۆر بەتام و چێژە. هەموو جۆرە گیا کێوییەکان لەسەر خوانەکە، هەیە. کنگر، گۆزروان، پاڕێزە و چەندجۆرە گیایەکی دیکەی کێوی، لە ڕۆن و پیازدا سوور کراونەتەوە، بە سماقەوە لێیان نابوو. سماقێک کەهی کێوەکانی سێکانیانە. بیردەکەمەوە ئەگەر ئەم خواردنانە لە یەکێک لە چێشتخانە بەناوبانگەکانی نیۆیۆرک بێت لە دووسەد دۆلار کەمتر وەرناگرن. دوو جۆر خۆراکی دیکەش لەسەر خوانەکە بوون، لە سەوزە و گژوگیای ئەم شاخە دروستکرابوون کە نەمزانی چین. خۆتان بڕۆن بۆ ئەم گوندە دڵگیرە کە بەشێکە لە مێژووی کەلتووریی کوردستانی عێراق، بڕۆن و لەوێ ئەو خواردنانە بخۆن. چەند جۆرە سەوزەیەکی بۆنخۆش لەسەر خوانەکە بوون، پەنیر و ماستی کوردیشی لێبوو. پەنیر و ماستێکی بەچێژ، نانیش کە بۆ خۆیان دروستیان کردبوو. دوای نانی ئێوارە دەکەوینە گفتوگۆ چەند کەسێکی دیکەش کە بۆ دیدەنی تەها هاتبوون، لەگەڵ ئەوانیش دەکەوینە گفتوگۆ.

**عومەر خدر محەمەد ئەمین**

عومەر خدر محەمەد ئەمین یەکێک لە میوانەکانە. ئەو لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٣ یە. دەڵێت لەکۆندا خەڵکی زیاتر ناوی عەرەبی و ئیسلامییان لە منداڵەکانیان دەنا، بەڵام ئێستا زۆربەی ناوەکان کوردیین.

دەربارەی کەسوکار، برا و خوشکەکانی لێی دەپرسم ئاهێک لە ناخیەوە دێتەدەر چاوەکانی پڕدەبن لە ئاو. دەڵێت برا گەورەکەم، عەزیز لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٠ بوو. هاوسەرەکەی ناوی مریەم محەمەد بوو، حەوت منداڵیان هەبوو. ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن سوپاکەی سەدامەوە ڕفێندران و لەناوبران. لە عەزیز، تەنیا یەک کوڕ ماوەتەوە ناوی نەوزادە. نەوزاد عەزیز خدر محەمەد ئەمین، ئێستا لە بریتانیا دەژی. عومەر، ئاهێک هەڵدەکێشێت. پیاڵەچاکەی بە دەستی دەڕێژێتە نێو ژێرپیاڵەکە. تێدەگەم کە خەم و گریان قوڕگی گرتووە. ناتوانێ «چا» کەی بخوداتەوە. چاوەڕێ دەکەم. چەند خولەکێک لەگەڵ ئەوانی دیکەدا گفتوگۆ دەکەم. دە خولەک دواتر، شاگوڵ چایەکی تازەی بۆ دەهێنێت. قومێک لە «چا» کە دەخوداتەوە. دەڵێت برا بچووکەکەم، ئەحمەد لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٦ بوو. هاوسەرەکەشی ناوی «ڕووناک» بوو، ئەوان گەنج بوون. ئەحمەد بیست و سێ ساڵ و ڕووناکیش بیست ساڵ بوو. سێ منداڵیان هەبوو. لە ساڵی ١٩٨٨ هەر پێنجیان ئەنفال کران. ئەوانیان برد و هەرگیزا و هەرگیز کەس نەیزانی چییان لێهات. عومەر، دوبارە دڵتەنگ بووەوە. من نامەوێت پرسیاری دیکەی لێبکەم. دوای چەند خولەکێک، خۆی درێژەی پێدەدات. دەڵێت خوشکێکیشم ناوی شەمسە بوو، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٥ بوو. هاوسەرەکەی ناوی عومەر بوو، پێشمەرگە بوو، ساڵی ١٩٨٦ شەهیدکرا. ساڵی ١٩٨٨ شەمسەی خوشکم و چوار منداڵی ئەنفال کران. پیرەمێرد سەیرێکی کێوەکان دەکات و دەڵێت ئەوەندەی ئەو کێوانە خەم لەسەر دڵمە. دوبارە درێژەی پێدەدات و دەڵێت: خوشکەکانی ترم «حەلاو و نەسرین» لە سلێمانی دەژین، خوشکێکی دیکەشم ناوی «حەپسە» یە لە پیرەمەگروونە. «ئازاد»ی براشم لە سلێمانی دەژی.

دوو برای دیکەم عەزیز و ئەحمەد، ڕۆیشتبوون بۆ ئێران. سەدام لە ساڵی ١٩٨٨ بڕیاری لێبووردنی ڕاگەیاند، کە گوایە هەر کەسێک ڕۆیشتووە بۆ ئێران یاخود هەر

وڵاتێکی تر، ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ عێراق سزا نادرێت و لێی خۆشدەبن. عەزیز و ئەحمەد خۆیان و خێزانەکانیان گەڕانەوە بۆ عێراق. بەڵام سەدام هەموویانی دەستگیر و ئەنفال کرد. عومەر، ئامۆزایەکیشی بە ناوی جەلال لە ساڵی ١٩٨٧ شەهید کرا. ئەم پیاوە کە بەرامبەری من دانیشتووە، بیست کەس لە نزیکەکانی لەدەستداوە. هەموویان شەهیدبوون یاخود ئەنفالکراون. نۆزدە کەس لە برا، خوشک و منداڵەکانیان و یەک ئامۆزاشی کە جەلال محمود خدرە. لەبارەی هاوسەری خوشکەکەیەوە لێی دەپرسم. دەڵێت: مێردەکەی شەمسە، ناوی عومەر عەلی حسێن بوو. حسێن، باپیرێ عومەر لە ساڵی ١٩٧٤ لە بۆردوومانی سێکانیان شەهید بوو. لەو سەردەمەدا هێزەکانی سەدام لەگەڵ هێزەکانی مەلا مستەفا لە جەنگدا بوون، هێشتا ڕێککەوتنامەی ١٩٧٥ ی جەزائیر، واژۆ نەکرابوو. عەلی کوڕی حسێن ئەویش لە لایەن هێزەکانی سەدامەوە گوللەباران کرا. عەلی کوڕێکی هەبوو ناوی عومەر بوو کە لە ساڵی ١٩٨٦ شەهید کرا. کوڕەکەی دیکەشی ناوی زرار بوو، لەگەڵ دایکیدا، خەدیجە هاوسەری عەلی، ئەنفالکران. چوار پشت لە یەک خێزان لەلایەن سەدامەوە کوژراون. من باوکان، دایکان، خوشکان، برایان و منداڵانی شەهیدانم بینیوە. دڵنەواییم کردون و لەگەڵیاندا گریاوم. بەڵام لە بەرامبەر پیاوێک کە دەیان کەس لە کەسە دوور و نزیکەکانی لە لایەن سەدامەوە شەهید و بێسەروشوێن کراون، دەبێ چی بڵێم؟

عومەر خدر محەمەد ئەمین، دونیایەک خەمی هەیە. ئەو زۆر وانە لە ژیانەوە فێربووە. لە دوایین قسەیدا دەڵێت با نزا بکەین کە داعشەکان، دەسەڵات نەگرنە دەست. ئیسلامییە توندڕەوەکانی وەک ئەلقاعیدە و داعش گەورەترین دوژمنانی دین و مرۆڤایەتین.

لە نێوان قسەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە جەمال محەمەد ساڵح، خۆی و ئەبوبەکری برای لە ساڵی ١٩٧٨ لە گوندی سەرگەڵوو شەهید کران.

شەو گەیشتە درەنگ. میوانەکان ڕۆیشتن. ئێمەش دەچینە ژوورەکەی خۆمان. هەندێک داری دیکە دەکەینە نێو زۆپاکەوە. دار بە ئەندازەی تەواو لە تەنیشت زۆپاکەوە هەیە. ئەگەر شەو هەوا ساردتربوو، دەتوانین ئاگرەکە زیاتر بکەین. من دادەنیشم و بیرەوەرییەکانم دەنووسم. فرمێسکەکانم پەڕەکانی بەردەستم تەڕ دەکات. شێتێک، ئەم

هەموو زوڵم و ستەمەی بەناوی مۆدێرنیزمەوە ئەنجامداوە. ئەو شێتە، ئەم هەموو کوشتار وماڵوێرانییەی بەناوی ئاوەدانکردنەوەوە ئەنجامداوە. سەدامی خوێنمژ، ئەمە بیرکردنەوەی بوو. ئەی باشە ئەفسەران و سەربازان بۆ چی فەرمانەکانیان جێبەجێ دەکرد؟ بژین ئەو سەرباز و ئەفسەرانەی کە لە سوپای سەدام هەڵاتن.

لە کۆتاییدا، لەنێو ئەو هەوا پاکە و لەو ژوورە خاوێنەدا لەسەر نوێنێکی پاک رادەکشێم. بەیانی زوو بە دەنگی کەڵەشێری ئاوایی بەخەبەر دێم و لە ژوورەکە دێمە دەرەوە. هەوا زۆر دڵگیرە. دەمویست بەو رێگایەدا برۆم کە تەها پێیدا دەرۆیشت بۆ قوتابخانە. پۆشاکەکانم لەبەر دەکەم و دەچمە سەر رێگاکە. هەوڵدەدەم بەسەر قیرەکەدا نەرۆم. لە بەر خۆمەوە دەمگوت دەبێت تەها لە کام لاو و لە کام باریکە رێوە رۆشتبێت؟ هەوڵدەدەم لەو لایەوە برۆم؛ بەڵام زەوی زۆر قورە. هەرچەندە بەرەو دۆڵەکە شۆڕ دەبمەوە کانیاو و ئاوەکان زۆرتر دەبن. لە هەموو لایەکەوە ئاو هەڵدەقوڵێت. بە ناچاری دێمەوە سەر رێگاکە. نزیکەی دوو کیلۆمەتر و نیو دەرۆم؛ بەڵام بیردەکەمەوە من بە کەسم نەوتووە بۆ کوێ دەچم؟ لەوانەیە نیگەرانم بن. دوبارە دەگەڕێمەوە. لە گەڕانەوەمدا باخەکانی دامێنی کێوەکە سەرنجم رادەکێشن. لە دوورەوە یاسین دەبینم لەنێو رەزەکەیدا خەریکی کارە. کاری جوتیاری، ئەویش لە سەرەتای وەرزی بەهاردا پشووی نییە. دەمەوێت برۆم بۆ لای یاسین؛ بەڵام نێوانمان دوورە، لە نێوان ئەو رێگایەدا کەندەڵانێک هەیە. دەبێ لە کوێوە خۆی گەیاندبێتە ئەو شوێنە؟ پیاوە جوتیارەکە زۆر زووتر لە من لە خەو هەستاوە و دەستی بە کار کردووە. ئەگەر ئەو لە جۆگەکانی پشت رەزەکەیەوە کار نەکات لە هاویندا هیچ بەروبوومێکی نابێت. ئەو دەبێت کاربکات تا لە هاویندا پاداشتەکەی وەربگرێت. دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. هەمووان دەپرسن لە کوێ بووی؟ هاوسەرەکەم دەڵێت من دەزانم بۆ کوێ رۆشتووە. ویستویەتی بڕوا بۆ سەرگەڵوو قوتابخانەکەی پێشووی تەها ببنێت. پێم گوت گومانەکەت زۆر راستە؛ بەڵام تەمەڵیم کرد و لە نیوەی رێ گەڕامەوە.

خوانی نانی بەیانی، رازاوەتەوە. هەموو بەروبوومی گوندەکەیە. لەسەر خوانی بەیانی گفتوگۆ دەکەین و پرسیار دەکەین و وەڵام وەردەگرینەوە. دکتۆر وسوقی لەگەڵ ژنەکان سەرگەرمی قسەیە. بە زمانی بێزمانی و هەندێک کوردی و فارسی و کەمێک

ئینگلیزی، لەگەڵ ژنەکان گفتوگۆ دەکات. هاوسەرەکەی فەرەیدوون بەکالۆریۆسی مێژووی هەیە و دەتوانێت بە ئینگلیزی قسە بکات. تەهاش هەر وەرگێڕی هاوسەرەکەم و ژنەکانی ترە. دوای نانی بەیانی لەگەڵ تەها بە ماشێنەکەی بەرەو گوندەکە دەڕۆین تەها لە بست بە بستی گوندەکە و دارستان و لەوەڕگەی گوندەکە بیرەوەریی هەیە. بیرەوەرییە خۆشەکانی منالّی. بیرەوەریی خەڵوز دروستکردن. یادەوەریی بۆردوومان و دەردەسەری.

زۆرێک لە داربەڕووەکانی دارستانەکە تۆکمە و بەهێز و گەورەن. شاری سلێمانی و شارەکانی دیکە گەورەترین بازاڕی ساغ کردنەوەی خەڵوزن. زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانی شارەکان، هۆکاری لەناوچوونی دارستانەکانن. لەگەڵ هاتنی کارەبا و پێدانی سوتەمەنی ئیتر کەس پێویستی بە خەڵوز نییە. سروشت دەیەوێت هەناسە بدات. دارستان دەیەوێت دوبارە گەشە بکات. لە هەموو شوێنێک دەوەن و داربەڕووەکان دەیانەوێت گەورە ببن. مانگاکانی گوند ئازادانە دەلەوەڕێن. لە دوای گوندی سێکانیانەوە هیچ گوندێکی دیکە نییە. تەها، کڵاشینکۆفەکەی و حەوت گوللەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. دواجار دەگەینە بەرزترین شوێنی کوێستانی سێکانیان کە نزیکەی ١٦٠٠ مەتر بەرزە. دیمەنی زۆر جوانە. شاخی پیرەمەگروون لە دورەوە دەبینین. شاخێکی زیاتر ٢٦٠٠ مەتر بەرزە. لووتکەکەی پڕە لە بەفر. شاخێک کە مێژووی چەند هەزار ساڵەی ناوچەکە و نەتەوەی کوردی لە خۆیدا هەڵگرتووە. لەخوار ئێمەوە کەندەڵانێکی ترسناک هەیە لە ڕاستیدا لەسەر بەرزایی کەندەڵانێک وەستاوین دەشتی سلێمانی لە دوورەوە دەبینرێت. ماشێنێکی زۆر بە ڕێگاکەدا دێن و دەچن؛ بەڵام بۆ گەیشتن بەو ڕێگایە دەبێت لەو کەندەڵانە ترسناکەوە تێپەڕین. کەندەڵانێک کە تەها چەندین جار پێیدا ڕۆشتووەتە خوارەوە. دیمەنەکە ئەوەندە جوان بوو کە ئاگامان لە تێپەڕبوونی کات نەما لە گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە لە شوێنێک وچان دەگرین. تەها لە تەنیشت کانیاوێک و خانوو و باخێکی بەجێهێڵراو ماشێنەکەی ڕادەگرێت. لە کانیاوەکە ئاو دەهێنین. ئاگر دەکەینەوە. تەها پێداویستی "چا"ی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. "چا" دەخۆینەوە و پشوویەک دەدەین. دەگەڕینەوە بۆ ماڵەوە. خوانی نیوەڕۆ ڕازێنراوەتەوە. زەحمەتیان کێشاوە. پشووی دوای نانی نیوەڕۆ لەزەتبەخشە.

دوانیوەڕۆ. کەشوهەوا دڵگیر و خۆشە. تەها دەڵێت ئەگەر دەتانەوێت دەچینە دیدەنی یەکێک لە خزمەکانم. دەڕۆین بۆ ماڵی حەسەن محەمەدئەمین حەسەن، ئەو لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٦ ە. سێ ساڵ لە من گەورەترە. ماڵەکەی لە تەنیشت ڕێگاکەیە. ئامۆزای باوکی تەهایە. محەمەدئەمین، برای فەرەجی باپیری تەهایە. کەلسومی هاوسەری یاسین‌یش ئامۆزای کاک حەسەنە. نازانم پێشتر تەها هەواڵی پێدابوون کە دەچین بۆ ماڵی ئەوان یا نا؟ بەڵام حەوشە و ماڵیان زۆر خاوێن بوو. دەچینە ناو هۆڵەکەوە زۆر پاکوخاوێنە. مریەم زۆر بە گەرمی پێشوازیمان لێ دەکات. "داستان" کچی کاک حەسەنە، زۆر جوان و گورجوگۆڵە. فەرموومان لێ دەکات و دەچینە ژووری میوان. لێمان دەپرسن حەزدەکەن لە بانیژەکە دانیشن یان لە ژووری میوان؟ هەوا خۆشە لەسەر بانیژەکە دادەنیشین. بانیژەکە دەکەوێتە بەرزی کەندەلانەکەوە. چەند دیمەنێکی جوانی هەیە. یەکێک لە سەرنجڕاکێشترین دیمەنەکان، کەندەڵانەکەیە. محاجەرەی باڵکۆنەکە پارێزەری گیانی مرۆڤەکانە، کورسی‌یان لەسەر بانیژەکە ڕیز کردووە، هەتاو نەرم و کەم تینە. بەرامبەر بانیژەکە، لەوبەری دۆڵەکەوە ڕەزەکانن، ڕەزەکان دامێنیان دەگاتە سەر شیوەکە. داستان، چامان بۆ دەهێنێت. چەرەس و میوەی وشکمان بۆ دادەنێن. تێداماوم، کە ئایا لەگەڵ ئەم ژن و پیاوە بەتەمەنە کوردە، دابنیشم و سەیری ئەو دیمەنە جوانە بکەم. یاخود پرسیاریان لێ بکەم. هەندێک بەسەر بانیژەکەدا پیاسە دەکەم. لە شوێنی دانیشتنەکە دووردەکەومەوە. لە لایەکی بانیژەکەوە دوور لە ماڵەکە سەربانی تەویلەکانە. چەند ئەسپ و مانگایەک لە حەوشەی تەویلەکەدا سەرقاڵی لەوەڕن. داستان کتێبی "شازادەی حمام"ی خوێندووەتەوە. خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕێت بە بینینی نووسەری کتێبەکە. منیش خۆشحاڵم کە ئەم کچۆڵە خانمە جوانەی کورد، لەم گوندە جوانە دوورەدەستەی هەرێمی کوردستان، کتێبەکەی منی خوێندووەتەوە. لە بارەی ژیان و گوزەرانی کاک حەسەنەوە پرسیار دەکەم. دەڵێت کاتێک کە منال بووم، لەم گوندەی ئێمە، هیچ پێداویستییەک نەبوو. گوندەکەمان وەک بەهەشت وا بوو. دارستان، دەشت، ئاژەڵی کێوی، هەوای پاک و ترێ. کاتێ گەنج بووم، خەبات دژی حکوومەتی بەغدا دەستی پێکرد. منیش بووم بە پێشمەرگە. لەگەڵ مەلا مستەفادا بووم. مەلاش هەر لێرە لە سەرگەڵوو بوو. دووری بنکە و

بارەگاکان تا ماڵی ئێمە چوار کیلۆمەتر بوو، زیاتر نەبوو. هەرکات پێویستی بکردایە من لە سەرگەڵوو بووم. دەجەنگاین هێرشمان دەکرد هیچ مووچەیەکمان نەبوو. هیچ پارەیەک نەبوو. هەر کاتێک لە گوندەوە دەڕۆشتم بۆ سەرگەڵوو هەندێک نان، خۆراک، دۆشاوی ترێ و پێداویستی دیکەم بۆ پێشمەرگەکان دەبرد. هیچ کاتێک بریندار نەبووم. تا مەلا مستەفا لێرە بوو من لەگەڵ هێزەکەی ئەودا بووم. کە مەلا مستەفا ڕۆیشت بۆ ئێران، من ئیتر درێژەم پێنەدا بەڵام بەردەوام هاوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانم دەکرد. هەر لەم گوندە مامەوە. ئێرە بەردەوام بۆردوومان دەکرا. باوکم محەمەدئەمین، هەشت منداڵی هەبوو ئێمە هەشت خوشک و برا بووین. برای لە من بچووکتر، ناوی سەعید بوو. سەعید محەمەدئەمین حەسەن، ئەو ژنی هێنابوو، سێ منداڵی هەبوو. هاوسەرەکەی ناوی خاتوون بوو. سەعید و هاوسەر و منداڵەکانی هەموو ئەنفالکران. هیچ یەکێکیان نەدۆزرانەوە. منداڵەکانی ناویان نیگار، کەژاڵ و پەرژین بوو. ئەوان بەهۆی بۆردوومانی کیمیاییەوە بەرەو ئێران هەڵاتبوون. ماوەیەک لە ئێران بوون. سەدام بڕیاری لێبووردنی دا. ئەوان بە بڕیارەکەی دیکتاتۆر، هەڵخەڵەتان و گەڕانەوە بۆ عێراق. هێزەکانی سەدام دەستگیر و ئەنفالیان کردن. ئیتر هەرگیز نەمبینینەوە. دواتر خوشک و براکانم لە گوندەکە ڕۆشتن عەبدولڕەحمانی برا گەورەم، لە سلێمانییە. حەلاوە لە هەولێرە، ئافتاو لە سلێمانییە و ئامینە و ئەسمەر و سەوزەش لە پیرەمەگروونن. بۆردوومان هەموومانی لە سێکانیان وەدەرنا. هیچ کار و کەسابەتێکمان نەبوو، دەبوو هەموو بڕۆین. حەسەن یازدە منداڵی هەیە، سوپاس بۆ خودا، ئەوان هەموو ساغ و سەلامەتن. دوو کەسیشیان لە بریتانیان، چڕۆ شووی کردووە و پێنج ساڵە لە بریتانیایە. ئەیوبیش لە ساڵی ٢٠١٧ چووە بۆ بریتانیا هەموویان لەم دێیە ڕۆیشتوون. جگە لە داستان و چۆمان، تەنها ئەم کچە -داستان- م لەلا ماوەتەوە، ئەویش لێرە بمێنێتەوە چی بکات؟ گەنجێکی، خوێندەوار و ڕووناکبیرە. هەتا ئەگەر بیشیەوێت شوو بکات، ئێرە پیاوی لێ نییە. کوڕانی گەنج لەم دۆڵە نەماون. "داستان"یش هەر دەبێت ڕۆژێک بە شوێن ژیانی خۆیدا بڕوات. من و هاوسەرەکەم دەمێنینەوە، لەگەڵ یادگارییە خۆش و ناخۆشەکانی گوند. حەسەن دەڵێت ئێستا کە ئێوە هاتوون بۆ سێکانیان، زۆر حۆشحاڵین. ڕۆژگارێک ئێمە لەم

گوندە دوورەدەستەدا، لەژێر هەڕەشەی بۆردوومان و کیمیاباراندا، لە جەنگدا بووین. هەموو ڕۆژێک کوژراو، بریندار و شەهید. نە ڕێگایەک، نە کارەبا، نە ئاوی بۆریی، نە پزیشکێک و نە مامۆستایەک نەبوو. دەڵێت هەموو شتێک بە پێچەوانەوەیە، سەردەمێک میوانمان هەبوو، خۆراکمان نەبوو. ئێستا خۆراکمان هەیە، میوانمان نییە. ئەم قسانەم چەندجار لە خەڵکی گوندەکە گوێ لێ بووە. کاک حەسەن دەڵێت زۆربەی ڕۆژەکان لە بەردەمی خانووەکەم دانیشتووم و چاوم بڕیوەتە ڕێگاکە، تا بزانم یەکێک لە کوڕەکانم، یا نەوە و بووک و زاواکانم لە شارەوە دێن یا نا. ئایا میوانمان دێت یا نا؟ من یازدە منداڵ، نۆزدە نەوە و نۆ بووک و زاوام هەیە. بەڵام ئێستا بەس خۆم و هاوسەرم و داستان ین. ئەو لەبارەی تەنیایی مرۆڤەوە قسەی دەکرد.

لە بارەی ئاژەڵە کێویەکانی سێکانیانەوە لێی دەپرسم. دەڵێت جاران، بزنە کێوی زۆر بوو. ڕاوکردن زۆر بوو. ئێستا ئاژەڵە کێوییەکانیش کەم بوونەتەوە. تەنانەت گورگ و چەقەڵیش کەم بوونەتەوە. ئێستا لە ناوچەکەدا ڕاوکردن قەدەغەیە. بزنە کێویی وردە وردە زۆر دەبنەوە. دەڵێت گورگ، چەقەڵ، ڕێوی، ژیژگ و چوالو وا خەریکن زیاد دەبنەوە. لە هەموویان زۆرتر، سمۆرەکانن. بەڵام مشکەکان ئافاتن. بەدەست مشکەوە، گیرمان خواردوە. دەبێ هەموو شتەکانمان بپارێزین، زیانی زۆرمان لێدەدەن. قارچک و ڕێواس زۆرە. وەرزی بەهار، وەرزی قارچک و گیادەرمانی و گیا خۆراکییەکانە. دەڵێت لەم کێوانە، هەموو شتێک خەریکە زۆر دەبنەوە جگە لە مرۆڤ. مرۆڤەکان لێرە دەڕۆن، بەڵام ئاژەڵ و سروشت و دارستان و گژوگیا دوبارە دەژێنەوە. لێی دەپرسم لە ناوچەی ئێوە (گەون - گوێنی) ی کەتیرە هەیە؟ دەڵێت زۆر زۆرە. بەڵام کەس نییە کەتیرە بکات. لە ڕابردوودا ئێرانییەکان دەهاتن بۆ ئەم کوێستانانەی ئێمە کەتیرەیان دەکرد. پرسیم تۆ ئێرانییەکانت دەبینی؟ گوتی بەڵێ، بەڵێ.. هەندێکیان لە شارەکەی ئێوەوە، لە یەزدەوە دەهاتن. نزیکەی چوار مانگ لەم کوێستانانە دەمانەوە، زۆر ڕەنجیان دەکێشا خەڵکێکی زۆر هەژار بوون. منداڵی بچووکیشیان لەگەڵدا بوو. هەندێک جار خۆراکمان دەدانێ.

تا دەروبەری ساڵی ١٩٧٠ لەم ناوچەیە، زۆرتر تووتن دەچێنرا. ئێستا گەنجێک نییە کە تووتن بکات. وەک دەڵێن خەڵکی ئێستا بۆ کاتبەسەربردن ڕوو دەکەنە گوندەکان. زۆربەی خەڵکی سێکانیان نیشتەجێی شارەکانن. لە بەهار و هاویندا دەگەڕێنەوە. ئێستا گەنجەکان، ماشێنی گرانبەها و شیکیان پێیە.

مریەمی هاوسەری، دەڵێت ئەو ڕێگەیەی کە ئێمە جاران بە دوو شەو و ڕۆژ دەمانبڕی، ئێستا بە سەعاتێک دەیبڕین. دەڵێت پێشتر خەڵک برسی بوون. نان و پەنیرێکیان دەست نەدەکەوت. ئێستا سوپاس بۆ خودا، بۆنی گۆشت و کەباب برژاندنیان گوندەکەی پڕ کردووە. گەنجترین کەس لە گوندەکەدا، کە جوتیاری دەکات، کوڕەکەی یاسینە. چای تازەمان بۆ لێدەنێن بە هەنجیری وشکەوە دەیخۆینەوە. داستان دەڵێت ئەمە هەنجیری کێوییە. خۆمان چنیومانە. هەرمێی کێویش، هەیە بەڵام ئێستا وەرزی نییە.

چا، بە هەنجیری وشەکەوە لەسەر ئەو بانیژەیە و لە بەرامبەر ئەو دیمەنە جوانەدا بە دەستی کچە کوردێکی میواندۆست، چێژێکی تایبەتی هەیە. حەسەن دەشەلێت. دەڵێت جومگەی ڕانم کێشەی هەبوو، نەشتەرگەریم بۆ کرد. بەڵام بە باشی بۆیان نەکردم بۆیە دەشەلم. حەسەن و هاوسەرەکەی خوێندەواریان نییە. بەڵام هەر یازدە منداڵەکەیان خوێندەوارن. حەسەن پێشمەرگەی خانەنشینە، مووچەی خانەنشینیەکەی وەردەگرێت و لە ڕەزەکەشیەوە داهاتێکی دەستدەکەوێت. دەڵێت کاتێک کە من منداڵ بووم، دەوڵەت دەسەڵاتی بە سەر ناوچەکەدا نەبوو. تەنانەت باج و خەراجیشمان پێنەدەدا. لە سەردەمی عوسمانییەکانیشدا باج و خەراجمان نەدەدا؛ بەڵام سەربازمان پێدەدان. هەر کەس دەگەیشتە تەمەنی سەربازی لە ناحیەی سورداشەوە ئاگادار دەکرایەوە تا بچێت بۆ سەربازی. ماوەی سەربازی دوو ساڵ بوو. بەڵام کاتی جەنگی نێوان ئێران و عێراق، دواتریش لە جەنگی کوەیتدا، سەدام زۆر کەسی تا نزیکەی پانزدە ساڵ، لە سەربازیدا دەهێشتەوە. حەسەن دەڵێت من هیچ کاتێک سەردانی ئێرانم نەکردووە، دوای ڕێککەوتنی یازدەی ئازار، پاسپۆرتم دەرهێنا و ڤیزەی ئێرانیشم لێدا، بەڵام سەفەرم نەکرد.

کات، بەرەو خۆراوابوونە. خۆر لە پشت کێوەکانەوە خۆی دەشارێتەوە. خۆراوابوون، دیمەنێکی سەرنجڕاکێش دەخوڵقێنێت. وا بیر دەکەمەوە لەوانەیە ڕۆژێک ئەم بانیژەیە، گەشتیارانێک بۆ خواردنەوەی کوپێک قاوە ڕابکێشێت. گەشتیارانێک، کە دەبێت بۆ خواردنەوەی چایەک لەسەر ئەم بانیژەیەوە، دەیان دۆلار بدەن.

ماڵاواییان لێ دەکەین. ماڵی یاسین لێمانەوە نزیکە. هەموو لە ماڵەوە، کۆبوونەتەوە. خوڵکمان دەکەن بۆ ژوورەوە. نزیک هەشتی ئێوارە خوان ئامادەیە. خوانێکی پڕ لە خواردنی جۆراوجۆر. دوای نانی ئێوارە دەچم بۆ گەرماو. ئاوی گەرماو بە کارەبا گەرم دەکرێت. لەنێو گەرماوەکەدا هیتەرێک دانراوە. دەمەوێت کەمێک لە شوێنەکەی

بیجولێنم. کارەبا، هەموو گیانی هەژاندم. وا بەتوندی ڕایچڵەکاندم هەستمکرد کە ئێستا دەمرم. دەستم لە هیتەرەکە دورخستەوە. وانەیەکی فێرکردم کە جارێکی دیکە لە شوێنی تەردا، دەستکاری ئامێری کارەبایی نەکەم. تەها دەڵێت حەزدەکەی سبەینێ لە سێکانیان بمێنینەوە یان بڕۆین؟ دەڵێم با بڕۆین ئینشائەڵڵا جارێکی دیکە دێمەوە و چەند ڕۆژێک لەم گوندە دەمێنینەوە. سێکانیان گۆشەیەکە لە مێژووی کوردستان. بەیانی دوبارە بە دەنگی کەڵەشێرەکان، لە خەو ڕادەپەڕم. بە دەنگی کەڵەشێرە ڕەنگاوڕەنگەکان. نانی بەیانی بەجوانی ڕازاوەتەوە و ئامادەیە. دەمانەوێت بڕۆین. کەلسوم بڕێکی زۆر پەنیر، ماست و دۆشاوی خورما دەدات بە تەها. نزیکی هەشت و نیوی بەیانی بەڕێدەکەوین. ئەو خێزانە میهرەبانە پێمان دەڵێن دەبێ جارێکی دیکە بێنەوە بۆ سێکانیان.

تەها دەڵێت لە ڕێگەی سەرگەڵووەوە، لە نزیک ئەشکەوت و بارەگاکانی شۆڕشەوە بەرەو دوکان دەڕۆین. لە ڕێگا پێچاوپێچەکەی سێکانیان تێدەپەڕین و دەگەینە سەرگەڵوو. سەرێک لە کۆنە بارەگاکان دەدەین. ئەشکەوتەکان بە قەدپاڵی کێوەکەوەن. گەیشتن پێیان کارێکی دژوارە. ئەم بارەگا و ئەشکەوتانە. دوای مەلا مستەفا، لەلایەن یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە سوودی لێ دەبینرا. دۆڵی سەرگەڵوو و بەرگەڵوو، یەکێک لە گرنگترین پێگەکانی ئازادیخوازانی کوردستانە. سەرگەڵوو، بەرگەڵوو و سێکانیان و چەمی ڕەزان وەک دۆڵی پێنجشێری ئەفغانستانە.

ڕێگا قیرە نوێیەکە لە تەختایی دۆڵەکەوە بە تەنیشت ڕووبارەکەدا تێدەپەڕێت. بەرەو بەنداوی دوکان دەکەوینەڕێ. وردە وردە لە دۆڵەکەوە دەچینە دەرەوە. دەگەینە گوندی قەڵەم پاشا. لەم شوێنە یەکەمین ڕانەبزنم بەکێوەکەوە بینی. پەڵە مەڕ و بزنی بچووکی پێوەبوو. ژمارەی ئاژەڵەکانی گوندنشینان کەم بوو، گوندنشینانیش خۆیشیان کەمن. قەڵەم پاشا، ناوی یەکێک لە گوندەکانە. ئێمە چەند خولەکێک لەنێو گوندەکە دەوەستین و پاشان دەستدەکەینەوە بە جوڵە.

دەگەینە گوندی جۆبلاغ. تەها لێرە کەمێک دەوەستێت، خاڵە سەلام لە ٢-٢-١٩٧٩ لەم گوندە شەهید بووە. سەلام لەگەڵ دوو هاوڕێی دیکەیدا بە دەستی جاشەکان شەهیدکراوە. وردە وردە دەریاچەی دوکانمان لێ دەردەکەوێت. بەنداوێک کە لە لایەن فەرەنساییەکانەوە دروستکراوە. بەنداوێکی گەورە کە شەش ملیار مەتر سێجا ئاو گلدەداتەوە. ڕێگای تەنیشت سەدەکە سەرنجڕاکێشە. نزیک کاتژمێر دەی بەیانییە.

بیجولێنم. کارەبا، هەموو گیانی هەژاندم. وا بەتوندی رایچڵەکاندم هەستمکرد کە ئێستا دەمرم. دەستم لە هیتەرەکە دورخستەوە. وانەیەکی فێرکردم کە جارێکی دیکە لە شوێنی تەڕدا، دەستکاری ئامێری کارەبایی نەکەم. تەها دەڵێت حەزدەکەی سبەینێ لە سیکانیان بمێنینەوە یان بڕۆین؟ دەڵێم با بڕۆین ئینشائەڵڵا جارێکی دیکە دێمەوە و چەند ڕۆژێک لەم گوندە دەمێنینەوە. سیکانیان گۆشەیەکە لە مێژووی کوردستان. بەیانی دوبارە بە دەنگی کەڵەشێرەکان، لە خەو ڕادەپەڕم. بە دەنگی کەڵەشێرە ڕەنگاوڕەنگەکان. نانی بەیانی بەجوانی ڕازاوەتەوە و ئامادەیە. دەمانەوێت بڕۆین. کەلسوم بڕێکی زۆر پەنیر، ماست و دۆشاوی خورما دەدات بە تەها. نزیکی هەشت و نیوی بەیانی بەڕێدەکەوین. ئەو خێزانە میهرەبانە پێمان دەڵێن دەبێ جارێکی دیکە بێنەوە بۆ سیکانیان.

تەها دەڵێت لە ڕێگەی سەرگەڵووەوە، لە نزیک ئەشکەوت و بارەگاکانی شۆڕشەوە بەرەو دوکان دەڕۆین. لە ڕێگا پێچاوپێچەکەی سیکانیان تێدەپەڕین و دەگەینە سەرگەڵوو. سەرێک لە کۆنە بارەگاکان دەدەین. ئەشکەوتەکان بە قەدپاڵی کێوەکەوەن. گەیشتن پێیان کارێکی دژوارە. ئەم بارەگا و ئەشکەوتانە. دوای مەلا مستەفا، لەلایەن یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە سوودی لێ دەبینرا. دۆڵی سەرگەڵوو و بەرگەڵوو، یەکێک لە گرنگترین پێگەکانی ئازادیخوازانی کوردستانە. سەرگەڵوو، بەرگەڵوو و سیکانیان و چەمی ڕەزان وەک دۆڵی پێنجشێری ئەفغانستانە.

ڕێگا قیرە نوێیەکە لە تەختایی دۆڵەکەوە بە تەنیشت ڕووبارەکەدا تێدەپەڕێت. بەرەو بەنداوی دوکان دەکەوینەڕێ. وردە وردە لە دۆڵەکەوە دەچینە دەرەوە. دەگەینە گوندی قەڵەم پاشا. لەم شوێنە یەکەمین ڕانەبزنم بەکێوەکەوە بینی. پەڵە مەڕ و بزنی بچووکی پێوەبوو. ژمارەی ئاژەڵەکانی گوندنشینان کەم بوو، گوندنشینانیش خۆیشیان کەمن. قەڵەم پاشا، ناوی یەکێک لە گوندەکانە. ئێمە چەند خولەکێک لەنێو گوندەکە دەوەستین و پاشان دەستدەکەینەوە بە جوڵە.

دەگەینە گوندی جۆبلاغ. تەها لێرە کەمێک دەوەستێت، خاڵە سەلام لە ٢-٢-١٩٧٩ لەم گوندە شەهید بووە. سەلام لەگەڵ دوو هاوڕێی دیکەیدا بە دەستی جاشەکان شەهیدکراوە. وردە وردە دەریاچەی دوکانمان لێ دەردەکەوێت. بەنداوێک کە لە لایەن فەرەنسایییەکانەوە دروستکراوە. بەنداوێکی گەورە کە شەش ملیار مەتر سێجا ئاو گلدەداتەوە. ڕێگای تەنیشت سەدەکە سەرنجڕاکێشە. نزیک کاتژمێر دەی بەیانییە.

ژمارەیەک خەڵک بۆ سەیران هاتوونەتە ئێرە. فەرەنسایییەکان بۆ دروستکردنی ئەم بەنداوە کارگەی زۆر باشیان بنیادناوە. ژوورەکانی ئەم کارگانە ئێستاش بەکاردەهێنرێت. دەڕۆین بۆ لای پاسەوانانی بەنداوەکە. تەها دەیەوێت کارئاسانیمان بۆ بکات تا سەردانی بەنداوەکە بکەین. بە تەلەفۆن سەرقاڵی هەماهەنگی کردنە. ئێرە هەمان ئەو شوێنەیە کە تەها بۆ ماوەی پێنج ساڵ لێپرسراوی بووە. ڕێگەمان پێدەدەن، بچینە ژوورەوە. بە مەرجێک وێنە نەگرین. دەچینە سەر تاجی بەنداوەکە. بەنداوێکی کەوانەیی بە چیمەنتۆ دروست کراوە. دەریاچەیەکی گەورە و فراوانە. بەنداوەکە لەسەر زێی بچووکە، ئێمە بە سەر بەنداوەکەدا تێدەپەڕین و دەگەینە جادەی دوکان. شارێک کە ڕووباری زێی بچووک کردوویەتی بە دوو بەشەوە. لەگەڵ چووینە نێو شار، هاوسەرم دەفتەرێک بۆ نووسینی یادەوەرەیی ڕۆژانەی دەکڕێت.



دیمەنێک لە بەنداوی دوکان – بەهاری ٢٠١٩

بەنداوەکە لە هەر چرکەیەکدا سەد و پەنجا مەتر سێجا ئاو بەردەداتەوە. ئاوەکە بە خوڕ دەڕژێتە خوار. لە تەختاییەکی دەوروبەری ڕووبارەکە بازاڕێک هەیە ژمارەیەک چێشتخانە و چایخانە و فرۆشگەی لێیە. تەها دەڵێت دەڕۆین بۆ ماڵی کاک مەجید. کاک مەجید، پیاوێکی بەساڵاچووە. تەمەنی سەروو حەفتا و پێنج ساڵە. خزمی تەهایە. هاوسەرەکەی، پووری هاوسەرەکەی فەرەیدوونی کوڕی شەمسەیە. خانوویەکی سێ نهۆمی لەسەر ڕووبارەکە هەیە. کاک مەجید، هاوسەر و کچەکەشیان بە بینینی تەها خۆشحاڵ دەبن. هاوسەرەکەی کاک مەجید، بەتەمەنە. ناهیدەی کچی کاک مەجید، زۆر میواندۆست و خوێنگەرمە. کورسیمان لەسەر بانیژەکە بۆ دادەنێت، بانیژەکە بەسەر ڕووبارەکەدا دەڕوانێت. ناهیدە کەمێک فارسی دەزانێت. ئەویش لە سەردەمی سەدامدا لەسەر خاکی خۆی ڕایکردووە. حەوت مانگ لە ڕەز و باخەکانی قەزوین بووە. لە کێڵگەیەکی پەلەوەری کاری کردووە. کاک مەجید دەڵێت لە سەردەمی سەدامدا، چەندین جار دوکان بۆردوومان کراوە، خەڵکێکی زۆر کوژران. هێزەکانی سەدام، بەهۆی بەنداوەکەوە، هەمیشە هێرشیان بۆ ئێرە دەهێنا. دەیانویست دەست بەسەر بەنداوەکەدا بگرن. بەنداوەکە، بەردەوام دەستاودەستی پێدەکرا. جارێک لە دەست سوپای سەدامدا بوو، و جارێکیش لە دەست هێزی پێشمەرگە. لە سەردەمی سەدامدا زۆربەی خانووەکانی دوکان، وێران کران. دوای ڕاپەڕین، خەڵک دوبارەوە شارەکەیان ئاوەدان کردەوە. کاک مەجید دەڵێت قوڵترین شوێنی ڕووبارەکە لە بەردەمی خانووەکەی ئەودایە، کە نزیکەی سی مەتر قوڵە. پانی ڕووبارەکەش نزیکەی هەشتا مەتر دەبێت.

پێشنیوەڕۆی ڕۆژی هەینییە. هاوڕێکانی کاک مەجید دێن بەدوایدا. دەیانەوێت بڕۆن بۆ نوێژی هەینی. دەڵێت لەوێ هەم نوێژ دەکەین، هەم ڕادەمێنین و بیردەکەینەوە. دەمانەوێت بڕیار بدەین کە چی بکەین بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیسلامییە توندڕەوەکان. ئەم پیرەپیاوە موسوڵمانە لە مەترسیەکانی داعش و هاوبیرانیان دەترسێت. کاک مەجید خولکمان دەکات. دەڵێت من دەڕۆم بۆ نوێژ و دەگەڕێمەوە، بۆ نانی نیوەڕۆ لێرە بمێننەوە. تەها داوای لێبوردنی لێدەکات. دەڵێت زەحمەتتان نادەین و دەڕۆین. ئێمەش ماڵاوایی لە کاک مەجید دەکەین. ئەو دەڕوات بۆ نوێژی هەینی. هاوسەر

و کچەکەی خزمەتمان دەکەن. قسەمان بۆ دەکەن. باسی ڕابردوو دەکەن. باسی جەنگ و ڕاکردن بەرەو ئێران. کچەکەی ناهیدە ناوی "ئاینا"یە، تەمەنی شەش ساڵە. کچێکی جوانکیلەیە. جلێکی جوانی کوردی پۆشیوە. ئەم کچە بچکۆلەیەش زۆر ڕێزمان لێ دەگرێت. زۆر خوڵکمان دەکەن بۆ نانی نیوەڕۆ بمێنینەوە، بەڵام ئێمە بەنیازی ڕۆیشتنین. ناهیدە دەبەیەکی سێ کیلۆیی ترشیاتی قەزوانمان پێدەدات. زۆر بەلەزەتە. بۆ یەکەمجارە کە کە تامی ترشیاتی قەزوان دەکەم. ترشیاتەکە دەهێنمەوە بۆ ئێران و بەسەر بنەماڵەکەمدا دابەشی دەکەم. دەیان کەس لە ترشیاتی قەزوانی کوێستانەکانی کوردستانی عێراق دەخۆن، کە ناهیدە دروستی کردووە.

نزیکی کاتژمێر دوازدە و نیوە. لە ماڵی کاک مەجید دێینە دەرەوە. بەرەو بازاڕی شارۆچکەکە دەڕۆین. پردێکی گەورە ئەمبەراوبەری ڕووبارەکە بەیەک دەگەیەنێت. لەوێ دوکان و فرۆشگەی زۆری لێیە. تەها دەڵێت تا سلێمانی ڕێگا دوورە. لێرە نانی نیوەڕۆ دەخۆین. ئێمە دەباتە چێشتخانەیەک خەڵکێکی زۆر لە چێشتخانەکەن. زۆربەیان گەنجن، دیارە هەندێکیان گەشتیارن. دوای نانی نیوەڕۆ تەها دەڵێت: لە ڕێگەیەکەوە دەڕۆین کە بتوانین هەموو دەریاچەی بەنداوەکە ببینین. دەریاچەکە فراوانە. دەوروبەری دەریاچەکە دەیان کیلۆمەترە. ئێمە نزیکەی سێ لەسەر چواری دەگەڕێین. پاشان دێینەوە سەر ڕێگای سلێمانی. پێش خۆراوابوونە. لە نزیک دەروازەی سلێمانی دەگەینە پارکێکی گەورە. تەها دەڵێت با سەردانێکی پارکەکە بکەین. کوڕە گەورەکەی تەها ڕەوکان، لەم پارکە کاردەکات. کەشوهەوا تا ڕادەیەک ساردە. ژمارەیەک گەشتیار لە پارکەکەدا سەرقاڵی پیاسە و گەڕانن. پارکێکی گەورەیە، ڕووبەرەکەی ٤٤٠٠ دۆنمە. تا ئێستا گەورەترین پارکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. لەنێوەندی پارکەکەدا "شانۆی ڕۆمانی" هەیە، کە لەسەر ڕووبەری هەشت هەزار و٥٠٠ مەتر دووجا، دروست کراوە. شانۆکە جێگەی ٥٠٠٠ هەزار بینەر زیاتری تێدا دەبێتەوە و گەورەترین هۆڵی شانۆیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. بۆ دروستکردنی بینای "شانۆیی ڕۆمانی" سوود لە دیزاین و تایبەتمەندییەکانی، بینا مێژووییەکەی شانۆ ڕۆمانی وەرگیراوە. چ لەڕووی لێکچوونی دیزاین و چ لەڕووی هەڵکەوتەی شوێنەکەی کە ناوچەیەکی شاخاوییە. تەلارێکی جوانیش لەبەردەمی شانۆکەدا هەیە. بەرزی و نزمی شوێنەکە وایکردووە

تەلار و شانۆکە جوانتر دەربکەون. وردە وردە تاریک دادێت. گڵۆپەکانی پارکەکە دیمەنێکی جوانتر بە شانۆکە و تەواوی پارکەکە دەبەخشن.

لە پارکەکە دێینە دەرەوە. پیاسەیەک بەنێو شاردا دەکەین. کاتژمێر نزیکی هەشتی شەوە. دەڕۆینەوە ماڵی تەها. زوبێدە، لەسەر لێواری قەرەوێڵەکەی دانیشتووە. دەبێت بە دوو دارشەق بە ڕێگەدا بڕوات. شەمسە نانی ئێوارەی ئامادە کردووە. ئەم ژنە شەست و پێنج ساڵە، لە کچێکی بیست ساڵ گورجوگۆڵترە. لە بەیانییەوە تاکوو شەو لە ماڵی براکەی کاردەکات. چاودێری و خزمەتی براژنەکەی دەکات. کە هاوکات خوشکی هاوسەرەکەشیەتی و هەم کچی خاڵیشیەتی. پەیام ی بووکی تەهاش کە کچی یاسینە، هاوکاری پووریەتی و بەردەستی دەکات. منداڵەکانی دیکەش هەریەکە و کارێک دەکەن؛ بەڵام لەو کاتەوە زوبێدە نەخۆشە، شەمسە کەیبانووی ماڵە. شەو، فەرەیدوون، هاوسەرەکەی و کچەکانی دێن بۆ سەردانی. کچێکیان لەگەڵدایە کە خزمی تەهایە. ئەو کچە زۆر بە باشی بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکات. لەگەڵ دکتۆر وسوقی دەکەونە گفتوگۆ. لەکۆتاییدا هاوسەرەکەم کەسێکی پەیداکرد کە لەگەڵیدا قسە بکات.

**نەورۆز لە سلێمانی**

نەورۆز نزیک دەبووەوە. هەستمان بە کەشوهەواکە دەکرد، لە جەنجاڵی بازاڕ، لە بازاڕکردن، لە ڕووناکی دوکانەکان، دیمەنی ماچوموچ و لە ئامێزگرتن. خەڵک لە شارۆچکە و گوندەکانەوە هاتبوون بۆ شاری سلێمانیی بۆ کڕینی نەورۆزانە. بازدان بە سەر ئاگری ڕۆژی «چوارشەممەسووریی» لە دامێنی شاخی پیرەمەگروون ئەنجام دەدەین. من بۆ حەفتا و یەکەمین جار لە تەمەنمدا بە سەر ئاگردا باز دەدەم. دەبێت «خوانی حەوتسین» بڕازێنینەوە. لە ماڵی تەها هیچ کەس ئاشنای خوانی حەوتسین نەبوو. هیچیان لە بارەیەوە نەدەزانی. خودی تەهاش دەیزانی خوانی حەوتسین چیە، بەڵام هیچ کات نەیبینی بوو. دکتۆر وسوقی و فەربود ئەم کارەیان لە ئەستۆگرت. بۆ خوانی حەوتسین هەموو کەوتبوونە تەقەلا. مێزێکیان هێنا و سەرمێزیان پێدادا. منداڵان بە شەوق و زەوقەوە هاوکارییان دەکرد. زۆربەی پێداویستییەکان لە ماڵەوە

هەبوو، بەڵام دەبوو ماسی بکڕدرێت. لە بازاڕی سلێمانی ماسی بۆ خوانی حەوتسین پەیدا نابێت. ئەگەر لە کوردستانی عێراق حەوتسین ڕەواج پەیدا بکات، پەروەردە و فرۆشتنی ماسی، بازاڕی گەرم دەبوو. خوانی حەوتسین سەوزەی دەویست، بەڵام کەس سەوزەی لەسەر دانەنا بوو. بە گوڵدانێکی سەوز ئەوەش چارەسەرکرا. تەها دەیگوت هەر شتێک لەماڵەوە بە سین دەست پێبکات بیهێنن. یەکێک سینی ·هێنا، دەستیان کرد بەپێکەنین. لە کۆتاییدا سێو بووە یەکەمینی سەر خوانی حەوتسین، سماق -ترش- دووەم و سنجو سێیەم، کە بەرهەمی باخەکەی خۆیان بوو. لە باخەکەی سێکانیانەوە سیریشیان هێنابوو. چەند سکە -پارەی کانزایی-یەکیش لەسەر مێزەکە دەدرەوشانەوە و ڕەنگکردنی هێلکەکانیش دیمەنێکی جوانی هەبوو. لە کۆتاییدا حەوتسینەکە تەواو بوو. بەم دەسکەوتەش شادی و خۆشحاڵییەکی زۆر، خێزانی تەها و خێزانی ئێمەی گرتەوە. یەکێک لە نەریتە کەلتوورییەکانی ئێمە کە لەم گۆشەیەدا لەبیرکراوە زیندوو کرایەوە. هەموو جلی جوانی کوردییان لەبەرکرد. لە کۆتاییدا لە دەوری مێزی حەوتسین دانیشتین و فاڵی حافزمان گرتەوە. تەها هەوڵیدا شیعری حافز وەربگێڕێت. کارێکی قورس بوو، بەڵام کردی. بە تێگەیشتن لە شعری حافز ڕازیبوون لە دەموچاوەکان دەباری. بە هاتنی ساڵی نوێ، بەخۆشییەوە پیرۆزباییمان لە یەکدی کرد. جەژنانەمان بەخشی و جەژنانەمان وەرگرت. تەها گوتی سبەینێ دەچین بۆ مەراسیمی جەژنی نەورۆز. ماڵی تەها لە شوێنی مەراسیمەکەوە دوورە. ئەوێ زۆر جەنجاڵ بوو. شوێنێک بۆ وەستانی ماشێن دەستنەدەکەوت. تەها و کوڕەکانی جلی کوردی جوانیان پۆشی بوو. جلوبەرگی کوردییان بۆ فەربود و هاوسەرەکەشم ئامادە کردبوو. جلە کوردییەکەی فەربود زۆر جوان بوو. کوڕە کوردێکی قۆزی لێ دەرچوو بوو. بە دڵخۆشییەوە کەوتینەڕێ. تەها بە چەند کۆڵانێکی باریک و تەنگدا پێچی کردەوە و گەڕا تا لە کۆتاییدا لە گۆڕەپانێکی بچووکدا شوێنێکی بۆ ڕاگرتنی ماشێنەکەی دۆزییەوە. لە گۆڕەپانەکەوە بە هەشت پلە چووینە نێو شەقامە گشتییەکەوە. شەقامێکی فراوان خەڵکەکە وەک شەپۆلی دەریا بە نێویدا دەهاتن و دەچوون. وەک ڕۆژی حەشر وا بوو. شەقامە چەند کیلۆمەترییەکە، لەلای چەپەوە شۆڕ دەبووەوە تا دەگەیشتە چاڵاییەک. دواتر بەرەو لای ڕاست وردە

سەردەکەوت. لەهەر لاوە تا چاو بڕی دەکرد پڕ بوو لە خەڵک. پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگی جوانیان پۆشی بوو. وەک ئەوەی هەموو خەڵکی سلێمانی لەوێ بن. شەقامەکە مۆزەخانەیەک بوو بۆ مرۆڤناسی. ژنان و پیاوان پۆشاکی کوردیی جوان و ڕەسەنیان پۆشی بوو. خێزانەکان دەستەدەستە دەهاتن و دەچوون. خۆشی لە ڕوخساریاندا بەدی دەکرا. ڕۆژی ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ بوو. باوەشیان بۆ یەکتر دەکردەوە و یەکتریان لە ئامێز دەگرت. دوکاندار و دەستفرۆشەکان خواردەمەنی جۆراوجۆریان دانابوو. ڕۆژی خەندە و خۆشی بوو. ئەم بۆنە و ئاهەنگانە لە وڵاتە ئازیزەکەی مندا جێگەیان خاڵییە. لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا وێنەمان گرت. بووک و زاواکانیش لەم ڕۆژەدا هەم بۆ مەڕاسیمی نەورۆز، هەم بۆ ئاهەنگی هاوسەرێتی هاتبوونە ئێرە. شیرینییان بەسەر خەڵکیدا دەبەخشییەوە. ژمارەیەک پزیشک لەوێ بوون، بێبەرامبەر پشکنینیان بۆ خەڵک ئەنجامدەدا. پزیشکانی ددانیش هەر کەسێک بیویستایە بێبەرامبەر چارەسەریان دەکرد. من بە سەرسوڕمانەوە سەیری ئەو هەموو خەڵکە جیاوازەم دەکرد. کورد و غەیرە کورد، سوننە و شیعە، یەکێتی و پارتی، هەموو بە ئاشتی و شەوقەوە لە پێشوازی بەهاردا بوون. شەقامەکە شانۆیەک بوو کە دەیان هەزاران نمایشکار و دەیان هەزاران بینەری لەخۆگرتبوو. هەموویان لە نمایشی نەورۆزدا هاوبەش بوون. ڕۆژی پێکەوە ژیانی نەتەوەیی و لابردنی کۆسپەکانی بەردەم ئاشتی و پێکەوەیی، ئازادی و ئارامی، دادپەروەری و خۆشگوزەرانی، بوو. من نەورۆزم لە زۆر جێگای وەک دوشەنبەی تاجیکستان و بەلخ و هەراتی ئەفغانستان و شارە جیاوەزەکانی ئێران بینیوە، بەڵام نەورۆزی سلێمانی بێهاوتایە. هەموو ڕۆژێکیان هەر نەورۆز بێت.

### میوانداریی نادر مەحموود حەمە

گوندی مەلاسەفی سەر بە ناحیەی حاجیاوای ڕانیەیە. کاک نادر ناسراو بە نادر مەلاسەفی ئێمەی بۆ ئەوێ بانگێشت کردبوو. وا بڕیاربوو میوانی قادر و نادر و عەبدولواحید بین. ماڵ و کێڵگەکەیان سەد و بیست کیلۆمەتر لە سلێمانییەوە دوورە.

دەبێت وابڕۆین کە بۆ ژەمی نیوەڕۆ لەوێ بین.

بەنێو دەشتە سەوز و جوانەکەی سلێمانی‌دا تێدەپەڕین. لە هەموو لایەک زەوی داچێنراوە. کێڵگەکانی گەنم وەک فەرشێکی زمرووود زەوییان داپۆشیوە. زەوی دانەچێنراو زۆرکەمە. بەنێو گوند و شارۆچکەکاندا تێدەپەڕین. چەندین کیلۆمەتر هەر کێڵگەی گەنمە. منداڵان لە ڕۆخی ڕێگاکەدا کنگر دەفرۆشن. شارۆچکەی خەلەکان تێدەپەڕێنین. ئیبن خەلەکان، قازیی، مێژوونووس، شەریعەتزان و نووسەری کورد (١٢١١ - ١٢٨٢ ز) خەڵکی ئێرەیە. لە دەشتەکاندا خانووی پلاستیکی گەورە دروستکراوە کە سەوزە و بەرهەمەکانی ئەو خانووە پلاستیکییانە لە گەشە دان. لە گوندی کانی وەتمان تێدەپەڕین. خەڵکێکی زۆر لە دەشت و دامێنی چیاکان بۆ گەشت و سەیران هاتوونەتە دەرەوە. هەموو پۆشاکی جوانیان لەبەردایە. جلوبەرگی نەتەوەیی ژنانی کورد لەگەڵ جوانی سروشت ئاوێزانی یەکدی بوون. ڕەنگی پۆشاکەکانیان وەک ئەو گوڵانەن کە لە سەر زەوییە بەپیت و سەوزەکان ڕوواون. ئازادی ئەمەی بەرهەمهێناوە. دیکتاتۆرییەت جەنگ، زیندان، مەرگ و ئەنفال وەبەردێنێت. ڕووخانی سەدام ئازادی، دادپەروەری، یەکسانی کۆمەڵایەتی پەرەپێداوە. هیوادارم ئەم ئازادییە گەندەڵی دارایی و دروستبوونی چینایەتی بەرهەم نەهێنێت.

تەها بیرەوەریی دەگێڕێتەوە. ئەو چەندین جار لە سلێمانییەوە هەر بەپێ ڕۆیشتووە بۆ ئێران. لە سلێمانییەوە بە ڕێگەی گۆپتەپەدا ڕۆیشتووە. هەر جارێک دە ڕۆژ بە ڕێگاوە بووە. کە دەگەیشتە ئێرە وچانێکی دەگرت. لێرەشەوە تاکوو سەردەشت چوار سەعات ڕێگا دەبێت. لە ڕێگا سەرەکییەکەوە بەرەو ڕێگایەکی لاوەکی لادەدەین. دەگەینە دەشتی بتوێن. لێرە کێڵگە گەنمەکان جوانتر و گەشەکردووترن. کێڵگە گەنمەکان زۆر فراوان و بەپیتن. تەها دەڵێت گەنمی ئێرە و دەشتی شارەزوور زۆر بەناوبانگن. دەگەینە گوندی قەمتەران،کێڵگەی فراوان و سەرسەوزی زۆری هەیە. کێڵگەکان زۆربەیان دێمەکارن.

گەیشتینە لایەکی دیکەی بەنداوی دوکان. کێوەکانی سنووری ئێران و عێراق دەبینرێن. شاخی قەندیل و شاخەڕەش لە دوورەوە دەبینرێن. لە ناوچەکە کێڵگەی داری زەیتون زۆرە. لە گوندی کانی ماران تێدەپەڕین. پرسیارێک لە یەکێکم پرسی

جگە لە گەنم چی دیکە دەچێنن؟ گوتی لۆبیا و فاسۆلیا دەچێنین. باخی هەناریش هەبوو. دەگەینە گوندی گردجان. لێرە کارگەی دروستکردنی بلۆک زۆرە. ناوچەکە دەشتێکی فراوانە، خاوەنی سەرچاوە و ئاوێکی زۆرە. هەموو ئەو ڕووبارانەی کە لە دەشتەکەوە هەڵدەقوڵێن دەڕژێنە زێیەکەوە.

بەردەوامین لە ڕۆیشتن. لە چوار ڕێیانێک کە چەندین بەنزینخانەی تێدابوو؛ هەمووشیان لەگەڵ یەکدا لە کێبڕکێی نرخ دابوون، تێدەپەڕین. لە بەنزینخانەی کاوە نووسرابوو بەنزین لیتری بە ٥٢٥ دینار. لە سلێمانی لیتری بەنزین تا شەش سەد دیناریش هەبوو. دەگەینە حاجیاوا. لە گۆڕەپانێکی فراواندا دەیان ماشێنی بارهەڵگر وەستاون. حاجیاوا، شارۆچکەیەکی تا ئەندازەیەک گەورەیە. لە دەشتێکدا هەڵکەوتووە. شارێکی تەختە، ڕێگا یەکتربڕەکان فراوانن و شێوەیەکی شەترەنجی هەیە. حاجیاوا وەک پیرەمەگروونە، شارۆچکەیەکە لە سەردەمی سەدام حسێن و دوای هێرشی کیمیایی بۆ سەر شار و گوندەکان لە ساڵی ١٩٨٨ دا، بنیادنراوە. لە ئێستادا ژمارەی دانیشتووانی زیاتر لە ٨٠٠٠ کەسە. ڕژێمی سەدام بۆ هەر خێزانێک نزیکەی ٢٠٠ تا ٢٥٠ مەتر چوارگۆشە زەوی پێداون. خەڵکی شارەکە بەبێ هاوکاری حکومەت خۆیان دەستیان بە بنیادنانی خانووەکانیان کرد. ساڵانێکی زۆر کار و کۆششیان کرد تا زەوییە کشتوکاڵییەکانیان سەرلەنوێ ئاوەدان کردەوە. خەڵک لە سەر گیرفانی خۆیان ئەم شارۆچکەیان دروستکردووە. هێشتا هەر خەریکی بنیادنانن. لە ساڵانی سەرەتاوە هەژاری، برسێتی، نەخۆشی و مەرگ، تەنگی پێهەڵچنیبوون. لە سەردەمی سەدامدا ڕێگە بە کەس نەدەدرا بگەڕێنەوە بۆ گوندەکان. ڕێگایان پێنەدەدرا کە بەروبوومی کێڵگە و باخەکانیان کۆبکەنەوە. ڕەز و باخەکان بەرەڵا کرابوون. ترێی ڕەزەکان بە بێ خاوەن وشک دەبوون و دەڕزین. سەردانی بۆ گوندەکان، سزای قورسی لە سەر دانرابوو. زیندانی و تەنانەت گوللەبارانی‌شی بەدواوە بوو. پیاوەکانیان بە زۆر دەبرد بۆ جەنگی کوەیت.

دەگەینە ڕێگای سەرەکی حاجیاوا. لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە گوێمان لە دەنگی بانگ و خوێندنی قورئان بوو. تەها لە ڕێگاکەوە بە ئاڕاستەی کێڵگەی براکانی مەلا سەفی لایدا. دەچینە سەر ڕێگایەک ژمارەیەکی زۆر خانووی پلاستیکی هەیە. بە

تەنیشتیاندا تێدەپەڕین. بەشێک لەو کێڵگە پلاستیکیانە هی نادر مەلا سەفییە. کات نزیکی نیوەڕۆیە. دەچینە ناو خانوو و باخەکەی نادر مەلا سەفیەوە و ژمارەیەک ماشێنی لێیە. میوانی زۆریان هەیە؛ ،بەڵام نادر و هەردوو براکەی قادر و عەبدولواحید، لەماڵەوە نین، چوون بۆ نوێژی هەینی. نزیکەی سی ژن لەوێ بوون. پێشوازییان لێکردین. کۆچەر، هاوسەری کارزان "کارزان نادر مەحموود" هات بە پێشوازیمانەوە. ڕێنوێنیمان دەکات بۆ سەر سەکۆیەکی گەورە. بە چەند پلەیەکدا سەردەکەوین. سەکۆیەکی زۆر گەورەیە. ژمارەیەک ژن و منداڵ لەوێ دانیشتوون. هەموویان لەبەر ئێمە هەڵدەستن و فەرموومان لێدەکەن. خانووەکەیان زۆر گەورەیە زیاد لە سەد و پەنجا کەس لە خۆدەگرێت. سەکۆکە بە سەر دەشت و کێڵگە سەرسەوزەکاندا دەڕوانێت. سەماوەرێکی خەڵوزی گەورە وا دەکولێت. گەورەیی سەماوەرەکە ئەوە دەردەخات کە خێزانێکی گەورە و میواندارن.

پیاوەکان لە مزگەوت دەگەڕێنەوە. ئەم سێ برایە بەیەکەوە کاردەکەن. کارزانی کوڕی کاک نادر، هاوسەری کۆچەریش دێت. ئەوانمان پێشتر لە ماڵی تەها بینیوە. باخ و باخاتێک لە دەوروبەری خانووەکانە. چەند درەختێکی زەیتوونی زۆر گەورەشی تێدایە. باخ و ڕەزەکان ئاودێری دەکەن. کێڵگەی گەنم و جۆ دەبینین. ڕووبەری ڕەز و باخەکان زۆر نین. نزیکەی پێنج هێکتارێک دەبن. بەڵام کێڵگەکانی گەنم و جۆ زۆر زیاترن. خانووی پلاستیکیشیان هەیە. ئەگەر وشکەساڵی بێت و باران نەبارێت تەنها یەکجار گەنم و جۆکان ئاودێری دەکەن. لەم پێدەشتەدا ئاوی ژێر زەوی زۆرە. کێشەی بێ ئاویان نییە. چەندیان بوێت لە ڕووبار و زێکەوە ئاو ڕادەکێشن. هیچ بەربەستێک نییە. بیری ئاوی زۆر هەیە. بیرەکان بە سی مەتر دەگەنە ئاو. هەندێک لە بیرەکان، نزیکەی تا سەد مەتر قوڵن. واتا حەفتا مەتر لە ئاستی ئاوەکەوە دەچنە خوار. بەڵام بە هۆی باران و ئەو هەموو کانیاوەوە، پێویستیان بە بیری قوڵ نییە. بەم دواییانە لەبەر پاراستنی ئاوی ژێرزەوی، هەڵکەندنی بیری قوڵ قەدەغەکراوە. پۆلیس ئەو بیرانە پڕدەکاتەوە کە ڕێگە پێنەدراون.

ئەم سێ برایە، شەش خوشکیشیان هەیە. خوشکەکان لە کێڵگەکەدا پشکیان نییە. کێڵگەکە بەرهەمی ئەرک و ماندووبوونی سێ براکەیە نەک میراتی باوانیان. کاک

قادر لەدایکبووی ١٩٦٦ ـە، کاک نادر لەدایکبووی ١٩٦٨ ـە و کاک عەبدولواحید لەدایکبووی ١٩٧٦ ـە. خوشکی گەورەیان ناوی زێڕینە، لەدایکبووی ١٩٧١ ـە. ئەم سێ برایە خۆیان کێڵگەکەیان بەڕێوەدەبەن، ئەگەر پێویست بکات سوود لە کرێکارەکانیش وەردەگرن. قادر هەشت مناڵی هەیە. نادریش هەشتی هەیە. عبدالواحیدیش پێنجی هەیە. منداڵەکانیان هەریەکە و کارێکی دیکە دەکات. بۆ نموونە کوڕە گەورەکەی قادر کە ناوی هاوکارە، پۆلیسە. کوڕە گەورەکەی کاک نادر "کارزان" نووسینگەی کڕین و فرۆشتنی زەویوزاری هەیە. سێ برا و خوشکەکان و هەموو خێزانەکەیان زۆربەی کات بەیەکەوەن. لە شارۆچکەی حاجیاواش خانووەکانیان بە تەنیشت یەکەوەن. حاجی خانزادی دایکیان لەدایکبووی ١٩٤٥ ـە. ژنێکی ئازا و بەجەرگە. ئەو هەشتا و پێنج کوڕ و کوڕەزا و کچەزای هەیە. بە بووک و زاواکانیانەوە زیاتر لە سەد کەس دەبن. کاتێ حاجی خانزاد لەسەر خوان دادەنیشت، سەد کەس لە کوڕ و کچ و زاوا و بووک و نەوەکانی لە دەوری دادەنیشتن. ئەم سێ برایە کە هاوبەشی یەکیدشن، هەفتەی چەند جارێک لە کێڵگەکەیان ئامادە دەبن و کاتێک کە خوان ڕادەخەن، لانیکەم سی و شەش کەس لە سەر خوانەکە دادەنیشن. هاوسەری نادر کچی پووری تەهایە.

ژنەکان خەریکی ئامادەکردنی ژەمی نیوەڕۆن. هەندێک لە کوڕە گەنجەکان، وەک کارزان خەریکی گۆشت برژاندنن. کۆچەر دوگیانە. ئەو ژنێکی ئازا و سەرپەشتیارە. ئاشکرایە ئەو داوا لە هەندێک کەس دەکات کە چی بکەن. کرێکارەکان کار دەکەن جگە لە ئێمە میوانی دیکەشی لێیە. باخ و ڕەزەکانمان پینیشان دەدەن. ئاووهەوای ناوچەکە بۆ کشتوکاڵ و باخداری زۆر گونجاو و لەبارە. لە باخەکەیاندا دارگوێز و پرتەقاڵیش هەیە. دارگوێز تایبەتە بە ناوچە سارد و شاخاوییەکان. پرتەقاڵیش دارێکی تایبەتە بە ناوچە گەرمەکان. داری زەیتوونیشیان هەیە، بەڵام کەمە. دەیانەوێت داری زیاتر بڕوێنن. داری هەرمێ، هەڵوژە، قەیسی، هەنار و هەنجیریشیان زۆرە. ئەم ساڵ ساڵی ٢٠١٩ بۆ تاقیکردنەوە داری فستقیان چاندووە. گێلاس لێرە نابێت. ناوچەکە بۆ گێلاس باش نییە. نیسک و نۆکی زۆر دەکەن. لەم ناوچەیەدا برنج دەچێنن. ئەم دەشتە فراوان و بە پیتە، بۆ زۆربەی دار و بەروبوومە کێڵگەییەکان لەبارە.

ئەم سێ برایە پێشمەرگایەتییان نەکردووە؛ بەڵام هاوکاری پێشمەرگە بوون. خۆراک و پێداویستییان بۆ دەناردن. کەسێک دەڵێت ئەگەر خەڵک هاوکاری پێشمەرگەی نەکردایە، نەیاندەتوانی بجەنگن. خۆشبەختانە لە خێزانەکەی نادری مەلا سەفی هیچ کەسێک شەهید و ئەنفال نەکراوە. نادر سێ مانگ زیندانی کراوە. هەڵبەت سوپای سەدام گوندی مەلا سەفی وێران کردووە و هەموو خەڵکەکەشی ڕاگواستووە بۆ حاجیاوا.

خوانیان ڕاخست. درێژی خوانەکە نزیکەی چل مەتر بوو. سەوزە و زەڵاتەیەکی زۆر لە سەر خوانەکە دانرا بوو. بە بەرچاوی خۆمانەوە کەبابیان دروست دەکرد. کەبابیان لە دوتوێی نانێکدا و لەسەر دەورییەک دانابوو. دەورییە کەبابەکانیان لە پێش میوانەکان دادەنا. دواتریش کەبابی زیادەیان بەسەرماندا دەگێڕا. زۆرباش خزمەتیان کردین، بەڕاستی ژەم و خوانێکی ڕازاوە بوو. دوای نانخواردن، چا و میوە و چەرەسیان بۆ هێناین.

لێیان دەپرسم ئایا ئێوە باج دەدەن بە دەوڵەت؟ دەڵێن جوتیارەکان باج بە دەوڵەت نادەن. دەوڵەت تا پێش جەنگی داعش هاوکاری دارایی جوتیارەکانی دەکرد. بەڵام ئێستا بەهۆی جەنگی داعش و وێرانکارییەکانی ئەو جەنگەوە، هاوکارییەکان کەمبوونەتەوە. ئەم خانەوادەیە کۆمەکیان لە حکومەت وەرنەگرتووە. تەنانەت خۆیان زەکات دەدەن، هەر کەس بۆ خۆی زەکات بە هەژاران دەدات. ڕۆژبەڕۆژ هەژاری لە ناوچەکە بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات. ئەگەر لە ناوچەکەدا هەژار نەبێت دەیدەن بەهەژارانی ناوچەکانی تر. هەندێ جار هاوکاری کوردانی سوریا دەکەن.

بۆ من جێگای سەرنجە، ئەم سێ برایە لەم کێڵگە گەورەیەدا، پێکەوە گونجاون و هاوکار و پشتیوانی یەکترن.. لە کاتێکدا ڕژێمی سەدام هەموو شتێکی ئەم خێزانەی لەناوبرد. دووری خستەوە لە گوندەکەیان. ڕێگەی پێنەدان بچنەوە سەر موڵک وماڵەکەیان. بەڵام دواتر خۆیان هەوڵ و هیمەتیان خستەکار، دەست لەناودەست کێڵگە و گوندەکەیان ئاوەدان کردەوە. ئەم کێڵگە و ڕەز و باخانەیان بنیادنایەوە. هەریەک بۆ خۆیان خانوویان دروستکرد. ئامێر و پێداویستی کشتوکاڵی و ماشێنی گران بەهایان کڕی. کاریان بۆ خەڵکی دیکەش دۆزییەوە. خزمەتی خەڵکیان کردووە و

دەیکەن. ژیانێکی خۆش و ئارامیان بۆ خۆیان دەستەبەر کردووە. ئەمەش هەمووی دەرەنجامی ئازادی و دادپەروەری و هەوڵ و کۆششی خودی خۆیانە. ئەم سێ برایە چاوەڕوانی ئەوە نەبوون دەوڵەت پشتیوانی و هاوکارییان بکات، خۆیان هاوکاری خۆیان کردووە. ئەوان تۆڵەیان لە هیچ کەسێک نەکردەوە. ئەوان جەنگیان گۆڕی بە سازان و پێکەوە ژیان. ئەم سێ برایە دەڵێن کاتێک دکتۆر بەرهەم سەرۆک وەزیری کوردستان بوو، بارودۆخی ئابووریی زۆرباش بوو. بەڵام جەنگ زیانێکی گەورەی لە ئابووریی ناوچەکە دا. داعش و تاڵیبان و ئەلقاعیدە و گرووپە توندڕەوەکان هەمان ئەو کارانە دەکەن کە ئیستیعماری ڕۆژاوایی دەیەوێت. ئەگەر تاڵیبان پەرەی بە تیرۆر و مرۆڤ کوشتن و تێکدانی ئاسایشی ئەفغانستان نەدایە، ئێستا ئەو وڵاتە یەکێک دەبوو لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی دونیا.

دوای نانی نیوەڕۆ بڕیارە بڕۆین سەردانی هەندێک شوێنی ناوچەکە بکەین. بە چەند ماشێنێک دەڕۆین، دەگەینە شارۆچکەی سەروچاوە. لەوێ تاڤگەیەکی دەستکردیان دروستکردووە. کە جێگەی گەشتیارییە، ئاوێکی زۆری هەیە. سەد مەتر فراوانە و پێنج سەد مەتر درێژە. لە دەوروبەری تاڤگەکەدا پارکێکی لێیە، سەدان کەس لەمبەر و ئەوبەری دانیشتوون. چەند منداڵێک لەنێو ئاوەکەدان. بەشی یەکەمی تاڤگە دەستکردەکە زۆر لێژە. بە دانانی بەرد لەناویا تەوژمی ئاوەکەیان کەم کرووەتەوە. بەهەشت ئەو شوێنەیە کە ئازاری لێ نەبێت و کەس کاری بە کەس نەبێت.

بەرەو شارۆچکەی شکارتە دەڕۆین. بنکەی پۆلیس و شارەوانی هەیە. شارۆچکەیەکە وەک پیرەمەگروون و حاجیاوا. کەلتووری ڕەسەنی کوردی باڵادەستە. کەلتووری ڕەسەنی کورد، دەتوانێت کاری سەدان پۆلیس ئەنجام بدات. ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی بەرقەرارە، ڕەوشت و ئاکاری خێڵەکی ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی بە بەهێزی هێشتۆتەوە. دەگەینە خۆران، لێرەوە سنووری کارگێڕی هەولێر دەستپێدەکات. دەگەینە شوێنێک بە ناوی دێ ڕەش، وەک شارۆچکەیەکە.

**بالیسان**

ماشێنەکان ڕادەوەستن. ئاهێک لە ناوەوەم سەرکەوت. کەوتمە لەرزە. هەموو ئەندامی لاشەم تەزووی پێدا هات. دەڵێن لە ماشێنەکە وەرنەخوارەوە. پێکانم سست بوون، نەمدەتوانی هەنگاوێک بنێم. هەموویان لە ماشێنەکان دابەزین. من هێشتا لە ماشێنەکەدام، سڕ و لەنگ ببووم. وەک ئەوەی منیش بەر کیمیایی کەوتبێتم. هاوسەرەکەم لە بارودۆخەکەم تێدەگات. ئەو دەزانێت کە من لەم کاتانەدا چۆن دەبم. خێرا دێت بەهانامەوە. ئاونەباتێکم پێدەدات. دەستم دەگرێت تا لە ماشێنەکە دابەزم. پێم دەڵێت دانبەخۆتدا بگرە. لە بەردەممدا زیاتر لە سەد کێلی سپی گۆڕی لێیە. ئێرە مەزارگەی شەهیدانی کیمیاییە. گۆڕستانی ئەوانەیە کە بەر کیمیایی کەوتوون. لە سەر هەندێک لە کێلەکان ناوی چەند کەسێک نووسراوە. هەندێکیان ناوی پێنج کەس لەسەر یەک کێل نووسراوە. ئایا چوار-پێنج کەس لە گۆڕێکدا نێژراون؟ هەندێک لە گۆڕەکان ڕەمزیین. چونکە کەسوکاریان ڕووفاتی شەهیدەکانیان دەرهێناوەتەوە و بردویاننەتەوە بۆ گوندەکانی خۆیان؛ بەڵام لێرە کێلێکیان بەناوی ئەوەوە وەک نیشانە داناوە.

لەم شوێنە کێلی گۆڕی ١٢١ خێزانی لێیە. واتا ئەندامانی یەک خێزان بەیەکەوە لە یەک گۆڕدا نێژراون. ڕووفاتی هەشتا و شەش خێزان لێرەیە و ڕووفاتی سی و پێنج خێزانەکەی دیکەش گواستراونەتەوە بۆ گوندەکانی خۆیان. ڕۆژی ١٩٨٧/٥/٢٤ ئەو ڕۆژە بوو کە هێزەکانی سەدام کیمیابارانی ئەم شوێنەیان کرد. ئێرە زیارەتگەی دڵسووتاوانە. ئەم شوێنە بەڵگەی تاوانەکانی سەدامە. ئەم جۆرە شوێنانە هەرگیز نابێت لەیاد بکرێن. فاتیحە دەخوێنین. فرمێسک دەڕێژین. بەهۆی ستەم و زۆرداریەوە، دڵ لێوانلێوی خەم و پەژارەیە.

هەندێک کەس لە بیریان دەچێتەوە. پەند لە مێژوو وەرناگرن. تەنانەت پەند لە مێژووی نزیک و ڕووداوەکانی ڕۆژگاری خۆیشیان، وەرناگرن. خەڵکی وایان دەزانی بە ڕووخاندنی سەدام، بە ئاشتی و ئارامی دەگەن. سەدام ڕەحمی بە کەس نەکرد. کورد، شیعە و سوننە، هەموویان دووچاری زوڵم و ستەم بوون. سەدام ڕەحمی بە عەرەب، عەجەم و تورک و تەنانەت کەسەکانی خۆیشی، نەکرد. زوڵمی لە

هەموویان کرد. کەسانێک کە ئەم هەموو زوڵم و ستەمەیان بینیوە شایستەی ئەوەن بە ئاشتی بژین؛ بەڵام خۆتان دەبینن لە عێراق چی دەگوزەرێت. دیسان هەندێک لە لاوەکان چەک هەڵدەگرن و خەڵکی خۆیان دەکوژن. ئەم گۆڕستانانە نابینن؟ لەگەڵ بوونی ئەم هەموو گۆڕە بەکۆمەڵەشدا، دیسان کەسانێکیان دەبنە لایەنگری داعش، قاعیدە و حیزبە وابەستەکانی دەوڵەتانی دەرەوە. سەرەڕای ئەو هەموو شەهیدە، کیمیاباران، بریندار، ئەنفال، زیندانی، دیلی، وێرانکاری و هێرشی ئەمریکییەکان، هێشتا شەڕی یەکتر دەکەن. ئەی جەنگاوەرانی عێراق! دوای ئەم هەموو زوڵمەی سەدام، چەکەکانتان دابنێن. یەکتری ماچ بکەن. لەگەڵ یەکتردا دابنیشن گفتوگۆ بکەن. شوێن بیری توندڕەوی مەکەون. ئەو ترسەی کە ئەم توندڕەوانە خستویانەتە سەر ژیانی خەڵکی هەرێمی کوردستان، بێ هۆ نییە. هەموو مرۆڤێکی هۆشیار لە بیری داعش و شێوە داعش دەترسێت. بەدەم ئەم بیرکردنەوانەوە گۆڕستانی شەهیدانی کیمیایی جێدەهێڵین. بارودۆخم هیچ باش نییە.

تەها دەڵێت ئێرە گوندی شیرەیە. دۆڵی شیرە و کوێستانەکانی مەلەکان. ئەو دەڵێت من سیساڵ پێش ئێستا، لەم شوێنەوە بە پێی بەرەو ئێران ڕۆیشتووم.

نزیکی خۆراوابوونە. بەرەو باخەکەی برایانی مەلاسەفی دەگەڕێینەوە. دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی. ئەندامانی بنەماڵەی مەلاسەفی خولکمان دەکەن کە بۆ نانی ئێوارە بمێنینەوە. خێزانەکە هەندێکیان چوونەتە سەربان. ئێمەش دەچین. دیمەنێکی زۆر سەرنجڕاکێش دەبینین. تا چاو بڕدەکات کێڵگە و باخ و بێستانە. هەمووی هەر گەنم و جۆیە. ئێرە کۆگای گەنمی عێراقە. کۆچەر گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر وسوقی دەکات. کارزانیش دێت. لەگەڵ هاوسەرە دوگیانەکەی دەوەستێت و وێنەیەکی یادگاری دەگرین. بەڵێ ژیان بەردەوامە. چەندین منداڵ لەدوای ڕووخاندنی سەدام لەدایک بوون. خۆزگە منداڵی ئەم دووانە هەرگیز شەڕ و نائارامی نەبینن.

دونیا وردە وردە تاریک دادێت؛ بەڵام دیمەنی دەشتەکان زۆر جوانن. ئاسمان ڕەنگی سووورباوە. تیشکدانەوەی خۆر لەنێو هەورەکانەوە دیمەنێکی ناوازەی خوڵقاندووە.

پیاوانی کورد بە باڵای بەرز، ڕووی خۆش، پۆشاکی کەشخەوە سەیری دیمەنەکان دەکەن. ڕوونکردنەوە بە من دەدەن. ژنان و کچانی کورد بە جلوبەرگەکانیانەوە

جوانی بە سروشت دەبەخشن. جوانی سروشت و مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا تێکەڵ بوون. هەموویان بۆ دوا تیشکی خۆر دەڕوانن. بیردەکەمەوە ئەگەر دوای پازدە ساڵی دیکە بێمەوە بۆ ئێرە، ئەو کاتە ژمارەی ئەندامانی خێزانی مەلاسەفی زیاتر لە سەد و هەشتا کەس دەبن؟ ئایا من تا پازدە ساڵی تر، دەمێنم؟ خۆزگە بۆ گەنجان شوورەیی نییە!

هەوا سارد بووە. دێینە ژوورێکی گەورەوە. دایکی خێزانەکە لە نێوەندی ژوورەکەدا دانیشتووە. ئەم ژنە حەفتا و چوار ساڵە، ئەزموونی تاڵ و ناڕەحەتی زۆری سەردەمی سەدامی بەسەرهاتووە. منداڵەکانی هەموو ساخ و تەندروستن، بەڵام خزم و کەسەکانی ناڕەحەتی و ئازاری زۆریان بە دەستی سەدام بینیوە.

کاتژمێر نزیکی نۆی شەوە. خوان ڕادەخەن. نزای سەر خوان دەخوێنن. قورمە سەوزییان لێناوە. سەرەڕای ئەو هەموو کەبابەی نیوەڕۆ. هێشتا قورمە سەبزی. لەبەر خۆمەوە دەڵێم نایخۆم. بۆ تەندروستیم باش نییە. نان و ماست دەخۆم؛ بەڵام بۆنوبەرامەی قورمەکە زۆر خۆش بوو. بە بۆنەکەی دەمم پڕ بوو لە ئاو. سی و نۆ کەس لەسەر خوانەکە دانیشتبووین. "وێل دۆرانت" دەڵێت: مرۆڤ هەموو کارێک بۆ تەندروستی خۆی دەکات؛ بەڵام ناتوانێت بەر بە ورگی بگرێت.

دوای نانی ئێوارە، دوبارە میوە خواردن و باسوخوداس. دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی. دەڵێن کات درەنگە و ڕێگاش دووروودرێژە. شەو لێرە بمێننەوە. بەیانی بڕۆن. حەز دەکەم هەر لەم ژوورەدا لە ناوەڕاستی ئەم کێڵگەیەدا بخەوم، بەڵام دەبێت بڕۆین بۆ حاجیاوا.

دەڕۆین بۆماڵی کارزان. کۆچەر ئەو خاتوونە میواندۆستە، بەو بارە قورسەیەوە دەیەوێت خۆی جێگامان بۆ ڕابخات. هاوسەرەکەی دەستوبرد دەکات و سێ دەستە نوێنی پاک و خاوێنمان بۆ دێنێ. ئاوی خواردنەومان بۆ دێنێت. توالێت و گەرماوەکەمان پیشان دەدات.

بەیانییەکی جوان بە خوانێکی ڕازاوەوە دەست پێدەکەین. دوای نانی بەیانی دووبارە خولکمان دەکەن کە ئەمڕۆش بمێنینەوە. دەڵێن ئەمڕۆ دەمانبەن بۆ گوندەکانی دەورووبەر. ئێمە هیچ کارێکمان نییە؛ بەڵام ئێمە دەزانین کە ئەوان کاریان هەیە. ماڵی

کاک نادریش لە تەنیشت ماڵی کوڕەکەیەتی. هەموویان لەبەر دەرگا کۆبوونەتەوە. وێنەیەک دەگرین و پاشان بەڕێدەکەوین. یادەوەریی میواندۆستی ژنان و پیاوانی کورد، بۆ هەمیشە لە بیرەوەرییمدا دەمێنێتەوە. یادگاری ئەو هەموو زەحمەتەی کە بە تەها مان دا. یادگاری میهرەبانی کارزان و کۆچەر و سارین. کاتێک کە دەچینە نێو ماشێنەکەوە. تەها قسەکانی کۆچەرمان بۆ وەردەگێڕێت. دەڵێت دەڕۆم "کتێبی شازادەی حەمام" دەخوێنمەوە. منیش هیوای سەلامەتی، بەختەوەریی، منداڵبوونێکی ئاسانی بۆ دەخوازم. ئەمە سێیەم منالّیانە. کارزان ژمارە تەلەفونەکەی خۆیمان پێدەدات و دەڵێت چاوەڕوانتانم.

## گوندی گەناو

بڕیارە ئەمڕۆ، تەها تا کوێستانەکانی سەر سنووری ئێران بمانبات. شوێنێک کە چەندین جار لە نێوان هێزەکانی ئێران و سەدام دا دەستاودەست کراوە. شوێنێک کە سوپای پاسداران چەندین کیلۆمەتر چوونەتە نێو قولایی خاکی عێراقەوە. شوێنێک کە تەها گەورەترین یادەوەریی ژیانی لەو شوێنە هەیە. یادەوەرییەک کە لێی جیا نابێتەوە. یادەوەرییەک کە بووەتە بەشێک لە بوونی ئەو.

کوێستانە بەرزەکانی سەر سنوور لە دوورەوە دیارن. وردە وردە لێیان نزیک دەبینەوە. لوتکە بەفرینەکان لە دوورەوە دەبینین. گوندەکان وردە وردە کەم دەبنەوە. زەوی یەکپارچە سەوزاییە. هەوا خۆش و لەبارە. لە چەند شوێنێک دەوەستین. تەها لەبارەیانەوە ڕوونکردنەوەمان دەداتێ. لە تەنیشت کانیاوێک دەوەستین. بە چیمەنتۆ سەکۆیەکیان بە دەوریدا دروستکردووە. درەختێکی گەورە سێبەری بە سەر سەکۆکەدا کردووە. لە بەرامبەر سەکۆکەدا، دیمەنێکی سەرنجراکێشە. کێڵگەو ڕەز و باخی سەوز لە دامێن و تەختایی شیوەکەدا ڕاکشاون. باخەکان لەکاتی دروستکردندان. ئەمانە هەوڵ و دەسەڵاتی مرۆڤ بە سەر سروشتدا پیشان دەدەن. کێشە، مین و گوللەتۆپە نەتەقیوەکانە. تەقەمەنی نەتەقیو، هەر ساڵە و کارەسات و کۆسپێک دەخوڵقێنێت؛ بەڵام دواجار سەرزەوی هەر ئاوەدان دەبێتەوە. کە دیکتاتۆر دەڕوات، ئاشتی و ئاوەدانی

دێت. دیموکراسی، ئازادی ڕادەربڕین و دانوستان دێت. هەمیشە، لانیکەم یەکێک لە لایەنەکانی جەنگ و ناکۆکی، ڕژێمێکی دیکتاتۆری نەزانە. خۆ ئەگەر هەر دولا شەڕخودازبن، چەند سامناکە.

لە ئاوی کانیاوەکە دەخۆینەوە و بەڕێدەکەوین. بەتەنیشت ڕێگاکەوە و لە دامێنی کێوەکەدا، سەنگەر و پەناگەی سوپای پاسدارانی لێ دروستکراوە. پەناگەیەک کە ڕۆژێک جەنگاوەرانی ئێرانی پشوویان تێیدا دەدا. دادەبەزین سەردانی ئەو سەنگەر و پەناگانە دەکەین. زیاتر لە سی ساڵە جەنگ تەواو بووە. لە کۆتایی شەڕەکەوە تا ئێستا ئەم پەناگانە سوودیان لێ نەبینراوە، گژوگیا لە سەر سەربانەکانیان ڕوواوە. میچی هەندێکیان بە پارچە ئاسنێکی کەوانەیی دروستکراون. هێندەیان لم لە سەر ڕۆکراوە، کە پەناگەکان وەک گردێک دێنە بەر چاو. تا ئێستاش هەر بە بەهێزی ماونەتەوە. ڕوخساری پڕ لە ئۆمێدی جەنگاوەرەکان دێتە بەرچاوم. جەنگاوەرانێک کە لەوانەیە لە دوورترین خاڵی ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە هاتبن. لە خۆراسانی باشوور، لە باشووری بەلوچستان. واتا لە ٢٥٠٠ کیلۆمەتر دوورتر بۆ بەرگری کردن لە نیشتمان و بەهاکانی خۆیان، هاتوون.

لەم ناوچەیە نە هیچ ئاوەدانییەک هەیە نە هیچ کەسێک. خاڵە سنوورییەکانی عێراق و ئێران بە سەر کێوەکانەوە دەبینرێن. دەگەینە قەدپاڵی گردێکی بەرز. گردێک کە نزیکە لە سنوورەوە. بنکەیەکی سەربازی لە نزیک گردەکەوە هەبووە کە هێشتا شوێنەوارەکەی ماوە. تەها ماشێنەکەی ڕادەگرێت. گردەکە چەند سەد مەترێک لە ڕێگاکەوە دوورە. گردێک کە بۆ منیش دەبێتە یادەوەریی. یادەوەرییەک کە لە چاوی تەهادا دەدرەوشێتەوە. دیمەنێکی دڵڕفێن، بەڵام بۆ ئێمە تۆقێنەر. ئێرە هەمان ئەو شوێنەیە کە تەها، قاچێکی تێدا لەدەستدا. لەو شەوە تاریکەدا تەها پێی لەسەر مینێک دانا. قاچی لە ئەژنۆیەوە پەڕی. ئەو گردە شوێنێکە کە خوێنی تەهای لەسەر ڕژاوە. هەندێک لەو بنتە سنوورییانە بە خوێن جێگیر کراون. بە خوێنی ئەو سەربازانەی کە نزیکەی چوار سەدە لەمەوبەر لە جەنگەکانی نێوان ئێران و عوسمانییەکاندا لەسەر ئەم زەویە ڕژاوە. بە خوێنی ئەو سەرباز و پاسدارانەی کە لەم خاڵانە شەهیدکراون. بە خوێنی سەدان کەسی وەکوو تەها. تەها بە حەسرەتەوە دەڕوانێتە ئەو گردە. ڕەنگە

بەو ڕوانینە بیەوێت قاچە پەڕیوەکەی ببینێت. بە ڕوانینەکەیدا دەیەوێت گیانبازی و کۆمەکی هاوڕێکانی ببینێت لە کاتی گواستنەوەی ئەودا، بەرەو سنووری ئێران. لەوانەیە بەو نیگایەی بیەوێت سوپاسی ئەو هاوڕێیانەی بکات کە ئەویان لە کۆڵ کردبوو، بەرەو سنووری ئێران ڕایاندەکرد. پێدەچێت بەو نیگایە بیەوێت سوپاسی خاڵە عەبدوڵلای بکات. خاڵە عەبدوڵلا کە ئەوی کردبووە کۆڵی و بەرەو سنووری ئێران ڕایدەکرد. چاوەکانم دەخەمە سەر یەک. هەوڵدەدەم دیمەنی تەقینەوەی مینەکە و پەڕینی قاچی تەها بهێنمە پێش چاوم. دەمەوێت ئەو دیمەنە دڵتەزێن و تۆقێنەرە وێنا بکەم. گرمەیەک لە کێوەکەوە دەنگی دایەوە. دوژمنە بەعسییەکان، لە هەموو لایەکەوە تەقە دەکەن. پێشمەرگەکان دەبێت تەها بگەیەننە پشت سەنگەرەکان. ئەوان دەبوو ئەوشەوە، هێرش بکەنە سەر دوژمن. بەڵام دەنگی تەقینی ئەو مینە، کارەکەی ئەوانی تێکدا. دوژمنی لە خەو هەستاند. شەوپەلاماری پێشمەرگە بووە هۆی شەڕی ئاشکرا. دوژمن لە مۆڵگەکانەوە کوێرانە تەقە دەکات. لە خەیاڵمدا، خوێن ڕژانی تەها دەبینم. زۆر بێتاقەتم. حەزدەکەم لە ڕێگاکە دوورکەومەوە و بگەمە دامێنی گردەکە. تەها ناڕازییە. دەڵێت ئێرە گێلگەی مینە. ترسناکە. زیاتر لە سی ساڵ بە سەر جەنگدا تێپەڕیووە، کەچی هێشتا ئەم شوێنە پڕە لە مین. سواری ماشێنەکە دەبینەوە. بە پێچاوپێچی ڕێگاکەدا بـەرەوژوور دەڕۆیـن. لەسەر بەرزاییەک خانوویەک هەیە. تەنها خانوویەک. بە تەها دەڵێم تکایە بووەستە. لەم چۆڵەوانییەدا، تاقە خانوویەک لێرە چی دەکات؟ لانیکەم بە درێژایی بیست کیلۆمەتر، هیچ نیشانەیەکی ئاوەدانیی نەبوو. بانگدەکەم. پیاوێک دێت. تێیدەگەیەنم کە دەمەوێت بچمە سەرئاو. خانمێک لە خانووەکە دێتەدەرەوە. بە میهرەبانییەوە بە فارسی لێم دەپرسێت ئێرانیت؟ دەڵێم :بەڵێ. دەستشۆرەکەم پیشاندەدات. لە پاکوخاوێنی توالێتەکە، سەرم سووڕ دەمێنێت. هەموو لە ماشێنەکە دادەبەزن. تەها لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا گفتوگۆ دەکات. مریشک و کەڵەشێرەکان لە دەوری ماشێنەکە بە دوای خۆراکدا دەگەڕێن. بانگی تەها دەکەم. لە پڕ خانمی خاوەن ماڵ لە تەها دەپرسێت تۆ چیت وت؟ تۆ ناوت تەها عەبدوڵلا فەرەجە؟ تەها دەڵێت: بەڵێ. ئەو ژنە هاوار دەکات: کاک تەها ئەمە تۆی؟ من ئایشەم، ئەوەش عەبدوڵلای هاوسەرمە. عەبدوڵلا عەلی محەمەد. من لەگەڵ سوعادی خوشکت،

لە "ئۆردوگای جەهرووم" سێ ساڵ پێکەوە بووین. خوشکەکەت ئێستا لە کوێیە؟ زۆر میهرەبانە. بیرمە جارێک تۆ هاتی بۆلای خوشکەکەت لە جەهرووم، من تۆم لەوێ بینی. بیست و چوار ساڵە سوعادم نەبینیووە. هەموویان خۆشحاڵ دەبن. تەها تەلەفۆن بۆ سوعادی خوشکی دەکات و مۆبایلەکەی دەداتە دەست ئایشە. بە بیستنی دەنگی سوعاد، ئایشە ڕوخساری دەگەشێتەوە. پێکەوە قسە دەکەن. باسی یادەوەرییەکانیان دەکەن. بڕیاردەدەن کە یەکتر ببینن. شەهێنی کچی ئایشە لە بەردەمی خانووەکەدا وەستاوە. ئەو لە حەوت ساڵیەوە سوعادی نەبینیوەتەوە. زۆر خوڵکمان دەکەن کە بچینە ماڵەوە. دەچینە ژوورەوە. ژووری میوانەکەیان گەورەیە. کوێستانە و هەواش تا ڕادەیەک ساردە. ئاگری زۆپاکە زیاد دەکەن و باس لە یادگارییەکانی ئێرانیان دەکەن.

عەبدوڵلا لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٤ ە و ئایشەش لەدایکبووی ١٩٦٩ یە. چوار منداڵیان هەیە، شەهێن لەدایکبووی ١٩٨٧ ە. تەمەنی یەک ساڵ بووە کە لەگەڵ دایک و باوکی بە هۆی جەنگەوە ئاوارەی ئێران بوون. "ئاوارە" کوڕی گەورەی عەبدوڵلایە. لە ساڵی ١٩٨٩ لە ئۆردوگای جەهرووم هاتۆتە دونیاوە. ئایشە بە تەها دەڵێت خوشکەکەت زۆر هاوکاری کردوم. من منداڵێکم هەبوو تەمەنی ساڵ و نیوێک بوو. دوگیانیش بووم. دەبوو بچوومایە بۆ کار. خوشکەکەت هاوکاری دەکردم. ئەو دەڵێت: ئامانج، کوڕەکەی دیکەشم لە ١٩٩١/٢/١٨ هەر لە جەهرووم هاتۆتە دونیاوە. ئەو ئێستا پێنج مانگە زەماوەندی کردووە. لە قەڵادزێ دوکانداری دەکات. عەبدوڵلا دەڵێت منداڵی چوارەممان ناوی ئەمیرە. ساڵی ١٩٩٧ لە جەهرووم هاتۆتە دونیاوە. سەرەتایی و ئامادەیی لە ئێران خوێند. دەیویست لە ئێران بچێتە زانکۆ. چوار منداڵم هەبوو. خەرجی گران بوو. کوردستانی عێراقیش ئارام و ئاسایش بوو. دوای بیست و چوار ساڵ پەلی ژن و منداڵەکانم گرت و هاتم بۆ ئەم چۆڵەوانییە. بیست و چوار ساڵ لە ئێران بووم. عەبدوڵلا و خێزانەکەی ئێستا ئەو چۆڵەوانییەیان لەسەر سنوور ئاوەدان کردووەتەوە. کێڵگەکانیان لە مین پاککردوەتەوە و ڕەز و باخیان بنیادناوە.

ئەوان چوار ساڵ لە جەهرووم، شەش ساڵ لە شنۆ، سیانزدە ساڵیش لە بێزیلێی بوون. عەبدوڵلا دەڵێت لە ترسی بۆردوومان، کوشتار و ستەم هەڵهاتم. بە منداڵێکی یەک ساڵەوە چووین بۆ ئێران و بە چوار منداڵی گەورەوە، لە ئێرانەوە گەڕاینەوە بۆ

کوردستان. ئەو ستایشی خەڵکی ئێران دەکات. دەڵیت زۆر لەگەڵمان میهرەبان بوون. ئێستا عەبدوڵلا سەرقاڵی کاری کشتوکاڵییە. باخێکی بچووکیشی هەیە کە هەنجیر، ترێ، هەنار و گوێزی تێدا ڕواندووە. نزیکەی دە هێکتار زەوی بەراو و دە هێکتاریش زەوی دیمی هەیە. گەنم، جۆ و نۆک دەچێنێت. بڕێکیش پاقلەی دێم و بەراو، کونجی دیمی، لۆبیا و بامیەش دەچێنێت.

شەهێنی کچیان سی و دوو ساڵ تەمەنیەتی کچێکی جوانکیلە و ڕووخۆش و گورجوگۆڵە. براکانی، ئەم و باوک و دایکیان، لەم خانووە تاک و تەنیایەی ئەم چۆڵەوانییە جێهێشتووە و خۆیان چوون لە شار نیشتەجێ بوون. ئەو لە کاری کشتوکاڵدا هاوکاری باوکی دەکات. هاوسەرگیریی نەکردووە. کامە لاو لەم شوێنە دوورەدەستەدا ئەم کچە کوردە جوانە دەبینێت؟ کچێک بیست و چوار ساڵ لە ئێران بووە و هیچ پەیوەندیی و تێکەڵاوییەکیشی لەگەڵ کەسوکاریدا نییە.

ڕژێمی دیکتاتۆری چ زوڵم و ستەم و بەدبەختیەک بۆ مرۆڤ دەهێنێت. خێزانێک کە دەبێت بیست و چوار ساڵ لە وڵاتێکی دیکە کرێکاری بکەن. کچێک کە لەوانەیە بە درێژایی تەمەنی مەحرووم بێت لە هەموو شتێک. گەنجێک کە دەبێت واز لە خوێندنەکەی بهێنێت و بەناچاری بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. وڵاتێک کە نە تیایدا هاتۆتە دونیاوە نە تیایدا گەورە بووە. ئەم خێزانە میهرەبانە زۆرمان لێدەکەن و خولکمان دەکەن کە بۆ خوانی نیوەڕۆ میوانیان بین. کوردی میواندۆست دەیەوێت مریشکێکمان بۆ سەرببڕێت. ناهێڵین و دەڵێین ئێمە دەڕۆین. نزیکی سەعات دوازدەیە. چەند نانی کوردی و قاڵبێک پەنیری دوو کیلۆیی مان دەدەنێ. دەڵێین پەنیرمان زۆر پێیە؛ بەڵام ئەوان پێداگری دەکەن و دەڵێن بەرهەمی خۆمانە. من لە ئێران، پەنیری وشکی قاش قاشم نەبینیووە. پەنیرێکی زۆر بە تامە و زۆریش دەمێنێتەوە.

ئێمە دەجوڵێین. ڕێگایەکی شاخاوی و سەر سنوورە. وا دەسووڕێینەوە و بەئاڕاستەی سلێمانی دەکەوینەڕێ بەڵام نەک لەو ڕێگایەوە کە پێیدا هاتین. دیمەنەکان لەڕووی زانستی زەوی ناسییەوە سەرنجڕاکێشن. هەردوو مامۆستای پایەبەرزم دکتۆر عەلی ئەسغەری ئاریایی و دکتۆر سەعید سەعادەت مامۆستای زەوی ناسی هاتنەوە یادم. خۆزگە ئەوانیش لێرە دەبوون و زەوییەکانی ئێرەیان لە ڕووی زانستی

جیۆلۆجییەوە هەڵدەسەنگاند. دەگەینە دەربەندێک. ڕێگاکە بە ناو دەربەندەکەدا دەڕوات. هەر کەسێک ئەم دەربەندەی لەژێر دەستابێت، دەتوانێت هەموو ڕێگا و شوێنە گرنگەکانی ئەم ناوچەیە کۆنترۆڵ بکات. دەگەینە پردێکی سەر ڕووبارەکە. ئاوی ڕووبارەکە زۆرە. گۆمی زۆریشی تێدایە. ڕووبارەکە بە تەوژم دەڕوات. ماشێنی خێزانێکی دیکەش دەوەستێت. نزیکەی نیو کاتژمێر لەم دەربەندە جوانە دەمێنینەوە. دواتر دەکەوینەوەڕێ. دەبێت بە گەردەنەکەدا سەرکەوین، نزیک کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆیە، ڕێگاکە دەشتێکدا دەڕوانێت. بۆ پشوودان سێبەری درەختێک دەستنیشان دەکەین و خوان رادەخەین. گەرچی خواردنمان پێیە بەڵام ئەو نان و پەنیرە دەخۆین کە عەبدوڵڵا پێشکەشی کردین.

دیمەنەکان ئەوەندە دڵڕفێنبوون کە حەزم دەکرد شاعیر بوومایە و بە شیعر باسی جوانیی ئەو سروشتە جوانەم بکردایە. میواندۆستی کوردان، هاودەمی یار، جوانی سروشت و بەهار و کوڕی ژیر و هاوڕێی وەفادار. بەرەو بێئاگاییم دەبەن.

حەزدەکەم چەندین کاتژمێر لەم بەرزاییە دڵگیرە دانیشم و چێژ لە جوانییە دڵفرێنەکەی سروشتی کوردستان وەربگرم؛ بەڵام دەبێت برۆین.

کاتژمێر ۳:۳۰ دوانیوەڕۆ بەڕێدەکەوین. دەبێت بگەڕێینەوە بۆماڵەوە. شەو دەچینە میوانی.

### دیدار لەگەڵ شێخ هاوڕێ، کوڕی کاکەحەمەی مامەڕەزا

بە درێژایی چەندین سەدە کوردستانی عوسمانیی، پاشان تورکیا و عێراق دوچاری جەنگ و خوێنڕشتن و خەباتی چەکداریی بوونەتەوە. دەوڵەتانی عوسمانی و سەفەوی، زوڵم و ستەمێکی زۆریان دەرهەق بە کورد کردووە. لە بارەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری شا عەباس لەگەڵ کوردەکاندا. دەتوانیت کتێبە مێژووییەکان بخوێنیتەوە، لەوانە نووسینەکانی نەسروڵڵا فەلسەفی (ژیانی شا عەباسی یەکەم لە ٥ بەرگدا).

کوردەکان لە بەرامبەر زوڵموزۆر، شەڕوشۆڕ، تۆپ و تفەنگدا ڕوویان کردووەتە بیرکردنەوە و فەلسەفەی ئارامبەخش. بیرکردنەوەیەک کە مرۆڤ لە ناخەوە ئارام

دەکاتەوە. ئەو ئەندێشانەی کە دەروونی مرۆڤ پاک و بێگەرد دەکات. میهرەبانی و سۆز بە مرۆڤ دەبەخشێت. مرۆڤ ئەگەر لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە لەگەڵ دوژمنەکانی لە جەنگدا، بێت دڵڕەق و زاڵم دەردەچێت. کوردەکان پەرچە کرداری جەنگ، ستەم و توندوتیژییان لە فەلسەفەی مرۆڤدۆستیدا دۆزیوەتەوە. هەر بۆیەش ڕێبازە سۆفیگەرییەکان لە کوردستاندا، زیاتر لە هەر شوێنێکی دیکەی ناوچەکە کاریگەرییان هەیە. نەقشبەندی یەکێکە لە ڕێبازە سۆفیگەرییەکان کە لە کوردستاندا چالاک هەبووە و هەیە. هەڵبەت ڕێبازی نەقشبەندی لە هەموو ئاسیای ناوەڕاست، گەشەی کردووە و بڵاوبووەتەوە. جەنگی نەقشبەندییەکان «باسەمچی»یەکان لەگەڵ سوپای ڕووسیای شورەوی، یەکێکە لە نموونە هەرە دیارەکانی بەگژداچوونەوەی ئیستعمار. ئەرکی سەرەکی ڕێبەرانی تەریقەتی نەقشبەندی بە خودایی کردنی ڕوحی مرۆڤ بووە و هەیە. زۆرێک لە پەیڕەوانی نەقشبەندی لە ناوچەکانی خۆیاندا لە بەرامبەر زوڵم و ستەمی زاڵمان و حکوومەتە دیکتاتۆرییەکاندا جەنگاون. یاخود پشتیوانیان لە جەنگاوەران و تێکۆشەرانی دژ بە زوڵم کردووە. بە ڕووکەش ئەمە دژایەتی ژیان و فەلسەفەیە. ئەوان باوەڕی مرۆڤدۆستی و خۆشویستنی هەموو دروستکراوەکان لەگەڵ خودادا دەخەنە ڕوو. خۆشەویستی سروشت، ژینگە و ئاژەڵە کێوییەکان، بەشێکە لەم فەلسەفەیە. هەمان بیرکردنەوە، مرۆڤ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی زوڵم و ستەم و داگیرکاری هاندەدات. هەڵگرانی ئەم باوەڕە ئەگەر پێویست بکات چەک هەڵدەگرن، هەرچەندە لەنێو دڵیاندا سۆز و خۆشەویستیان چاندووە. تەنانەت لە دڵدا سۆزیان بۆ دوژمنەکانیشیان هەیە. لە دەستیاندا تفەنگ هەیە و لە باوەڕیشیاندا بەخشین، جوامێری، میهرەبانی، بەڵێن و وەفا. ڕێبازی نەقشبەندییش بانگەشە بۆ هەموو ئەوانە دەکات؛ بەڵام هاوکات شەڕ لەگەڵ نەفسی خۆیاندا درێژە پێدەدەن. ڕێبازی مامەڕەزاییش یەکێکە لە ڕێبازەکانی نەقشبەندی. پێش ئەوەی سەردانی کوردستانی عێراق بکەم، لە بارەی ڕۆڵی شێخانی نەقشبەندییەوە دژ بە سەدام و حزبی بەعس تا ئەندازەیەک ئاگاداربووم. بەڵام لەم سەردانە کورتەمدا بۆ کوردستان زیاتر ڕۆڵ و کاریگەری ڕێبازی نەقشبەندی و قادریم لە بەرامبەر زوڵم و ستەمی زۆرداراندا بۆ دەرکەوت. من لەگەڵ ژمارەیەک لەو پێشمەرگانەی کە مێژوویەکیان

لە بەرەنگاربوونەوەی سەدامدا هەیە، قسەم کرد. بەنزیکی هەموویان هاوڕابوون، لەسەر ڕۆڵی پشتگیری، ڕۆحیی و ڕێکخراوەیی گرووپە نەقشبەندییە جیاوازەکان، لەو خەباتەدا. تەهاش چەند جارێک باسی لە ڕۆڵ و کاریگەری مامەڕەزاییەکان دەکرد. باسی لە پشتیوانی دارایی و ڕۆحیی مامەڕەزاییەکان لەگەڵ پێشمەرگەدا دەکرد. لە خراپترین و سەخترین دۆخەکاندا مامەڕەزاییەکان هاوکار و پشتیوانی پێشمەرگە ئەو کوردانەیان کردووە کە ستەمیان لێکراوە. مامەڕەزاییەکان لە سەردەمی خەباتی دژ بە سەدام، لە کوردستانی ئێرانیش چالاک بوون. زۆرێک لە پەنابەرە عێراقییەکان لە ئێران، بۆ پشتیوانی مامەڕەزاییەکان و گرووپە نەقشبەندییەکانی دیکە ئامادەی تێکۆشان بوون.

ڕۆژی چواردەیەمی مانەوەمان بوو لە سلێمانی. سەرەتا وا بیرمان دەکردەوە کە ئەوپەڕی یەک هەفتە لە عێراق دەمێنینەوە. هەموو ڕۆژێک دەمانویست بەرەو ئێران بگەڕێینەوە، بەڵام تەها دەیگوت سبەی. ئەو پیاوە میهرەبانە ئێمەی لە سلێمانی هێشتەوە. هەموو ڕۆژێک بەرنامەیەکی ڕێکدەخست و دەیبردین بۆ شوێنێک. بۆ گوندێک، دەربەندێک، ئەشکەوتێک، پەناگەیەک، دارستانێک، بۆ دیداری جەنگاوەرێک و میوانداریی تایبەتی. هەڵبەت ئێمەش حەزمان دەکرد لە سلێمانی بمێنینەوە، بەڵام تەها و خێزانەکەی زۆر پێمانەوە ماندوبوون. لەم سەردانەدا بەشێکی گرنگم لە ناوچە گەشتیاری و مێژوویی و شوێنەوارییەکانی دەوروبەری سلێمانی بینی؛ بەڵام هەستم دەکرد کە گەشتەکەمان لە شتێکی گرنگی کەمە. ماوەی گەشتەکەمان کورت بوو، گەشتێک نەبوو بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، تەنها سەردانکردن و بینین بوو. بەو ئۆمێدەی دەرفەتێکی دیکەم بۆ بڕەخسێت کە بتوانم زیاتر لە سلێمانی بمێنمەوە. وەلێ هەستم دەکرد کە لەم گەشتە کورتەدا شتێک هەیە کە پێویستە هەندێک لەبارەیەوە بزانم. ڕۆژی چواردەیەمین بوو تەها گوتی: دەتانبەم بۆ لای شێخ هاوڕێی کاکە حەمەی مامە ڕەزا. خۆشحاڵ بووم، گوڵێک لە گوڵەکانم پشکوت. گوتم بەڵێ ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە لە گەشتەکەم کەم بوو. گەشت بۆ نێو ئەندێشە و ڕۆح. هەڵبەت ناسین و پەیبردن بە قوڵایی هەردوو فەلسەفەی نەقشبەندی و قادریی، بۆخۆی تەمەنێکی دەوێت؛ بەڵام وەک دەڵێن بینینی دەروازە نیشانەی چوونەژوورەوەیە.

بەرەبەیان کەوتینەڕێ. دەبوو بەرەو دوکان بڕۆیشتینایە. ڕێگاکەمان لە دەشتەوە بۆ ناو چیا و دیمەنە جوانەکان دەکشا. تەها وەکو جاران ڕوونکردنەوەی پێدەداین. لە چێشتخانەیەک ژەمی نیوەڕۆمان خـوارد. کەشێکی بـاراناوی هەبوو. دەبـوو، ماشێنەکەمان لە دۆڵێکەوە، بـەرەو بەرزاییەک بڕۆشتایە. لە دووریـی بوو، سێ کیلۆمەترێکەوە خانوویەکی گەورە کە دەیڕوانی بەسەر دۆڵەکەدا، دەبینرا. تەها گوتی: ئەوە خانەقای مامەڕەزاییەکانە. لە دەوروبەری ڕێگای بەرەو خانەقاکە کێڵگە و باخی زۆری لێبوو. تەها گوتی: ئەم کێڵگە و باخانە هی خانەقایە. دەچینە نێو گۆڕەپانی خانەقاکەوە، دەروازەیەک هەیە. تەها پێشتر هەماهەنگی نەکردبوو، خۆی بە پاسەوانی خانەقاکە ناساند. دوای چەند خولەکێک چووینە ژوورەوە. دەگەینە نزیک سەکۆیەکی گەورە. دیمەنەکانی بەردەم سەکۆکە زۆر جوانبوون. دیمەنێکی شاعیرانە بوو. دونیا کەمێک تەمومژ بوو. باران نم نم دەباری. دیمەنەکەی هاوشێوەی هەندێک لە دیمەنی دۆڵەکانی باکووری ئێرانە. هەڵبژاردنی ئەم شوێنە بۆ خانەقا نیشانەی حیکمەت و داناییە. سروشت و دیمەنە جوانەکانی دەروونی مرۆڤ پاکدەکەنەوە. هەموو جۆرە ڕق و کینەیەک لادەبات. ئەم دیمەنانە پەیوەندی مرۆڤ و سروشت بەهێزتر دەکات. سروشتێکی بێ خشت، کۆنکرێت و ئاسن، تەلاری بەرز، ترافیک و جەنجاڵی خەڵک و هەوای پیس؛ نەشئە، میهرەبانی و خۆشەویستی بە مرۆڤ دەبەخشێت.

کەسێک دێت بـەرەو پیرمان و خوڵکمان دەکـات. دەمانبات بـەرەو هۆڵێک کە درێژییەکەی لانیکەم٤٠ مەترە و پانییەکەشی پێنج بۆ شەش مەترێک دەبێت. لە بەری ڕۆژهەڵاتی هۆڵەکە، بەرامبەر پەنجەرەکەدا، کورسی و قەنەفەی گرانبەها ڕیزکراوە. ئێمە بەرەو ئەوێ ڕێنمایی دەکات. دەڵێت: چەند دەقیقەیەکی دیکە گەورەمان دێت. چامان بۆ دێنن. بەدیوارەکەوە تابلۆیەک هەڵواسراوە. لەسەر تابلۆکە، زنجیرەی ڕەچەڵەکی مامەڕەزاییەکان تا شێخ بەهادین محەمەد وەیسی نەقشبەندی بوخارایی "سەدەی هەشتی کۆچی" نووسراوە. لەبارەی مامەڕەزاییەکانەوە زۆر لێکۆڵینەوە کراوە.

پیاوێکی کەمێک کورتە باڵا، بە بەرگێکی کوردی جوان و سەرنجراکێشەوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دێن. شێخ هاوڕێی کاکە حەمەی مامەڕەزا، پیاوێکی زۆر میهرەبان و

ڕەوشت بەرزە. هاوسەریشیان ناوی نازەنینە. ژنێکی سەنگین و سەلارە. تەها هەر لەمێژە پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ شێخدا هەیە. شێخ هاوڕێ فەرماندەی تیپی ۲۹ ی کەڵکە سماق بووە. سەعید حەمەشوان، خاڵی تەها جێگری فەرماندەی تیپ بووە. باپیرەی شێخ هاوڕێی کاکە حەمەی مامەڕەزا لە نێوان ساڵەکانی ۱۹٤٦-۱۹٤٧ لە مەهاباد ژیاوە. مامەڕەزا ۲٥-۲-۱۹٦۱ لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد و کوڕەکەی کاکە حەمەی مامەڕەزا، لە جێگەی دانیشت.

کاتێک کە تەها بەر گازی کیمیایی کەوتبوو، کاکەحەمەی مامەڕەزا هاوکاری زۆری کردبوو. لە سەردەمی سەدامدا مامەڕەزاییەکان لە کوردستانی ئێرانیش چالاک بوون. ئەوان زۆر هاوکاری خەڵک و پێشمەرگەشیان دەکرد. تەها قسەکانمان وەردەگێڕێت. شێخ هاوڕێ وەڵامی پرسیارەکانم دەداتەوە. سەرچاوەی دارایی خانەقاکە، هاوکاری موریدان، داهاتی بەروبوومە کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییەکانە. باپیری شێخ هاوڕێ لە ساڵی ۱۹٤٦ هەندێک گۆڕانکاری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و دابونەریتی ئەو سەردەمەدا ئەنجامداوە. بۆ نموونە لە پرۆسەی هاوسەرێتیدا، دەبوو کچەکە ڕازی بووایە بەو پرۆسەیە، کە لەو سەردەمەدا ئەمە وەرچەرخانێکی گرنگ بووە. کاکەحەمە کە باوکی شێخ هاوڕێیە، لە پاییزی "۱۳٦۸ - ۱۹۸۹" لە ژێر فشاری حکومەتی سەدامدا ڕوویکردە کوردستانی ئێران و لە سەقز نیشتەجێ بوو. بە دوورکەوتنەوەی کاکەحەمە زۆرێک لە لایەنگران و پەیڕەوانی تەریقەت ڕوویان کردە ئێران و لە ناوچە جیاوازەکانی ئێراندا نیشتەجێ بوون. دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس، زۆربەیان گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان. لەنێو مامەڕەزاییەکاندا کەسانی مەسیحیش هەبوون. بنەما سەرەکییەکانی مامەڕەزاییەکان بەم جۆرەرە:

هەموو مەزهەبەکانی ئیسلام، تەنانەت ناموسوڵمانەکانیش دەیانتوانی بێنە سەر ئەم ڕێبازە. بنەمایەکی دیکەش برایەتی، یەکسانی ژنان بۆ هاوسەرێتی و مامەڵەکردن و دۆستایەتی و ڕاستگۆیی و دادپەروەرییە. ئەگەر من بە دروستی لێی تێگەیشتبم، ڕێبازی مامەڕەزاییەکان وەک نەقشبەندیی و قادریی خودا گەرایی، پاشان مرۆڤ گەراییە. بناغەکەی لەسەر عیشقی خودایی و خۆشەویستی مرۆڤەکان و هەموو دروستکراوەکانە؛ بەڵام لە بەرامبەر ستەمکار ڕادەوەستن و بەرگری ستەملێکراو

دەکەن. عیشق، خۆشەویستی و هاوڕێیەتی سەرقافڵەی هەموو جوانییەکانە.

خەڵکانێکی زۆر لە گوند و شارەکاندا پەیڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی و ڕێبازی مامەڕەزاییەکانن. لە بارەی سروشتەوە لە شێخ هاوڕێ دەپرسم، ئەو دەڵێت سروشت و گیانداران، تەواوکەری یەکترن. ئێمە هەمیشە سروشت و دارستانەکانمان پاراستووە، زۆر بەتوندی دژی جەنگین. بەڵام ئەگەر ناچاربین دەجەنگین. هەروەک چۆن لەسەر دەمی سەدامدا جەنگاین و پشتیوانی پێشمەرگە بووین. ئێمە هەمیشە دژی جەنگ و ناکۆکی بووین و دەبین. ئێمە هەوڵ بۆ ئاشتی دەدەین.

مستەفا عەسکەری، ئامۆزای شێخ هاوڕێ، کتێبێکی بەناونیشانی (تێڕوانینێک بۆ حەقەکان) نووسیوە. خودی شێخ هاوڕێش دوای هێرشەکانی سەدام لە ساڵی ١٩٨٨تا ١٩٩١ لە ئێران لە شاری سەقز نیشتەجێ بوو. شوێنکەوتووان یاخود مامەڕەزاییەکان لە ئێراندا زیاتر لە شارەکانی سەقز، سەردەشت، پیرانشار و مەهابادن.

نازەنین، هاوسەری شێخ هاوڕێ لەگەڵ دکتۆر وسوقیدا بە زمانی ئاماژە گفتگۆ دەکەن و شێخ هاوڕێ و هاوسەرەکەی خولکمان دەکەن شەو لە خانەقا بمێنینەوە و میوانی ئەوان بین. لەڕاستیدا حەزمدەکرد بمێنینەوە، تا سوودی زیاتر لە تێڕوانین و هەست و ناخی شێخ و هاوسەرەکەی وەربگرم. خۆشیی سروشتیش کە شوێنی خۆی هەبوو؛ بەڵام نەدەبوو ببین بەئەرک بەسەریانەوە. بە شێخ هاوڕێ دەڵێم بەهیوای خودا لە دەرفەتێکی دیکەدا بەخزمەتتان دەگەینەوە.

وا گەیشتینە کۆتایی گەشتەکەمان بۆ کوردستانی عێراق. گەشتێکی بەرهەمدار و پڕ لە ئەزموون بوو. بیرم دەکردەوە، دەمگوت ٥٠٠ ساڵ، ڕەنگە زیاتریش بێت، تێکۆشان دژی زۆرداری جەنگ، دەتوانێت مرۆڤ توندوتیژ بکات. هەر لە ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگیی عوسمانی و سەفەوییەکانەوە تا سەدام حسێن، دەتوانێت مرۆڤ و پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی توندوتیژ بەرهەم بهێنێت؛ مرۆڤگەلێکی زبر و میکانیکی باربێنێت. بەڵام ئەگەر زانایی و پەرچەکرداری وەک خوداناسی و مرۆڤدۆستی نەبووایە، کوردستان دەبووە کۆگایەکی پڕ لە بارووت بۆ جیهان. ئەگەر بیر و ئەندێشەی ژیانویستی، مرۆڤدۆستی و دڵپاکی نەبووایە کوردیش وەک لژیۆنە توندەکانی فەڕەنسایان لێ دەهات. لەگەڵ ئەو هەموو ستەم و ململانێ و جەنگ و شەڕی ناوخۆییەی کە دەرهەق

بە کورد کراوە، هێشتا کوردێک شک نابەین کە دەستی دابێتە تیرۆر و ڕەشەکوژی و خۆتەقاندنەوە، کوردێک کە بیەوێت بە کوشتنی ژنی دوگیان و منداڵ، بڕواتە بەهەشت، پەیدالانابێت.

بە هیوای ئارامی، ئاشتی و ئازادی لە جیهان دا.

## گەشتی تەها بەنیازی هەندەران

ڕوونکردنەوەیەک:

هەڵبەت بەسەرهات و بیرەوەرییە تاڵ و شیرینەکانی تەها سێکانیانی، هەوێنی چەندین کتێب و سیناریۆی فیلم و درامایە. ئەم بەسەرهاتەی «گەشتی تەهابەنیازی هەندەران»، لە بەرگی پێنجەمی «شازادەی حەمام» ی چاپی فارسیدا نییە، بەڵکو لە نێو ئەو دەفتەر و دەستنووسانەدا بوو، کە لە سەرەتای ساڵانی دوو هەزارەوە و لەسەر داوای بەندە، لەلایەن خودی تەها سێکانیانییەوە، بەمەبەستی کۆکردنەوە و چاپکردنیان وەک کتێبێک لە دواڕۆژدا، نووسراون. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە بە باشمان زانی کە بیرەوەریی ئەو ڕۆژانەی سەفەری هەندەرانیش، تێکهەڵکێشی کۆی ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە بکەین کە دکتۆر پاپۆلی نووسیونییەوە. ئەوەی جێگەی سەرنج و لێڕامانە، تەها تەنها وەک مرۆڤێک و بەهۆی کوردبوونەوە لە سێ وڵاتی عێراق، ئێران و تورکیا، ڕووبەڕووی زیندان و لێدان و دەربەدەریی، کوێرەوەریی و دەردەسەریی زۆر بووەتەوە.

سالح بێچار

تەها، تاکو مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠١ یش، هەرگیز باوەڕی بە جێهێشتنی وڵات و چوونە هەندەران نەبوو. پاش ئەوەی لە یەکەم سەفەریدا گیرا و گەڕایەوە، ئەگەر لەبەر خاتری نەجمەدین تەلانی نەبووایە، جارێکی دی نەدەڕۆیشتەوە. چونکە یەکەمجار نەجمەدین لەبەر تەها چوو. واتا ئەگەر تەها نەڕۆیشتمایە، ئەو نەدەڕۆیشت. جاری دووەم، ڕۆژی ٢١-٩ بە ماشێنی تەها، چوون بۆ ڕانیە. لەوێ چاویان بە کەمالی ڕێبەر کەوت، گوتی بەیانی زوو وەرن بۆ "کانی زەرد"ی ئێران، دەڕۆین. ئەوانیش دەبوو، هەمان ڕۆژ بەخێرایی بگەڕێنەوە بۆ شارۆچکەی دوکان، تا خۆیان ئامادە بکەین و دووبارە بەنیازی هەندەران بەڕێ بکەونەوە. لەبەر ئەوەی زۆر پەلەیان بوو، لە گەڕانەوەدا لە چوارقوڕنە، تەها بە ماشێن خۆی کێشا بە عەرەبانەیەکدا، ماشێنەکە هەندێک زەرەر و زیانی لێکەوت، بەڵام خۆیان سەلامەت بوون. بەر لە ئێوارە گەیشتنەوە دوکان، نەجمەدین چوو بۆ سلێمانی و تەهاش شەو خۆی ئامادە کرد. بەیانی زوو بەڕێکەوتن، کە بریتیبوون لە تەها، نەجمەدین تەلانی، خالید و سەرکەوت. تا قەڵادزێ بە ماشێنە بەرازیلییەکەی نەجمەدین ڕۆیشتن. لەوێش بەلاندکرۆزەر بەرەو نۆکان بەڕێکەوتن. لە نێوان شێنێ و زەڵێ، خالید و سەرکەوت، لە ترسی بازگەکەی زەڵێ دابەزین. بەڵام تەها و نەجمەدین وەرەقەیان پێبوو. لە نۆکان هەر چواریان یەکیان گرتەوە. تەها ئەسپێکی بەکرێ گرت و ئەوانیش بەپێ، بەرەو "کانی زەرد" کەوتنەڕێ. کاتژمێر یەکی پاشنیوەڕۆ، گەیشتنە گوندی "گڵکەند" لە تەنیشت گوندی "کانی زەرد". پاش ماوەیەک هێمنی برازای مام کەمال گەیشتە لایان، هەر لەوێ نانی نیوەڕۆیان خوارد. خانەخوێکەیان پیرەپیاوێک بوو، ناوی مام ئیبراهیم بوو. ماڵێکی زۆر باش بوون، زۆر ڕێزیان لێ گرتن. نزیکەی هەفتەیەک لەو ماڵە مانەوە. ئەو ماوەیەی لەوێ مانەوە زۆر بێزار و بێتاقەت بوون. چونکە ئەوان وا چووبوون

که تەنها شەوێک لەوێ بمێننەوە. ڕۆژانە دەچوونە نێو گوێزەکانی "کانی زەرد" بۆ گوێز خواردن. دۆڵی کانی زەرد زۆر خۆشە، دۆڵێکی دووورودرێژە لە گوندی بنە و خەڵەفەوە دەستپێدەکات تا قاسمە ڕەش. تەها بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٨٢ بەو دۆڵەدا ڕۆیشتبوو، ئەوکات ماڵی لە سلێمانی بوو، چووبوو بۆ سەرکردایەتی (ی.ن.ک). ئەو سەردەمە ئەو ناوچەیە بەدەست حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە بوو. ساڵی ١٩٨٨ یش کە بەهۆی ئەنفالەوە ئاوارە بوون، تەها جارێکی دی چووەوە بۆ ئەو ناوچەیە. ساڵانی ١٩٩٠ و ١٩٩١ پێش ڕاپەڕینیش بارەگایان چووە زەڵێ، هەمیشە بەدۆڵی کانی زەردا لەهاتوچۆدا بوو، بەرەو سەردەشت.

ئەو ماوەیەی لە گڵکەند مانەوە، تەها زۆر بێزار بوو، بڕیاریدا کە سەفەرەکەی نەکات و بگەڕێتەوە. زۆری بە نەجمەدین گوت تا بگەڕێنەوە، کەچی ئەو ڕازی نەبوو. بەڵام خالید و سەرکەوت پێیان خۆش بوو چونکە بەبێ هیچ هۆیەک شەش شەو لەسەر سنوور بمێننەوە، مانای نییە. تا شەوێک لەناکاو مام کەمال پەیدا بوو، سڵاوی کرد و دانیشت گوتی: تەوقە ناکەم، چونکە دەزانم زۆر پەستن. هەر زوو، کەوتە پاساوهێنانەوەی دواکەوتن و زۆر قسەی تر. لە کۆتاییدا گوتی بەیانی بەڕێتان دەکەم بۆ سەر مەرزی ئێران - تورکیا، ئەوانیش ناچار قبوڵیان کرد.

ڕۆژی ٩/٢٧ کاتژمێر یازدەی نیوەڕۆ لاندکرۆزەرێک هات و ئەوان پێنج کەس سواربوون. سەرکەوت نەچوو، گەڕایەوە. بۆ نیوەڕۆ چوونە سەردەشت. شۆفێرەکە ناوی سەڵاح بوو، بردنی بۆ ماڵی خۆیان، لە بنەڕەتدا قەڵادزێیی بوو، بەڵام ماڵی لە سەردەشت بوو. دیاربوو، لە ئێران زۆر دەستی دەڕۆیشت. نیوەڕۆ هەر لە ماڵی ئەوان نانیان خوارد و خزمەتی باشیان کردن. کاتژمێر دوو بەڕێکەوتن، لەلای نەڵاسەوە لە چۆمی کەڵوێ بەڕینەوە و چوونە مهاباد. لەوێوە چوونە ڕەزاییە. لەوێش دابەزین و سواری پەیکانیان کردن، بەڕێکران بەرەو مەرز، چوونە گوندی "مەلحەم" کە نزیکەی هەشت سەد ماڵ دەبوو. گوندێکی زۆر خۆش بوو، ئێوارە لەوێ نانیان خوارد و پاش ماوەیەک پێنج کەسی دیکەش هاتن، چەند ڕۆژێک بوو لەوێ بوون، ماوەیەک لە زیندانی مەهاباد زیندانی کرابوون و بەپارە کڕیبوویاننەوە، ناوەکانیان جەمال، هێمن، محەمەد، ئاوات و ئیسماعیل. دوانیان قەڵادزێیی و یەکێکیان هەولێری و دوانیان

ژاراوەیی بوون، بڕیاردرا کە سبەینێ لای نیوەڕۆ بەسواری ماشێن بەرەو دوا گوندی ئێران بەڕێبکرێن.

شەو پارەیان دا بە جەمال کە ئەو مەسرەفیان بکات، بڕیاردرا قادری برای خاوەن ماڵەکە، لەگەڵیاندا بێت بۆ گوندی نۆبرینگ کە گوندێکی تورکیایە. پێشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، هەر لەو ماڵە هەموویان سەریان شۆرد و ڕیشیان تاشی. کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ سواری ماشێنیان کردن و بەرەو سنوور بەڕێکران، لە گوندی (کۆزە ڕەش) دابەزین و لە شیوێکدا تا ئێوارە دانیشتن. دواتر چوونە نێو گوندەکە، لەوێ ئەسپسوار هاتن تا ئەسپەکانیان بەکرێ لێ بگرن. چونکە پارەی ئێرانییان پێنەبوو، بەلیرەی تورکی مامەڵەیان کرد. تەها و نەجمەدین یەکی بە پازدە ملیۆن لیرەی تورکی ئەسپیان بەکرێ گرت، تا نیوەی ڕێگا. کاروانیان کەوتەڕێ، سەد کەس زیاتر دەبوون، زۆربەی خەڵکەکە ئەسپی‌ان بەکرێ گرت، نزیکەی کاتژمێرێک ڕۆیشتن تووشی کەمینی (P.K.K) بوون، بۆ هەر کەسێک هەزار تومەنیان وەک گومرک، لێ وەرگرتن. ڕێگەی زۆریان بڕی گەیشتنە شوێنێک خاوەن ئەسپ تەهای دابەزاند و گوتی ماوەی سواربوونەکەت کۆتایی هات. ناچار بە دە ملیۆن لیرە، ئەسپێکی دیکەی بەکرێ گرت. تەها سەد دۆلار و بیست ملیۆن لیرەی لە قاچە دەستکردەکەیدا شاردبووەوە، پێنج ملیۆن لیرەش لەگیرفانیدا بوو، بۆیە دە ملیۆن لیرەی لە نەجمەدین وەرگرت و دایەدەست خاوەن ئەسپەکە. بەردەوام دەڕۆیشتن، لە پشت پایگایەکی تورکییەوە تێپەڕین. لە شوێنێک وەستان، کەسانی شارەزای تورکیا هاتبوون بەدویاندا، تەها لەوێ لە ئەسپ دابەزی. بەش بەش کران هەر کۆمەڵێک بریتیبوون لە دە تا پازدە کەس. ڕێبەرێکی چەکدار هەموو کۆمەڵەکانی لەگەڵ خۆی برد و ڕۆیشت. ئەمانیش قادریان لەگەڵدا بوو، کوڕێکی تورک پێشیان کەوت و کەوتنەڕێ، تەنها دە کەس و دوو قاچاخچی و ئەسپێک بەدەستە چەپی گرووپەکەی دیکەدا ڕۆیشتن.

تەها لە ڕێگە سواری ئەسپەکەی قادر بوو، مانگەشەو بوو، زۆر ڕووناک بوو. نزیکەی دوو کاتژمێر ڕۆیشتن، پاشان تەها دابەزی و ئەسپەکەی دایەوە بە قادر، قادر سواربوو. ڕۆیشتن تا گەیشتنە دۆڵێک، دۆڵێکی پانوبەرین بوو، بەناوەڕاستیدا ئاوێک دەڕۆیشت بەوبەریشەوە گوندێک دیار بوو، ناوی "نۆبرینگ" بوو. لە هەردوو

بەری ئاوەکەوە جادە هەبوو، جار جارە ماشێن هاتوچۆی دەکرد. ڕۆیشتن و لە جادەی یەکەم پەڕینەوە و لەسەر ئاوەکە لەنێو پەڵە سپیدارێک دانیشتن. کوڕە گوتی ناتانبەمە گوندەکەوە، چونکە دەستگیر دەکرێن. دەیانبینی ماشێن زۆر هاتوچۆیان دەکرد، وایان بەچاکزانی لە ئاوەکە بپەڕنەوە. تەها لە پشت قادرەوە سواری ئەسپەکە بوو، بەڵام ئەسپەکە کەوتە جووتەهاویشتن و هەردوکیانی بەردایەوە. هەموو بەنێو ئاوەکە کەوتن، نەجمەدین تەهای کۆڵ کرد، چوونە ئەوبەر. ماشێنێک هات و ڕاوەستا، قادر و کوڕە تورکەکە ڕایانکرد. بەتەنیشت ڕووبارەکەوە شیوێکی قوڵی گەورە هەبوو، ئاوی تێدا نەبوو، هەموو لەنێو شیوەکەدا بێدەنگ ڕاکشان. ماشێنەکە فول لایتی هەڵکردبوو ڕووی کردبووە شیوەکە. هەموو گوێیان لە دەنگی جەندرمەکان بوو کە بەشوێن ئەماندا دەگەڕان. پاش ماوەیەک ماشێنە سەربازییەکە ڕۆیشت. ئەمانیش چوون، لەولاتر پردێک هەبوو، هەندێکیان پەڕینەوە، لەناکاو جەندرەمە بۆیان دابەزین و پەلاماریاندان. بەخێرایی سواری ماشێنەکەیان کردن. لە کاتی سەرکەوتن بۆ نێو ماشێنەکە، جەندرمەیەک بۆکسێکی لە تەها سرەواند، جەندرمەیەکی دیکەش پەلاماری کاتژمێر و ئەنگوستیلەکەی دا و لێیان سەند. جەندرمەیەکیش پەلاماری گیرفانەکانی دا، ئەگەرچی پێنج ملیۆن لیرەی تێدا بوو، بەڵام چونکە شەو بوو نەیدۆزییەوە. بەو شێوەیە پەلاماری گیرفانی هەموویان درا، جەندرمەکان دەسکەوتیان هەبوو، چونکە جگە لە پارە هەر شتێک بەنرخ بوایە لێیان دەسەندن.

نزیکەی سی خولەک ڕۆیشتن، بردیاننە قەرەقولێک. لەوێ ڕیزیان کردن، کە بینییان تەها قاچێکی نییە، ڕێگەیان دا لەسەر کورسییەک دابنیشێت. بە وردی هەموانیان پشکنی. ئەفسەرەکەیان کەسێکی باش دیار بوو، کە سەیری گیرفانی تەهای کرد، پێنج ملیۆن لیرەکەی بینی بەڵام لێی نەسەند. تەها، دوو ناسنامەی پێبوو، یەکێکیان ناسنامەی ڕێکخراوی ئیمرجنسی ئیتاڵی بوو، ئەوی دیکەشیان ناسنامەی ڕێکخراوی هاندیکاپی فەرەنسی بوو، هەردووکیان تایبەت بوون بە دروستکردنی قاچی دەستکرد. هەر لەبەر ئەو ناسنامانەش بوو کە تەها نەیتوانی ناوی خۆی بگۆڕێت. چونکە ئەوانی دی هەموو ناوی خۆیان گۆڕیبوو، کەسیان ناوی ڕاستی خۆیان نەدەگوت. کە نۆرە هاتە سەر نەجمەدین، گوتی ناوم ئەحمەد حەسەن بەکرە، لەو کاتەدا تەها زۆر پێکەنینی

دەهات، خەریک بوو بە پێبکەنینەکەی ئاشکرایان بکات. تەها لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئاخر ناو نەماوە، ئەم ناوە نەبێت. هەڵبەت بۆیە ئەو ناوەی لە خۆی نابوو، تا بیری نەچێتەوە. شەو لە کاتژمێر چوار لای دابوو، سەتەلایت ئیشی دەکرد، لەسەر کەناڵێکی پۆڕن بوو، بە ئەوانیشیان گوت سەیر بکەن. ئەوان لە ژیانی خۆیان بێزاربوون. دواتر بردیاننە ژوورێکی بچووکەوە و دوو بەتانییان بۆ ڕاخستن، لێی ڕاکشان. تەها لەبەر سەرما و برسێتی و لە هیلاکی و خەفەتدا، خەوی لێ نەکەوت، پاش دوو کاتژمێر دونیا ڕووناک بووەوە.

تا کاتژمێر دوازدەی نیوەڕۆ لەو قەرەقولە مانەوە، بێ لێدان و جوێندان. پاشان سواری ماشێنیان کردن و بردیانن بەرەو ئەو قەرەقولەی کە شەوی ڕابردوو لە پشتی‌یەوە هاتبوون. هەر لەگەڵ گەیشتنیان، یەکسەر ڕیزیان کردن و زۆر بەوردی دەستیان کرد بەپشکنینیان، هەموو لەشیان گەڕان. هاوکات هەموو جانتا و جلوبەرگەکانیان هەڵڕشت و زۆر بە دیقەت دەیانپشکنین. گۆرەوی قاچە ساخەکەیان بە تەها داکەند و بەوردی ناو پێڵاوەکەشی گەڕان. بەڵام قاچە دەستکردەکەیان پێدانەنا. تەها لەوکاتەدا زۆر دەترسا، چونکە سەد دۆلار و بیست ملیۆن لیرەی تورکیی، لەنێو قاچە دەستکردەکەیدا شاردبووەوە. بەڵام پێنج ملیۆن لیرەکەی گیرفانی دۆزرایەوە و بردیان. زۆر بەوردی هەموو ئەوانی دیش گەڕان و پارەی باشیان دۆزییەوە. نەجمەدین بیست ملیۆن لە گیرفانیدا بوو، دۆزییانەوە و لێیان سەند. دواتر هەر لەوێ هێشتنیانەوە و پاسەوانیان بۆ دانان. چەند توتکە سەگێک لەو دەروبەرە بوون، پاسەوانەکان یارییان لەگەڵدا دەکردن، چونکە شوێنەکە خۆڵ بوو، بایەکی بەهێزیشی دەهات، هەموو تۆز و خۆڵەکە دەیدا بە دەموچاوی ئەواندا. تەها پێنووسێکی جوانی پێمابوو، کە پاسەوانەکە بینی، خێرا لێی سەند و خستییە گیرفانی خۆیەوە، گوتی ئەوە دیارییە، تەهاش گوتی ئەوە دیاریی نییە، ئەوە شەقە.

زوو زوو پاسەوانەکان دەگۆڕدران، بەڵام هەموویان هەر زوو لەگەڵ سەگەکان دەکەوتە یاریکردن. تەها و برادەرەکانی زۆریان برسی بوو، چونکە لەو کاتەوە دەستگیرکرابوون هیچ خواردنێکیان نەدابوونێ، بەڵام زوو زوو خواردنیان دەدا بە سەگەکان، هەڵبەت جەندرمە تورکەکان سەگەکانیان بەلاوە بەڕێزتر بووە تا ئەوان.

تەها و برادەرەکانی، وا بەنیازبوون بەرەو ئێران بەڕێ بکرێن، پرسییان کەی بەڕێیان دەکەن؟ گوتیان شەو. ئەوان حەزیان دەکرد زووتر بەڕێ بکرێن، تا بەڕووناکی بڕۆن. ئەو ڕۆژە بەڕێ نەکران، هەوا زۆر سارد بوو، هەموو لەسەرما هەڵدەلەرزین. کردیاننە هۆڵێکەوە کە پڕ بوو لە مێز و کورسی، تەلەفزیۆن و سەتەلایت ئیشی دەکرد.

لە هۆڵەکە دانیشتن وایانزانی خواردنیان دەدەنێ، بەڵام هیچ نەبوو. حانوتێک هەبوو بەڵام خۆ ئەوان هیچ پارەیان پێ نەبوو، تا شتێک بکڕن. دوو سێ بەتانییان پێدان و گوتیان بخەون ئەمشەو ڕەوانە ناکرێن. ئەوانیش پاڵیان لەیەکدا و بەتەنیشت یەکەوە لێی نووستن. تەها نەیدەتوانی قاچە دەستکردەکەی لە پشت سەرییەوە دابنێت، ناچار هەر لای قاچەکەی دیکەیەوە داینا. جەندرمەکانیش تا بەیانی نەنووستن، تەهاش نەیتوانی بنوێت، چونکە هەرکات نا کاتێک جەندرمەیەک دەهات و قاچە دەستکردەکەی تەهای هەڵدەگرت و سەیری دەکرد. تەهاش خێرا لێی وەردەگرتنەوە، چونکە پارەیەکی زۆری تێدابوو، نەیدەوێرا لێی بێ خەم بێ. جەندرمەکان تا بەیانی سەیری سەتەلایتیان دەکرد و شەڕە قسەیان بوو. بەیانی کردیاننە دەرەوە، تەهایان گێڕایەوە و جەندرمەیەک گوتی لەسەر ئەو کورسییە دانیشە. نان و چاو حەڵوایان هێنا بۆ جەندرمەکان و دەستیان کرد بەخواردن، تەها هەر چاوەڕوان بوو ئەویش بێبەش نەکەن، پاشان لە بەرماوەی جەندرمەکان چەند پارچە سەمونێک و پەرداخێک چایان بۆ تەهاش هێنا. ئەو چایە بەلای تەهاوە زۆر بەلەزەت بوو. تەها داوای لە جەندرمەکان کرد کە پارچە سەمونەکانی دیکەش کۆبکاتەوە بۆ برادەرەکانی، ئەوانیش ڕێگەیان پێدا، پارچە سەمونێکی زۆری کۆکردەوە، پاشان برادەرانیشیان کردە ژوورەوە، چایان بۆ ئەوانیش هێنا، ئەوانیش دەستیان کرد بەخواردنی بەرماوەی جەندرمەکان. ئەو بەیانییە، ئەوان ژەمی سەگەکانیان خوارد. پاشان کرانە دەرەوە، پێیانگوتن دەوروبەرەکەیان بۆ پاک بکەنەوە، ئەوانیش هەرچی پارچە کاغەز و پیسی نێو قەرەقولەکە بوو پاکیان کردەوە، دواتر هەموو پێکەوە لە جێیەک دانیشتن. ئەوان نەیاندەزانی بۆچی شەو بەڕێ نەکران. دڵیان بەوە خۆش بوو، ئەگەر سنوورداش بکرێنەوە، قادر لەسەر مەرز چاوەڕوانیان دەکات و دووبارە بەرەو تورکیا دەگەڕێنەوە. لە کاتژمێر نۆ و نیودا، گوێیان لە بانگە بانگێک بوو لای ئەو ڕێگایەوە کە شەوی پێشووتر پێیدا هاتبوون، ئەسپسوارێک

لەوبەرەوە تێپەڕی، دوای کەمێک گەڕایەوە، هەموو گوتیان ئەوە سۆراخی ئێمە دەکات. ئەوان لەم خەیاڵەدا بوون، گەلابەیەک هات و لە گۆڕەپانەکەدا وەستا، سێ کەسی تێدابوو، تەها سەیری کرد یەکێکیان قادرە، هیچ قسەی لەگەڵ نەکرد، بەڵام بەچاو تێیگەیاند کە بەرەو تورکیا دەگەڕێنەوە. تەها خێرا برادەرانی ئاگادارکردەوە. هەموو بەو پێشهاتە زۆر خۆشحاڵ بوون. پاش ماوەیەک سواری لۆرییەکەیان کردن و بەرەو ئێران بەڕێکەوتن. دوای کەمێک گەلابەکە وەستا، کەسێک هاتە لایان و پرسی قاچاخچی ئێوە کێیە لە تورکیا؟ گوتیان ناوی شێخ موسە، گوتی دەیناسن؟ گوتیان نەخێر. گوتی من شێخ موسم، ئێوەم کڕیوەتەوە بە سەد و پەنجا دۆلار. بەڕێکەوتنەوە، چوونە گوندی "نۆبرینگ" ئەو گوندەی لە نزیکی دەستگیر کران. برانە جێیەک پڕبوو لە عێراقی و ئەفغانی، تێکڕا سەد تا سەد و بیست کەس دەبوون. تا ئێوارە لەوێ بوون، پاشان کەوتنەڕێ. ماوەی چل و پێنج خولەک ڕۆیشتن، گەلابەیەک ئامادە کرابوو، سواربوون و ڕۆیشتن. پاش ماوەیەک دایانبەزاندن و سواری لۆرییەک کران. ماوەیەکی دیکە ڕۆیشتین و دایانبەزاندن. ماوەی کاتژمێرێک بەپێ ڕۆیشتن، گەیشتنە گوندێک بەناوی "بابڵە سەن"، لەوێ دابەشیان کردن. تەها و دە کەسی تر، چوونەماڵێک، لە ژوورێکی گەورە و پیس و دوکەڵاویدا بوون، هەندێک جلەکەر و شتی دیکەی لێ بوو، ڕایانخست و لێی دانیشتن، جگە لە ژن و پیاوێکی پیر هیچ کەسێکیان نەبینی، نان و چایەکی پیسیان پێدان.

ویستیان بنوون، کابرای خاوەن ماڵ لەناکاو گوتی هەستن ڕاکەن، وا جەندرمە هات. شارەزایەک پێشیان کەوت و چوون لە دەرەوەی گوند، خۆیان شاردەوە. دوو ماشێنی جەندرمەیان بینی چوونە نێو گوندەکەوە، پاش ماوەیەک ماشێنەکان ڕۆیشتن و ئەوانیش گەڕانەوە گوندەکە. جەندرمەکان چووبوونە ئەو ماڵەی کە ئەوانی لێ بوون، تومەس خەبەریان لێدابوون. لەوێ لەسەر جلەکەرەکان لێی نووستن، هێشتا چاویان نەچووبووەوە خەو، دووبارە هەڵیانساندن، گوتیان جەندرمە گەیشتۆتە نێو گوند. دوبارە ڕایانکردەوە، سێ ماشێن خۆیان کرد بەنێو گوندا، بەڵام هیچ نەوەستان، یەکسەر ڕۆیشتن. ئەمجارەش سەلامەت بوون و گەڕانەوە و لێی نووستن، کاتژمێر دوازدەی شەو هەڵیانساندن و شارەزا پێشیانکەوت و ڕۆیشتن. کاتژمێر و نیوێک زۆر

بەخێرایی ڕۆیشتن. لە شوێنێک دانیشتن هەندێک خەڵکی دیکەشی لێ بوو، ئەو ڕۆژە ٢٠٠١/١٠/١١ بوو، زۆر زۆر سارد بوو. تەها دوو پانتۆڵ، تراکسودێک، دوو بلوز، دوو کراس و قەمسەڵەیەکی لەبەردا بوو، کەچی هێشتا زۆری سەرمابوو. هێمن جلەکەرێکی لەماڵەکە هێنابوو تەها ویستی پێی بخەوێت، بەڵام لەسەرما خەو نەچووە چاوی. هەر لەوێ هێمن قسەی لەگەڵ کوڕێکدا کرد، ناوی شیروان بوو، گوتی حەزدەکات لەگەڵ گرووپەکەی ئێمەدا بێت و قاچاخچییەکان دەستیان بڕیوە. ئەو کوڕە پێشتر حیمایەی کاک کۆسرەت ببوو. لە تەقینەوەکەی هەولێر کە T.N.T بۆ کاک کۆسرەت دانرابوو، دوو پێشمەرگە شەهید ببوون و ئەمیش دەموچاوی سووتابوو. تەها زۆر دڵی بۆی سووتا، هەستی حیزبایەتی بۆی جوڵا، گوتی با هاوکاری بکەین. تا کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ لەوێ مانەوە، پاشان خەڵکی گوندەکە بە سواری ئەسپەوە هاتن، بۆ ئەوەی ئەسپەکانیان بەکرێ پێبدەن. تێکڕا ئەسپیان بەکرێ گرت، زیاتر لە سەد کەس بە سواری ئەسپ کەوتنەڕێ. ئەم هەموو ئەسپسوارە بەو هەڵەتەدا کەوتنەڕێ، لەشکرەکەی تەیموری لەنگی بیری تەها هێنایەوە کە خۆی لە بیرەوەرییەکانیدا باسی کردووە، بەڵام بەدوو جیاوازییەوە، یەکەم لەشکرەکەی تەیموری لەنگ زیاتر لە سەد هەزار سوار بوون، بەڵام ئەمان زۆر کەم بوون، دووەم ئەوان هەموو سوارچاک و جەنگاوەر بوون و زۆر ئازابوون، بەڵام ئەمان هەندێکیان زۆر ترسنۆک بوون، تەنانەت نەیاندەوێرا سواری ئەسپیش ببن. بە شاخێکی زۆر بەرزدا سەرکەوتن، شاخێکی کوێستان، پێدەچوو هەمیشە جگە لە بەفر هیچی تری لێ نەبارێ. وا دیار بوو لەبەر ساردی، جگە لە هەندێک دڕک و داڵی کوێستانی هیچ ڕووەکێکی دیکەی لێ نەڕوێت. تەها، تا کاتژمێر سێ و نیوی پاشنیوەڕۆ، بەسواری ئەسپ ڕۆیشت، بە بیست ملیۆن لیرەی تورکیی. پاشان دابەزی و بەپێ دەڕۆیشت، لەسەر شاخەکەوە ڕۆیشتنە خوارەوە، پاشان بە شیو و دۆڵدا، یەک وچان ڕۆیشتن تا کاتژمێر دوازدەی شەو گەیشتینە گوندی "جانداران"، لەوێ بۆ ماوەی کاتژمێرێک سواری لۆری بوون، نەفەری بە دە ملیۆن لیرە. پاش کاتژمێرێک ڕۆیشتن لە شوێنێک دابەزین و زۆر بەخێرایی دەڕۆیشتن. زۆر هیلاک ببوون بەتایبەتی تەها، کە هێندەی نەمابوو پەکی بکەوێت. بانگی بەیانی گەیشتنە گوندێک، لەوێ ماشێنی سەرگیراو ئامادەکرابوو، سواربوون

ماوەی کاتژمێرێک زیاتر ڕۆیشتن گەیشتنە شاری "وان". لەوێ لەخانوویەکدا دایاننان. دەمێک بوو هیچیان نەخوارد بوو، زۆریان برسی بوو، کاتژمێر نۆ ناردیان سەمون و تەماتەیان بۆهات و نانیان خوارد. تا کاتژمێر حەوتی ئێوارە لەوێ مانەوە، پاشان ماشێن هات و بردیاننە خانوویەکی دیکە کە نهۆمی ژێرەوە بوو. زیاتر لە پەنجا کوردی دیکەشی لێبوو. زۆر هەوڵدرا خانوو پەیدا نەبوو بۆیان. پاشان خاوەن ماڵ ئەوانی بردە نهۆمی سەرەوە، لای ماڵ و مناڵەکەی. ژوورێکی بۆ چۆڵ کردن، شەوی بە سێ ملیۆن لیرە بۆ هەر نەفەرێک، نانخواردنیش لەسەر گیرفانی خۆیان. کە چوونە ژوورەکەوە، ژوورێکی زۆر خۆش بوو، هەموو داوای گەرماویان کرد، خاوەن ماڵ کە ناوی شێخ موس بوو، گوتی نەفەری بە یەک ملیۆن. بۆ جلوبەرگیش دەبێ پارە بدەن، بە جلشۆر بۆتان دەشۆین، ڕازی بوون، ناچاربوون. تەها بایی سێ ملیۆن و نیو خۆشۆرین و گەرماوی کرد، یەکەم کەسیش خۆی شۆری. شاری وان زۆر سارد بوو، داوای بەتانیی زیاتریان کرد، گوتیان بەتانی نییە، ئێوە کوڕی کوێستانن بەتانیتان بۆچییە. ئەو شەوە زۆریان سەرمابوو، هەر لەوێ بەتەلەفۆن قسەیان لەگەڵ مام کەمال کرد و باسی شیروانیان بۆ کرد کە کەوتۆتە گەڵ ئەوان، گوتی زۆر باشە. گوتیان پارەمان لا نییە بۆ مەسرەف، شیروان پارەی پێیە لە حسابی تۆ لێی وەردەگرین، گوتی باشە. بۆیە دوو سەد و پەنجا دۆلاریان لێوەرگرت بۆ خەرجیی. ئیتر لە حسابی مام کەمال دەستیان کرد بە مەسرەف، ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بوون پێنج جار گۆشتیان خوارد، هەر شتێکی دیکەیان داوا بکردایە لەسەر حسابی خۆیان شێخ موس بەزوویی بۆی دەهێنان. هێمن زۆری حەز لەخواردن بوو، هەموو ژەمێک بیبسی قوتوی دەخوارد.

چەند ڕۆژ لەویش مانەوە، زۆر پەست بوون. ڕۆژێک مام کەمال تەلەفۆنی کرد، تەها قسەی لەگەڵدا کرد. گوتی "کانی زەرد"م لێ دووبارە دەکەیتەوە؟ مام کەمال گوتی سبەینێ بەڕێدەکەون بۆ ئەستەمبوڵ. بەڵام دیسان بەڕێ نەکران. تەها بەنیاز بوو، فاکس بنێرێت بۆ زوبێدە، بەڵام نەینارد. ڕۆژێک کتوپڕ زوبێدە تەلەفۆنی بۆ کرد، زۆر خۆشحاڵ بوو کە هەواڵی ماڵ و منداڵی زانی. زوبێدە هەر لە ماڵەوە پێش بەڕێکەوتن، بە تەهای گوت لە هەر شوێنێک وڵاخ هەبوو بەکرێی بیگرە، خەمی پارەت

نەبێت. تەهاش بەقسەی کرد، گەر بەقسەی نەکردایە دەبوو بە فیلم. ئەو شەوەی کە لە سنووری ئێران - تورکیا پەڕینەوە، ئەسپی بەکرێ گرت، ئەو ڕۆژەی کە چوون بەرەو "وان"، دوبارە ئەسپی بەکرێ گرت، تێکڕا چل و پێنج ملیۆن لیرەی تورکیی دابوو بە کرێی ئەسپ. ڕۆژی ۱۰/۷ کاتژمێر حەوتی ئێوارە سواری پاسی سەرگیراو کران و بردیانن بۆ جێیەک، کردیاننە ژوورێکەوە، خەڵکی دیکەشی لێبوو. زۆربەیان ئەو برادەرانە بوون کە جاری پێشوو، پێکەوە بوون. لەوانە خدر ئیتاڵی کە کوڕێکی زۆر باش بوو، مامۆستا ئاری، کارمەند، سەلام و حەمەڕەش. لە ساڵانی هەشتاکانی ڕابردوودا زۆربەی پێشمەرگەکانی سنووری قەڵادزێ برادەری تەها بوون، خەڵکی زۆر ئازا و شۆڕشگێڕن بوون کە بەداخەوە زۆربەیان شەهید بوون.

پاش چاکوچۆنی لەگەڵ برادەرە تازەکانیان، نزیکەی کاتژمێرێک مانەوە. پاشان هەموو پێکەوە کەوتنەڕێ کە تێکڕا ببوون بە سی و هەشت کەس، ئەمان یازدە کەس و ئەوانیش بیست و حەوت کەس. پاش ماوەیەک ماشێنەکە ڕاوەستا، کەسێک هات، گوتی بۆ ماوەی چارەکێک چەند نەفەرێکی دیکە سواری پاساکە دەکەین، کە هاتن ئەوانیش سی و سێ ئەفغانی بوون. زۆر بە پاڵەپەستۆ لە پاسەکەدا جێگەیان بووەوە، پاش نیو کاتژمێر دایانبەزاندن و شارەزا پێشیانکەوت. زۆر بەخێرایی دەڕۆیشتن، پاش ماوەیەک لەسەر دەریاچەی وان خۆیان بینییەوە. ئاوی دەریاچەکە سوێر و لینج بوو، بەکەڵکی خواردنەوە نەدەهات، هیچ زیندەوەرێکی تێدا ناژی. لەوێ زۆر سەرمایان بوو، پاش ماوەیەک چاوەڕوانی، بەلەمێکی گەورە هات، لەنێو بەلەمەکەدا ژوورێکی تێدابوو، لەگەڵ شوێنی دانیشتن لە دەرەوە. تەها فریا نەکەوت بچێتە ژوورەکەوە، لە دەرەوە دانیشت، بەختی هەبوو ئەو شوێنەی لێی دانیشت، ئاستی ئەگزۆزی بەلەمەکە بوو، هەر بۆیە زۆر سەرمای نەبوو. پاش چوار کاتژمێر گەیشتنە وشکانی و دابەزین. پازدە خولەک بەپێ ڕۆیشتن، لۆرییەک ئامادە کرابوو کە لە سەرەوە فەردە "کا"ی لێ بارکرابوو، قاتی خوارەوەش بۆ ئەمان ئامادە کرابوو. زۆر بەناڕەحەت جێگەیان بووەوە، چونکە ژمارەیان زۆر بوو، سەرجەم حەفتا و یەک کەس بوون، کورد و ئەفغانی. نزیک کاتژمێر یەکی شەو، سواربوون، لۆرییەکە بەردەوام دەڕۆیشت، چەند جارێک لە خاڵی پشکنینی سەر ڕێگا ڕاگیرا. دواجار کاتژمێر دەی بەیانی، ڕۆژی دواتر،

لۆرییەکە لە خاڵێکی پشکنین ڕاگیرا و دەرگایان کردەوە، تەها جەندرمەکانی بینی، هەمدیسان دەستگیر کران. پاشان کەوتنەڕێ، لۆرییەکیان بردە قەرەقولی جەندرمەی شارۆچکەی "ئەشقەلا". لەوێ دایان بەزاندن، کورد و ئەفغانیان لە یەکدی جیاکردەوە. ڕیزیان کردن، دەستیان کرد بە پشکنینیان، ناونووس کران. دواتر کورسی و مێزیلن بۆ خۆیان هێنا و چەند کەسێک دانیشتن. یەک یەک بانگیان کردن و جۆرەها پرسیاریان لێ کردن، پاشان پەنجەمۆری هەردوو دەستیان لێوەرگرتن. هۆڵێک چەند ماشێنێکی تێدابوو، لای ئێوارە ماشێنەکانیان دەرکردن و فەردە "کا"کانی نێو لۆرییەکەیان پێبردنە ژوورەوە، گوتیان بۆخۆتان لەسەری بنوون، بەبێ ڕاخەر و بەتانی. ئەو ڕۆژە هەر یەکەی سەمونێکیان وەرگرتبوو. سبەی بەیانی کە هەڵسان سواری لۆرییەکەیان کردن و بردیانن بۆ دادگا، لەوێش پرسیاری زۆریان لێ کرا و هەموو واژۆیان پێکرا. لە هۆڵی دادگا چایخانەی لێ بوو، ئەمانیش زۆر حەزیان لە چا بوو، کابرایەک لەڕێی خودا یەکی چایەکی بۆ کڕین. دوای دادگا بردنیانەوە بۆ قەرەقول، لەوێش هەریەکە و سەمونێکیان دانێ. ئەو شەوەش لەوێ مانەوە. ئەفغانییەکان زۆر بێدەنگ بوون، یەکێکیان کە ناوی "شا وەلی خان" کوڕی "خوداجە قەهارەدین" بوو، فارسی باش دەزانی. خان چووە لای تەها و ئەوان، کە زانی تەهاش فارسی دەزانێت، لێی پرسی ئێوە شیعەن یا سوننەن؟ تەهاش گوتی کورد هەمووی سوننەیە، خان زۆری پێخۆش بوو، گوتی ئێمە چوار کەسمان سوننەین، ئەوانی دیکە هەموویان شیعەن. زۆر مەدحی سوننە و زەمی شیعەی کرد. تەها بە شا وەلی خانی گوت تۆ کێت خۆشدەوێت؟ ئەویش گوتی حیزبی تالیبان، ئوسامە بن لادن و مەلا محەمەد عومەری ڕابەری تالیبان، لەگەڵ موسڵمانی سوننە. تەها گوتی منیش هەر ئەوانەم خۆشدەوێت و دەچم بۆ ئەفغانستان بۆ جەنگ. خان زۆری پێخۆش بوو وایدەزانی تەها بەڕاستییەتی. تەها گوتی شا وەلی خان، خۆ من و تۆ هەردوکمان سوننەین، من بە کوردی نزا دەکەم، تۆش بڵێ ئامین، خان گوتی زۆر باشە. تەها گوتی یاخودا ئوسامە بن لادن ڕووڕەشی دونیا و قیامەت بێت، شا وەلی خان گوتی ئامین. تەها گوتی یاخودا حیزبی تالیبان کەسیان نەمێنن، خان گوتی ئامین. تەها زۆر دوعای شەڕی کرد، خان هیچ حاڵی نەدەبوو، هەر دەیگوت ئامین. دوا جار شا وەلی خان ناونیشانی خۆی دا بە تەها، بۆئەوەی کە چووە ئەفغانستان سەردانی بکات.

تەها و برادەرەکانی زۆریان پێسەیر بوو کە لەو قەرەقولە لێدان و جوێندان نەبوو. هیچ ئیشێکیان پێنەدەکردن. زۆر ڕێزیان لێ دەگرتن و سوعبەتیان لەگەڵ دەکردن. شەوێکی دیکەش هەر لە ئەشقەڵا مانەوە، ڕۆژی دواتر کاتژمێر دەی پێشنیوەڕۆ، سواری لۆرییەکەیان کردن و بەرەو شاری "ئەرزڕۆم" بەڕێیان کردن. بە کاتژمێرێک گەیشتینە نێو شار، شارێکی زۆر گەورە بوو، تەلارەکانی هەمووی شەش - حەوت نهۆم بوون. شارێکی زۆر پاک و خاوێن و جوان بوو، لۆرییەکە لە بەردەمی ئەمنیەت -ئاسایش- ڕاوەستا، دایانبەزاندن. پاش ماوەیەک سواری لۆرییەکەیان کردنەوە و ماوەی سێ کاتژمێر لەنێو لۆرییەکەدا مانەوە. هەر لەنێو لۆرییەکەدا یەکی نیو سەمونیان دانێ. دواتر دەستیان کرد بە پشکنینیان، لەپێشدا لە ئەفغانییەکانەوە دەستیان پێکرد، هەرچی لیرەی تورکی‌یان پێبوو لێیان سەندن. نزیکەی هەشتا ملیۆن لیرەیان پێبوو. پاشان هاتنە سەر کوردەکان، بە هەموویان نیو ملیۆن لیرەیان پێبوو. دیسان دایانبەزاندن و بردیاننەوە ژوورەوە، بەپلیکانەدا بردیاننە ژێرزەمینی بینای ئەمنیەت، کە بەتایبەت بۆ زیندان دروست کرابوو، پێنج ژوور و توالێت و گەرماوی تێدا بوو. کومبار لە ژوورەکاندا ڕاخرابوو، دوو تاک قەنەفەی تێدابوو، لەگەڵ سێ بەتانی. ژوورەکان هەر یەکەیان سێ مەتر بە سێ مەتر دەبوون. ئەمان نۆزدە کەس لە ژوورێکدا بوون، زۆر بەخراپی جێگەیان ببووەوە. ئێوارە هەر کەسە و سەمونێک و تەماتەیەکیان پێدان. سبەی بەیانی بردیانن بۆ توالێت، دەموچاویان شۆری و کردیاننەوە ژوورەوە. تێکڕا زۆریان برسی بوو، لای نیوەڕۆ یەکی سەمونێک و دوو تەماتەیان دانێ. پاشان ئەفغانییەکانیان بانگ کرد، کە ڕۆیشتن، نەهاتنەوە. کوردەکان زانییان کە ئەفغانییەکان بەڕێکراون. پاش ماوەیەک دەستیان کرد بەخوێندنەوەی ناوی کوردەکانیش، چەند ناوێکیان خوێندەوە لە ژوورەکەی تەها و ئەواندا نەبوون. تەها بینی، ئەو کەسانەی کە ناویان دەخوێنرێتەوە، دەچن پارەیان دەدەنێ. کە ناوی ئەویش خوێنرایەوە، چوو واژۆیان پێکرد و ملیۆنێک لیرەیان پێدا. هەر کەسە و ملیۆنێک یان نیو ملیۆن لیرەی وەرگرت. پاشان کرانەوە ژوورەوە. پاش نیو کاتژمێر بانگکرانە دەرەوە و ڕیزیان کردن، پاسێک ئامادە کرابوو، سواریان کردن و چەند کەسێکیان لەگەڵدا ناردن و بەڕێیانکردن. تێگەیشتن بۆ سنووورداشکردنە بەرەو مەرزی سلۆپی و

ئیبراهیم خەلیل. کاتژمێر دوو و نیوی پاشنیوەڕۆ لە ئەرزڕۆمەوە بەڕێکەوتن، چەندین شار و گوندی جوان سەرنجی تەهایان ڕاکێشا، زۆری پێ سەیر بوو کە تورکیا چۆن بەو ئابوورییە ڕووخاوەوە، ئەم کۆشک و تەلارە جوانانەی دروست کردووە. جگە لە چەندین گوند و شارۆچکەی جوان. ئەم شارانە زۆر سەرنجی تەهایان ڕاکێشا: ئەلازیک، کە شارێکی زۆر گەورە و خۆشە. ماوەن، شارێکی گەشتوگوزارییە. ئامەد، ماردین، جزیرە، سلۆپی، خابوور.

هێشتا لەئەرزڕۆم بوون کە کوردێکی زیندانی خەڵکی باشووریان هێنایە لای ئەمان. لە ناویان پرسی، گوتی ناوم کامیلە و چەند مانگێکە لە ئەستەمبوڵم، خۆم ڕادەستکردووە، تا بگەڕێمەوە بۆ کوردستان. بە قسەکانیدا دیاربوو زیاتر ژیانی لەسەر دزیکردن بووە. لە ئەستەمبوڵ لە پاسەکەدا کەوتە چەنەبازی و لە تورکەکان دەچووە پێشەوە، دوو وشە تورکیشی نەدەزانی، ئەوانیش پێیان ڕادەبوارد و جوێنیان بە کورد و مام جەلال و کاک مەسعود دەدا. تەها ڕوویکردە کامیل و بەهەڕەشەوە پێیگوت کە زمان نازانی، بۆچی لێیان دەچیتە پێش؟ بۆ قسەیان لەگەڵ دەکەیت؟ تەنانەت برادەرانی قەڵادزێش زۆر لە کامیل بێزار بوون، ویستیان لێی بدەن، بەڵام تەها نەیهێشت.

هەر لەو ڕۆژەوە کە دەستگیر کرابوون، تەها لە سنووورداشی دەڤەری برادەرانی پارتی دەترسا، چونکە ئەو پێشمەرگەی دێرینی یەکێتی بوو، لە نێو ڕیزەکانی یەکێتیی‌دا، زیاتر لە سی ساڵ کار و خەباتی کردبوو. چەند کەسێکی خەڵکی سلێمانی لەگەڵیاندا بوون، دوانیان برا بوون، لە ئەنجامی گفتوگۆدا، تەها زانی ئەو دوو برایە پارتی‌ین، ئەوان بە تەهایان گوت ئێمە لەنێو پارتی هیچ ناترسین، چونکە تا پاریش باوکمان حیمایەی کاک عارف تەیفور بووە.

کاتژمێر حەوت و نیوی سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٢-١٠ گەیشتنە سلۆپی، لەوێ بۆ ماوەی کاتژمێرێک ڕایانگرتن، پاشان لێپرسراوێکی تورک هات وەریگرتن و کۆمەڵێک جوێن و قسەی ناشرینی پێگوتن. لەسەر پردەکەی خابوور ڕایانگرتن، بەرێکی پردەکە لە ژێر کۆنترۆڵی تورکیادایە، بەرەکەی دیکەشی باشووری کوردستانە. پاشان لێپرسراوی ئاسایشی ئیبراهیم خەلیل هات وەریگرتن و بردنیە ئاسایشی

ئیبراهیم خەلیل، لەوێ لە سەربانی ئاسایش دایاننان و ناونووس کران، هەر کەسە و پازدە دیناریان لێ وەرگرتن. لای نیوەڕۆ پاسیان بۆ هێنان سەریانخستن، بە نزیک شاری زاخۆی جواندا بەرەو دهۆک ڕۆیشتن. لەوێش لە ئاسایش دایانبەزاندن، چوونە حەوشەکە، چەند کەسێکی سنووررداشی دیکەش لەوێ بوون، کە ڕۆژی پێشتر گەیشتبوون. لەوێ سەریان شۆرد و تا ئێوارە مانەوە. ئەفسەرێکی ئاسایش هات ماوەی پازدە خولەک هەندێ قسەی کاڵ و کرچی بۆ کردن، هەر نەیدەزانی قسە بکات. کەچی هیمەت بەو نەزانیەی خۆیەوە دەیگوت، پارتی پەنجا کادری وایان هەبێت بەسیانە! تەهاش گوتی ئەوە کەی کادرە و کەی قسەزانە؟ ئەوە لەچاو تۆدا کە هیچ نازانی، ئەو کادرە.

پاشان هەرکەسە و دوو سەمون و دوو ترۆزییان بۆ هێنان و نانیان خوارد. دواتر نزیکەی حەفتا و پێنج کەسی دیکەشیان هێنا کە ئەوانیش هەر سنووررداش کرابوون، ئەوانیش نانیان خوارد و هەموو دانیشتن. پاشان ئەفسەری ئاسایش ئاگاداریان کردن کە هەر بیست کەس و بە لیستێک ناوی خۆیان بنووسن. پێیانگوتن کرێ پاسی بەیانیش کۆبکەنەوە بەرەو هەولێر، بۆ هەر کەسێک حەفتا دینار. هەموو ناویان نووسی و پارەیان کۆکردەوە. لەنێو ئەوانەدا کە تازە هاتبوون، کوڕێکیان تێدابوو ناوی موحسین بوو، قاچی شوێن گوللەی کۆنی پێوە بوو، گوتی پێشمەرگەی پارتی بووم و لە شەڕی هەولێر بریندار کراوم، زەلامێکی زل و بەهێز بوو. تەها گوتی قاچم ئازاری زۆرە، نازانم چی بکەم؟ نەجمەدین گوتی با، ئەم برادەرە بەهێزە بۆت ڕابکیشێ، بەڵکو چاک ببێت. هیمەت گوتی ئەوە شەقت لە من هەڵدا بۆیە وات لێهات. کاک موحسین گوتی من قاچت بۆ ڕادەکێشم، بەڵکو چاک ببێت، نەیزانی قاچی تەها دەستکردە، قاچی چەپی تەهای گرت و بە هەموو هێزی خۆی ڕایکێشا، قاچەکە بەدەستیەوە دەرهات، موحسین زۆر شڵەژا، خەریکبوو بتۆقێ.

شەو نووستن، بەیانی زۆر زوو هەڵسان و سواری پاس بوون، کاتژمێر سێ و بیست خولەک بەڕێکەوتن، کاتژمێر نۆ و نیوی بەیانی گەیشتنە ئاسایشی گشتی هەولێر. لەوێ تا ناوەکان خوێنرایەوە ماوەیەک ڕایانگرتن. پاشان بردیانن بۆ ئاسایشی سلێمانی. کاتێ بە نزیک پەرلەماندا تێپەڕین، ئیسماعیل گوتی ئەوە پەرلەمانە، تەها

گوتی ئەوە جێگەی شێرە، کەچی ئێستا ڕێوی لێی دەکا گێرە. چوونە ئاسایشی سلێمانی، لەوێش بردیاننە سەربانەکە و زۆر بەوردی هەموویان پشکنین. یەک، یەک بانگیان دەکردنە خوارەوە، چەند پرسیارێکیان لێ دەکردن و دەچوونەوە سەربانەکە، لە تەهایان پرسی قاچت بەچی لەدەستداوە؟ تەهاش گوتی لە کاتی فەوجە خەفیفەکاندا، لە شاربازێڕ جاش بووم، جەلالییەکان هاتنە سەرمان و بە (R.P.G) لێیاندایین، قاچم پەڕی و بەو دەردەیان بردم. تەها لەو کاتەدا، لە ناخی خۆیدا زۆر نیگەران و بێزار بوو، دەیگوت ژیان چەند سەیرە، بۆ دەبێ خۆت مێژووی پڕ شکۆی خۆت، ئاوەژوو بکەیتەوە و نەتوانیت بڵێی من پێشمەرگە بووم و چەکی خەبات و شەرەفم لە شاندا بووە، بەرگریم لە خاک و خەڵک کردووە، بۆیە ئاوام بەسەرهاتووە. بەڵام ئاسایی بێت خۆت بکەی بە جاش و نیشتمان فرۆش. چەند کارەسات و قێزەونە لە نێو خەڵک و میللەتی خۆتدا بوختان بۆ خۆت دروست بکەیت، ئاخ تاڵاوی شەڕی براکوژی.

پاشان تەهاش چووەوە سەربانەکە. لە کاتی ڕاوەستانیان لە سەربانەکە، کوڕێکی ئاسایش، کە ناوی تۆفیق بوو، گوتی خەڵکی جاسەنەتان تێدا نییە؟ تەها خێرا ڕووی خۆی وەرگێڕا، ترسا لەوەی بیناسێت. کاتژمێر دوو و نیو، لێکۆڵینەوە کۆتایی هات، گوتیان بڕۆن. ئەوانیش چوونە بازاڕ و لەوێوە چوونە گەراجی سلێمانی و سواری ماشێن بوون. نەفەری پەنجا دیناریان دا و بەرەو سلێمانی بەڕێکەوتن. تەها، شەو کاتی نوێژی خەوتنان گەیشتەوە ماڵەوە، لە شارۆچکەی دوکان.

پاشان تەها لەوە تێگەیشت، ڕۆیشتن بۆ هەندەران بەشێکی تەنها چاولێکەرییە. دەنا، کەسێک ئەگەر هەشتا هەزار دیناری هەبێ، بۆچی هەژارە. یاخود کوردانی ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستان، لە دۆخێکی زۆر خراپی ئابوورییدان، بەڵام هەرگیز هێندەی کوردانی باشوور، بیر لە ڕۆیشتن و جێهێشتنی وڵات ناکەنەوە.



لە ڕاستەوە: د. پاپولی یەزدی، تەها سیکانیانی بە بەرگی پێشمەرگایەتییەوە و فەربودی پاپولی - سیکانیان



امینە حەمەشوان و محەمەد عەبدوڵڵا (دایک و برای تەها)



لە ڕاستەوە: شەمسە، د. وسوقی (هوما) و زوبێدە



بارین کوڕەزای تەها



گۆڕەپانی مۆزەخانەی نیشتمانیی ئەمنەسوورەکە - سلێمانی





مۆزەخانەی نیشتمانیی ئەمنەسوورەکە - ژوورەکانی ئەشکەنجەدان



شوێنەواری گوللە بە دیواری (مۆزەخانەی نیشتمانیی ئەمنەسوورەکە) وە



(هۆڵی ئاوێنەبەندی شەوەزەنگ و ڕۆشنایی) لە مۆزەخانەی نیشتمانیی ئەمنەسوورەکە



بەشی زیندانی ژنان لە مۆزەخانەی نیشتمانیی ئەمنەسوورەکە



لە ڕاستەوە: د. پاپولی یەزدی، د. وسوقی، فەربود پاپولی و ساڵح بێچار - کۆفی نێتی ئەمنەسوورەکە



دیمەنێکی بازاڕی سلێمانی



شانۆی ڕۆمانی لە نێو پارکی هەواری شار- سلێمانی



دیدار لەگەڵ سەرۆکی زانکۆی سلێمانی پ. د. ڕەزا حەسەن حسێن



دیدار لەگەڵ سەرۆکی زانکۆی سلێمانی پ. د. ڕەزا حەسەن حسێن



بەشی زمان و ئەدەبی فارسی لە زانکۆی سلێمانی




بەشی زمان و ئەدەبی فارسی لە زانکۆی سلێمانی



له ڕاسته‌وه‌: د. ئه‌حمه‌د حه‌مه‌ئه‌مین، سالّح بێچار، د. پاپولی یه‌زدی، د. وسوقی، د. ئه‌رکان عه‌بدوڵلا، و ته‌ها سێکانیانی - زانکۆی سلێمانی



دیمه‌نێکی که‌مپی نوێی زانکۆی سلێمانی



بارەگاکانی شۆڕش لە چەمی ڕەزان



گوندی سێکانیان (شوێنی لەدایکبوونی تەها)



خێزانی یاسینی حاجی عەبدوڵڵا برای تەها لە سێکانیان



ئاگرکردنەوەی نەورۆز لە دامێنی شاخی پیرەمەگروون - ئێوارەی نەورۆزی ٢٠١٩



خوانی حەوتسین و حافزخوانی



فەربود بە بەرگی کوردییەوە




کۆبوونەوەی خەڵک بۆ خۆشی دەربڕین بە بۆنەی نەورۆزەوە لە سلێمانی






مۆنۆمێنتی شەهیدانی کیمیابارانی گۆپتەپە



تەها لەنێو مۆنۆمێنتی شەهیدانی کیمیابارانی گۆپتەپە




مۆنۆمێنتی شەهیدانی کیمیابارانی گۆپتەپە



مۆنۆمێنتی شەهیدانی کیمیابارانی گۆپتەپە



کارزان و کۆچەر - دوو هاوژینی لاو



نیوارۆخوانی برایانی مەلاسەفی لەنێو باخەکەی خۆیاندا



لە راستەوە: خاتوو خانزاد، قادر و نادری کوڕی



گەناو - ئەو شوێنەی تەها "مین" لە ژێر پێیدا تەقی و قاچێکی لەدەستدا



لە ڕاستەوە: تەها، د. پاپولی، عەبدوڵڵا، ئایشە، د. وسوقی و شەهێن



کاکەحەمەی مامەڕازە (ڕێبەری هەقەکان)



شێخ هاوڕێ کاکەحەمە و د. پاپولی یەزدی (نەورۆزی ٢٠١٩)



خانەقای مامەڕەزاییەکان - کەڵکەسماق




نەخشەی کوردستانی گەورە لە شاری سلێمانی بەسەر چیای گۆیژەوە



ئارامگەی خەباتگێڕی کورد مام جەلال تاڵەبانی، سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و سەرۆک کۆماری عێراق



(شەهید زرار سەعدون هاوسەری شەمسە)



هەردوو شەهیدی فەرماندە زرار و سەلام حەمەشوان (خاڵی تەها)




شەهید زوهێر (برای زرار و زوبێدە)




شەهید ستار سێکانیانی (برای تەها)




شەهیدی فرماندە سەلامی حەمەشوان (خاڵی تەها)



شەهید دڵشاد تۆفیق بەنگینە (هاوڕێی تەها)

## سوپاس و پێزانین

دەربڕینی هەستی سوپاسگوزاری ئاسوودەیی بەناخی مرۆڤ دەبەخشێت، کەواتە لە قوڵایی دڵەوە سوپاس بۆ بەڕێز سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی، بەتایبەت سەرۆکی زانکۆی سلێمانی بەڕێز «پرۆفیسۆر دکتۆر ڕەزا حەسەن حسێن»، کە ئەرکی لەچاپدانی ئەم کتێبە بەنرخەی گرتە ئەستۆی خۆی، وەک دەستکەوتێکی زانستی گەورە لە پاڵ هەموو ئەو دەسکەوتانەی لە ماوەی سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی‌دا پێشکەشی ڕەوتی زانست و بەرەوپێشچوونی زانکۆی دایک، بەدەستی هێناوە.

بەڕێز ڕاگری کۆلێجی زمان «پرۆفیسۆر دکتۆر شاخەوان جەلال حاجی فەرەج» بۆ هاوکاری و کارئاسانی بەڕێزیان.

بەڕێزان لیژنەی پاداشتی توێژینەوە و دانانی کتێب لە زانکۆی سلێمانی، بەڕێز «پرۆفیسور دکتۆر عیزەدین بابان» و ئەندامانی لیژنەی بەڕێز، بۆ هەموو هەوڵ و ماندووبوونێکیان.

هەریەک لە بەڕێزان: پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر محەمەد ئەمین محەمەد نوری ئەمین «هەورامان» و پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر عەدنان عەبدولڕەحمان تەها، هەڵسەنگێنەرانی زانستی کە بە سەرنج و تێبینییەکانیان کتێبەکەیان دەوڵەمەندتر کرد.

بەڕێز پرۆفیسۆر دکتۆر شیلان عومەر حسێن، هەڵسەنگێنەری زمانەوانی کە بەوپەڕی دڵسۆزانە و زۆر بە وردی پێداچوونەوەی زمانەوانی و هەڵەبڕی کتێبەکەی لە ئەستۆگرت.

بەڕێز پرۆفسیۆر دکتۆر محەمەد دلێر کە زۆر هاوکاری کردین لە پێدانی زانیاری دەربارەی مێژووی زانکۆی سلێمانی.

بەڕێز پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر «سازان زاهیر سەعید» بۆ هاوکاری و کارئاسانی بەردەوامی بەڕێزیان.

بەڕێز مامۆستا مۆفەق میراودەلی، بۆ پێدانی زانیاری ورد سەبارەت بە بۆمبارانی زانکۆی سلێمانی، لە قەڵادزێ لە ١٩٧٤/٤/٢٤ دا.

سوپاس و پێزانین بۆ هەموو ئەو کەسانەی هاوکارمان بوون تەنانەت ئەگەر بە دەربڕینی وشەیەکیش بووبێت.